


ناوی کتێب: ڕۆژی دوایی..

بەڵێنە ڕاستەقینەکە

نــووســەر: عمر عبدالكافي

وەرگێڕانی: ئامانـج محمد أمين

چاپ و دیزاین: ناوەندی ڕاگەیاندنی ئارا

نۆبەی چاپ: یەکەم ٢٠١١

تیراژ: (١٠٠٠)دانە



ARA Media Center

ناوەندی ڕاگەیاندنی ئارا

هەنگاوێك بەرەو ڕاگەیاندنێکی کوردیی ئیسلامیی هاوچەرخ



ناونیشان: ناوەندی ڕاگەیاندنی ئارا

سلێمانی / شەقامی پیرەمێرد

0770 358 7100

0750 106 9589

0748 013 4669

ara.m@hotmail.com



لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان

ژمارە (١٥٣١) ی ساڵی ٢٠٠٩ ی پێدراوە

# ڕۆژی دوایی

## بەڵێنە ڕاستەقینەکە

نووسینی

د.عمر عبدالکافي

وەرگێڕانی

ئامانج محمد أمین

چاپی یەکەم

٢٠١١

# نەخۆشی مەرگ

## ئاگات لەم ڕێڕەوە بێت...!!

ئەجەل بۆ ئادەمیزاد نزیکترە لە هیوابوون، مردنیش لە خودی خۆی نزیکترە. ئادەمیزاد هیوا خوازە زۆر بژی و خاوەنی هەموو نیعمەتەکان بێت و سامان کۆبکاتەوە و بگات بە پلەو پایەی دنیا... سوربوون لەسەر دنیا خاوەنەکەی لەناو دەبات، خراپترین کەس ئەوانەن کە هیوادرێژن بەدنیا.

داوامان لێکراوە ئەو هاوسەنگییە ڕابگرین کە پێغەمبەری خوا ﷺ ڕێنمویی بۆ کردوین و دەفەرموێت: (اعمل لدنياك كأنك تعيش أبداً واعمل لآخرتك كأنك تموت غداً) واتە: (کاربکە بۆ دنیا وەك ئەوەی کە بۆ هەمیشە دەژی، وە کاربکە بۆ قیامەت وەك ئەوەی کە بەیانی دەمریت). بەڵام ئەگەر لایەنی دنیاو هیوا درێژیمان لەسەر حسابی ڕۆژی دوایی هەڵبژارد، ئەمە هانمان دەدات هەتا بەخۆماندا بچینەوە، دەبێ ئەو ڕاستییە بزانین کە ئادەمیزاد بێ هودە دروست نەکراوە و بێ ڕێنمویی جێی نەهێشووە، پرۆگرامێکی ڕوونی پێداوە، ئەوەتا پێی ڕاگەیاندوین ئێمە لە ژیانی دنیادا وەك نامۆیەکین یاخود ڕێبوارێکی ڕەوتەنی، نموونەی ڕێبواری ڕەوتەنی بۆ ڕێگەی بیابانێکی کاکی بەکاکی بەکاردێت کە ئەو ڕێبوارە دەیبڕێت و پاشان دارێکی بێتە سەر ڕێ و بۆحەوانەوە بچێتە ژێری (ئەمەیە دنیا) پاش ماوەیەکی کەم ئەو سێبەرە کاتییە جێ دێڵێت و درێژە بە سەفەرەکەی دەدات، ئەمە سروشتی ژیانی دونیایە نەمانەوەی هەمیشەیی نەجێگیربون، نەئاسایشی بەردەوام، کەواتە هەمیشە و هەردەم بۆچونی مردن ئامادەیە. بۆیە وەیل بۆ ئەو کەسەی بە دنیا فریو دەخوات و بەرەو نیعمەتە کاتیی و بەسەرچووەکانی مل دەنێت و دڵی پێ خۆش دەکات، نموونەیەك بۆ ئەم حاڵەتە دێنینەوە ئەگەر یەکێك لە کۆمپانیا پەیمانکاریەکان ڕێرەوێکیان

دروست کردو کەسێك هات لەسەرئەو شوێنە خانویەکی دروست کرد داخۆ خەڵکی چی پێ دەڵێن؟ بێگومان دەڵێن ئەمە شێتە! گریمان ئەو ڕێڕەوە دووکەنار بەیەك دەگەیەنێت و هەریەکەیان جیهانی زیندەوەرانیان تێدایە، بەڵام ژیانی باوەڕدار لەسەر دوو جیهان وەستاوە جیهانی دنیای فانی و جیهانی ڕۆژی دوایی هەتاهەتایی، لەگەڵ ئەو جیاوازییە بەرفراوانەی کە لەنێوانیاندایە ناتوانین بڵێین شێتە، بەڵکو دەبێت بڵێین نازیرە، شێت ئەو کەسەیە دوورە لە میهرەبانی خوا، بۆیە پێغەمبەر ﷺ پێی ڕاگەیاندوین بەو جۆرە کەسانە نەڵێین شێت، بەڵکو بڵێین بەرکەوتوو یاخود بریندار چونکە شێت ئەو کەسەیە لە ڕەحمی خوا سڕاوەتەوەو زیریی لێ سەندووەتەوەو ڕێگەیەکی حەرامی گرتوەتەبەرو پشتی کردۆتە ڕاستی بۆیە بۆتە دۆزەخی.

ئەوانەی ژیانی دنیایان کردۆتە مەبەستی سەرەکیان کارو ژیانیان بەبێ هودەیی لە دەست چوو لەدوایشدا هەرئەوەیان چنگ کەوت کە خوای گەورە بۆی دیاری کردبوون. کەواتە دنیا نمایشێکی بەسەرچووە، ڕابواردنێکە پڕ لە خۆبایی بوونە، چاك و خراپ لەسەری دەژی. ڕۆژی دوایی وادەیەکی پێش وەختەو نیعمەتێکی بەردەوامە سەردارێکی دادپەروەر تیایدا دەسەڵاتدارەو حەق لە شوێنی خۆیدا بەرقەرار دەکات و ناڕەوایش وەك خۆی نیشان دەدات.

## ئاگات لەم دوو بەشە بێت:

خوای گەورە دنیای داوە بەوکەسەی خۆشی دەوێت یان خۆشی ناوێت (دنیا وشەیەکی عەرەبییە واتە (دنیە) واتە: نزم، نزمایی) بەڵام ڕۆژی دوایی تەنها بە بەندە لەخوا ترسەکان بەخشراوە، دینیش نەدراوە بەکەسێك کە خۆشی ناوێت، هەندێکمان سەیری هەندێکمان دەکەین، بۆ دنیایەکی بەسەرچوو ئێرەیی بەیەك دەبەین، ماڵ و سامان و بازرگانی، دەسکەوتەکان و پلەو پایە، خۆمان سەرقاڵ

و بێ ئاگا دەکەین لەو بەندایەتی و گوێڕایەڵیەی کە خوای گەورە ئێمەی لەبەرئەوە بەدیهێناوە ئیتر چۆن ئێرەیی بەیەکتر نەبەین لەبەر ڕۆشنایی ئەو ڕێنماییەی پێغەمبەر ﷺ کە فەرمویەتی: ماڵ و سامانمان لە پێناوی بەدیهێنانی حەقدا بەخەرج بدەین و لە زانست و فێرکردنی زانستدا بۆ خەڵکی بەکاری بهێنین، کێ لە ئێمە پرسیاری لەخۆی کردووە: ئایا کوڕەکەی قورئانی لەبەرکردووە؟ ئایا بەکچەکەی وتووە خۆی بالا پۆش بکات و دین و ناموسی خۆی بپارێزێت، کێ لە ئێمە شەو هەڵدەستێ و خێزانەکەشی بەئاگادێنێ و خوای گەورەش ڕوخساری ڕۆشن دەکاتەوە: ﴿تَعْرِفُ فِي وُجُوهِهِمْ نَضْرَةَ النَّعِيمِ﴾[1].

واتە: لە سیمایانا گەشیی نازو نیعمەت ئەناسیتەوە. پێویستە لەسەر هەمووماندەرك بەم ڕاستیانە بکەین، ﴿وَفِي ذَٰلِكَ فَلْيَتَنَافَسِ الْمُتَنَافِسُونَ﴾[2]، واتە: دەسا با ئەوانەی لەناو خۆیانا ئەکەونە ململانێ و هەرکەسێ شتی چاکی بۆ خۆی ئەوێ، بۆ دەستخستنی نازو نیعمەتی وا بکەونە ململانێ.

إبن القیم (ڕەزای خوای لێ بێ) دەفەرمویت: (بۆ گەیشتن بەخوا لەزۆر دەرگام دا، بینیم نزیکترین دەرگایان لەخواوە (عز وجل) دەرگای خۆنەوی کردنە بۆی) بانموونەیەك لەسەر حاڵی ژیانی دنیا بێنینەوە کە چۆن مانایەك دەگەیەنێت لە بەرامبەر ڕۆژی دوایی.

خەڵکانێك لەسەر کەشتیەك بوون، سەرکاری کەشتیەکە ویستی لەو سەفەرەیدا کەمێك بحەوێتەوە تەماشای کرد لەبەردەم دورگەیەکدان پێی وتن: بڕۆن دابەزن بۆ ئەم دوورگەیە بەڵام زۆر مەمێننەوە چونکە بەزوویی دەڕۆین، خەڵکەکە بوون بە سێ بەشەوە، بەشی یەکەم گوێڕایەڵی سەرکاری کەشتیەکەبوون خێرا گەڕانەوە ناو کەشتیەکە و زۆر پێی دڵخۆش بوون، و

---

١- المطففین: ٢٤

٢ - المطففین: ٢٦

سەرکەوتنێکی گەورەیان لەو گوێڕایەڵییەدا بەدیهێنا، چونکە بەهۆی خۆشی و جوانییەکانی ئەو دوورگەیەوە دوچاری لەخۆبایی بوون و سەرقاڵی نەبوون، لەکاتێدا هۆکارەکانی ئەو خۆشی و ڕابواردنەی تیابوو وەك بەروبومی جۆراوجۆرو خورماو باخ و باخاتی چڕوپڕو سایەو ڕەزو باخی بەردار.

بەشی دووەم بەو نیعمەتانەوە سەرقاڵ بوون و لە گەڕانەوەیاندا بۆ ناو کەشتییەکە زۆرێك لەو نیعمەتانەیان لەگەڵ خۆیاندا دەهێنا بەڵام سەرکاری کەشتیەکە فەرمانی پێکردن فڕێیان بدەن لەبەرئەوەی جێگەیان نیە لەناو کەشتیەکەدا، بەشی سێیەم نیعمەتەکان فەرمانی سەرکاری کەشتیەکەی بیربردنەوەو کەشتیەکە کەوتە ڕێ و لە غەم و نائومێدیدا جێی هێشتن.

ئەوانەی لە ژیانی دنیادا کاردەکەن وەك ئەو پیاوە وان کە کۆمەڵێك کرێکاری گرتووە تا لە ماڵەکەیدا کاربکەن، کارەکانی بەسەردا دابەش کردن دوای ئەوەی وادەی حەقی کرێکەیانی پێدان ئەمانەتی کارەکانی دایە دەستیان و پاشان بەجێی هێشتن و ڕۆیشت ئەوانیش وا گومانیان برد کە خاوەنی ماڵەکە دیار نەماو ئاگای لەکارەکانیان نیە بۆیە هەندێکیان لەسەر ئەو وادەیە بوون کە بەخاوەن ماڵیان دابوو کارەکانیان بە دڵسۆزییەوە ئەنجامدا، هەندێکیشیان لەنێوان کارو جار جار پشوودااندا کارەکەیان ئەنجامدا، ئەوانی تریش ئەو وادەو ئەمانەتەی درابووە دەستیان نەیان پاراست و هیچ کارێکیان ئەنجام نەدا، هەتا خاوەنی کارەکە گەڕایەوە لایان و بێ ئەوەی ئەوان هەستی پێ بکەن چاودێری کردبوون بەڵام حەقی ماندوبونەکەی بە دادپەروەرانە پێدان و ستەمی لە کەسیان نەکرد، بۆیە هەندێکیان زۆر سەربەرزانە کارەکەیان ئەنجامدا، هەندێکی تریشیان گەیشتن بە مەبەستی خۆیان، ئەوانی تریش دوچاری خەسارەتمەندی بوون.

له میهرەبانی خوای گەورەیە بۆ ئێمەی بەندەکانی کە کۆتایی ژیانی پێ ڕاگەیاندوین و چارەنوسی مرۆڤی لە ڕۆژی دوایدا دیاری کردووە: ﴿ إِنَّكَ مَيِّتٌ وَإِنَّهُم مَّيِّتُونَ ﴾[1]

واتە: بێگومان، ئەی موحەممەد! تۆ سەرەنجام ئەمریو ئەوانیش هەموو ئەمرن.

﴿ كُلُّ نَفْسٍ ذَآئِقَةُ ٱلْمَوْتِ ﴾[2]، واتە: هەموو گیانلەبەرێ ئەبێ تالاوی مەرگ بچێژێو ئەم دنیایە بەجێبێڵێ.

﴿ كُلُّ مَنْ عَلَيْهَا فَانٍ ﴾[3] واتە: هەموو ئەوانەی بەسەر ئەرزەوەن فەوتاوو لەناوچوون.

تاکە ڕاستی ڕوون و ئاشکرا لەم ژیانەدا مردنە کە فریای هەموو زیندەوەران دەکەوێت و پێیان دەگات:

﴿ أَيْنَمَا تَكُونُواْ يُدْرِككُّمُ ٱلْمَوْتُ وَلَوْ كُنتُمْ فِي بُرُوجٍ مُّشَيَّدَةٍ ﴾[4] واتە: لە هەرکوێ بن مردن پێتان ئەگات و ناتوانن لێی ڕزگار بن، ئەگەرچی لە قەڵای بەرزو سەخت و قایمکراودا بن.

تەنانەت بێ باوەڕانیش مشت و مڕ لەسەر ئەم ڕاستییە ناکەن، هەموان لەئاست ئەم ڕاستیەدا سەرنەوی دەکەن.

لەگەڵ ئەمەش دا زۆرێك لە مرۆڤەکان ئەم راستیـیە فەرامۆش دەکەن یاخود لە بیریان دەچێتەوە !.

---

١- الزمر: ٣٠

٢ - آل عمران: ١٨٥

٣- الرحمن: ٢٦

٤- النساء: ٧٨

## لەوانەیە ڕەحمەت بێ...

مردنی لەناکاو مایەی حەوانەوە و ڕەحمەتی پەروەردگارە بۆ کەسی باوەڕدارو غەم و نائومێدییە بۆ خراپەکاران، کەسی باوەڕدار مافەکانی پەروەردگارو ئەمانەتی سەرشانی یەك بەیەك جێبەجێ دەکات و لەهەر کاتێکدا بێت ئامادەیە بۆ گەیشتن بەخوای خۆی.

زۆرجار ئادەمیزاد لەکاتی نوێژ کردندایەو بێ هۆیەکی دیارو لەناکاو مردن یەخەی پێ دەگرێت، داخۆ حاڵی کەس و کاری چۆن بێت بۆی، دیارە زۆر خۆشحاڵ دەبن چونکە شایەتومانی هێناوەو پاشان مردووە بۆیە خۆزگەی پێ دەخوازن بەو چارەنوسەی کە لەلایەن پەروەردگارییەوە بۆی دیاری کراوە، ئەو کەسێکی نوێژخوێن بوو دیارە یەکەم پرسیار کە لە گۆڕدا لە بەندە دەکرێت دەربارەی نوێژەکەیەتی، ئەگەر دەرکەوت کە بە تەواوی و بێ کەم و کوڕی ئەنجام دراوە ئەوا لێی وەردەگیرێت بەدوای ئەوەشدا سەرجەم کارەکانی تریشی لێ قبوڵ دەکرێت، خۆ ئەگەر کەموکوڕی تیابوو ئەوا دەدرێتەوە بەسەریداو کارەکانی تریشی لێ وەرناگیرێت.

کەواتە ئەوەی وازی لە نوێژ هێناوە ئەوا لەم ئیسلامەدا هیچ پشکێکی نابێت.

مردنی لەناکاو ڕەحمەتێکی گەورەیە بۆ بەندەی خوا، لەبەرئەوەی ئەگەر لەوە زیاتر بژیایە، لەوانەیە تەرازووی کردەوە چاکەکانی سوکتر ببوایە، یاخود دنیاو داوەکانی دەوریان بگرتایەو لەبەرامبەریاندا ئارامی نەبوایە، یاخود دوچاری چەند تاقیکردنەوەیەك ببوایە و خۆگرو دامەزراو نەبوایە.

## بەم شێوەیە حەزمان بە مردنە...!!!

هەموومان حەزمان بەمردن نییە، بەڵام ئەبو زەر (ڕەزای خوای لێ بێ) لەم بارەیەوە وتەیەکی تری هەیە! دەفەرموێت: حەزم بە برسێتیە، حەزم بە نەخۆشیە و، حەزم بەمردنە، دەفەرموێت: لەبەرئەوەی ئەگەر برسیم ببێت دڵم

ناسك و پاك دەبێتەوە ئەوەی دەیەوێت با سەیری كەسی ڕۆژووان بكات لە ڕۆژانی ڕەمەزاندا!. ئەگەر نەخۆش كەوتم ئەوا گوناهەكانم سوك دەبن چونكە نەخۆشی لابەری گوناهەكانە. بەڵام ئەگەر مردن هات بەسەرمدا ئەوا بەخوای خۆم دەگەم، ئەمەش ئەوپەڕی حەزو ئاواتمە، باسی مردن وا لە كەسی داواكار دەكات خوای زیاتر خۆش بوێت.

بەڵام خۆشویستن و حەزكردن لە مەرگ لای خاتوو عائیشەی دایكی باوەڕداران (ڕەزای خوای لێ بێ) بەم جۆرەیە لە خزمەت پێغەمبەردا بوو ﷺ فەرمووی: یا رسول الله هەموومان حەزمان بە مردن نییە ئەویش فەرمووی: بەوجۆرە نیە بەڵكو كاتێك ڕۆح گەیشتە گەروو ئەو كاتە ئادەمیزاد شوێنگەی خۆی لە بەهەشت یان لە دۆزەخدا دەبینێت، ئەگەر لە گرۆی بەهەشتیەكان بوو ئەوا حەزی بەو مردنەو گەیشتن بەخوا دەبێت خوای گەورەش پێشوازی لێ دەكات، خۆ ئەگەر لە دۆزەخییەكان بێت ئەوا حەزی بەو مردنە نابێت و خوای گەورەش بەو گەیشتنەی خۆشحاڵ نابێت.

وەختی سەردانی فریشتەی مەرگ بۆلای ئادەمیزاد مانای ساتی وادەی مردنیەتی ئەو سەردانەی هیچ هۆیەكی تری نیە تەنها كۆتایی ئەجەلی نەبێت:

﴿فَإِذَا جَآءَ أَجَلُهُمۡ لَا يَسۡتَأۡخِرُونَ سَاعَةٗ وَلَا يَسۡتَقۡدِمُونَ﴾[1] واتە: بۆ هەموو ئوممەتێ ماوەییێكی تایبەتی دانراوە، كە ماوەكەیان تەواو بوو و ڕۆژیان هات نە سەعاتێ دوائەخرێن و نە سەعاتێ پێش ئەخرێن.

دیارە ئێمە ناتوانین بڵێین فریشتەی مەرگ لە كەسی بەساڵاچوەوە نزیكترە وەك لە گەنج یاخود منداڵ یاخود نزیكترە لە نەخۆش وەك لە كەسێكی تەندروست، لەوانەیە كەسی لەش ساغ و تەندروست سەردانی كەسێكی نەخۆش

---

١- الأعراف: ٣٤

بكات بەڵام لەناكاو مەرگ ببێتە میوانی و كەسی نەخۆشیش بەرەوچاك بونەوە بچێت.....

بەڵێ ئەوە ئەجەلە و مردنیش پێویستی بە هۆیەك نییە لە هۆیەكانی دونیا بۆیە شاعیر دەڵێت:

| | |
|---|---|
| مشيناها خُطىً كتبت علينا | ومن كتبت عليه خُطىً مشاها |
| ومن كانت منيته بأرض | فليس يموت في أرض سواها |

## سودی یادی مردن:

یادی مردن تەوبەكردن و گەڕانەوە لە گوناه و تاوان خێراتر دەكات، كێ دەزانێت كە سەفەر دەكات، جانتای سەفەرەكەی ئامادە دەكات، ئەو پێداویستییانەی دادەنێت كە لەماوەی سەفەرەكەیدا پێویستی دەبێت ئەی ئاخۆ سەفەری مردن چۆن بێت! . یادی مردن وام لێ دەكات بە كەم ڕازی بم وە یەكێك لەم چوار تەوەرەیەی تەقوام بۆ بەدی دێنێ ئەویش ترسان لە خواو كاركردن بە قورئان و سوننەت و ڕازی بوون بە كەم و خۆئامادەكردن بۆ ڕۆژی كۆچ كردن، ئەم ڕازی بوونە بە كەم لە مرۆڤێكەوە بۆ مرۆڤێكی ترجیاوازە.

پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت: (من أصبح منكم آمناً في سربه (أي أهله) معافى في جسده، عنده قوت يومه، فكأنما حيزت له الدنيا)[1]

یادی مردن وام لێدەكات قەناعەت بەو ڕۆزییە بكەم كە خوا پێی بەخشیوم و دڕایەتی وابەستەبوان بەم دنیایەوە ناكەم لە ژیانیاندا. چەندێك هەوڵ بدەم بۆ زیاد كردنی ڕۆزییەكەم بێ سودە ئەگەر ویستی پەروەردگاری لەسەر نەبێت لەوەی كە بۆی دیاری كردووم، ئەمەیش لاوازیی كەسایەتی نییە بەڵكو پشت بەستنە بە خوای گەورە: (واعلم أن الأمة لو اجتمعت على أن ينفعوك بشيء، لن

---

١- رواه الترمذي.

ينفعوك إلا بشيء قد كتبه الله لك)[1]. (بزانه ئەگەر هەموو ئوممەت كۆبونەوە بۆئەوەی سودێکت پێ بگەیەنن، هیچ سوودێکت پێناگەیەنن مەگەر بەشتێ نەبێت کە خوای گەورە بۆی نوسیویت).

## لەبەرئەمەیە کە هەندێ ڕقیان لێیەتی...!!!!

پرسیار لە پیاوچاکێك کرا: بۆچی ڕقمان لە مردنە؟ وتی: لەبەرئەوەی دنیای خۆتان ئاوەدان کردۆتەوە و ڕۆژی دواییتان کردوەتە وێرانە، بۆیە ئادەمیزاد ڕقی لەوەیە لە ئاوەدانییەوە بڕوات بۆ وێرانە بەڵام پیاوچاکان دنیا و ڕۆژی دواییان پێکەوە ئاوەدان کردۆتەوە بۆیە لە مردن ناترسن.

پیاوێکی نامۆ هات بۆ کوفەو وتی: یاشێخ کوا عیمران؟ ئەویش هێنای بۆگۆڕستان..!! وتی: من پێت دەڵێم کوا عیمران تۆ دەمهێنی بۆ ئێرە!. کابرا وتی: ئەوەی لەویایە هەمووی دێت بۆ ئێرە کەس لێرەوە ناڕواتەوە بۆ ئەوێ.

بەڵێ، ئێمە لەمردن دەترسین لەبەرئەوەی لە لێپرسینەوە دەترسین بەهۆی زۆری سەرپێچی وگوناه وکەم وکوڕیەکانمان، یەکێکی تر لەپیاوچاکان دەڵێت: (وتە وتەی کەسی ترساوە، کردەوەیش کردەوەی کەسی هێورو ئارامە) بۆیە ئێمە خەڵکێکین هیوا دوورو درێژەکانمان فریوی داوین ئێمە دەڵێین گومانمان بەخوای خۆمان چاکە بەڵام گومانی چاك بردن نیە بەخوا، چونکە ئەگەر وا بوینایە کردەوەکانمان چاك دەکرد و ئەو کارانەمان نەدەکرد کە کردمان!.

نائومێدی بۆ ئەوکەسەی کە لە عاقیبەت شەڕی ناترسێت، بەندە کاتێك دەڕۆم بۆ کارێك لە دەزگایەك یاخود کۆمپانیایەکدا داوای دۆسیەی کردەوە تاوانییەکانم لێ دەکەن هەتا لە رابردووم تێبگەن و لە کردەوەکانم دڵنیابن هەرکەسێك دۆسیەکەی ڕەش بێت ئەوا خاوەنی کارەکە وەریناگرێت، داخۆ حاڵ

---

١- رواه الترمذي.

و باری ئەو جۆرە كەسانە چۆن بێت لە ڕەش بونی دۆسیەی ئیمانییان ناترسن كە بە سەرپێچی و گوناه پڕبۆتەوە چۆن لە ڕۆژی لێپرسینەوەدا لە بەرامبەر خوای گەورەدا دەوەستن...؟!!

## نەسیمی ڕەببانی بۆ نەخۆش:

ئادەمیزادی باوەڕدار كاتێك خوای گەورە دوچاری نەخۆشییەكی دەكات، دەزانێت چەندین گوناهی هەیەو دەیەوێت بەهۆی ئەو نەخۆشییەوە پاكی بكاتەوە، مادام ئارام دەگرێت و چاوەڕێی پاداشتە لەخوای گەورە، تەنانەت كاتێك دڕكێك دەچێت بەپێی باوەڕدارێكدا دەبێتە چاكەیەك ئەمەش نامەی یەكەم و نەسیمی یەكەمە - دووەم: خوای گەورە دەیەوێت زەلیلی عیززەت و دەسەڵاتی بم، بەڵام هەتا ئادەمیزاد نغرۆی نیعمەتەكان بێت ئەوا لە بەڵایەكی گەورەدا دەژی و نوقمی خۆشی ڕابواردن و تەندروستی چاك و ماڵ و سامان وكورسی و دەسەڵات بووە.. هەموو ئەمانەیش تاقیكردنەوەن بۆ ئادەمیزاد و چارەنوس و داهاتویان شەڕ و خراپەن بۆ خاوەنەكەی چونكە لە بەندایەتی و پەرستنی خوا دووری دەخاتەوەو بەرەو لادان و سەرپێچی هانی دەدات، ئەوجا شەیطانی ئادەمی و پەرییەكان بە خەیاڵی سەرپێچی سەرقاڵی دەكەن و سوپاسگوزاری پەروەردگاری لەبیر دەبەنەوە، بۆیە ئەم نەخۆشییە پێویستی بە هەڵوێستەیەك هەیە بۆ بیركردنەوەو گەڕانەوە بەرەو ئامێزی باوەڕ.

سێیەم: بەرەكەتی نزای پیاوچاكانی دەست دەكەوێت، ئەگەر نەخۆشی نەبێت ئەوا هەندێك گێرە و كێشە هەیە بەردەوام دەبن، بۆ نموونە كەسێك نەخۆش دەكەوێت هاوڕێكانی دەچن بۆسەردانی ئەویش داوای نزای خێرو لێبووردنی ئەوان و لێخۆشبونی خوایان لێ دەكات، ئەم خۆشەویستییەش لەخوای گەورەوەیە، دەیدات بەهەركەسێك لە بەندەكانی كە خۆی ویستی لەسەرە

دیاره كەسی سەردانكەر كاتێك دەچێت بۆلای نەخۆش ئەو نزایەی بیرناچێت كە دەفەرموێت: (الحمد لله الذي عافانا مما ابتلي بـه كثيراً مـن خلقـه وفضـلنا علـى كثير ممن خلق تفضيلا). واتە: سوپاس بۆ ئەو خوایەی كە منی لـەو نەخۆشـییە پاراستووە كە داویەتی بەسەر ئـەم نەخۆشـەداو فـەزڵی داویـن بەسـەر زۆرێـك لـە دروستكراوەكانی خۆیدا).

دیـارە سـەردانی نـەخۆش بۆتـە فـەرزو ئـەركێك و ئیسـلام دیـاری كـردووە و ئەركی سەرشانی هەموو موسوڵمانێكە بەسەر هەر موسوڵمانێكی ترەوە، ئـەوەتا خوای گەورە لـەم فەرمایشـتە قودسـییەدا دەفـەرموێت: (ياعبـدي: مرضـت فلـم تعدني. قال: يا رب كيف أعودك وأنت رب العـالمين! قـال: أمـا علمـت أن عبـدي فلان مرض فلم تعده أما علمت أنك لو عدته لوجـدتني عنـده (أي لوجـدت جـزاء ذلك عندي) )[١]. واتە: بەندەكەم: نەخۆش كەوتم و سەردانت نـەكردم بەندەكـەش دەڵێت: خوایە چۆن سەردانت بكەم كە تۆ خوای جیهانیانیـت! خـوای گـەورەش دەفەرموێت: ئایا نەتزانی كە فڵانە بەندەم نـەخۆش كـەوت تـۆ سـەردانت نـەكرد ئایا نەتزانی ئەگەر سەردانت بكردایە لـەوێ منـت دەبینـی (واتـە: پاداشـتی ئـەو كـارەت لای مـن دەبـوو). ئەگەرسـەردانی بكـەیت لـە تاڵـە مووەكـانی سـەرتەوە ڕەحمەتی خوا بەسەرتدا دەبارێت هەتا بنی پێت و(٧٠) هەزار فریشـتە سـەڵاوات لەسەرت دەدەن.

كەسانێك هەن سـەردانی نـەخۆش دەكـەن بـۆ مەبەسـت و بەرژەوەندییـەكی دنیایی كە لـەخودی خۆیانـدا هەیـە یـاخود سـەردانی نـەخۆش ناكـات بـەبیانوی ئەوەی ئەو نەخۆشـە كـاتی خـۆی سـەردانی ئـەمی نـەكردوە كەنـەخۆش بـووە، دیارە خوای گەورە كارێك وەرناگرێت هـەتا زۆرتـرین دڵسـۆزی و ڕاسـتگۆیی تیـا

---

١- رواه مسلم.

نەبێت ئەوەتا دەفەرموێت: (أنا أغنى الشركاء عن الشرك فمن عمل عملا أشرك معي فيه غيري وضعت نصيبي له). واتە: من لە هەموو هاوبەشەکان بۆ هاوەڵ پەیداکردن بێ نیازترم ئەوەی کردەوەیەك بکات هاوەڵ بۆ من پەیدا بکات تیایدا ئەم جۆرە کارانەش تەنها ئەو جۆرە کەسانە دەیکەن کە بەندەی دنیان ئەوەتا پێغەمبەری خۆشەویست لەم کردەوەیە ئاگاداری کردوینەتەوەو دەفەرموێت: (تعس عبد الدينار وعبد الدرهم وعبد الخميصة، إن أعطي رضي وإن لم يعط سخط تعس وانتكس وإذا شيك فلا انتُقش)[1]. واتە: تیاچێ ئەوانەی عەبدی دینارن بەندەی درهەمن بەندەی جل و بەرگ و پۆشاکن، ئەگەر پێی درا خۆشحاڵ و ڕازی دەبێ ئەگەر نەشیاندایە ئەوا توڕەو بێزار دەبێت، (چارە ڕەش و سەرشۆڕ بێت وە ئەگەر پۆشاکی ڕێکوپێکی پۆشی رازاوە نەبێ).

کەواتە نابێ غەمی موسوڵمان تەنها دنیا بێت، هەمومان لە تاقیکردنەوەی جەستەمان دەترسین کەسەرجەم نەخۆشیەکانە بە بچوك و گەورەیانەوەو پەنادەگرین بەخوا لێیان بەڵام تاقیکردنەوەی دینەکەمان و نەخۆشییەکانی ڕۆحمان لەیاد کردووە خوای گەورە لە هەموویان بمانپارێزێت لەوەی دوچاری لەخۆڕازی بوون ببین و خوای گەورە هیچ کارو کردەوەیەکمان لێ وەرنەگرێت یاخود بە دینەکەمان تاقی بکرێینەوە واز لە گوێڕایەڵی بێنین بۆ سەرپێچی و گوناه، دیارە هەموو بەڵایەك بێجگە لە دینەکەی بۆ مرۆڤ ئاسانە.

## ڕەوشت و هەڵسوکەوتەکانی سەردانی نەخۆش:

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: (إذا دخلتم على المريض فنفسوا له في الأجل)[2]. واتە: ئەگەر سەردانی نەخۆشتان کرد مژدە بەخشبن بۆی و مەیترسێنن. واتە: پێی بڵێن فلانە کەس وەك تۆ نەخۆش بوو پاشان خوای گەورە چارەسەری کرد،

---

١- رواه البخاري.

٢- رواه البخاري.

ئـەم قسـەیە دەکـەم ئەگـەر رویشـی نـەدابێت، ئەمـەش رێگـە پێـدراوە چـونکە ئاسەوارێکی باش لە دەروونـی نەخۆشـەکەدا جـێ دەهێڵێـت، حاڵـەتی دەروونـی مـرۆڤ کاریگەرییـەکی بەرچـاوی هەیـە لەسـەر بەرگـەگرتنی نەخۆشـی و بـەرەو باشبوونەوە، هەروەها دەبێـت لـەکاتی سـەردانی نەخۆشـدا ڕووخـۆش و کـراوەو گەشبین بم نەك مڕومۆچ و ڕووگرژ پاشـان چـەند دوعایـەکی شـەرعی هەیـە بـۆی بکەم وەك ئەوەی دەستم بخەمە سەرشوێنی نەخۆشـییەکە بەومەرجـەی بـەهۆی ئەو دەست لێدانـەوە دوچـاری توشـبوون و گواسـتنەوەی ئـەو نەخۆشـییە نـەبم یاخود کاریگەریی خراپی نەبێت بۆ سەر نەخۆشەکە لەگەڵ ڕەچاوکردنی حاڵەتی پیاو بـۆ پیـاو و ئـافرەتیش کەسـێکی مـەحرەمی خـۆی پاشـان بـەدڵێکی پـاك و دەروونێکی بێ گەردەوە ئەم نزایـەی بـۆ بکـەین: (اللـهم رب النـاس اشـف وأنـت الشافي، لا شفاء إلا شفاؤك، شفاء لا يغادر سقما اللهم كما عرفنا رحمتك في السماء أنزل رحمتك على الأرض أنزل رحمتك على هذا المريض رحمة من رحمتك وشـفاء مـن شـفائك). واتـە: ئـەی خـوای هـەموو خـەڵکی شـیفا ببەخشـە هـەرخۆت چارەسەرسازی، هیچ چارەیەك نیە مەگەر چارەسازیی زاتی تۆ نەبێت، چارەیەك بێت ئـازار و نارەحـەتی لابـەرێت خوایـە گیـان وەك چـۆن ڕەحمـەتی تۆمـان لـە ئاسمانـدا زانـی ئاوەهـاش ڕەحمـەتی خـۆت بـۆ سـەرزەوی دابارێنـە هـەروەها ڕەحمەتی خۆت بەسەر ئـەم نەخۆشەیشـدا دابارێنـە ڕەحمـەتێك لـە ڕەحمـەت و بەزەیی خۆتەوە بێـت شـیفایەك بێـت لـە شـیفاکانی خـۆت). بـەم لاڵانەوەیـە لـە نزاکردن و بەو ئیخلاصەوە بەئیزنی خوا نەخۆش چاك دەبێتەوە. یـاخود دەڵـێم: (بسم الله ثلاث مرات، أعوذ بعزة الله وقدرته من شر ما أجد وأحـاذر سـبع مـرات) واتە: سـێجار دەڵـێم: بسـم الله، پـەنادەگرم بـە عیززەتـی خـواو دەسـەڵاتی بـێ پایانی لەو شەڕەی کـە دەیبینـم یـاخود خـۆمی لێ دەپـارێزم. بەبەرەکـەتی ئـەم نزایە ئەو بەڵایە دەڕوات.

هەروەها ئەركی نەخۆش ئەوەیە ئارام و خۆڕاگر بێت و سوپاسگوزاری خوا بێت و بەئارام بێت لەسەر بەڵا بەمەش پلەی باوەڕدار لای خوا بەرز دەبێتەوەو لە گوناهەكانی خۆش دەبێت. ئەگەر پرسیار لە نەخۆش كرا تەندروستیت چۆنە دەڵێت: سوپاس بۆ خوا من لەخێرو تەندروستییەكی تەواودام وەكو حەزرەتی یەعقوب بڵێت: (إنما أشكو حزني وبثي إلى الله). ئەم دێڕە هۆنراوەیە چەندێ ڕەوانبێژیی تیایە لەسەر دواندنی نەفس و دەروون كە (أبو ذوئب الهذلي) نووسیویەتی:

وتجلدي للشامتين أريهمو　　　أني لريب الدهرِ لا أتضعضع

جارێك پێشەوا ئەحمەدی كوڕی حەنبەل (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) نەخۆش كەوت ئیمامی شافعی ڕۆیشت بۆ سەردانی و دكتۆرێكیشی لەگەڵدا بوو، لەپاشاندا پێشەوا ئەحمەدیش ڕۆیشت بۆ سەردانی شافعی لەماڵەكەی خۆیدا، پێشەوا شافعی لەم هەڵوێستەی ئەم هۆنراوەیەی وت:

مرضى الحبيب فعدته　　　فمرضت من خوفي عليه

فأتى الحبيب يعودني　　　فبرأت من نظري إليه

كاتێك پێشەوا شافعی (ڕەزای خوای لێ بێ) نەخۆش كەوت داوای دكتۆرێكیان بۆكرد، ئەمیش سەیرێكی كرد و فەرمووی: داوای دكتۆرێكی نەخۆشیان بۆ كردم منیش داوای دكتورێكی ئاسمان دەكەم، دوو دكتۆر: ئەمەیان دەرمان دیاری دەكات ئەویشیان چارەسەر دەكات.

حەزرەتی موسا ﷺ دەفەرموێت: ئەی پەروەردگار ئایا چارەسەر هەر لای خۆتەوە نیە؟! خوای گەورەش فەرمووی: بەڵێ ئەی موسا. ئینجا موسا ﷺ فەرمووی ئەی دكتۆرەكان كاریان چییە؟ خوای گەورە فەرمووی: ڕزق و ڕۆزی

خۆیان دەخۆن و چارەی دەروونی بەندەکانم دەکەن هەتا یان شیفای منیان بۆ دێت یان قەزای من.

* هەموو نەخۆشییەك گوناهەکان دەسڕێتەوە ئەگەر دڕکێکیش بێت بە قاچیدا بچێت هەر پاداشتی خۆی لەسەر وەردەگرێت.

# وەسیەت کردن

## بەرەکەت لە درێژییەکەیدایە...

ئەگەر ئادەمیزاد ئەوە بەسەریدا هات بەدەستوخەتی خۆی وەسیەتنامە بنوسێت و چەند شایەتێك بۆی واژوو بکەن، لەبەرئەوەی مردن هەردێت و هیچ ڕێگری نابێت ئەم بۆچونەش مەبەست پێی ڕەشبینی و نائومێدی نیە، بەڵکو ئێمە هەموومان بەرەوپیری مەرگ دەڕۆین و هیچ دەرباز بونێکمان نیە: ﴿ كُلُّ نَفۡسٖ ذَآئِقَةُ ٱلۡمَوۡتِۗ ﴾[1]

دوعاکردن بۆ تەمەن درێژی نە لە کتێبە شەرعییەکانی ئێمەدا نە لای پێشینەی پیاوچاکانی ئێمەدا نەهاتووە بەڵکو ئەوەی هاتووە نزا کردنە بۆ بەرەکەتدار بوون، دیارە تەمەنی مرۆڤ بەزۆریی ساڵەکانی ئەژمارد ناکرێت بەڵکو بەو بەرهەم و داهێنان و کردەوە چاکانە ئەژمارد دەکرێت و بەهۆیەوە لەڕۆژی دوایدا تای کردەوە چاکەکانی لەسەر تەرازووی کردەوەکانی قورستر دەبێت، لەدوای مردنیش زمانەکان بە چاکە و ستایش لەسەری دەدوێن، ئەمەش بۆ ئەو جۆرە مرۆڤانە تەمەنێکی ترە.

جارێك پێغەمبەر ﷺ گوێی لە ڕەملەی کچی ئەبو سوفیانی خێزانی بوو دوعای تەمەن درێژی دەکرد بۆ پێغەمبەر و بۆ ئەبو سوفیانی باوکی، پێغەمبەر

---

١- آل عمران: ١٨٥

ﷺ پێی فەرموو: ئەی دایکی حەبیبە تەمەنەکان دیاری کراون کردەوەکانیش نوسراون دەی بڵێ: خوایە گیان تەمەنی هاوسەرەکەم پێغەمبەری خواو تەمەنی باوکم و براکەم بەرەکەتدار بکە.

شێخ حەسەنی بەصری دەڵێت: ئەی ئادەمیزاد پێ بەزەویدا بنێ و برۆ چونکە بەم زوانە دەبێتە گۆڕەکەت، چاك بزانە تۆ لە ساتی لەدایك بونتەوە تەمەنی خۆت بەرەو نەمان دەبەیت، چاك بزانە ئەگەر هەندێك لە تەمەنت رۆیشت ئەوا هەموویت لەدەست داوە.

چەند رۆژ کە بەسەر تەمەنتدا تێپەڕ دەبێت لەساتی مردنت نزیکتر دەبیتەوە، پەیوەندی دونیا بەرۆژی دوایيەوە وەك رێگای نێوان دوو شارە، چەندێك لە شارێکیان نزیك بکەویتەوە ئەوەندە لەو شارەی تریان دوور دەکەویتەوە ئێمە لەو رۆژەوەی لە هەناوی دایکمانەوە هاتوینەتەدەر هەنگاوەکانمان بەرەو قیامەت گرتۆتە بەر، مردن یەخەماندەگرێت گۆڕ دامان دەپۆشێت قیامەتیش کۆمان دەکاتەوە خوای پەروەردگاریش جیامان دەکاتەوە.

ئەوەی وامان لێ دەکات رقمان لە وەسیەت کردن بێت سواربونی ئەسپی هیوا درێژییە، ئەوەش سەرمایە دۆڕاوەکانە، ئەوەی گرنتی مانەوەی دونیا بکات وەکو ئەو پەنجانە وایە کە دراوە بەسەر ئاوێك داو لەنێوانیانەوە ئاو دزە دەکات.

دووەم هۆکار بۆ ئەوەی کە رقمان لە وەسیەت کردن بێت زۆر خۆشویستنی دنیا و لەدەستدانی زوهدە، ئەوەتا خوای گەورە گەردوون و سەرجەم خۆشییەکانی دونیای فەراهەم هێناوە هەتا بە هۆیانەوە ئاسوودەو خۆشحاڵ بین بەو جۆرەی کە خۆی دەیەوێت بەڵام نابێت رۆژیی دوایی و لێپرسینەوە لە یاد بکەین، دەبێت دونیا لە دەستەکانماندا بێت نەك لە دڵەکانماندا.

## پارێزکاریو خۆگرتنەوە (زوهد):

زوهد سێ جۆری هەیە: زوهدی ڕەشۆکی و زوهدی تایبەتەکان و زوهدی ناوازەکان.

أ- **زوهدی ڕەشۆکی**: ئەو زوهدەیە لە حەرام واتە لە سزای خوا بترسیت ڕێگە بە خۆت نەدەیت بکەویتە بازنەی حەرامەوە، ئەوەش یەکەم هەنگاوی تەوبەو گەڕانەوەیە، مەبەست لەو پەشیمانییەی کە ڕاستگۆیانە ئەنجامی دەدەین و جارێکی تر ناگەڕێینەوە سەری نەك وەکو تەوبەی ڕێوی!. لە بەسەرهاتێکی ڕەمزیدا کە دەتوانین وەك لایەنێکی پەروەردەیی بەکاری بێنین: ڕۆژێك ڕێوییەك هێشووە ترێیەکی فڕاند خاوەن ڕەزەکەش ڕایکرد ئەویش بەسەر پەرژینی ڕەزەکەدا بازیداو هێشوە ترێکەی لەدەم کەوتە خوار، ڕێوییەکە لە دورەوە سەیری گۆچانی دەستی خاوەن ڕەزەکەی دەکردو چاوێکیشی لە هێشووە ترێکە بو ئەمەش بووبوە پەژارە بۆی، پاشان وتی: سوپاس بۆ ئەو خوایەی کە ئەو حەرامەی نەکردە نسیبمان.

ئەوە تەوبەیەکی ناچارییە، تەوبەی ڕێوی، زۆرجار ئەوانەی کە جگەرەکێشن یاخود مەی خۆرن یان ئالودەن بە مادده بێ هۆشکەرەکانەوە لەبەر خۆپارێزییان لە تورەبوونی پەروەردگار وازی لێناهێنن، بەڵکو لە ترسی کاریگەریە خراپەکانی ئەو ماددانە لەسەر ژیانیان دەستبەرداری دەبن، بۆ نموونە کەسێکی ئالودە دوای ئەوەی پاش ماوەیەك باری تەندروستی خراپ دەبێت، پزیشك لە حاڵەتی مەترسیداری ئەو ئالودەبوونەو نەخۆشییەکەی لەسەر ژیانی ئاگاداری دەکاتەوە لەوێدا واز لەو کارەی دەهێنێت ئایا ئەمە تەوبە کردنە!!! ئەوە تەوبە کردنی ڕێوییە.

ب- **زوهـدی تایبەتـەکـان:** ئـەو زوهدەیـە لـە سـنوری حـەڵاڵدا، ئەگـەر سروشتی وەهایەو وا ڕاهاتووە کە دوو کولێرە بخوات ئەوا بەیـەك دانـە قەناعـەت دەکات واتە واز لە ئارەزووی بۆ ئەو خواردنـە دێنێـت کـە حـەزی لێیـەتی و وەك گوێڕایەڵی و تەماداری پاداشـت، لەبەرئـەوەی خـراپترین دەفرێـك کـە ئـادەمیزاد پڕی کرد بێـت ورگییـەتی، لەبەرئـەوەی مـاڵ و سـامانەکانمان حـەرامی تێکـەڵاو دەبێت ئەگەر کەمیش بێت، کەواتە بـا بـارە تێکەڵەکان کـەم بکەینـەوە ئـەوەتا پێغەمبەر ﷺ گەدەی کردووە بە سـێ بەشـەوە بەشـێکی بـۆ خـواردن بەشـێکی تری بۆ خواردنەوە بەشی سێیەمیش بۆ هەناسەی.

زانایان دەڵێن: سێیەکی قەبارەی گـەدە (٥٠سم)ە ئـەو ماوەیەیـە کـە بـوار بەگەدە دەدات لەنێوان سییەکانیدا هەناسە بدات. بۆیە کاتێك گەدەمان پڕ کـرد ئەوا گەدەمان ماندوو دەکات و جەستەشمان بەجۆرێك قـورس دەکـات نـەتوانین فەرزەکان و سوننەت و شەونوێژ و نوێژی عیشا بە کۆمەڵ لـە مزگەوتـدا ئـەنجام بدەین.

ج- **زوهـدی نـاوازەکـان:** حەزرەتی عومەر لە ڕۆژێکی زۆر گەرمدا پەرداخێك ئاوی پێ بوو دەنکە خورمایەکی کردە ناوی هەتا ساردی بکاتەوە پاشان بەرەو دەمی بەرزیکردەوە پاشان دووری خستەوە، وتیان: ئەوە چییە پێشەوای موسوڵمانان، فەرمووی: هەتا لەڕۆژی قیامەتدا پێم نەوترێت: ﴿أَذْهَبْتُمْ طَيِّبَاتِكُمْ فِي حَيَاتِكُمُ الدُّنْيَا وَاسْتَمْتَعْتُم بِهَا﴾[1] واتە: ئێوە نازو نیعمەتی خۆتانتان هەر لە ژیانی دنیاتانا بۆ خۆتان بردو لەزەتتان لێ وەرگرت.

بۆیە دەبێت حەزو ئارەزوەکان هۆکارێك بن بۆ سوپاسگوزاری نیعمەتەکان.

---

١- الأحقاف: ٢٠

وأدب النفس واستكمل فضائلها فـأنت بالنفس لا بالجسـم إنسـان

ئادەمیزاد بـەهێزە، نـەك بـە جەسـتەو ئارەزووەكـان چونكە لـەم حاڵەتـەدا ئاژەڵ لەو بەهێزترە، بەڵام بە پاككردنەوەی دەروونی خۆی و وەگەڕخستنی بۆ گوێڕایەڵی و بەندایەتی كردنی خوا(جل جلاله) بەهێزترە.

## چاودێری ڕۆڵەكان...

هەموومان لەسەر پێویستی نوسینی وەسیەت یەك دەنگین و بیخەینە بەردەم یەكێك لـە زانایـانی شـەرع هـەتا جـەخت لەسـەر دروسـتیی ئـەو چـەند خاڵـەی وەسیەتەكە بكاتەوە لـە ڕووی شـەرعەوە كەسـێك كاتێـك دەیـەوێت ئوتومبیلێك یـاخود خانویـەك بكڕێـت گرێبەسـتەكە نیشـانی پارێزەرێـك دەدا هـەتا لـە ڕووی یاساییەوە لە دروستی مامەڵەكەی دڵنیابێت. جیاكردنەوەو هەڵبژاردنی یەكێك لە كوڕەكانت لـەو وەسیەتەدا. ئایا مـافی ئـەوەم هەیـە زیـاتر بـدەم بەیـەكێك لـە كوڕەكـانم لەبەرئـەوەی چـاكە لەگەڵمـدا و یـاخود یـەكێكیانی لێ بێبـەش بكـەم لەبەرئەوەی ئازارم دەدات؟

یەكەم: دەبێت باس لەمافی منداڵەكانت بكـەین، كـچ لـە ئەسـتۆی بـاوك دایـە هـەتا شـوو دەكـات بـەڵام كـوڕ مافـەكانی پـارێزراو دەبێـت تـا دەگاتـە تەمـەنی هـەرزەكاربوون، لـەدوای ئـەو تەمەنـەوە دەبێـت پشـت بـە خـۆی ببەسـتێت و كارەكـانی خـۆی ڕاپـەڕێنێت، بـەڵام ئەگـەر لـە هـەوڵی بەدەسـتهێنانی زانسـت و زانیاریـدا بێـت ئـەوا دەبێـت خـەرجی بـدەین هـەتا لـەو ڕێگەیەیـدا خـۆی یـەك لا بكاتەوە هەتا بتوانێت خزمەت بـە كۆمەڵگاكـەی بكـات پـێش خزمـەت كـردن بـە بەرژەوەندییـەكانی خـۆی، لەبەرئـەوە كاتێـك پێغەمبـەر ﷺ تەمـەنی لـە (١٣) ساڵیدا بـوو كـاری شـوانیەتی دەكـرد و حـەقی كارەكـەی دەهێنایـەوە بـۆ (أبـو طالب)ی مامی.

باسەکە لەوە دەچێت کە موچەیەك بدرێت بەوکەسەی کە خۆی یەکلایی دەکاتەوە، ئەگەر قوتابیەکت هەبێت لەیەکێك لە بوارەکانی زانستی تیۆری و کردەیی ئەوانەی کە سود بەکۆمەڵگا دەگەیەنن (بەتایبەت زانستە نوێیەکانی وەك ژمێریارو ئینتەرنێت و ئەندازەگیری بۆماوەیی) بەڵام هەژار بوو ئەوا ئەرکی سەرشانی سەرجەم کۆمەڵگایە کە خەڵکانێك دابین بکات خەرجییان بۆ دابین بکات ئەگەر ئەم کارە ئەنجام نەدرێت ئەوا سەرجەم کۆمەڵگا گوناهبار دەبن.

ئەمە مافی کوڕە لەسەر باوکی، بەڵام ئەگەر باوك خەرجی بۆ کوڕێکی پێگەیشتوی گەورەی بدات ئەوا لەگەورەیی خۆیەتی و ناتوانین باوك ناچار بکەین خەرجی کوڕو کوڕەزای بدات، هەروەها نابێت فەزڵی کوڕێکت بدەیت بەسەر یەکێکی تریاندا یاخود ئەو کوڕەت بێبەش بکەی لەحەقی خۆی بەبیانوی ئەوەی کە ئازارت دەدات و خراپە بۆت.

دیارە چاکیی کوڕ بۆ باوکی پاداشتێکی زۆر گەورەی هەیە و بە پێچەوانەوە بە ئازاردانیشی سزا دەدرێت و لێپرسینەوەی لەگەڵدا دەکرێت.

یەکێك لە هاوەڵان ڕۆیشتە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ هەتا لەگەڵ خۆیدا بیبات بۆ بەخششێك کە داویەتی بە یەکێك لە کوڕەکانی، ئەم هاوەڵە دوو ژنی هەبوو دەیویست ئەم کوڕەی کە لەژنێکیانە جیابکاتەوە لە کوڕەکانی تری، دایکی ئەو کوڕە وتی ڕازی نابم هەتا پێغەمبەری خواﷺ تەشریفی نەهێنێت، باوکی کوڕەکە چووە خزمەت پێغەمبەری خواﷺ و پێی وت: یارسول الله: باخێکم هەیە داومە بەکوڕەکەم: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئایا بۆ کوڕەکانی تریشت هەمان دیاریت بەخشیوە؟ باوکەکە وتی: نەخێر. پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئایا دەتەوێت لەو چاکەکردنە پاداشتت دەست بکەوێت؟! یەکێکی تر بکەرە شاهید بۆی چونکە من نابمە شاهیدی کاری خراپ، پاشان فەرمووی: هەرکەسێ یەکێك لە میراتبەرەکانی لە سامانەکەی بێ بەش بکات خوای گەورە

له ڕۆژی قیامەتدا لە میراتی بەهەشت بێ بەشی دەکات، لەم ژیانەدا ماڵ و سامان تایبەتن بەخۆت ببەخشیت بەهەرکەسێك ئارەزوی خۆتە بەلاّم جیاوازی لەنێوان کوڕێك و کوڕێکی تردا مەکە، خوای گەورە فەرمانی کردووە تەنانەت لەماچ کردن و سۆزو خۆشەویستیمان بۆ منداڵەکانمان دادپەروەرانە هەڵس و کەوت بکەین ئەی ئەگەر باسی ماڵ و سامان بێت داخۆ چۆن بێت: ﴿ٱعۡدِلُواْ هُوَ أَقۡرَبُ لِلتَّقۡوَىٰ﴾[1] واتە: دادپەروەرو حەق گۆو حەق کردار بن. دادو ڕاستی نزیکترتان ئەکاتەوە لە گوناه نەکردن و لەخوداترسان.

لەهەر شوێنێکدا بەرژەوەندی یاخود قازانجێك هەبوو شەرعی خواش لەوێ ئامادەیە.

من وەك باوکێك مەیلی خۆشەویستیم زیاتر بۆ یەکێك لە منداڵەکانمە لەبەرئەوەی سۆزی زیاترم ئەداتێ و لەوانی تر ڕەفتاری جوانترە لەگەڵمدا، بەلاّم نابێت ئەمە وام لێبکات لەوانی تر جیای بکەمەوەو ئاشکرایشی بکەم چونکە لە پاشەڕۆژدا دەبێتە بەلاّ بۆی و دەکەوێتە بەر ئیرەیی و ڕق و کینەی براکانی تری و درەختی ڕق و کینە لە دڵی هەریەکێکیاندا بالاّتر دەبێت و بەرهەمەکەی شەڕێکی گەورە دەبێت، بەجۆرێك ئەم شەڕانە منداڵی پێغەمبەرانیش لێی بەدەر نەبون، ئەوەتا حەزرەتی یەعقوب نەیتوانی سۆزو خۆشەویستی خۆی بۆ یوسف بشارێتەوە لەناو کوڕەکانی تریدا دواجار حەزرەتی یوسف عليه السلام رووبەرووی ئیرەیی و ڕقی براکانی تری بوویەوەو وتیان: ﴿لَيُوسُفُ وَأَخُوهُ أَحَبُّ إِلَىٰٓ أَبِينَا مِنَّا﴾[2]، واتە: یوسف و بنیامینی برای لە ئێمە خۆشەویستترن لای باوکمان.

---

١- المائدة: ٨

٢- یوسف: ٨

کاتێك هەستی خۆی دەربڕی فەرمووی: زۆر غەمبار دەبم لەئامێزم دوری بخەنەوە و ببیەن، شەیطان ڕۆیشتە ناو ماڵی حەزرەتی یەعقوبەوە. ئایا ماڵەکانی ئێمە خراپترن لەماڵی پێغەمبەری خوا یەعقوب؟!

پێویستە لەنێوان منداڵەکانمدا دادپەروەربم، بۆ نموونە ئەگەر چوار کچ هەبێت سیانیان شووی کردبێت و یەکێکیان مابێتەوە چۆن لەگەڵیدا ڕەفتار بکەم کە ناتوانم تەمەنم مسۆگەر بکەم؟ دەتوانم ئەوەندەی بۆ جێبهێڵم هەتا بۆ داهاتوو ئامادەی بکەم وەك چۆن لەگەڵ خوشکەکانی تریدا کردم، هەر ئەمەش کارێکی دادپەروەرانەیەو هیچ جیاوازی و جیاکاری تیانیە.

هەموو منداڵەکان لە دڵی باوکەکاندا هەمان جێگەو خۆشەویستیان هەیە، لە ئافرەتێکی ئەعرابیان پرسی: کام کوڕەیان لای تۆ لەوانی تر چاکترە؟ وتی: بچوکەکەیان هەتا گەورە دەبێت، ئەوەیان کە لەسەفەردایە هەتا دەگەڕێتەوە، هەروەها ئەوەیان کە نەخۆشە هەتا چاك دەبێتەوە.

## بێ بەش بوون لە میرات:

هەندێك کەس کە تەنها کچیان هەیەو کوڕیان نیە، هەوڵ دەدەن مامەکەیان لەمیرات بێبەش بکەن و دەڵێن ئەو کەسێکی دەوڵەمەندەو کچەکانیش لاوازن... نەخێر با لە خوا بترسێت مامیش لەپلەی باوکدایە، نابێت کچەکان بەمیراتی ڕابوێرن و باوکیان لە دۆزەخ دا ئەشکەنجە بدرێت، حەزرەتی عومەرﷺ دەفەرموێت: خوایە پەنا دەگرم بە ماڵێك میراتگرەکانم بەهۆیەوە لەدوای من ڕابوێرن و منیش لە گۆڕەکەمدا لەسەری ئازار بدرێم هەروەها دەبێت بزانم ئەم پارەیەی کە لەدەستمدایە هی من نیە بەڵکو هی خوای گەورەیەو منی کردۆتە سەرکارێ بەئارەزووی خۆم دەیبەخشم مادام لە ژیاندام چونکە کە مردم دەبێتە موڵکی میراتگرەکانم.

## سنورەکانی وەسیەت کردن:

وەسیەت نابێت لە سێیەك زیاتر بێت، ئەگەر کەسێك بە سێیەك زیاتر وەسێتی کرد ئەوا لەسەر سێیەکەکە بڕیار دەدەین و زیادەکەی دەگێڕینەوە بۆ ئەوانی تر، سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص هاتە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ و وتی: دەمەوێت وەسیەت بەهەموو سامانەکەم بکەم، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: نەخێر ئەی سەعد، سەعد وتی: بەنیوەی پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: نەخێر نابێت، سەعد وتی: بە سێیەکی. پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بەڵێ ئەمەیان تەواوە و سێیەك زۆرە ئەگەر تۆ میراتگرەکانت بە دەوڵەمەندی جێ بهێڵیت باشترە لەوەی بە هەژاری بمێننەوەو سواڵ بکەن.

حەزرەتی عومەری کوڕی عەبدولعەزیز سیانزە کچی هەبوو پێیان وت: وەسیەتیان بۆ بکە، فەرمووی: ئەگەر چاك و صالح بن ئەوا خوای گەورە بۆ ئەوانەی هەر بۆ لای خۆی دەگەڕێنەوە لێخۆشبووە، خۆ ئەگەر چاك نەبن ئەوا ئەو ماڵەیان نادەمێ هەتا بەهۆیەوە بەهێز ببن و لە سەرپێچی کردنی خوای گەورەدا خەرجی بکەن، پاشان کۆچی دوایی کردو هەموو کچەکانی شوویان کرد یان بە سەردارێك لە سەردارەکان یان دەوڵەمەندێك لە دەوڵەمەندەکان.... بەڵێ، خوای گەورە ئەولاتر و لەپێشترە بۆیان ﴿ وَلْيَخْشَ الَّذِينَ لَوْ تَرَكُوا مِنْ خَلْفِهِمْ ذُرِّيَّةً ضِعَافًا خَافُوا عَلَيْهِمْ فَلْيَتَّقُوا اللَّهَ وَلْيَقُولُوا قَوْلًا سَدِيدًا ﴾[1]

واتە: با ئەوانەی میرات وەرئەگرن و، خزم و هەتیوو هەژارانیان لا کۆئەبنەوە، وا فەرز بکەن کە خۆیشیان ئەمرن و منداڵەکانیان دەستەپاچەو لانەواز داماون و ئەڕۆنە ئەو شوێنانەی میراتیان تیا بەش ئەکرێو چاوەڕوانی دەست و دەهەنەیان ئەبن. هەروەکو حەز ئەکەن بەشیان بدەن و ئیحتیاجییان جێبەجێ

---

١- النساء: ٩

بکەن، بەشی ئەو هەتیوو خوێش و هەژارانەیش بدەن و دڵیان خۆش بکەن. با لە خودا بترسن و قسەی دامەزراوی شەرعییان لەگەڵ بکەن.

با پەند و ئامۆژگاری لە حەزەتی زەکەریا (عليه السلام) وەربگرین:

﴿ قَالَ رَبِّ إِنِّي وَهَنَ ٱلْعَظْمُ مِنِّي وَٱشْتَعَلَ ٱلرَّأْسُ شَيْبًا وَلَمْ أَكُنۢ بِدُعَآئِكَ رَبِّ شَقِيًّا وَإِنِّي خِفْتُ ٱلْمَوَٰلِيَ مِن وَرَآءِى وَكَانَتِ ٱمْرَأَتِى عَاقِرًا فَهَبْ لِى مِن لَّدُنكَ وَلِيًّا يَرِثُنِى وَيَرِثُ مِنْ ءَالِ يَعْقُوبَ ۖ وَٱجْعَلْهُ رَبِّ رَضِيًّا ﴾[1] واتە: وتی: خودایا من ئێسقانم بێ هێز بووەو بە هۆی پیرییەوە سەرم سپی بووەو، لەمەوپێش نزا و پاڕانەوەم ڕەد نەکراوەتەوەو، هەر تکاییێکم لێ کردبێ جێبەجێت کردووە بۆم. بەڕاستی من لە خزمەکانم ئەترسم کە پاش خۆم بە چاکی شوێنم نەگرنەوەو لە دین لابدەن. ژنەکەیشم نەزۆکەو منالی نابێ، بۆیە لە میهرەبانیی تۆ ئەپاڕێمەوە کوڕێکم پێ ببەخشی سەرداریی ئەم خانەدانو جێگاو ڕێگایە بکات. ئەو کوڕە کوڕێکی وەها بێ میراتی پێغەمبەرایەتی لە من و لە ئالی یەعقووب وەربگرێ و جێگامان بگرێتەوە. خودایا بیشیکە بە کوڕێکی کردەوە پەسەند کە خۆت لێی ڕازی بیت.

زەکەریا دارتاش بوو خاوەنی هیچ نەبوو، ئایا چی دەویست بیکات بە میرات بۆ کوڕەکەی؟!

بڕیاریدا زانست و لەخواترسان بکاتە میراتی کوڕەکەیو کەسێکی ڕازی بێت نەك دەوڵەمەند، یاخود با بڵێین بە لەخواترسان دەوڵەمەند بێت و دڵی بە ئیمان ئاوەدان بێت.

---

١- مریم: ٤ - ٦

## وەسیەت بۆ کێیە:

نابێت میراتکەر وەسیەت بکات بەپێی دەقی فەرمایشتی پێغەمبەرمان ﷺ کە دەفەرموێت: (لا وصية لوارث)[1]. لەبەرئەوەی ئەمە دەچێتە ئەو بڕەی کە خوای گەورە دایناوە، وەسیەت دەبێت بۆ کاری خێرو چاکە بێت لە کۆمەڵگادا، بۆ هەژارێکی کەم دەست بۆ کتێبخانەی گشتی، بۆ نەخۆشخانەیەك کە چارەسەری نەخۆشی تیابکرێت کەسانێکیش هەن وەسیەت دەکەن بۆ ماڵ و سامانیان بۆ کوڕێکیان و کچەکەیان بێ بەش دەکەن لێی یاخود موڵکەکانی وەك فرۆشتنێکی ڕوکەش بۆ کوڕەکەی دەنوسێت هەتا زاواکەی لێ بێبەش بکات کە مێردی کچەکەیەتی. هەموو ئەمانە حەرامن.

ئایا دەتوانێت زاواکەی مسۆگەر بکات بەجوانی جگەرگۆشەکەی بەخێو بکات یان پارچە زەوییەك یاخود کەمێك پارەی وەك وەسیەت بۆ دیاری بکات! با باسی هەڵوێستی پێغەمبەری خواﷺ بکەین لەبەرامبەر حەزرەتی عوسمانی کوڕی عەففاندا(ڕەزای خوای لێ بێ) کە زاوای بوو هاوسەری ڕوقییە بوو، ئەوە بوو ڕوقییە کۆچی دوایی کردو أم کلثومی پێ بەخشی و پاش ماوەیەك ئەویش کۆچی دوای کرد پێغەمبەر ﷺ فەرمووی ئەگەر کچی تریشم ببوایە پێم دەبەخشی.

## پێشەکیەکانی وەسیەت:

دەبێت زۆر خاوێن بکرێت و گومانی باش بەخوا ببرێت، ئەوە حەزرەتی ئەبوبەکری کوڕی صدیقە وەسیەت دەکات لەدوای خۆی بەجێنشین هەڵبژێرن، دوای ئەوەی ڕاوێژی کرد بە موسوڵمانان ئەوە بوو دوای ڕاوێژی هاوەڵە گەورەکانی پێغەمبەر ﷺ بڕیاریدا حەزرەتی عومەر بکرێت بەجێنشین،

---

[1]- رواه البخاري.

حەزرەتی ئەبوبەکر وەسیەتەکەی بەم شێوەیە دیاری کردو حەزرەتی عوسمان دەینوسی حەزرەتی ئەبوبەکر فەرمووی بنوسە: ئەوە ئەبوبەکری کوڕی ئەبی قوحافە بڕیاریدا لەسەری کە لەدوا ساتەکانی تەمەنی دایەو لەدنیا دەردەچێت و دەچێتە سەرەتای ساتەکانی چوونە نێو ژیانی ڕۆژی دوایی، کەسێك دابنێم بە جێنیشین و پێشەوا بۆ موسوڵمانان... پاشان لەهۆش خۆی چوو ئەوەبوو حەزرەتی عوسمان یەکسەر نووسی عومەری کوڕی خەتتابە، پاش کەمێك هاتەوە هۆش خۆی و بە حەزرەتی عوسمانی فەرموو ئادەی وەسیەت نامەکەم بۆ بخوێنەرەوە، ئەویش خوێندیەوە.. کە حەزرەتی عومەری کوڕی خەتتاب دەکەمە جێنیشن و پێشەوا بەسەر موسوڵمانانەوە. حەزرەتی ئەبوبەکر فەرمووی: خوا پاداشتی خێرت بداتەوە ئەوە مەبەستی من بوو... سەیری ڕادەی ئەمانەتی حەزرەتی عوسمان بکەن خۆ ئەگەر خۆشی بنووسیایە شایستە بوو بەو جێنشینیە.

## دوا ساتەکان:

ئەبو حامدی غەزالی لەڕۆژی کۆچی دواییدا کە تەمەنی (٥٥) ساڵ بوو لە دوای ئەوەی نوێژی بەیانی کرد وتی: دەمەوێت چاوم بە فریشتەیەك بکەوێت پاشان داوای لە منداڵەکانی کرد ئاوی بۆ بهێنن خۆی پێ شت و دەست نوێژێکی گرت و دەستێك جلی سپی لەبەرکردو وەك کفن پێچای بەخۆیەوە منداڵەکانی ماوەیەکی زۆر لە دەرەوەی ژورەکەی چاوەڕێیان کرد کاتێك دەرگاکەیان لێ کردەوە سەیریان کرد دەستی خستۆتە ژێر ڕومەتی ڕاستی و بەلای ڕاستیدا نوستووە و کۆچی دوایی کردووە.

حەزرەتی عومەری کوڕی عەبدولعەزیز بە خێزانەکەی فەرموو: بڕۆرە دەرەوە چەند ڕوخسارێك دەبینم نە مرۆڤن نە پەری، فاطمە ڕۆیشتە دەرەوەو لەپشتی

دەرگاکەوە کەوتە گوێگرتن، گوێی لە حەزرەتی عومەر بوو فەرمووی بەخێربێن ئەی باوکی مرۆڤایەتی ئادەم و پێغەمبەری خوا نوح، بەخێربێن باوکی پێغەمبەران ئیبراهیم، حەزرەتی موسا، حەزرەتی عیسا یاخوا بەخێر بێی خۆشەویستەکەی خوا، ئەی فریشتەی مەرگ لەکاتی خۆیدا هاتی. ئینجا فەرمووی: (أشهد أن لا إله إلاّ الله) و ئیتر گیانی پاکی سپاردەی پەروەردگاری کرد.

## نشینگەی یەکەم...!!!

دەبێت لەکاتی نووسینی وەسیەتدا قەرزاریەکان بنوسرێت پێش ئەوەی ئەو کەسە گیان بسپێرێت، هەروەها وەسێت بکرێت کە هاوارو ناڵە نەکرێت بەسەر تەرمەکەیدا پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: (ئەو کەسە لەئێمە نییە ڕوومەت دابڕنێ و جلەکانی بدڕێنێ و قسانێك لەزاری دەربچێت کە هی سەردەمی جاهیلین)[1].

کەواتە دەبێت گریان و شینی کەس وکاری مردوو یان دراوسێکانی هەر تەواو ببێت.

ئەرکی سەرشانی دراوسێکانە خواردن دروست بکەن بۆ کەسوکاری مردوەکە چونکە ئەوان بەدەم ئازارو غەمی مردووەکەیانەوەن.

پاشان دەبێت مردوو وەسیەت بکات کێ لەسەری نوێژی مردوو بکات و کاتێك خستیانە گۆڕەکەیەوەو ناشتیان کێ و کێ لەسەر گۆڕەکەی بمێنێتەوە چونکە ئەو وەکو خنکاوێك وایەو دەیەوێت کەسێك ڕزگاری بکات یاخود چاکەیەك یارمەتی بدات.

عەمری کوڕی عاص وەسیەتی بۆ کوڕەکەی کرد کە لەسەر گۆڕەکەی بمێنێتەوە بەئەندازەی کاتی سەربڕینی وشترێك و دابەشکردنی هەتا بۆماوەیەك

---

[1] - رواه البخاري.

دڵیان پێ خۆش بکات، عەمر ئەو حاڵەتە بەحاڵی منداڵێك دەچوێنێت کە لە یەکەم ڕۆژی خوێندنی دایە، هەست بە تەنیایی دەکات، وەك کەسێکی ترساو وایە ئەوەش سەختترین کاتێکە کە بەسەر مرۆڤدا دێت، کەس لەویا نیە تەنها خوایەکی باڵادەست و بەندەیەکی لاواز، خوایەکی گەورە و بەندەیەکی بێ دەسەڵات.

خوای گەورە دەفەرموێت: (بەندەکەم هاوڕێکانت ڕۆیشتن و بەجێیان هێشتی و لەسەر گەردنیان هەڵیان گرتی و بە تەنیایی خستیانیتە ژێر گڵ و جێیان هێشتی ئەگەر لەگەڵیشت بمانایەتنەوە هیچ سودێکیان پێ نەدەگەیاندنی، کەواتە کەست بۆ نەمایەوە تەنها من نەبێت منیش ئەو زاتەم کە بۆ هەتا هەتایە زیندووم و نامرم.

هیچ شتێك لەگەڵ ئادەمیزاددا نامێنێتەوە کردەوەکانی نەبێت خزمایەتی و نزیکی و ناسیاوی نامێنێت، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: (ئەی نەوەی هاشم، ئەی نەوەی عبد المناف خەڵکی چاکەکانیانم بۆ ناهێنن لەڕۆژی دواییداو ئێوەش گوناهەکانتان بدەن بە کۆڵتانداو بێنە لام و پێم بڵێن: محمد فریامان بکەوە منیش وەکو پیاوە صاڵحەکە پێتان بڵێم: ﴿إِن تُعَذِّبۡهُمۡ فَإِنَّهُمۡ عِبَادُكَۖ وَإِن تَغۡفِرۡ لَهُمۡ فَإِنَّكَ أَنتَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ﴾[1]، واتە: ئەگەر عەزابیان ئەدەی ئەوا بەندەی خۆتن و ئەتوانی بە ئارەزووی خۆت لەگەڵیان بجووڵێیتەوەو سزایان بدەیت. موڵکی خۆتن و کەس حەقی ڕەخنەی نییە. ئەگەر لە گوناهیشیان خۆش بیو چاوپۆشییان لێ بکەیت کەس ناتوانێ بڵێ: نەیتوانی سزایان بدات، بۆیە بەخشینی! تۆ زۆر بەهێزی و دەستت بەسەر هەموو شتێکدا ئەڕوات. ئەتوانی بەخشیو ئەتوانی سزا بدەیت. کارەکانیشت پڕ لە حیکمەتن.

---

١- المائدة: ١١٨

ئەوەی کردەوەکانی خاوی بکەنەوە خزمایەتی و پشتی خێراتری ناکەن.

بۆیە کاتێك یەکێك لە هاوەڵان داوای لە پێغەمبەری خوا کرد ﷺ لە بەهەشتدا هاوەڵی بێت بەهۆی ئەو خۆشەویستییە بێ سنورەی کە بۆ پێغەمبەر ﷺ هەیبوو، پێغەمبەریش ﷺ پێی فەرموو: کۆمەکی خۆت بکە بە زۆر سوژدە بردن.



# نیشانە بچوکەکانی قیامەت

## ڕاستگۆ نیشانەیەکی بەسە...

خوای گەورە ئەوەندە هۆکارو توانای پێ بەخشیوین کە ئیتر هیچ بیانویەکمان بۆ نەمێنێتەوە لەکاتی بەڵایەکدا، نایەتە بەر هەستم ئادەمیزادێك هەبێت لەدەرگای زانایەك بدات و پرسیاری لێ بکات نیشانە بچوکەکانی بەرپابونی قیامەت چییە، لەبەرئەوەی مەسەلەکەی بەلاوە گرنگ نییە.

بەڵام زۆر بەلایەوە تەواوە پرسیار لە تیۆریکی ئابوری بۆ نرخی ئەمڕۆی بەشەکەی لە فلانە کۆمپانیادا. با سەیری حاڵی دنیاو مەسەلەی ڕۆژی دوایی بکەین ئێمە دەتوانین باوەڕدارێك چەندی پێیە بۆ دنیاو ڕۆژی دوایی ئەگەر لەگەڵیدا دانیشتی سەعاتێك باسی دنیای کردو چەندین سەعات باسی قیامەتی کرد ئەوا دەتوانیت بەئەندازەی هەریەکەیان دڵی و زمانی بخوێنیتەوەو بۆت دەربکەوێت. ئەویش لە بەخشیندەیی پەروەردگارە کە دوو جۆر نیشانەی بۆ دیاری کردویت.

زانایان نیشانەکانی ڕۆژی دوایی دەکەن بە دوو بەشەوە:

- نیشانە بچوکەکان و نیشانە گەورەکان جیاوازی نێوانیشیان زۆر فراوانەو ئەوەش قورئان باسی نەکردووە.

خوای گەورە نیشانە بچوکەکانی ڕۆژی دوایی کردۆتە زەنگێکی ئاگادار کردنەوەی بەندەکان هەتا بە ئاگابێتەوەو لەکاتی نیشانە بچوکەکانی ڕۆژی

دواییدا دەرگای تەوبەکردنی بە هەمیشەیی بۆ والآ کردوین. چەند نیشانەیە؟ لەوانەیە بگاتە سەد نیشانە، ئایا پێویستی بە سەد نیشانە هەیە یان بەیەك نیشانە بۆ ئەوەی بەئاگا بێینەوە.

باوەڕداری ڕاستگۆ یەك نیشانەی بەسە، بەڵام سروشتی ئادەمیزاد وایە کەرەمی خوایی لەسەرمان بیردەچێتەوە بۆیە نیشانە بەدوای نیشانەدا دەنێرێت هەتا هەمیشە لەیادماندا بێت ئەوەش ڕەحم و میهرەبانی خوای گەورەیە بۆ عەبدەکانی و هەر خۆی ڕەحمانی دونیاو ڕەحیمی ڕۆژی دواییە. ئەگەر نیشانە بچوکەکانی ڕۆژی دوایی هەندێکیان یاخود هەموویان تەواو بوون یان گومانی سەرهەڵدانی نیشانە گەورەکانی ڕۆژی دوایی سەریان هەڵداو خۆر لە ڕۆژئاواوە هەڵهات ئیتر دەرگای تەوبەکردن دادەخرێت و ئەو خەڵکانەی کە لەو سەردەمەدا دەژین ڕووبەڕووی چەندین تاقیکردنەوەی سەخت و دژوار دەبنەوە. واتە ئیتر نامەی کردەوەکان بەرز دەبنەوە و قەڵەمەکانیش وشك دەبنەوە.

هەر بەتەواو بوونی دواهەمین نیشانە بچوکەکانی ڕۆژیی دوایی ماوەیەکی زۆر دەکەوێتە نێوان نیشانەکانەوە، لەناکاو لەخەو هەڵدەستن یەکەم نیشانەی گەورەی بەرپابوونی ڕۆژی دوایی دەردەکەوێت ئەویش هەڵهاتنی خۆرە لە ڕۆژئاواوە.

با لەسەر قورئان و فەرمایشتەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ بوەستین و لەسەر هەر یەکێك لەنیشانەکان لەڕێی وتەی زانایانەوە بوەستین و ئەو ڕاستیە بزانین ئایا زنجیرەیەکی دیاری کراو هەیە لەوەی کە نیشانەکان بەدوای یەکدا سەر هەڵدەدەن یان نا؟ شتێك نیە دەریبخات نیشانەیەك پەیوەندی بە نیشانەیەکی ترەوە هەبێ، لەوانەیە لە یەك کاتدا چەند نیشانەیەك سەرهەڵبدەن، بۆ نموونە (١٠) نیشانە بەیەکەوە، یەکەم نیشانە ناردنی پێغەمبەرە ﷺ ئەوەتا دەفەرموێت: ((بعثت أنا والساعة كهاتين وقرن مابين السبابة والوسطى)) واتە:

((هاتنی من و هاتنی ڕۆژی دوایی وەکو ئەو دوانە وایە، کە هەردوو پەنجەی لەیەك نزیك دەکردەوە ئەوانیش پەنجەی شەهادەت و پەنجەی ناوەڕاستە "کە هیچیان لەنێواندا نیە" ))[1].

﴿يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلسَّاعَةِ أَيَّانَ مُرْسَىٰهَا فِيمَ أَنتَ مِن ذِكْرَىٰهَآ﴾[2]، واتە: ئەی پێغەمبەر! لە بارەی قیامەتەوە لێت ئەپرسن: کەی دێو دائەمەزرێ؟ تۆ لە چ پایەیەکدای تا بزانی قیامەت کەی ئەبێ و کەی نابێ؟

پێغەمبەری خوایە ﷺ لەبەرئەوەی دوای محمد پێغەمبەری تر نایەت لە دوای ئیسلام هیچ ئاینێکی تر نیە، لەدوای ئوممەتی ئیسلامیش هیچ ئوممەتێکی تر نیە.

بۆیە دەبێت ئامادەکاریەکی ئیمانی بکەین لەبەرئەوەی ئەو پیاوەی کە وتی ئەی پێغەمبەری خوا کەی ڕۆژی قیامەت بەرپا دەبێت؟ وەڵامەکەی زۆر نزیك بوو بۆمان، فەرمووی ئەوەی پرسیار دەکات باشتر وەڵامەکەی دەزانێت وەك لە پرسیار لێ کراو. بەڵام وەڵامی پێغەمبەری خوا وا بوو فەرمووی: چیت بۆ ئامادە کردووە. ئەو زیرەکییەی پێغەمبەر ﷺ ئەو پیاوەی لە گرنگەوە گواستەوە بۆ گرنگتر. پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: (قیامەت بەرپا نابێ هەتا بەدڕەوشتی بەرپا دەبێت بەزمان و بەکردەوەو پچڕانی پەیوەندی خزمایەتی، خراپ مامەڵە کردنی دراوسێیەتی، ئەوەی پیسە ئەمانەت دەدرێتە دەستی و دەست پاکیش دەکرێت بە دەست پیس و دز)[3]. ئەمە شەش نیشانەی بچوکن و لەسەر هەر یەکەیان کەمێك دەوەستین.

---

١- البخاري.
٢- النازعات: ٤٢ – ٤٣
٣- مسند أحمد.

کاتێك بەدڕەوشتی بەرپا دەبێت (الفحش) واتە: ئەنجام دانی بەدڕەوشتی بەکردەوەو (التفاحش) واتە: باس کردنی بەدڕەوشتی بەزارەکی، بۆ نموونە ئەو ئافرەتانەی لە نمایشکردنی جلوبەرگی رووت و دانەپۆشراودا بەشداری دەکەن ئەوە جۆرێکە لە بەدڕەوشتی بەڵام گواستنەوەی ئەو پێشبڕکێیە بەهۆی گۆڤار و باس و خواسی میدیاکانەوە (التفاحش)ە واتە: بڵاوکردنەوەی خراپەکاری لەنێو باوەڕداراندا.

## پێوانە هەڵگەڕاوەکان...!!

ئایا مانای (الفحش) یان خراپەکاری لە شەریعەتی ئیسلامی‌دا چیە؟

ئەو کارەیە کە خواو پێغەمبەرەکەی نیگەران و توڕە دەکات ئەگەر پێغەمبەر ﷺ کارێکی خراپەکاری ببینیایە ڕووبەڕووی دەبۆوەو دژایەتی دەکرد. هەریەکێك لە ئێمە دەتوانین لەڕێی قورئان و سوننەتەوە پێوانەیەك بۆ خراپەکاری بە زمان و بەکردەوە دیاری بکەین، هەمیشە وا خۆت بهێنەرە بەرچاو کە بە تەنیشت پێغەمبەرەوەی ﷺ و ئەویش بە تەنیشتەوەیە ئایا ئەو گۆڤارە دەبینێت یان نایبینێت؟ ئایا ئەگەر بەتەنیشتتەوە دێت لەگەڵتدا دێت بۆ گازینۆو تیایدا دانیشێ یان نا؟

پچڕانی پەیوەندی خزمایەتی یەکێکی ترە لە نیشانەکانی قیامەت. ئەبو هورەیرە(رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: یارسول الله هاموشۆی خزمەکانم دەکەم و سەردانیان دەکەم بەڵام ئەوان بەخراپە وەڵامم دەدەنەوە، گرنگیان پێ دەدەم ئەوان فەرامۆشم دەکەن. پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەبو هورەیرە لەسەر کردەوەکانی خۆت بەردەوام بە.

بەدوای کارێکدا بگەڕێ کە تەرازووی کردەوە چاکەکانت قورستر بکات، قورسترین کردەوەیەك کە بخرێتە ناو تەرازووی بەندەکانی خواوە لەڕۆژی

قیامەت دا کەمێك کینەیە لە هەناویدا هەڵیگرتوەو دەشتوانێت لەو کەسە خۆش ببێت، پچڕانی پەیوەندی خزمایەتی لەم سەردەمەدا زۆر بڵاوبۆتەوەو بۆتە سیمایەکی بەرچاوی ئەمرۆ.

کێن ئەوانەی بە(رەحم) ناو دەبرێن؟ ئەو کەسانەن کەتۆ مردیت میراتیەکەت حەڵاڵە بۆیان، بەدوای ئەواندا خزمە پلەیەك و دوو سێکانە.

پیاوێك هات دایکی خستبوە سەرشانی و لە شامەوە هەزاران کیلۆمەتری بڕی بوو بەرەو مەککە دەڕۆشت. هەتا حەجی بۆ بکات، وتی: ئەی پێشەوای باوەڕداران واجبی خۆم لەبەرامبەریدا بەجێهێناوە؟ فەرمووی چی و کردووە بۆی؟ وتی: بەدەستی خۆم دەیشۆم ئەوەتا لەو شوێنە دوورەوە هاتووم حەجی بۆ دەکەم و بەدەستی خۆم خواردنی پێ دەدەم ئایا ئەمە بەس نیە؟ پێشەوا فەرمووی: پاداشتی یەك ژانی ساتی لەدایك بوونی خۆتت کە لەسکیدا بویت نەداوەتەوە دایکت هەموو شتێکی بۆ دەکردیت هەمیشە ئاواتی باشترین ژیانی بۆ تۆ دەخوازی تۆش ئەمەت بۆ کردووەو ئاواتی مردنی بۆ دەخوازیت!!!.

یەکێکی تر لە نیشانەکانی خراپ مامەڵە کردنی دراوسێیە. لەسەردەمی دێرین دا دراوسێ لەبرا نزیکتر بوون بۆ یەك، جارێك عەبدولرەحمانی کوڕی عەوف بە پێغەمبەری خوایﷺ فەرموو: ئەو پیاوە زۆری خایاند کە بەدیارتەوە وەستابوو! فەرمووی: ئەی کوڕی عەوف بینیت؟ وتی: بەڵێ. فەرمووی: ئەوە جبریل بوو ئەوەندە جەختی کردەوە لەسەر دراوسێ تا وا گومانم برد دەبێتە میراتگرم. خراپیی مامەڵە لەگەڵ دراوسێدا خۆهەڵقورتاندن لەکارە تایبەتیەکانی یەکترو هەوڵدان بۆ دەرخستنی نهێنییەکانی دراوسێکەت هەموو ئەمانە ئێستا لەنێو خەڵکیدا زۆر بڵاوە.

باش مامەڵەکردنی دراوسێ کارێکی داواکراوە ئەگەر موسوڵمانیش نەبێت، من وام لێ داواکراوە کە بەجوانی مامەڵەی لەگەڵدا بکەم ئیتر یان بێ لایەنبم لەگەڵیدا یان بیخەمە سەر دینەکەم ﴿ رَبَّنَا لَا تَجْعَلْنَا فِتْنَةً لِّلَّذِينَ كَفَرُوا ﴾[1]

واتە: خوایە! مەمانکە بە مەیدانی تاقیکردنەوە بۆ کافران بەوە کە زاڵیان بکەی بەسەرماناو ئەوانیش سزامان بدەن و ئێمەیش لە ئەنجامی ئەو سزادانەدا دڵمان بگۆڕێ.

کاتێک دراوسێ جولەکەکەی ئەبوحەنیفە خانووەکەی فرۆشت بە شەراب دروست کەرێك، ئەمەش تاقیکردنەوەیەکی سەخت بوو بۆ پێشەوا ئەبو حەنیفە کە دراوسێیەکی خراپ بوو ئەو گەنجە شەو بەسەرخۆشیەوە دەگەڕایەوە ماڵەکەی خۆی دەیوت: منیان فەوتاند چۆن تیاچونێك پاش ماوەیەك ئەبوحەنیفە گوێی لە دەنگی ئەو گەنجە مەی فرۆشە نەبوو پرسیاری کرد ئەوە لەکوێیە؟ وتیان: پۆلیس دەست بەسەریان کردووە.

ئەبوحەنیفە ڕۆیشت بۆ بنکەی پۆلیس ئەو بنکەیە هاتە لەرزین کە ئەبوحەنیفەیەکی زانای بەڕێز چی دەوێت؟ فەرمووی: دراوسێیەکم هەیە هاتووم شەفاعەتی بۆ بکەم داواتان لێ دەکەم لێی خۆش بن هەرچیەك لەو بنکەیەدا بوو لەبەر ڕێزو هەیبەتی پێشەوا ئەبوحەنیفە هاتنە دەرەوە.

ئەوەبوو لەدوای ئەبوحەنیفەوە ڕۆیشت و خۆی شۆرد و بۆ یەکەم جار ڕۆیشتە ناو مزگەوت و لە پشتی پێشەوا ئەبوحەنیفە نوێژی کرد، ئیتر دوای ئەوە هەرکاتێك ئەو گەنجەی دەبینی دەیفەرموو: گەنجی جوان تیاچویت؟ گەنجەکە دەیوت: نەخێر تەواو من تیاچوو نیم.

ئەوە جوان مامەڵە کردنی دراوسێیە.

---

[1] - الممتحنة: ٥

چی تر هەیە لەنیشانە بچوکەکانی ڕۆژی دوایی؟ ئەمانەت دەدرێتە دەست کەسی خیانەتکار گەورەترین خیانەتیش ئەوەیە کە لە خواو پێغەمبەرەکەی بکەیت. واتە پیاوێك بەرپرسیاریەتییەکی پێ دەدەیت لە دەزگایەکدا کچێك دەچێت بۆ لای بە مەبەستی دامەزراندنی بەڵام پێی دەڵێت: ببورە ئێمە کارنادەین بە باڵاپۆشان...!!!! بۆچی؟ پێت دەڵێن فەرمانەکە وایە، ئەمە خیانەتە لەخواو پێغەمبەرەکەی.

ئەمانەت دانە دەستی خیانەتکارەکان بۆتە سیمایەکی بەرچاوی ئەم سەردەمەو لەو لایشەوە کەسی دەست پاك و بەرەوشت بەخیانەتکار تۆمەتبار دەکرێت بڕوا بەدرۆزن دەکرێت و ڕاستگۆ بە درۆزن لە قەڵەم دەدرێت.

لە پێغەمبەری خواوە ﷺ هاتووە کە دەفەرموێت: (ئەگەر کارێك درایە دەستی کەسێك کە شایستەی ئەو شوێنە نەبێت ئەوا چاوەڕوانی بەرپابوونی قیامەت بن)[١].

واتە: دانانی کەسێکی نەگونجاو بۆ شوێنێکی گونجاو. لە شوێنێکی تردا پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: (هەرکەسێك سەرکارێك بەهۆی خزمایەتیەوە لە شوێنێکدا دابمەزرێنێت و لەنێو موسوڵمانانیشدا کەسانێك هەبن زۆر لەو شارەزاتر بن ئەوا ئەو کەسە بۆنی بەهەشت ناکات ماوەی ڕۆشتنی ئەو بۆنە ئەوەندەو ئەوەندەیە).

پێغەمبەر ﷺ لەدوای ئەبوبەکر (ڕەزای خوای لێ بێ) بووە جێنیشین ئەمیش لەدوای خۆی حەزرەتی عومەری هەڵبژارد حەزرەتی عومەریش خزمەکانی پێغەمبەری خوای دادەمەزراند ئەوانەی لەکاتی جەنگدا لەپێشەوە بوون و لەکاتی کۆکردنەوەی دەسکەوتەکاندا خۆیان دەشاردەوە (حەزرەتی عەلی و

---

١- رواه البخاري.

ئەباعوبەیدەی کوڕی حارثەی ئامۆزای لە جەنگەکاندا پێش دەخست، بەڵام لەساتی کۆکردنەوەی دەسکەوتەکاندا خۆیان دەشاردەوە یاخود کۆتا کەس بوون کە وەریان دەگرت). ئەمەش بەرزترین نموونەی فەرمانڕەوای دادپەروەر و فەرمانبەرداری پیاو چاکە کە خزمایەتی ناخاتە پێشەوە ئەگەر شایستەی نەبێت.

(والأقربون أولى بالمعروف)، نزیکەکان لەپێشترن بۆ چاکەکردن لەگەڵیاندا، بەڵام ئەمە بۆ ماڵ و سامانێك دەبێت کە تایبەت بێت بە خودی خۆم، نزیکەکان کاتێك لەپێشتر دەبن لە بەرژەوەندیدا کە ماڵ و سامانی گشتی نەبن چونکە من ئەمینداری ئەو ماڵ و سامانەم.

## دڕندەیی دەروون و خراپیەکانی کار:

ئەوەی کە ئیبن ماجە ریوایەتی کردوەو شێخی ئەلبانی پشت ڕاستی کردوەتەوە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: (ئەی کۆمەڵی کۆچ کردووان پێنج شت هەن ئەگەر بەهۆیەوە تاقیکرانەوەو دوچاری بەلابوون پێوەی -پەنا دەگرم بەخوا ئەگەر فریای بکەون-، خراپەکاری و بەدڕەوشتی لەهەرگەلێکدا بڵاوبووەوەو بانگەوازی بۆکرا ئەوا بە دڵنیاییەوە نەخۆشی تاعون و برسیەتی لەناویاندا پەرەدەسێنێت بەجۆرێك کە لە نەوەکانی پێش خۆیاندا شتی وایان بەسەردا نەهاتووە، هەروەها تەرازووبازی لەناویان بڵاوبێتەوە ئەوا دوچاری کەمی ڕزق و ڕۆزی و ستەمی دەسەلاتداران دەبن پاشان زەکاتی ماڵەکانیان دەرنەکەن ئەوا باران بارینیان لێ دەگیرێتەوە خۆ ئەگەر گیانلەبەرەکانیان نەبوایە بەهیچ جۆرێك بارانیان نەدەبینی، ئەگەر پەیمانی خوا و پێغەمبەرەکەیان بشکێنن ستەمکار و خوێنرێژێك دەکاتە دەسەلاتدار و فەرمانڕەوایان و ئەوەی لەبەردەستیان دایە لێیان دەسێنێت، ئەگەر پێشەواو سەرکردەکانیان حوکم بە

فەرمانی خوا نەکەن یان بە ئارەزووی خۆیان هەڵیبژێرن ئەوا خوای گەورە جەنگ و ئاژاوە دەخاتە نێوان خۆیانەوە)[1].

## نەخۆشیەکان ... نەخۆشیەکان:

لێرەدا پێنج شت کورت دەکەینەوە:

یەکەم: بڵاوبوونەوەی بەدڕەوشتی یاخود دەرکەوتنی یاخود بانگەشەکردن بۆی، ئاکامەکەی بڵاوبوونەوەی نەخۆشی طاعون و نەخۆشییە گوازەرەوەکانی تر دەبێت هەروەها برسیەتی لەناویاندا بڵاودەبێتەوە بەجۆرێك کە لەنەوەکانی پێش خۆیاندا نەبووە، بۆ نموونە شێرپەنجە لەگەڵ ئەو هەموو پێشکەوتنە زانستیانە تا ئێستاش چەندین نەخۆشی هەن کەزۆر لە خەیاڵ نامۆترن بواری پزیشکی تا ئەمڕۆ لە بەردەمیدا دەستەوسانەو فریای هەموو ئەو نەخۆشییانە ناکەوێت کە زوو زوو سەرهەڵدەدەن.

بانگەشەکردن بۆ بەدڕەوشتی تاوانێکی زۆر گەورەیە، گەلی لوط خوای گەورە شارەکەیانی بەرزکردەوە بۆ ئاسمان تەنانەت فریشتەکان لە ئاسماندا گوێیان لە وەڕینی سەگەکانیان بوو پاشان جوبرەئیل فڕێیدانەوە بەزەویدا ئەمەش لە کاتێکدایە کە ئادەمیزادەکان لە سنوری مرۆڤ بوونی خۆیان دەردەچن.

﴿جَعَلْنَا عَالِيَهَا سَافِلَهَا﴾[2] واتە: شوێنەکەمان سەرەوژێر کرد و کاولمان کرد بەیەکا.

ئەمە بەڵای یەکەم بوو کە کاتێك بەدڕەوشتی بڵاودەبێتەوە.

---

١- ابن ماجە.

٢- هود: ٨٢

## ستەمکردن....بە ستەمکردن:

دووەم: ئەو کاتەی دەکەونە تەرازووبازی ئیتر خوای گەورە قات و قڕی و کەمی ڕۆزییان بۆ دەنێرێت، کاتێک دەچیتە بازارەکان دەبینیت خەڵکانێک تەرازووبازی دەکەن ﴿وَيْلٌ لِّلْمُطَفِّفِينَ﴾، یاخود بۆ نموونە دەچێت بۆلای کوتاڵ فرۆشێک (٣) مەتر قوماشی لێ دەکڕێت کوتاڵ فرۆش وا خۆی دەردەخات کە زیاتری بۆ بڕیوە کاتێک دەچێتەوەماڵەوە سەیری دەکەین دوو مەترو سێ چارەکە ئەمە ئەوکارەیە کەپێی دەوترێت هەڵپەکردن یان تەماع، ئەوەتا خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَيْلٌ لِّلْمُطَفِّفِينَ الَّذِينَ إِذَا اكْتَالُوا عَلَى النَّاسِ يَسْتَوْفُونَ وَإِذَا كَالُوهُمْ أَو وَّزَنُوهُمْ يُخْسِرُونَ﴾[1] واتە: هاوار بۆ ئەوانەی لە کێشانەو پێوانەدا زیادو کەم ئەکەن. ئەوانەی کە شتی خەڵکیان بۆ خۆیان پێوا بەتەواوی حەقی خۆیان وەرئەگرن. کە شتیشیان بۆ ئەوان پێوا یا کێشا زەرەریان لێ ئەدەن و کەمیان بۆ دائەنێن.

دیارە لە باسی کێشدا پاراستن نیە، بەڵکو باسەکە مامەڵەیە من دەمەوێت ستەم لە هەموو مافەکانی خێزانەکەم بکەم و قەرەبووی بۆ ناکەمەوە بەدوای ئەمەدا ساڵانێکی قات و قڕی و کەمی ڕۆزی دێت بەسەرماندا.

سێیەم: دەسەڵاتدار ستەمی لێ دەکات، ئایا پەیوەندی ستەمی دەسەڵاتدار چیە بە تەرازوو بازییەوە؟ کاتێك ئادەمیزاد لەتەرازوو مامەڵەدا ستەمێك دەکات خوای گەورەش کەسێکی بەسەردا زاڵ دەکات کە ستەمی لێ بکات، دیارە پاداشت لەجۆری کارەکەیە.

---

١- المطففين: ١ – ٣

## ڕژدیی خاوەنەکەی نائومێد دەکات:

چوارەم: لەکاتی گرتنەوەی زەکاتدا خوای گەورە وشکە سالّی دەنێرێت و باران نابارێت، ئەگەر دوعا کردن نەبێت ڕزقیان ناداتیّ.

کوا زەکاتی موسوڵمانان؟! خەڵکانێکی هەژار هەن کەس پێیان نازانێت، ورگ دڕاویی دەوڵەمەندەکانە کە هەژاریی دروست کردووە، بەو مانایەی ئەگەر دەوڵەمەندەکان زەکاتی ماڵی خۆیان دەربکەن و بیبەخشن بەهەژاران ئەوا هەژار لە وڵاتانی ئیسلامی‌دا نەدەما ئەم پارووە لە زەکاتی ماڵی ئەمەدایە.

زەکات نەدان خوای گەورە تووڕە دەکات فریشتەکان نیگەران دەبن و ڕەحمەتی خوا دانابەزێت، کەواتە خوای گەورە باران بارینی بەستۆتەوە بەدەرکردنی زەکاتی ماڵەوە واتە: کاتێك زەکاتی ماڵەکەم دەدەم ئەو ماڵە گەشە دەکات وەك چۆن کاتێك باران باری زەوی گەشە دەکات و دەبوژێتەوە.

سەیری ڕەوانبێژی پێغەمبەری خواﷺ بکە فەرموویەتی: ئەوەی گەشە دەکات زەکاتەکەی دەرنەکەیت ئەوا ئەوە نابەیت یان (دەستت ناکەوێت) کە گەشەی کردووە. (لن تدفع ماينمّي لن تأخذ ما يُنمّي). ئەگەر نزاکان نەبوایە ڕۆزی بەتەواوی دەبڕا، ئەمەش دیارە سوکایەتی تیایە بۆ ئێمە کە فەرمویەتی: ئەگەر نزاکردن نەبوایە ڕۆزیتان نەدەدرا مەگەر ئەو کەسانە نەبێت کە لەخوا دەترسن.

حەزرەتی موسا لەپاڵ گەلەکەیدا بەنی ئیسرائیل وەستاو دوعای نوێژە بارانەیان دەکرد، حەزرەتی موسا فەرمووی: خوایە خەریك بوو تیا دەچوین. خوای گەورە فەرمووی: ئەی موسا کەسێك لەناوتاندایە بەهۆی ئەوەوە بارانم لێ گرتونەتەوە ئەگەر دەرنەچێت باران نابارێت. حەزرەتی موسا هاواری کرد: کەسێك لەناوماندا گوناهبارە با ئەو کەسە دەربچێت خوای گەورە بارانمان بۆ دەبارێنێت، پاش کەمێك حەزرەتی موسا دەستەکانی بەرزکردەوە لەناکاو

ئاسمان بەهەور تاریك بوو باران بەلێزمە دایكرد حەزرەتی موسا زۆر سەری سوڕما و فەرمووی: خوایە چۆن بارانت باراند لەكاتێكدا كەس لەناوماندا نەهاتە دەرەوە؟! خوای گەورە فەرمووی: لەنێوان من و خۆیدا تەوبەیەكی زۆر گەورەی كردو منیش بۆم پۆشی. حەزرەتی موسا فەرمووی: خوایە نیشانم بدە بزانم كێیە ئەو كەسە هەتا تەوبەكردنی لێوە فێربم ئەمەش لەڕەوشت بەرزی پێغەمبەرانە. خوای گەورە فەرمووی: لەكاتێكدا ئەو سەرپێچی كاربوو بۆم پۆشیبو ئێستاش ئاشكرای ناكەم كە تەوبەی كردووە.

ڕەحمەتێكی سەراپاگیر لە ئیستیقامەیەكی تایبەتەوە دێت واتە: ئەو كەسەی كە لەناخیدا لەخوا دەترسێت و سنورەكانی خوا ڕادەگرێت و لەنێوان خۆی و خوادا نایانشكێنێ ئەوا چاكەكاری كۆدەكاتەوە.

## لەدەستدانی زەوی بە لەدەستدانی پەیماندان...

هەركاتێك ئەو پەیمانەی كە داویانە بەخواو پێغەمبەرەكەی نەیان بردەسەر ئەوا ستەمكارێكیان دەدات بەسەردا ئەوەی لەدەستیاندایە دەیبات، داگیركردنی خاكی ئیسلام و تالآن كردنی سەروەت و سامان و خێرو بێرەكەی نیشانەیەكن بۆ شكاندنی پەیمانی خوای گەورە!! چۆن ئەو پەیمانەی درا بەخوای گەورە شكا؟! خوای گەورە پەیمانی لێ وەرگرتین نوێژ بكەین ئێمە نایكەین، پاك بین پاك نین وە شەرعی خوا ڕاگرین بەلآم ڕامان نەگرتووە فەرمانەكانی ئەو وەرگرین ئەوەی ئەو نەفرینی لێ كردووە ئێمە نەیكەین، نەمانكرد.

كەواتە ئەو بارودۆخەی كەتیایدا خاكی موسوڵمانان داگیر كراوەو سەروەت و سامان و كەرامەتی دزراوە لەقەزاو قەدەری خوا نیە بەڵكو گوناهو تاوانەكانی خۆمانە. باوەڕداری لاواز بەقەزاو قەدەر بیانو دێنێتەوە بەلآم باوەڕداری بەهێز بەقەزاو قەدەری خوا ڕازی دەبێت.

دیاره باوەڕدار بەهێز نابێت مەگەر ئەو کاتە نەبێت لەناخی خۆیدا پەیمانی خوا ڕانەگرێت، دەوڵەتیش بەهەمان شێوەیە چەند دەوڵەتمان بینی پەیمانی شکاندو پشتیان کردە خوای گەورە، چییان بەسەرهات:

﴿فَحَاسَبْنَٰهَا حِسَابًا شَدِيدًا وَعَذَّبْنَٰهَا عَذَابًا نُّكْرًا﴾[1] ، واتـــە: ئێمـــەیش بـــە لێپرسینەوەیەکی سەخت لێمان پرسینەوەو بە سزایەکی نابار سزامان دان.

هەرکاتێك پشتیان کردە یادی خوا ئەوەیان بەسەردێت کە ئێستا پێوەی دەناڵێنن، ﴿وَإِذَآ أَرَدْنَآ أَن نُّهْلِكَ قَرْيَةً أَمَرْنَا مُتْرَفِيهَا فَفَسَقُوا۟﴾[2]

واتە: کاتێ بمانەوێت ئاوەدانییەك بفەوتێنین فەرمان بە خاوەن نیعمەتەکان و دەستەڵاتدارەکانی ئەدەین پەیڕەویی پێغەمبەرەکەیان بکەن و، لە ڕێی ڕاست لانەدەن.

خاوەن بڕیارو ڕۆشنبیران و کەسانی هەڵبژاردەو ئیعلامیان تیایە.

﴿فَحَقَّ عَلَيْهَا ٱلْقَوْلُ فَدَمَّرْنَٰهَا تَدْمِيرًا﴾[3] واتـە: ئـەوانیش بـێگوێیی فەرمانەکە ئەکەن و لـە ڕێـی ڕاسـت لائـەدەن، ئـەنجا سـزایان لەسـەر پێویسـت ئـەبێ و بـە تەواوی وێرانی ئەکەین.

ئەگەر لەخوا ترس بین خوای گەورە هەموو خێرێکمان پێدەبەخشێت و ترس و بیم دەخاتە دڵی دوژمنەکانمانەوە.

﴿وَمَا رَمَيْتَ إِذْ رَمَيْتَ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ رَمَىٰ﴾[4] واتـە: لـە ڕاسـتیدا ئـەو وردە بەردانە کە تۆ فڕێت دان بەرەو دەموچاوی کافرەکان تۆ فڕێت نەدان، خـودا بـە

---

١- الطلاق: ٨

٢- الإسراء: ١٦

٣- الإسراء: ١٦

٤- الأنفال: ١٧

دەستەڵاتی بێپایانی خۆی ئەو وردە بەردانەی کرد بە دەم و چاویانداو خەریکی کردن بە ئازاری چاویانەوەو، ئێوە دەستتان کرد بە کوشتن و دیل کردنیان.

﴿ٱلَّذِينَ قَالَ لَهُمُ ٱلنَّاسُ إِنَّ ٱلنَّاسَ قَدْ جَمَعُوا۟ لَكُمْ فَٱخْشَوْهُمْ فَزَادَهُمْ إِيمَٰنًا وَقَالُوا۟ حَسْبُنَا ٱللَّهُ وَنِعْمَ ٱلْوَكِيلُ ﴿١٧٣﴾ فَٱنقَلَبُوا۟ بِنِعْمَةٍ مِّنَ ٱللَّهِ وَفَضْلٍ لَّمْ يَمْسَسْهُمْ سُوٓءٌ وَٱتَّبَعُوا۟ رِضْوَٰنَ ٱللَّهِ ۗ وَٱللَّهُ ذُو فَضْلٍ عَظِيمٍ ﴿١٧٤﴾ إِنَّمَا ذَٰلِكُمُ ٱلشَّيْطَٰنُ يُخَوِّفُ أَوْلِيَآءَهُۥ فَلَا تَخَافُوهُمْ وَخَافُونِ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ﴾[١] واتە: ئەو موسوڵمانانەی کە بیستیان ئەبووسوفیان و جەماعەتەکەی دووبارە گەڕاونەتەوە بۆ شەڕکردن، دوای پێغەمبەر کەوتن و، لەگەڵ برین و ئازاریشدا بەرەو دوژمن ڕۆیشتن و نەیانویست لەو پاداشە بێبەش بن، لە ڕێگا تووشی جەماعەتێکی هۆزی (عبدقیس) بوون پێیان وتن: ئەبووسوفیان و جەماعەتەکەی خۆیان کۆکردووەتەوە بۆتان، بەم قسەیە ویستیان موسوڵمانەکان بترسێنن، بەڵام ئەمان نەترسان، بەڵکو ئیمانیان بە خودا زیاتر بوو و وتیان ئێمە خودامان بەسە بۆ یارمەتیدانمان، خودا باشترین پشت و پەنایە. * جا کە شەڕ تازە نەبوویەوەو کافرەکان بەرەو مەککە گەڕانەوە، ئەو موسوڵمانانە شوێنەکەیان بەجێهێشت و، بە کۆڵێ نیعمەت و کەرەمی خوداوە گەڕانەوەو، باوەڕیان بە خوداو یارمەتیدانی بەهێزتر بوو. هەروەها لەو شوێنەدا هەندێ مامەڵەیان بۆ ڕێککەوت کە قازانجێکی باشیان تیا دەستکەوت. بێجگە لەمانەیش هیچ جۆرە زیانێکیان تووش نەبوو. هەوڵیان دا بۆ ڕەزامەندیی خودا کە سەرچاوەی هەموو بەختیارییەکە. بێگومان خودا خاوەنی بەخششێکی گەورەیە. * قسەی پڕوپووچی وا کە عەزیمەتی ئینسان سست ئەکات وەسوەسەی شەیتانە کە دۆستانەکانی خۆی ئەترسێنێ، ئەوانەی دانیشتن و لەگەڵ پێغەمبەردا ئامادەی جەنگ نەبوون. ئێوە ئەی موسوڵمانەکان لە

---

١- آل عمران: ١٧٣ - ١٧٥

کافرەکان مەترسن، ئەو بێئاییینانە پیاوی ئەوە نین ئێوە لێیان بترسن. لە من بترسن و پشت بە یارمەتیی من ببەستن ئەگەر خاوەن ئیمانن.

ئەگەر پێشەواو دەسەلاتدارانیان بەفەرمانی خوا حوکم نەکەن و بەئارەزووی خۆیان قورئان هەلبژێرن و بڕوایان بەهەندێکی بێت و بەهەندێکی تر نەبێت ئەوا خوای گەورە جەنگ و دوژمنایەتی دەخاتە نێو خۆیانەوەو وایان لێ دێت بەزەییان بەیەکدا نەیەتەوە تاوانەکان دەدەن بەسەر یەکتردا یەکتری داگیر دەکەن. ئەوەتا قورئان باسی بەنی ئیسرائیلمان بۆ دەکات کە دەفەرموێت: لەنێو خۆیاندا زۆر دوژمنی یەك بوون، ئایا ئەمەش لەناو ئێمەدا ڕوودەدات کە لە دورەوە یاخود بەڕوکەشی سەیریان دەکەیت لە برا دەچن بەلام دلیان پارچە پارچەیە، ئایا هەمان باسی بەنی ئیسرائیل بەسەر ئێمەشدا جێبەجێ دەبێت. خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿إِن تَنصُرُواْ ٱللَّهَ يَنصُرۡكُمۡ وَيُثَبِّتۡ أَقۡدَامَكُمۡ﴾[1] واتە: ئەی ئەوکەسانەی ئیمانتان هێناوە ئەگەر ئێوە یارمەتیی خوا بدەن، خوایش یارمەتیی ئێوە ئەداو پێتان لە مەیدانی غەزادا لە دژی کافران قایم ئەکاو ئەچەسپێنێ.

ئەگەر باسەکە پێچەوانە بووەوە ئەوانە نەسەرتان دەخات نەجێ پێتان جێگیر دەکات... ئەمە لەگۆڕەپانەکەدا ڕوو دەدات لەنێو خەلکیداو دوژمنایەتی دەردەکەون، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿أَذِلَّةٍ عَلَى ٱلۡمُؤۡمِنِينَ أَعِزَّةٍ عَلَى ٱلۡكَٰفِرِينَ﴾[2] واتە: میهرەبان و دلنەرمن لەگەل موسولمانان و، توندو بەدەستەلاتن لەسەر کافران.

---

١- محمد: ٧

٢- المائدة: ٥٤

ئێستا ئێمە عیززەت بەسەر یەکتری دا نیشان دەدەین بەڵام بۆ جگە لە خۆمان سەرمان شۆڕ دەکەین.

ئێستا جارێکی تر با فەرمایشتەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ بخوێنینەوە: (یا معشر المهاجرين، خمسٌ إذا ابتليتم بهن وأعوذ بالله أن تبلغوهن: ما ظهرت الفاحشة في قوم حتى يعلنوا بها إلا فشا فيهم الطاعون والأوجاع التي لم تكن في أسلافهم الذين مضوا ولم ينقضوا المكيال إلا أخذوا بالسنين وشدة المؤنة وجَوْر السلطان، ولم ينقضوا عهد الله وعهد رسوله إلا سلط الله عليهم عدواً من غيرهم يأخذ بعض ما في أيديهم، وما لم تحكم أئمتهم بكتاب الله ويتخيروا ما أنزل الله سبحانه وتعالى إلا جعل الله بأسهم بينهم).

واتە: (ئەی کۆمەڵی کۆچ کردووان، پێنج بەڵا هەیە ئەگەر یەخەتان پێبگرێت، پەنا دەگرم بەخوا گەر توشتانبێت: بەدڕەوشتی لەهەر گەلێکدا بڵاوبووەوەو بانگەشەی بۆکرا ئەوا طاعون و برسیەتی لەنێوانیان بڵاودەبێتەوە کە لەنەوەکانی پێش خۆیاندا نەبووە، ئەگەر کەوتنە تەرازووبازی ئەوا ڕزق و ڕۆزییان کەم دەبێتەوە و ستەمکاری بەسەریاندا زاڵ دەبێت، ئەگەر پەیمانی خواو پێغەمبەرەکەی بشکێنن خوای گەورە دوژمنێکیان بەسەردا زاڵ دەکات ئەوەی لەدەستیاندایە بەتاڵان دەبیات، ئەگەر فەرمانڕەواو دەسەڵاتدارانیان حوکم بە بەرنامەی خواو پێغەبەرەکەی نەکەن ئەوا دوژمنایەتی و ڕق وکینە دەخاتە نێوانیانەوە). بۆچی پێغەمبەری خوا ﷺ پەنای بەخوا گرتووە لەوەی بکەوێتە نێو ئەم پێنج حاڵەتەوە، لەبەرئەوەی ئاسان نیە چونکە ئەگەر بەدڕەوشتی بڵاوبووەوە ئەوا تاك نامۆ دەبێت، چەندێك ڕۆژگار نزیك بووەوە ئەوەندە زیاتر ئادەمیزاد هەست بەنامۆ بوون دەکات، سەرپێچی لە سەیرکردنێکەوە دەست پێ دەکات دەبا لە سەیرکردنی تەلەفزیۆن خۆمان

بپارێزین، مامۆستای زانکۆ چاوی بگرێت، کەسی ئیعلامی فێری چاو داخستنمان بکات.

بەو شێوەیە ئوممەتی ئیسلامی وای لێ دێت فەرمان بەچاکە دەکات و نەفرین لەخراپە دەکات، تا ئێستایش لەنێو ئوممەت دا پیاوچاکان ماون و ئافرەتانی بەرەوشت بونیان هەیە.

قیامەت بەرپا نابێت هەتا ڕوباری فورات وشك دەكات كێوێكی زێڕینی تیا دەردەكەوێت سەرجەم خەڵكی لەسەری بەشەڕ دێن لەهەر سەد كەس (٩٩) كەس لەسەری دەكوژرێن دواكەس دەڵێت: ئومێد دەكەم من دەربازیم و گەنجینە زێڕەكە دەست من بكەوێت.

یەكێكی تر لەنیشانەكان ئەوەیە شەو و ڕۆژ بەسەر هەر شوێنێكدا بێت ئەم ئاینەش دەگات بەو شوێنانە.

## لە دڵنیایی هاوەڵان:

**كاتێك فەرمایشتی خوای گەورە دابەزی كە دەفەرموێت:**

﴿ وَتَرَى ٱلْجِبَالَ تَحْسَبُهَا جَامِدَةً وَهِىَ تَمُرُّ مَرَّ ٱلسَّحَابِ ۚ صُنْعَ ٱللَّهِ ٱلَّذِىٓ أَتْقَنَ كُلَّ شَىْءٍ ﴾[1] واتە: كێوەكانی سەر زەوی ئەبینی وا گومان ئەبەی كە وەستاو و ئارامن و لە ڕاستیدا وەك پەڵە هەور ئەبزوون چونكە شتی گەورە كە بەجارێ بجوولێ ئادەمزاد هەست بە جووڵەی ناكا. ئەمەیش كاری ئەو خوایەیە كە هەموو شتێكی بە باشی دروست كردووە.

ئەو نەوەیە هەزارو پێنج سەدساڵ گوێیان گرت لەم فەرمایشتە و نەیان وت ئەمە چۆن دەبێت؟ ئەو عەرەبەی كە لە ئامێزی چیادا پێ دەگەیشت باوكی

---

١- النمل: ٨٨

دەیبینی باپیری دەیبینی شاخەکەیش لە شوێنی خۆیدا نەدەجوڵا! بەڵام وتیان پێغەمبەری خوا ﷺ ڕاستی وت و ڕاستی فەرموو.

﴿وَلَمَّا رَءَا ٱلْمُؤْمِنُونَ ٱلْأَحْزَابَ قَالُوا۟ هَٰذَا مَا وَعَدَنَا ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ وَصَدَقَ ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ ۚ وَمَا زَادَهُمْ إِلَّآ إِيمَٰنًا وَتَسْلِيمًا﴾[1] واتە: بەڵام موسوڵمانە خاوەن باوەڕەکان کاتێ کە تاقمەکانی کافرەکانیان دی، وتیان: ئەم هێرشی کافرانە بۆ سەرمان و ئەم شەڕە کە دەرگای پێ گرتووین، ئەوەیە کەخواو پێغەمبەر گفتیان دابووینێ کە فەرموویان: ڕۆژی وەك ئەم ڕۆژەتان دێتە ڕێ و هەرکەسێ خۆی ڕابگرێ و ئیمانی نەلەقێ خوا سەری ئەخاو لە قیامەتیشا پاداشی چاکی ئەداتەوەو، خواو پێغەمبەری خوا ڕاستیان بە موسوڵمانان وتبوو و موسوڵمانانیش لە باوەڕ زیادبوون بە فەرموودەی خواو پێغەمبەر و لە ڕەزامەندی بە فەرموودەی ئەوان بەولاوە هیچیان لەو ڕۆژە پڕ تەنگوچەڵەمەدا زیاد نەکرد. واتە ئەو هاتنەدییەی فەرموودەی خواو پێغەمبەرو ڕووبەڕووبوونەوەی ئەو هێرش و هاتنی کافرانە هیچ ورەی پێ بەرنەدان و، بە پێچەوانەوە باوەڕیانی بە هەرچی کە خواو پێغەمبەری خوا بیفەرموون، زیاتر کرد.

خوای گەورە بەم شێوەیە پێناسەی کردوون: ﴿رِجَالٌ صَدَقُوا۟ مَا عَٰهَدُوا۟ ٱللَّهَ عَلَيْهِ﴾[2] واتە: لەناو موسوڵمانانا پیاوانێ هەن ڕاستیان کردووە لەو گفتەدا کە بەخواو بە پێغەمبەری خوایان داوە. بەڵام نەك لەبەر پیاوەتیەکەیان بەڵکو بەژیرییان.

دیاردەی ڕوودانی شەو و ڕۆژ گەیشت بەهەر شوێنێك ئیسلامیش بەو شوێنە دەگات ئەوەتا ئێستا لەڕێی کەناڵە ئاسمانیەکانەوە دەگات بەهەموو شوێنێك

---

١- الأحزاب: ٢٢

٢- الأحزاب: ٢٣

لەدەشت و دەرو بیابان بێت یان لەشارو شارستان بێت ئیتر بە عیززەتی خاوەن عیززەتان بێت یان بەزەلیلی لاوازەکان بێت، بە عیززەتێك کە خوای گەورە دەیدات بە ئیسلام یاخود بە زەلیلیەك کە خوای گەورە بێباوەڕانی پێ سەرشۆڕ دەکات، دڵنیایی و متمانەی هاوەڵان بە پێغەمبەری خوا ﷺ نەلەرزی.

پێغەمبەری خوا ﷺ (١٣) لە مەککەدا ژیا (٨٤)کەس باوەڕیان هێنا سەرەتا (٤٠)کەس بوون دوایی لە پەیمانی عەقەبەدا بوونە (٧٢)کەس واتە لەکاتی کۆچ کردنی پێغەمبەردا ﷺ گەیشتنە (١٥٢١) کەس و فێری دینداری کردن.

﴿إِذَا جَآءَ نَصۡرُ ٱللَّهِ وَٱلۡفَتۡحُ ۝١ وَرَأَيۡتَ ٱلنَّاسَ يَدۡخُلُونَ فِي دِينِ ٱللَّهِ أَفۡوَاجٗا﴾[١] واتە: کاتێ کە یارمەتیی خوایی هات و مەککە گیراو، خەڵکی جزیرەی عەرەبت دی پۆل پۆل دێنە ڕیزی ئایینی خواوە.

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: (ئیسلام بەنامۆیی هاتە دنیاوەو هەر بەنامۆییش دەگەڕێتەوە). بابێینە سەر بەسەرهاتی ئەبو موسای ئەشعەری (ڕەزای خوای لێ بێ) ئەوە بوو شوێن پێغەمبەری خوا کەوت ﷺ بۆلای دیواری بەنی فلان یاخود باخی بەنی فلان، وتم: با دوای کەوم هەتا چووە ناو باخەکەوەو بەرەو لای بیرە ئاوەکە ڕۆشت خۆی هەڵکرد هەتا تۆزێ ئاوی لێ دەربێنێت. وتم وەڵاهی ئەبێ ببمە دەرگاوانی پێغەمبەری خوا ﷺ داوای ئیزنم لێ کردو پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ئیزنم دایت، ئینجا لە پشت دەرگاکەوە دانیشت و فەرمووی: هەرکەسێك هات پێم بڵێ: پاش کەمێك یەکێك لە دەرگای‌دا پێم وت: خۆزگە براکەم دەبوو (سبحان الله حەزدەکات براکەی بێت)، وتم کێیە؟ وتی: ئەبوبەکر، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بیکەرە ژورەوەو مژدەی بەهەشتی پێ بدە ئەوەبوو چوو لەلای ڕاستیەوە دانیشت و حەزرەتی عومەریش لای چەپیەوە، پاشان

---

[١] - النصر: ١ - ٢

لەدەرگایان دایەوە وتم کێیە وتی: عوسمانم پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: دەرگاکەی لێبکەرەوەو مژدەی بەهەشتی بدەرێ و پێی بڵێ: دوچاری بەڵایەك دەبێت (ئەمە لایەنێکە لەو تاقیکردنەوەیەی کە زانایان بەیەکێك لە نیشانەکانی ڕۆژی دواییان داناوە، ئەوە بوو ئەو بەڵایەی کە حەزرەتی عوسمان دوچاری هات تەنانەت لەناو عەرەبی نەفامیدا ڕووی نەدابوو بەو شێوە دڕندانەیە، چۆن کوشتیان؟ زۆر بەدڕندانە چووە سەر سنگی و شەهیدی کرد، بەڵێ حەزرەتی عوسمانیش چووە نزیك پێغەمبەر ﷺ دانیشت.

ئەبو موسا لەدڵی خۆیدا وتی: ئەوە مژدەی پێدراو ئەمیش مژدەی پێدرا. ئینجا پێغەمبەر ﷺ پێی ڕاگەیاندم و فەرمووی: قیامەت بەرپا نابێت هەتا لەگەڵ جولەکەدا بەجەنگ دێین و جولەکە لەپشتی درەخت و بەردەوە خۆی دەشارێتەوە ئینجا درەخت و بەرد لێیان دێنە زمان و بەموسوڵمان دەڵێن وەرە ئەی موسوڵمان ئەوە جولەکەیەکە لەدوامەوە وەرە بیکوژە تەنها درەختی (غرقد) نەبێت کە درەختێکی جولەکەیە ئەوەتا ئێستا (١٠) بلیۆن درەختیان لەم جۆرە ڕواندووە لەدوای ساڵی (١٩٦٧)ەوە بەڵام درەختەکە دەڵێت: ئەی بەندەی خوا (بەندەیەك کە تەواوی بەندایەتی بۆ خوا ئەنجامداوە) ئەمەش نیشانەیەکە لەنیشانەکانی بەرپابوونی قیامەت.

## بانگخوازان لەبەر دەرگاکانی دۆزەخ:

لەئەثەردا هاتووە: ڕۆژی بەرپابوونی قیامەت لەبەردەستمدایە فیتنەو دووبەرەکی وەکو شەوی تاریك و ئەنگوستەچاو ڕوودەدات خوا پەنامان بدات، بەیانی مرۆڤ هەڵدەسێت موسوڵمانەو شەو دەکاتەوە کافر دەبێت، باوەڕدار بەچەند شتێکی بێ نرخی دنیا دینی خۆی دەفرۆشێت، بۆ پلەو پایە یاخود ماڵ و سامانێك. لەو حاڵەتەدا ئەوەی دانیشتووە چاکترە لەوەی بەپێوەیە ئەوەی

پیادەیە لەسواریی باشترە ئینجا فەرمووی چەکەکانتان بشکێنن و یەکتری پێ مەکوژن.

﴿ لَئِنۢ بَسَطتَ إِلَيَّ يَدَكَ لِتَقْتُلَنِي مَآ أَنَا۠ بِبَاسِطٖ يَدِيَ إِلَيْكَ لِأَقْتُلَكَۖ إِنِّيٓ أَخَافُ ٱللَّهَ رَبَّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٢٨﴾ إِنِّيٓ أُرِيدُ أَن تَبُوٓأَ بِإِثْمِي وَإِثْمِكَ ﴾[1] واتە: بەخودا قەسەم ئەگەر تۆ دەستت رابدەی بۆ ئەوەی بمکوژی من هەرگیز دەستم رانادەم بۆ ئەوەی بتکوژم. من لەو خودایە ئەترسم کە پەروەردگاری هەموو عالەمە. من ئەمەوێ گوناهی من و تۆیش بکەوێتە ئەستۆی تۆو بچێتە ئاگری دۆزەخەوە.

هەندێك لەخەڵکی دەڵێن: (هۆکاری دواکەوتوییمان دینەو دەڵێن کەعبە وێنەیەکە لە بتپەرستی. خەڵکانێك دەڵێن حیجاب فەرز نیەو دەبێت ئافرەت و پیاو یەکسان بکرێن) بەم شێوەیەیە کە فەرمایشتەکە دەفەرموێت پیاو رۆژ دەکاتەوە موسوڵمانەو شەوی بەسەردا دێت کافر دەبێت و بەپێچەوانەوە دینەکەی بەچەند کەل و پەلێکی بێنرخی دنیا دەفرۆشێت، بەهەر مامەڵەیەکی بێ نرخ لەمامەڵەکانی دنیا!

## سەربەرزی باوەڕدار لە دەستگرتن بە حەقەوە:

لەفەرمایشتێکدا هاتووە دەفەرموێت: (ئەگەر کەسێك رۆشت بۆلای دەوڵەمەندێك یاخود پادشایەك بەهۆی دەوڵەمەندییەکەیەوە سەری بۆ نەوی بکات ئەوا سێیەکی دینەکەی لەدەست دەدات) خوای گەورەش دەفەرموێت:

﴿ وَتَخْشَى ٱلنَّاسَ وَٱللَّهُ أَحَقُّ أَن تَخْشَىٰهُ ﴾[2] واتە: لە خەڵك ئەترسای و شەرمت ئەکرد خەیاڵەکەی دڵت دەرخەی، خوا لە هەرکەس شایانترە بەوە کە لێی بترسی.

---

١- المائدة: ٢٨ - ٢٩

٢- الأحزاب: ٣٧

ئەبو حازم ڕۆشت بۆلای هیشامی کوڕی عەبدولمەلیك و پێڵاوەکانی داکەند و لەژێر دەستیدا دایناو وتی: سڵاوتان لێ بێت هیشام چۆنیت. ئەبو هیشام وتی: لەقسەکەتدا هەڵەیەکت کرد پێڵاوەکانت لەلای دەرگاکەماندا داناو قسەت لەگەڵدا نەکردم و سڵاوت لێ نەکردم وەك پێشەوای باوەڕداران (سێ هەڵەی ئاشکرا) ابو حازم وتی: سەیرە پێڵاوەکانم دانا لەبەردەستی خوادا تووڕە نابێت ئیتر تۆ بۆ تووڕەبویت؟ ئەوەتا خوای گەورە بانگی ئەولیاکانی کردو فەرمووی:

﴿يَٰمُوسَىٰٓ أَقۡبِلۡ وَلَا تَخَفۡ﴾[1] واتە: مووسا! ڕوومان تێبکەو مەترسە.

﴿يَٰيَحۡيَىٰ خُذِ ٱلۡكِتَٰبَ بِقُوَّةٖ﴾[2] واتە: ئەی یەحیا! بەهێز و ئیرادەو تواناوە تەورات هەڵبگرەو کاری پێ بکەو بە خەڵکی ڕابگەیێنە. ﴿يَٰدَاوُۥدُ إِنَّا جَعَلۡنَٰكَ خَلِيفَةٗ﴾[3] واتە: ئەی داوود! ئێمە وا تۆمان کرد بە جێنشینی پێغەمبەرانی پێشوو لە زەویدا.

ئەوەتا نازناوی دوژمنەکانی بەم شێوەیە دیاری کردووە ﴿تَبَّتۡ يَدَآ أَبِي لَهَبٖ وَتَبَّ﴾[4] واتە: یاخودا وشك بن هەردوو دەستی ئەبوولەهەب و، وشکیش بوون.

ئیتر من چۆن بە تۆ بڵێم ئەی گەورەی باوەڕداران لەکاتێکدا هەموو لایەکمان ڕازی نەبووین بەوەی کە تۆ پێشەوامان بیت، من نامەوێت لەبەردەم پەروەردگاردا لەڕۆژی دواییدا بە درۆزن ناوببرێم..

---

١- القصص: ٣١

٢- مريم : ١٢

٣- ص: ٢٦

٤- المسد: ١

ئەبو حازم پیاوێکی دڵسۆز بوو ڕاستگۆیانە پەیوەندی بەخواوە بەستبوو بۆیە خـوای گـەورە ویسـتی وابـوو ڕێنمـویی بکـات بـەرەو چـاکە، بـەو مانایـەی عەبدولمەلیك دەڵێت: کاتێك پیاوێك دەهاتە ژورەوە بۆلام دەیوت: لەخوا بترسـە. منیش دەم وت: ئەم پیاوە ڕیاکارە بەڵام کاتێك سـەعد بـە عومـەری وت: لـەخوا بترسە سەعد زۆر دڵسۆز بوو بۆیە عومەر زۆر سوربوو لەسـەر ئـەو دڵسـۆزییەی، گرفتەکە لەخۆماندایە، داواکارین لەخوا ڕێنمویمان بکات، ئەگەر دەمانـەوێت ئـەو ستەمەی لەسەرمانە هەڵبگیرێت با ئـەو ستەمانەی لەیـەکتری دەکـەین نـەیهێڵین لـەنێو ماڵـەکانمان و دامـو دەزگـاو هـاوڕێ و کارەکانمـان و بەرژەوەندییـە تایبەتیەکانمان، خوای مرۆڤەکان ڕازی بکە مرۆڤەکانیش لێت ڕازی دەبـن و لێـت دەترسـن و خۆشیشـیان دەوێـت، ئەگـەر مرۆڤـەکان ئازاریـان دایـت ئـەوە تەرازووەکەت دەکەوێتە بەردەستی پەروەردگار.

## ئارامگریی و سوپاسگوزاری...

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: (لەهەژاربوونتان ناترسم بەڵکو لەوە دەترسم دنیـا بەسـەرتاندا زاڵ ببێـت وەك چۆن بەسـەر ئوممەتـەکانی پـێش ئێـوەدا زاڵ بـوو کەوتنە کێبـەرکێیی یـەکترو یـەکترییان لـەناوبردو ئێـوەیش وەك ئـەوان یـەکتری لەناوبەرن)[1].

لە فەرمایشتێکی تردا هاتووە دەفەرموێت: (دوچـاری زیـان بـوون و ئارامتـان گرت دوچاری خۆشی و قازانجیش دەبن ئارام بگرن) کاتێك دەڵێت: بەڵای ژیان و ناڕەحەتی واتە: وەك ئەو بەڵایانەی کە ڕووبەڕووی هاوەڵان بـووەوە لـە جـەنگی (خەندەق) و (بەدر) و (ئوحد)دا، هـەروەها کـە دەفـەرموێت: ڕووبـەڕووی بـەڵای خۆشی و قازانجی زۆر دەبنـەوەو ئـارام بگـرن مەبەسـتی لەوەیـە کـە ئـادەمیزاد

---

[1] - البخاري.

ڕوبەڕوی دیاردەکانی ژیان دەبێتەوە بەپارەو سامانی زۆر و ئەوەش پێویستی بە سوپاسگوزاری دەبێت کە هەردوکیان کۆکەرەوەی باوەڕن.

## زانین لای خواوەیە:

لە حەزرەتی عومەرەوە(رەزای خوای لێ بێ) هاتووە دەڵێت: لە کاتێکدا ئێمە لەخزمەت پێغەمبەردا بوین پیاوێك هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ قژێکی ڕەشی پێوە بوو کەسمان نەمان دەناسی ئەسپەکەی لەبەرامبەر مزگەوتدا بەستەوە هاتە ژورەوە بۆ ناو مزگەوت و لەبەرانبەر پێغەمبەردا ﷺ دانیشت هەردوو ئەژنۆی لکاند بە ئەژنۆی پێغەمبەری خواوە ﷺ هەردوو دەستیشی خستە سەر ڕانی و لە پێغەمبەری پرسی ئیسلام چی‌یە؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئیسلام ئەوەیە شایەتومان بێنێ، هەتا دوا ڕوکنەکانی هەموی پێی وت: پیاوەکەیش وتی: ڕاست دەفەرموێت: ئینجا وتی: ئەی (الإحسان) چی‌یە؟ ئێمەش سەرمان سوڕما کە پرسیاری لێ دەکات و دەشڵێت ڕاست دەکەیت هەتا دوا پرسیار وتی: ئەی ڕۆژی دوایی کەی دێت؟ پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: پرسیار لێکراو زاناتر نیە لە پرسیارکەر.

کەواتە پێغەمبەر ﷺ و جوبرەئیلیش عليه السلام نازانن کەی ڕۆژی دوایی بەرپا دەبێت ﴿يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلسَّاعَةِ أَيَّانَ مُرْسَىٰهَا ﴿٤٢﴾ فِيمَ أَنتَ مِن ذِكْرَىٰهَآ ﴿٤٣﴾ إِلَىٰ رَبِّكَ مُنتَهَىٰهَآ﴾[1]

واتە: ئەی پێغەمبەر! لە بارەی قیامەتەوە لێت ئەپرسن: کەی دێو دائەمەزرێ؟ تۆ لە چ پایەیەکدای تا بزانی قیامەت کەی ئەبێو کەی نابێ؟ سەرەنجامی ئەم باسە بۆ لای خوا خۆی ئەگەڕێتەوەو ئەو پێی ئەزانێ.

---

١- النازعات: ٤٢ - ٤٤

## دوو نیشانەی دیارو بەرچاو:

وتی نیشانەکانیم پێ بڵێ، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: (أن تلد الأمة ربتها وأن ترى الحفاة العراة رعاة الشاة يتطاولون في البنيان)[1]. (ئەگەر کەنیزەك خانمی خۆی لێ کەوتەوە، وە کە بینیت پێ پەتیە ڕوتەکان و شوانی مەڕەکان بیناکانیان بەرزکردەوە) . وتی: بەڵێ پاشان ڕۆشت، دواتر پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: دەزانن ئەوە کێ بوو؟ وتمان: نەخێر نازانین، فەرمووی: ئەوە جوبرەئیل بوو هاتبوو دینەکەتان تێ بگەیەنێت.

دوو نیشانەی گەورەمان هەیە: منداڵ لەدایکی خۆی هەڵدەگەڕێتەوە و فەرمانی بەسەردا دەکات ئالێرەوەیە کە کێشانەو پێوانەکان هەڵدەگەڕێنەوە، بابەتەکە پەیوەست نیە بە کەسانی خانەدان، دیل، یان ئازاد، بەڵکو پەیوەستە بە تێکچوون و هەڵگەڕانەوەی تەرازوو و کێشانەکانەوە. دایکێکی خزمەتکار کچێکی ئازادی دەبێت، واتە لەسەردەمی ڕابردوودا کاتێ پیاوێك کەنیزەکێکی دەکڕی کچێکی ئازادی لێدەکەوتەوە. ئەو کچەش دوای ئەوەی لەدایك دەبێت دایکی ئازاد دەبێت. هەروەك ئەوەی ئەو دایکە وەکو جاریە وابێ بۆ کچەکەی، هەروەك وتمان کێشانەکان پێچەوانە دەبنەوە ناپاك و دەست پیس دەکرێتە سپاردە پارێز، دەست پاك بە ناپاك لەقەڵەم ئەدرێ و ڕاستگۆ بەدرۆ دەخرێتەوە.

یان ڕەنگە بارودۆخ وەکو ڕابردووی لێبێتەوە، دەشێ سەردەمی کۆیلەو کەنیزەك بێتەوە گۆڕێ، ئەگەری هاتنەکایەی هەموو شتێ لە ئارادایە.

سەیر دەکەیت خەڵکێکی پێ پەتی و ڕوتی بێ بەرگ و دەشتەکی و شوانی ئاژەڵ دەبنە خاوەن سامان و سەرقاڵی بەرزکردنەوەی باڵەخانەی بەرز دەبن و

---

[1]- رواه مسلم.

باڵەخانەی هەور بڕ دروست دەکەن هەرچەندە ئەمە لە خۆیدا شتێکی خراپ نیە، بەڵام بەو مەرجەی سوپاسی خوای لەسەر بکرێت.

## لێرەدا داوای مردن دەکەیت...!!!

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: (خوازیاری مردن بن ئەگەر ئەم شەش خەسڵەتە هاتنە دی: کاتێك پێشەوایەتی درایە دەست خەڵکێکی کاڵفام، هەروەها فرۆشتنی فەرمانڕەوایی، بەسوك تەماشاکردنی خوێن، زۆر بوونی پۆلیس، پچڕانی پەیوەندی خزمایەتی، قورئان خوێن پەیدا دەبن لەبەری دەکەن و بە ئاوازی جۆراو جۆرەوە دەیخوێننەوە، پیاو بەناوی دایکیەوە بانگ دەکرێت و ڕێزی لێ دەگیرێت، پێویستیت بە شارەزاترین کەسیان نەبێت)[١].

مەبەست لەم فەرمایشتە ئەوەیە کە ئاوات خواستن بۆ هەریەکێك لە ئێمە لەکاتی ڕوودانی ئەو شەش خەسڵەتەی کە لە داهاتوودا ڕوودەدەن دروستە یەکەمیان دەفەرموێت: ئەو کاتەی کە خەڵکی کاڵفام لەسەر ئاستی هۆز، لەسەر ئاستی دەزگایەکی بچوك دەکرێتە سەرکارو گەورەیان، وشەی (السفیه) واتە: ئەو کەسەیە کە دەرك بەوکارە ناکات کە ئەنجامی دەدات لەگەڵ ئەمەشدا عەقڵیشی هەیە، (إمارة السفهاء) واتە: بەرپرسێك دەبینیت لە دەزگایەکدا بەچاکی بەڕێوەی نابات و هەڵس و کەوت و ڕەفتاری دروست ئەنجام نادات دژایەتی خاوەن ژیریەکان دەکات ئەوانەی کە خاوەن بەڵگە و ژیریی تەواون. شاعیریش دەڵێت:

إذا كان الغراب دليل قوم       يمربهم على جيف الكلاب

واتە: ئەگەر قەلەڕەش ببێتە ڕێنیشاندەری گەلێك، ئەوا بە کەلاکی سەگێکدا دەیانبات.

---

١- رواه احمد.

فرۆشتنی فەرمانڕەوایی، دروست و ڕاست نیە ئەگەر سەرۆکی دەزگاکان یاخود دەوڵەت پلەو پایەکان بفرۆشێت.

داخۆ لەسەدەی دێریندا چۆن فەرمانڕەوایان دەهێنایە سەر حوکم؟ دەوڵەت دەهات بەڕێزترین و هێمنترین و دادپەروەرترین و ژیرترین کەسایەتیان هەڵدەبژارد. لەناو هەموو ئوممەتێکدا کەسایەتی ژیرو بەتوانا لەنێو خەڵکیدا هەبوون:

﴿قَالَتۡ يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡمَلَؤُاْ أَفۡتُونِي فِيٓ أَمۡرِي﴾[1] واتە: شاژن بە دەستەو دائیرەکەی خۆی وت: ئەی کۆمەڵ! لەم پرسەما کە پێتان ئەکەم وەڵامم بدەنەوەو قسەی خێرم بۆ بکەن.

دەبێت خەڵکانێك هەبن ڕاوێژکار بن لەنێو خەڵکە دیارو بەرچاوەکاندا نەك لەنێو خەڵکێکی گشتی‌دا خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿إِنَّ ٱلۡمُلُوكَ إِذَا دَخَلُواْ قَرۡيَةً أَفۡسَدُوهَا وَجَعَلُوٓاْ أَعِزَّةَ أَهۡلِهَآ أَذِلَّةٗۚ وَكَذَٰلِكَ يَفۡعَلُونَ﴾[2].

واتە: شاژنیش وتی: پادشاهان ئەگەر پێیان نایە ئاوەدانییەك و داگیریان کرد کاولی ئەکەن و وەزعی تێك ئەدەن و خراپەی زۆری تیا ئەکەن و پیاوە گەورەکانی زەلیل و سووك و سەفیل ئەکەن. هەمیشە هەر وایان کردووەو ئێستەیش ئەگەر لەشکری سولەیمان بێ بەسەر ئەم وڵاتەی ئێمەدا هەروا ئەکا.

ئەمە فەرمایشتی بەلْقیس بوو کە فەرمووی: ئەگەر دەسەڵاتداران چونە نێو هەر شارو ئاوەدانییەکەوە خراپەکاری تێدا دەکەن، خۆی پادشا بوو، چەند جوانە پاشاکان بەم شێوەیە بن، دیارە مەبەستی لە حەزرەتی سولەیمان بوو کە

---

١- النمل: ٣٢

٢- النمل: ٣٤

تـا ئـەو كاتـە نەيناسـيوە، خـۆی لـەوە جيـاكردەوە، ليّـرەدا خەڵكـە نيـار و بەرچاوەكە وتيان:

﴿نَحْنُ أُوْلُواْ قُوَّةٍ وَأُوْلُواْ بَأْسٍ شَدِيدٍ وَٱلْأَمْرُ إِلَيْكِ فَٱنظُرِي مَاذَا تَأْمُرِينَ﴾[1]

واتە: كۆمەڵەی دەستەو دائيرەكەيشی لە وەڵاما وتيان: ئێمە بە ژمارەی سەر زۆر و بەهێزين و بـە لەشـيش زۆر ئـازاو لێهـاتووين و مەسـەلەكەيش لـە دەسـتی خۆتايە چونكە پادشای ئەم وڵاتەی، كەواتە وردبەرەوە چـی بـە بـاش ئـەزانی و فەرمان بە چ ئەدەی فەرمان بدە ئێمەيش جێبەجێی بكەين.

هـيچ ڕەفتـارێكی نـەنواد بـەڵكو پێـی بـاش بـوو سـەرەتا ڕاسـتگۆيی تـاقی بكاتـەوە... ديـارە ڕای لاواز نابێـت وەربگيرێـت ڕاوێـژيش ناكرێـت بەوكەسـەی خـاوەنی ڕای خـۆی نيـە، لەگـەڵ ئەوەشـدا كەسـايەتيەكی لاوازی نيـە تەماشـای خەڵكی بكات ئەگەر چاكەيان كرد ئەويش چاكە بكـات خراپەشـيان كـرد ئـەويش خراپە بكات ديارە يەكێك لەو پێنج گرۆيە كە لە دۆزەخدان ئەم جۆرە كەسانەن.

ئەگەر ژياننامەی پياوچاكانی پێشين بخوێنيتەوە يەك ڕووداو نابينيـت تيايـدا كورسی فەرمانڕەوايی فرۆشرا بێت بەكەسـانێك ئـيلا ئـەو دوو دەوڵەتـە دوچـاری ئاژاوەو كێشە بووە، ئەو دەسەڵاتەی كە لەسەردەمی پێغەمبەرايەتی و جێنشينە پێگەيشـتووەكاندا (الخلافـة الراشـدة) هـەبوە پـاكترين دەسـەڵاتداريی بـوو كـە ئـادەميزاد پێـی گەيشـتبێت، هـيچ يـەكێك لـەهاوەڵان گومانيـان لـە جێنشـينی حەزەتی ئەبوبەكر نەبوو حەزەتی عومەر پێی فەرموو: پێغەمبەر بە تۆ ڕازی بوو لەبەر دينەكەمان ئێمـە لـەتۆ ڕازی نـەبين بـۆ دنيامـان!! واتـە ئـەو (١٢) ڕۆژەی كەتيايدا پێغەمبـەر ﷺ نـەخۆش كـەوت و ڕازی بـوو لـەوەی پـێش نوێـژيان بـۆ بكات، ئايا ئێمەش ئەمانەتی كورسی دەسەڵات لەدنيادا نەدەينە دەست تۆ!!.

---

١- النمل: ٣٣

بەسوك سەیرکردنی خوێن واتە بەئاسان زانینی کوشتن، واتە: ئەگەر ڕوداوێك لەسەرە ڕێگەیەکدا ڕوویدات، بۆ نموونە ئەگەر دوو کەس لەو ڕوداوەدا بکوژرانایە ئەوا هەموو خەڵکی ئەو شارە دەخرۆشان، کەچی ئێستا لەبەردەم شاشەی تەلەفیزۆندا دادەنیشێت (٥٠) لاشەی کوژراو دەبینێت لەڕێی بەیەکدا ڕژانێکدا کەوتون لەفلانە هۆزو فلانە تیرە یان (٣٠) کوژراو کەچی بەڕووداوێکی زۆر سروشتی و ئاسایی دەزانیت خەڵکیی دەخۆن و دەخۆنەوەو بەسوك تەماشای خوێن دەکەن.

ئەگەر بەدوای هەواڵەکانی دوو ساڵ لەمەوبەردا بگەڕێیت ژمارەیەکی زۆر کوژراوت بەرچاو دەکەوێت نموونەی ئەمە لە دووەم جەنگی جیهانی دا بوونی نەبوە.

له کۆندا قابیل دەبینین کە هابیلی برای دەکوژێت کەچی خێرا دەشڵەژێ و بۆی دەردەکەوێت کە کارەساتێك ڕویداوە بووە یەکەم بکوژ:

﴿ فَطَوَّعَتْ لَهُۥ نَفْسُهُۥ قَتْلَ أَخِيهِ فَقَتَلَهُۥ فَأَصْبَحَ مِنَ ٱلْخَٰسِرِينَ ﴾[1]

واتە: نەفسی ڕێگای کوشتنی هابیلی برای لەبەرچاو ئاسان و جوان کردو کوشتیو بەهۆی ئەو تاوانە گەورەوە کە کردی زیانبار بوو و دین و دنیای دۆڕاند.

خوای گەورە ئەم تاوانەو ئاستەکەی ڕون دەکاتەوەو دەفەرموێت :

﴿مَن قَتَلَ نَفْسًۢا بِغَيْرِ نَفْسٍ أَوْ فَسَادٍ فِى ٱلْأَرْضِ فَكَأَنَّمَا قَتَلَ ٱلنَّاسَ جَمِيعًا وَمَنْ أَحْيَاهَا فَكَأَنَّمَآ أَحْيَا ٱلنَّاسَ جَمِيعًا ۚ وَلَقَدْ جَآءَتْهُمْ رُسُلُنَا بِٱلْبَيِّنَٰتِ ثُمَّ إِنَّ كَثِيرًا مِّنْهُم بَعْدَ ذَٰلِكَ فِى ٱلْأَرْضِ لَمُسْرِفُونَ ﴾[2]

---

١- المائدة: ٣٠

٢- المائدة: ٣٢

واتە: هەرکەس نەفسێ بکوژێ بێئەوەی قیصاصی لەسەر بێ یا خراپەی لە سەرزەوی کردبێ یا شەریکی بۆخودا قەرار دابێ یا ڕێگری کردبێ لە خەڵك و خەریکی ڕاووڕووت بووبێ، ئەوە بکوژەکە وەك ئەوەیە هەرچی بنیادەمە هەمووی کوشتبێ. هەرکەسیش یەکێ ڕزگار بکات لە مردن، بە هەوڵ بۆدان یا یارمەتی یا هەر هۆیێکی ڕەوای تر، ئەوە وەك ئەوە وایە هەمووی ڕزگار کردبێ. پاش ئەوەی ئەم حوکمە توندەمان ڕاگەیاند پێغەمبەران لەلایەن ئێمەوە چوونە سەریان و ئایەت و موعجیزەیان پیشان دان و حوکمی خودایان بۆ دووپات کردنەوە، لەگەڵ ئەوەیشدا زۆرێ لەوان زیادەڕەوییان کرد لەسەر زەوی و دەستیان لە پیاوکوژی هەڵنەگرت.

لەگەڵ ئەوەشدا یەك کەسی کوشت ئەگەر کاری بۆ ئاسان بکرایە هەموو خەڵکیی دەکوشت. ئەگەر خۆی بەسوك و نزم هاتە بەرچاو بەو جۆرەش سەیری هەموو مرۆڤایەتی دەکات.

تۆش کاتێك ستەم لەیەکێك دەکەیت ستەم لەهەموو مرۆڤایەتی دەکەیت کەخوای گەورە بەدیهێناوە. کاتێك مرۆڤێك کەسێکی وەك خۆی فریو دەدات یاخود کەسێك ستەم لەکەسێکی تر دەکات بە پێنووسێك یا بە بڵاوکردنەوەی قسە لەسەری، ئەمە خوای گەورە پێی ڕازی نابێت.

ئافرەتێك بەهۆی پشیلەیەکەوە خرایە ئاگرەوە ئەی ئەگەر ئەو تاوانە کوشتنی مرۆڤێك بێت، دیارە ئەوانە بۆ هەمیشە لە ئاگردا دەمێننەوە، لەبەرئەوە کەسی بکوژ هەرگیز تەوبەکردنی بۆ نیە مەگەر ڕەحمی خوا نەبێت کۆمەکی بکات.

زیادەیەك بخەرە سەر ئەم کوشتنە ئەویش کوشتنی ویژدانی (معنوي)یە، بەو مانایەی ئەگەر پیاوێك ژیان لە خێزانەکەی بەجۆرێك تاڵ بکات کە ئیتر لەژیانی خۆی بێزار بێت، ئەمە جۆرێکە لە کوشتن. پیاوێك بەرپرسە لە

دەزگایەکدا ستەم لە پیاوێك دەکات کە جگە لەخوا هیچ پشتیوانێکی نیەو ژیانی لێ تەنگ و تاریك بکات. یاخود کەسێك بڕیاری زیندانیی کردنی کەسێکی تری بەدەست بێت فەرمانی ستەمکارانەی بەسەردا بدات و بەو شێوەیە.

ئەمە بەسوك تەماشاکردنی خوێنی کەسێکە کەخوا کردویەتی بەجێنشینی خۆی لەسەر زەویدا. ئیتر چۆن ڕێزی نەگرم، ئەگەر ڕێزم گرت ئەوا ڕێزی پێغەمبەری خۆشەویستم گرتووە خوای گەورە ڕێزی لە ئادەمیزاد گرتووە بۆ جێنشینیەتی، هەڵەکردن لە لێبوردندا چاکترە لە هەڵەکردن لە سزادانێکدا. زۆر بوونی پۆلیس، بۆ نموونە لە هەندێك وڵاتدا دەبینیت ژمارەی پۆلیس لە ژمارەی دانیشتوانەکەی زیاترە، ئەمەش کارەساتێکە، بوونی پۆلیسی زۆر واتە: ئاسایش لەو سەردەمەدا پتەو نیە. کاتێك حەزرەتی عومەر لەجێشینی ئەبوبەکردا قەزاوەت و دادوەریی گرتە دەست، ئەوە بوو هەردوو دەستی نایە ژێر ڕوومەتیو پاشان هات هەتا بەزمانی سەردەم دەست لەکار بکێشێتەوە فەرمووی: ئەی جێنشینی پێغەمبەری خوا لێم وەرگرە! لەبەرچی منت لەناو خەڵکیدا کردۆتە دادوەر هەریەکەو ئەرکی خۆی دەزانێت و بەجوانی بەجێی دەگەیەنێت و کەم وکوڕی تیاناکات، لەبەرئەوە دەست لەکار کێشانەوەکەم لێ وەربگرە سبحان الله! دەبێت کارەکان لەنێو وڵاتانی ئیسلامیدا بەم شێوەیە بێت.

ئەگەر باوەڕ لەدڵی خەڵکیدا جێگیر بوو ئەوا دادوەر دەحەوێتەوە پارێزەر دەحەوێتەوە دادگاکان لەگرفت ڕزگاریان دەبێت و هەموومان دەحەوێینەوە، کەواتە چەندێك ژمارەی پۆلیس زیاد بێت، چەندێك شایەتی دانی درۆ زیاد بکات! ئەوەندە کارەساتەکان گەورەتر دەبن. زۆربوونی پارێزەرەکان لە هەندێکیاندا چاکە، بەڵام لە هەندێکیشیاندا بەو جۆرە نین.

– پچڕانی پەیوەندی خزمایەتی: پێشتر لە فەرمایشتەکەدا ڕوونمان کردەوە.

(نشء يتخذون القرآن مزامير): گەنجانێکی تازە پێگەیشتوو پەیدا دەبن قورئان بەئاوازەوە دەخوێنن، گوایە پێغەمبەر ﷺ بەو جۆرە خوێندویەتیەوە، نابێ خوێندنەوەی قورئان تەنها بە بیستن وە یا بە ئیجتیهاد وەربگرین، بەڵکو پێویستی بە زنجیرەیەك سەنەد هەیە، بۆ نموونە دەڵێین: فلانە کەس لەفیسارە کەسەوە ئەویش لەفلانی ترەوە ئەمیش لەفلانێکی ترەوە ئەویش لەپێغەمبەری خواوە لەبەر ئەوە دەوترێت: لە (حەفص)ەوە ئەویش لەعاصمەوە، دەبێت بەم شێوە بێت.

ئەوەی بەبێ بوونی سەنەدەکان قورئان دەخوێنێتەوە هیچ بنەمایەکی ڕاستی تێدا نیە، کەسانێك هەن قورئان وەك خەڵکی عاشق و ئارەزووبازەکان دەخوێننەوە ئەمە دروست نیەو ئەو کەسە لۆمەکراوە.

چی تر لەنیشانەکانی ڕۆژی دوایی، عەدی کوڕی حاتەم باوکی بەخشندەترین کەسی عەرەب بوو سەتانەی خوشکی بەدیل گیرا هاتە خزمەت پێغەمبەری خواو چەند وتەیەکی ئەدەبی زۆر جوانی وت: ئەی محەمەد من کچی بەخشندەترین پیاوی ناو عەرەبم، پیاوێك بوو دەستگیرۆیی هەژارانی دەکرد ڕێزی میوانی دەگرت من (سەتانەی کچی حاتەمی طائی)م، وەڵامی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوە بوو فەرمووی: ئازادی بکەن باوکی ئەم کچە تەواوکاری ڕەوشتە باڵاکان بوو، (منیش بۆئەوە نێردراوم کە تەواوکەری ڕەوشتە باڵاکان بم)، سوێند بەخوا ئەی بەندەی خوا ئەگەر باوکت موسوڵمان بوایە ئەوە بەزەییمان پیادا دەهاتەوە. ئەوە بوو خێرا ڕۆشت بۆلای عەدی، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی بەڕشتنی خوێنی ئەم پیاوە کرد بوو، سەیرکە باوکیانی بەکەم تەماشا نەکرد لەبەر کافربوونی منداڵەکانی و موسوڵمان نەبوونیان.

پێغەمبەر ﷺ بۆ ئەوە نێردرا بوو کە ئاسانکارو مژدەدەر بێت دیارە خوڕەوشتی شایستەی ئەوەبوو بکرێتە پەیام و بەرنامەی ژیان.

گەڕایەوە بۆلای عەدی هەتا پەنای بدات ئەبوبەکر عەدی هێنا، پێغەمبەریش ﷺ بەخێرهاتنی کردو عەباکەی سەرشانی پێ بەخشی هەتا لەسەری دابنیشێ ئەوەبوو موسوڵمان بوونی خۆی ڕاگەیاند، ئینجا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: عەدی حیرەت بینیوە؟ وتی: بیستومە بەڵام نەمبینیوە.

مەدینە لەکوێیە و حیرە لەکوێیە؟ مەدینە بە عەرەبە دەشتەکیەکان و دووڕو و جولەکە دەورە دراوەو پایتەختی ئیسلامە، لەوکاتەدا لەسەر نەخشە هیچ بایەخێکی نەبوو، لەو سەردەمەدا کیسرا عەرەبی بەکۆمەڵێکی دواکەوتووی بێ ناو نیشان دەزانی بەو شێوەیە دەژیان، پاشان بە هاوەڵانی فەرموو: هەریەکەتان (١٠) دینارتان پێدەدەم و بگەڕێنەوە ئەو شوێنەی لێوەی هاتوون ئەمەی بە (ئیبن عامر) وت. روبعی لەژێرەوە تەماشای دەکردن، روبعی کوڕی عامر لە هەژارەکانی مەدینە بوو، سەعد بەسەرۆکایەتی وەفدێك بۆ دانوستان لەدوای فتوحات ناردی، لەگەڵ (١٢) هاوەڵی تردا ڕوبعی بەجلەکەی بەریەوە کەدوو پینەی پێوەبوو بەشمشێرەکەی دەستیەوە وەستابوو، سەربازەکانی کیسرا ویستیان شمشێرەکەی لێ بسێنن، وتی: شمشێرەکەم دانانێم.

سەیرکە باڵیۆزی ئیسلام چی فەرموو.. ئەم هەڵوێستە باڵایەی بوو شایستەی کرد ببێتە جێنیشین، وتی: ئەی پادشا: خوای گەورە ئێمەی نارد هەتا بەندەکانی خوا لە بەندایەتی کردنی بەندەکانەوە بەرین بۆ بەندایەتی کردنی خوای بەندەکان، هاتوین ئەو خەڵکە لە زۆرو ستەمی دینەکانی ترەوە بێنین بۆ دادپەروەری ئیسلام هاتوین خەڵکیی لە تەنگەبەری دنیاوە بەرین بۆ بەرفراوانی ڕۆژی دوایی، ئەی پادشا سێ خاڵ لە نێوانماندایە، یان بێیتە ناو ئیسلامەوە، یان سەرانە بدەیت، یان ئێمەو ئێوەو مەیدانی جەنگ، کیسرا بەم قسانە کەوتە لەرزین لەبەرئەوەی حەق خاوەنی دەسەڵاتی خۆیەتی.

له جه‌نگی یه‌رموکدا ڕۆسته‌می سه‌رکرده‌ی سوپاکه‌ی کیسرا به خالیدی کوڕی وه‌لیدی وت: خالید ڕاسته ده‌ڵێن: خوای گه‌وره له ئاسمانه‌وه شمشێرێکی دابه‌زاندووه‌و داویه‌تی به تۆو تۆش لێت وه‌رگرتووه، ده‌ڵێن ڕۆشتیته هه‌ر جه‌نگێکه‌وه هه‌ر سه‌رکه‌وتوو بوویت؟ خالید وتی: نه‌خێر ئێمه له‌به‌رئه‌وه سه‌رکه‌وتوو ده‌بین باوه‌ڕمان به‌خوا هێناوه‌و ئێوه‌ش پشتان تێ کردووه. سبحان الله ده‌یتوانی بڵێت به‌ڵێ.

ده‌گه‌ڕێینه‌وه سه‌ر به‌سه‌رهاته‌که‌ی عه‌دی کوڕی حاته‌می طائی پێغه‌مبه‌ر ﷺ پێی فه‌رموو: خوای گه‌وره ئه‌م دینه ده‌گه‌یه‌نێت هه‌تا ئافره‌ت له‌حیره‌وه دێته ده‌ره‌وه بۆ مه‌ککه‌و طه‌وافی ماڵی خوا ده‌کات له‌که‌س ناترسێت و له‌په‌نای که‌سیشدا نابێت، خوای گه‌وره گه‌نجینه‌کانی کیسرای کوڕی هورمز ده‌کاته‌وه: وتی یا رسول الله کیسرای کوڕی هورمز؟ فه‌رمووی: به‌ڵێ کیسرای کوڕی هورمز پاشان فه‌رمووی ئه‌وه‌نده پاره زۆر ده‌بێت که‌س وه‌ری ناگرێت....

ئه‌مه فه‌رمایشتی پێغه‌مبه‌ری خوا بوو ﷺ ئه‌ی وه‌ڵامی عه‌دی کوڕی حاته‌می طائی چی بوو، عه‌دی وتی: له‌دوای کۆچی دوایی پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ بۆ لای په‌روه‌ردگاری له‌ژیاندا بووم به‌چاوی خۆم بینیم ئافره‌ت له‌حیره‌وه به‌ته‌نهاو بێ ترس ده‌ڕۆی بۆ (أم القرى) بێ ئه‌وه‌ی له‌په‌نای که‌سیشدا بێت. ئێستا ئاسایش به‌رقه‌رار بووه، پاشان وتی: له‌گه‌ڵ (سه‌عد)دا به‌شداری به‌ده‌ست هێنانی گه‌نجینه‌کانی کیسرای کوڕی هورمزم کرد، به‌ڵام سێیه‌مم هێشتا نه‌بینیوه به‌ڵام هه‌ر ده‌بێ سێیه‌میش ببینم چونکه پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ فه‌رمویه‌تی: ئه‌ویش زیاد بوونی پاره بوو به‌جۆرێك که‌س نه‌یه‌وێت، ئه‌وه له‌دوای (٦٠) ساڵ له کۆچی دوایی پێغه‌مبه‌ر ﷺ و له‌سه‌رده‌می حه‌زره‌تی عومه‌ری کوڕی عه‌بدولعه‌زیزدا ڕوویدا که فه‌رمووی: چۆن له‌ماڵی زه‌کات دابه‌ش نه‌که‌م؟ سه‌رۆکی ئه‌میندارى

گشتی گەنجینەکان وتی: ئەی پێشەوای باوەڕداران دادپەروەریت هەموو خەڵکی دەوڵەمەند کردووە.

ئەمە بانگەوازی بەڕائی کوڕی عازبە کاتێك سەعد پـێی وت: نزامـان بۆ بکـە خوای گەورە ئەمڕۆ مەدائینمان بۆ ڕزگار بکات چونکە پێغەمبەر ﷺ فـەرمووی: (لەوانەیە کەسێکی تەپ و تۆزاوی و قژ ئاڵۆزکاو ئەگەر سوێند بەخوا بخوات خوای گەورە بۆی جێبەجێ بکات) بۆیە سەعد هەر نزاو داوایەکی لە خوا بکردایە خوای گەورە بۆی جێبەجێ دەکرد بەڵام بە ئەدەبەوە، ئەی (بەراء) سوێند بەخوا بخۆ.

ئەوەبوو دوو ڕکات نوێژی کردو وتی: (خوایە سوێند دەخۆم بەگەورەیی و دەسەڵاتت خۆرئاوابوون نەیەت لەسەرماندا ئێمە لە مەدائن بین) واتە: دوا ساتی ئاوابوونی خۆر لەدەم کەلەوە بانگخوێن مزگەوت بکوژێنێتەوە، الله أكبر خوای گەورە بەندەیەکی هەیە ئەگەر ویستیان ئەویش ویستی وا دەبێت.

## نەمانی پیاوەتی (مەردایەتی) ....!!!

یەکێکی تر لەنیشانەکانی بەرپابوونی ڕۆژی دوایی بەدڕەوشتیە بە بەرچاوی خەڵکیەوە لەسەرە ڕێگاکاندا و کەسیش ڕێگری ناکات، ئێستاو لەم سەردەمەی خۆماندا ئەم دیمەنانە لەسەرە ڕێگاکان و سەر شاشەی تەلەفزیۆنەکاندا دەبینین و هاتۆتە نێو ماڵەکانمان بێ ئەوەی هیچ بڵێین.

سەیرکە چی بە ئەندێشەی حەزرەتی عەلی دا تێپەڕ دەبێت کاتێك سیواکێك لەدەمی خاتوو فاطمەی خێزانیدا دەبێت.

| | |
|---|---|
| هُنِّئْتَ يا عود الأراك بثغرها | ما خفت مني يا أراك أراكا |
| لو كان غيرك يا أراك قتلته | ما فاز مني يا سواكُ سواكا |

هەستی بەغیرە دەکرد بەهۆی ئەو سیواکەوە ئەو جۆرە غیرەیە رەوشتێکی سروشتیە، لەخوای گەورە داواکارین ئەو پیاوەتیە دروستە بگەڕێتەوە ناومان.

سەعدی کوڕی مەعاذ (رەزای خوای لێ بێ) پیاوێك بوو غیرەی زۆر بوو، پێغەمبەر ﷺ بە هاوەڵەکانی فەرموو: سەرتان لەغیرەو پیاوەتی سەعد سوڕماوە سەعد پیاوێکی بەغیرەیە منیش غیرەی پێ دەبەم خوای گەورەش لەمن بەغیرەترە بۆیە لەبەر غیرەی خوایە کە بەدڕەوشتی ئاشکراو پەنهانی حەرام کردووە.

## ڕازاندنەوەی مزگەوتەکان:

**هەروەها یەکێکی تر لە نیشانەکانی ڕۆژی دوایی:** ئەگەر مزگەوتەکانتان ڕازاندەوە کە لە ڕۆژگاری ئەمڕۆدا زۆر بووە وە قورئانەکانتان نەخشاند واتە گرنگی دان بەڕوکەشەکان.

ئەگەر حەزرەتی عومەر کەسێکی ڕاسپاردایە بۆ بنیاتنانی مزگەوتێك پێی دەفەرموو: من نامەوێت مزگەوتەکان بە نەخش و نیگارو ڕەنگی جۆراو جۆرو زێڕ برازێنرێتەوە چونکە خەڵکی سەرقاڵ و بێ ئاگا دەکات لەو مەبەستەی بۆی هاتووە.

مزگەوتەکەی پێغەمبەری خوا ڕایەخەکەی لم و خۆڵ بوو کۆڵەکەکانی لقی دارخورما بوو، سەربانەکەشی گەڵای خورما بوو.

هاوەڵان خاوەن پارە بوون بەڵام ئەوان دڵەکانیان بنیات دەنا نەك نەخش و نیگارو ڕوکەش. دانایی ئەو شتەیە کە لە باوەڕدار ونە، وەریبگرە ئەگەر لە ناموسوڵمانیشەوە بێت. هەندێك لەمەسیحیەکان دەڵێن: گرنگ نیە کەنیسە لەزێڕ دروستکرا بێت و قەشەکانی نێوی لە دار بەڵکو گرنگ ئەوەیە کەنیسە لە دار دروست کرابێت و قەشەکان لە زێڕ.

قورئانەکانتان بەجۆرێك دەڕازێننەوە کە لە زێر ڕێژکرا بێت. نەخش و نیگاری جوانی لەسەر بێت و لەسەرخانەی کتێبخانەکان دانرا بێت، پێغەمبەر ﷺ قورئانی وەك کۆمەڵە ئامۆژگارییەك بۆ جێهێشتوین. بەڵام ئێمە ڕازاندمانەوەو زێر ڕێژمان کردو دواتر وازمان لێهێنا، چی بە پێغەمبەر ﷺ بڵێین ئەو کاتێك قورئانەکەی دەگرت بەدەستییەوە دەگریاو دەیفەرموو: جیهادو تێکۆشان لەڕێی خوادا بەخۆیانەوە سەرقاڵ کردم و فریایی تۆ نەکەوتم، ئەی ئێمە چی سەرقاڵی کردوین؟ ئێمە ئوممەتێکین هەردەبێت جارێکی تر بگەڕێینەوە لای دینەکەمان، دەبێت زانایان دابنیشن لێکۆڵینەوەی ورد بکەن لەسەر ئەو هەموو تێکشکانە گەورانەی دووچاری هاتین هەتا بەئاگابێینەوە.

(ئەگەر مزگەوتەکانتان پڕ لەنەخش و نیگار کردو قورئانەکانیشتان ڕازاندەوە ئەوا وێرانبوون بەشتان دەبێت) ئەمە نوقڵانەیەکی شومە، وێرانەو تیاچون؟ ئایا چی لەمە زیاتر تیاچونە کە دڵەکان تیاچون؟ با لەجیاتی ئەوەی لاپەڕەکانی قورئان زێر ڕێژ بکەین با لە دڵەکانماندا بە تەواوی لەبەری بکەین.

## دووڕوویی زمانەکان و درۆی دڵەکان:

**یەکێکی تر لە نیشانەکان:** (ئەگەر خەڵکی زانستیان نیشان دراو کاریان بەکردەوە پێ نەکرد وە بەزمانەکان خۆشەویستیان دەربڕی و بە دڵەکان ڕق و کینەیان هەڵگرت بوو، پەیوەندی خزمایەتیان پچڕاند ئەوا خوای گەورە نەفرینییان لێ دەکات و چاویان کوێر دەکات و گوێیان کەڕ دەکات).

واتە: ئەو خەڵکە قسەی جوان دەزانن بەڵام کاری پێناکەن بە زمان یەکیان خۆش دەوێت بەڵام دڵیان پڕ لەڕق و کینەیە، تۆ دەزانیت کە دەبرینی زەردەخەنەیەك لە بەرانبەر براکەتدا وەك چاکەیەك وایە، خەڵکی لە مامەڵەکردنیاندا دبلۆماسیانە ڕەفتار دەکەن، زمانەکان لە هەنگوین شیرینترن

بەڵام دڵەکانیان لە ئارام گرتن تاڵترن، ئەمەش نیشانەی دووڕوویییە لە بەرانبەر مامەڵەکردن لەگەڵ خەڵکیدا، قورئان دەفەرموێت:

﴿ٱدۡفَعۡ بِٱلَّتِي هِيَ أَحۡسَنُ فَإِذَا ٱلَّذِي بَيۡنَكَ وَبَيۡنَهُۥ عَدَٰوَةٞ كَأَنَّهُۥ وَلِيٌّ حَمِيمٞ﴾[1] واتە: تۆیش چاری کردەوەی خراپ بە کردەوەی چاك بکە لە بەرانبەری کردەوە خراپەکەی خراپەکەردا. کە وات کرد ئەبینی ئەو کەسەی دوژمنایەتی لە نێوان تۆو ئەوا هەیە وەك دۆستێکی گەرم وایە بۆت لە خۆشەویستیدا.

## ڕۆژی دوایی بەسەر خەڵکانی خراپدا بەرپا دەبێت!

سێ نیشانە لەنیشانەکانی بەرپابوونی ڕۆژی دوایی ئەوەیە کە ئەو بەرپرسانەی کە سەرۆکاری دەزگاکانی دەوڵەت یاخود شارو دەوڵەتانی ئیسلامی دەکەن خەڵکێکی خراپ دەبن.

کارەکان خراپ دەکرێن دوای ئەوەی بەدەست خەڵکێکی چاکەوە بوو، دەیدەن بەدەست ئافرەتانەوەو پیاوان بەدوور دەگرن، پارەو سامان دوای ئەوەی بەدەست خەڵکی بەخشندەو چاکەوە بوو دەکەوێتە دەستی خەڵکی ڕژدو خراپەکارەوە.

هەروەها: قیامەت بەرپا نابێت هەتا یەك کەس لەزەویدا مابێت بڵێت الله الله. وەکو ئەوەی خێرو چاکە بەتەواوی ون و شاردرابێتەوە، موسوڵمانێك نامێنێ، موسوڵمانی ڕاستەقینە ئەو کەسەیە کە دینی خوا جێبەجێ دەکات کاتێك پێغەمبەرﷺ چاوی پێی کەوت ڕوخساری ڕۆشنتر ببێتەوە چونکە ئەو بەبینینی هاوەڵانی خۆشحاڵ دەبێت.

ئیتر ئەوە دەپێچرێتەوە هەتا بەتەواوی زیکرو یادی خوا لەسەر زمانەکان نامێنێت..!! کەواتە یادی چی دەکرێت؟ یادو باسی دنیا دەکرێت وەکو ئەوەی

---

١- فصلت: ٣٤

موسوڵمان بەموسوڵمانی دروست نەکرابێت یان هەر لە ڕووی نایەت و شەرم دەکات ئیسلامەکەی بۆ خەڵکیی دەربخات؟ لەبەرئەوە دەزانێت ئەگەر ئیسلامەکەی دەرخست لەوانەیە خەڵکی فشار بخەنە سەری ئەو کاتە باوەڕەکەی لاواز دەبێت و دڵنیاییەکەی نامێنێت ئیتر زۆر دوور خۆی دەپێچێتەوەو دێتەوەیەك.

ئەوە ئەو حاڵەتەیە کە پێغەمبەر ﷺ دەربارەی فەرموویەتی: (باوەڕداری بەهێز چاکترو خۆشەویسترە لای خوا لە باوەڕدارێکی لاواز)[1].

کاتێك خاتوو عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێ) کۆمەڵە گەنجێکی بینی بەخاوی و تەمەڵییەوە بەڕێگادا دەڕۆشتن، فەرمووی ئەوانە کێن؟!! وتیان: ئەی دایکی باوەڕداران ئەوانە خواپەرستەکانن، فەرمووی: سەیرە ڕەحمەتی خوا لە حەزرەتی عومەر! ئەگەر بڕۆشتایە خێراتر بوو، ئەگەر قسەی بکردایە گوێشی دەگرت، ئەگەر لە کەسێکیشی بدایە ئازاری پێ دەگەیاند، بەڕاستی ئەو خواپەرست بوو.

ڕۆژێك حەزرەتی عومەر(ڕەزای خوای لێ بێ) گەنجێکی بینی بە تەمەڵی و خاویەوە بەڕێگادا دەڕۆشت بەو پارچە قامچییەی بەدەستیەوە بوو پاڵێکی پێوەناو فەرمووی خێرا بڕۆ بەڕێگادا ملکەچیی لەدڵدایە، ڕۆژگارێك لەم ئوممەتە دێتە پێشەوە لەسەر زەوی‌دا کەسێك نامێنێتەوە بڵێت الله الله.

ئەم ئوممەتە لەم حاڵەتە چی دەست دەکەوێت جگە لە خەسارەتمەندی.

چی تر، ڕۆژی دوایی بەرپا نابێت هەتا خاکی عەرەب بە باخ و باخات سەوز هەڵدەگەڕێت، لەڕووی زانستی جیۆلۆجییەوە سەلمێنراوە کە زانستی زەوی ناسییە دەڵێت: خاکی عەرەبی سەوزایی بووە، پێش ئەوەی وشك و زەرد بێت،

---

١- رواه مسلم.

دیاره خاکی عەرەب تەنها سعودیه نیه بەڵکو خاکی عەرەبی زۆربەی وڵاتەکانی دەگرێتەوەو خاکەکەیان بیابانە، ئەوەتا لەم چەند ساڵانەی دوایدا سەوزایی جیهانی بیابانی داپۆشیوە، عەرەبیش هەروایە.

## چەند حیزبێکی پەرتەوازە:

چەند نیشانەیەکی تر: ئوممەت دەبێت بە حەفتاو سێ تاقم و کۆمەڵەوە هەموویان لەئاگردان تەنها یەکێك نەبێت وتیان: یارسول الله تەنها یەکێك؟ فەرمووی: (ئەوە کە من و هاوەڵانمی لەسەرە)[1].

ئەو پرۆگرامەی کە پێغەمبەر ﷺ بۆی بەجێهێشتوین خۆی لەهاوەڵاندا دەبینێتەوە، ئەوە ئیسلامە، ئیتر جگە لەمە هەمووی شوێن کەوتنی ئارەزووە، دیارە ئەوەش شوێن ئارەزووەکانی بکەوێت خوای گەورە گومڕای دەکات، ئاسەواری شوێن کەوتنی ئارەزووەکان کەڕ بوون وکوێر بوونە، ئەوەتا دەبینین کەسی ئارەزوو پەرست هەرگیز حەق وەرناگرێت چونکە بونیادی خۆی لەسەر ناڕەوایی دامەزراندووە ئەگەر هەموو زانایانی ئوممەت کۆببنەوە لەسەر ئەوەی ڕێگری لێ بکەن، وەری ناگرێت، دەبێت بەپێی قورئان و سونەت کار بکات، دەبێت ئارەزووەکانی شوێنکەوتەی ئەو فەرمایشتانە بێت کە پێغەمبەر ﷺ بۆی دیاری کردووە لەگەڵ گوێڕایەڵی بۆ ئیسلام.

پێغەمبەر ﷺ لەسەر ڕێگەیەکی سپی جێی هێشتوین، شەوی وەکو ڕۆژ وایە تەنها ئەوانە لێی دادەبڕێن کە تیاچوون.

دوای ئەوە ئەبو حەنیفە(ڕەزای خوای لێ بێ) کتێبێکی دەربارەی (فقه) نوسی پێیان وت: ئەی ئەباحەنیفە ئەمە ئەو حەقەیە کەناڕەوای تێدا نیە؟ فەرمووی: لەوانەیە ئەو ناڕەوایە بێت کە ڕەوایی لەگەڵدا نییە! فتوای دەداو دەیفەرموو:

---

١- سنن الترمذي.

ئەمە ئەو ڕایەیە کە بەڕاستی دەبینم ئەگەری هەڵەبوونیشی هەیە، ڕاکانی جگە لەخۆیشم بەهەڵەی دەزانم و ئەگەری ڕاستیشیان تێدایە ئەوەی ڕای وەك ئێمە نەبێت ئەوا ئەوە ڕای خۆیەتی و ئێمەش ڕای خۆمان.

## فرۆشتنی هەرزان بەها:

لە نیشانەکانی بەرپابوونی ڕۆژی دوایی کێبەرکێکردنی خەڵك لەسەر پێشەوایەتی، کەسیشیان دەست ناکەوێت پێشەوایەتیان بکات پاڵ بەیەکترییەوە دەنێن و دەیانەوێت یەکێکیان پێشکەوێت بەڵام هەریەکەیان بەهەر بیانویەك بێت ناچێتە پێشەوە.

و چی تر (کاتێك دین دەفرۆشن بۆ دنیا) ئوممەتان دین دەفرۆشن بۆ دنیا، ئەمە ئەو سوخۆرییە نیە وەکو سەرانیان لەوەو پێش دەیان وت، خوای گەورە لە زمانی ئەوانەوە دەفەرموێت: ﴿إِنَّمَا ٱلۡبَيۡعُ مِثۡلُ ٱلرِّبَوٰاْ﴾[1] واتە: موعامەلەی بێسوود وەك موعامەلەی سووددارەو فەرقیان نییە.

سەیری بوێرییان بکەن لە بەرامبەر خوادا سویان کردوەتە ئەصڵ!!
لەکاتێکدا خوای گەورە کڕین و فرۆشتنی حەڵاڵ کردووەو سوخواردنی حەرام کردووە، دیارە ناوبردنی شتەکان بەدوور لە ناوەکانی خۆیان تاوانە.

هەروەها هەر لە میانەی نیشانەکانی ڕۆژی دواییدا تەڵاق دان زۆر دەبێت! ئەمە چ پەیوەندیەکی هەیە بە بەرپابونی ڕۆژی دواییەوە؟! لەبەرئەوەی کۆمەڵگا بەهۆی تەڵاقەوە لەبەریەك هەڵدەوەشێت، دیارە ئەوەی ئێستا دەیبینین بەڵگەیە لەسەر نەبوونی پێکەوە ژیان و خۆشەویستی، خێزانەکان دوورن لە دینداری و لەسەر بنەمای دین پێك نەهاتوون، ئەوەتا دەبینی ڕێژەی تەڵاق لە وڵاتانی ئیسلامیدا بەرزبۆتەوە بۆ ٣٦٪ لەهەر (٤٠) حاڵەتی

---

١- البقرة: ٢٧٥

هاوسەرداریدا یەك ئافرەت تەلاق دەدرێت. بەڵام ئێستا ئەو ڕێژەیە بەرز بۆتەوە بۆ لە ٥٠٪ ئەمەش بەڵگەیە لەسەر نەبوونی تێگەیشتن و ڕێزنەگرتن لە مافەکانی یەکتر لە ژیانی هاوسەریدا.

هەروەها لە نیشانەکانی ڕۆژی قیامەت مردنی لەناکاوە. قورئان دەفەرموێت:
﴿فَإِذَا جَآءَ أَجَلُهُمْ لَا يَسْتَأْخِرُونَ سَاعَةً وَلَا يَسْتَقْدِمُونَ﴾[1]

واتە: بۆ هەموو ئوممەتێ ماوەیێکی تایبەتی دانراوە، کە ماوەکەیان تەواو بوو و ڕۆژیان هات نە سەعاتێ دوائەخرێن و نە سەعاتێ پێش ئەخرێن.

هەروەها لەنیشانەکانی ڕۆژی دوایی زۆربوونی ڕوداوە سروشتیەکانی وەك بومەلەرزەو بورکان و ئەو بەڵایانەی کە ئێستا ڕوودەدەن.

## درێژبوونی بڵندگۆکان:

سەرەتا بڵندگۆکەی پێغەمبەری خوا ﷺ دارخورمایەك بوو، پاشان فەرموی: بڵندگۆیەکم بۆ دروست بکەن، کاتێك بۆیان دروست کرد پێغەمبەری خوا ﷺ بەسەریدا سەرکەوت، بڵندگۆی دارخورماکە بەجۆرێك ئازاری پێگەیشت ئەوەی لەو مزگەوتەدا بوو گوێی لەگریان و هەنسکی ئەو بڵندگۆ دارخورمایە بوو پاش هاتنەخوارەوەی پێغەمبەر ﷺ، پاشان فەرمووی: ئەو لقە دارە بخەنە ژێرسەربانی مزگەوتەکە نەبادا خۆڵ دایبپۆشێ چونکە زۆر خزمەتی کردین، ئەمەش جۆرێك بوو لەوەفاداری پێغەمبەر ﷺ بۆ دارێك.

ئەگەر حەزرەتی عەلی(رەزای خوای لێ بێ) سێ پلە بەسەر بڵندگۆکەدا سەربکەوتایە ئەوکاتە ڕوخسارو دەست جوڵاندن و شێوە نیگای دەم و چاوی دەردەکەوت، بەڵام ئەوکاتەی بڵندگۆکان بەرزکرانەوە ئیتر خەڵکی لێیان دابڕاو ئەو پێکگەیشتنە تەواو بوو دڵەکان بەرەو داڕمان چوون، ئەگەر دڵەکان بوونە

---

١- الأعراف: ٣٤

وێرانە ئەوا ئیمانیش دەبێتە هەڵم بەجۆرێك دڵ ڕق و کینەو ئێرەیی بردن وێرانی دەکەن و سنورەکانی خوا پەکیان دەکەوێت، دیارە سنوری خوا قورئانی پیرۆزە، داوێن پیسی و دزی و ناو زڕاندن و تۆمەت خستنە پاڵ ئافرەت و لەکەدارکردنی، پەکخستنی سنورەکانی پەروەدگار مایەی نەگبەتین بۆ خەڵکی، چونکە سنورەکانی خوای گەورە کۆمەڵگە بەرەو چاکسازی دەبات ئەگەر یەك سنور لەسنورەکان لەنێو کۆمەڵگادا جێبەجێ بکرێت باشترە بۆیان لەوەی (٧٠) پایز بارانیان بۆ ببارێت.

## گۆڕینی دروستکراوەکانی خوای گەورە:

– سەبارەت بە خۆشوبهاندنی پیاوان بە ژنان و ژنان بە پیاوان، پێغەمبەر ﷺ لە فەرمایشتێکدا دەفەرموێت: (خوا نەفرەتی کردووە لەو ئافرەتانەی کە خۆیان بە پیاو دەشوبهێنن، وە لەو پیاوانەش کە خۆیان بە ئافرەت دەشوبهێنن)[١].

– هەروەها لەفەرموودەیەکی دیکەدا دەفەرموێت: (خوا نەفرەتی کردووە لەوانەی کەخاڵ دەکوتن و لەوانەش کە خاڵەکەیان بۆ دەکوترێت، وە لەوانەش کە موو هەڵکێشی دەم و چاون و لەوانەش کە بۆیان هەڵدەکێشرێت، وە لەوانەش کە نێوانی دانەکانیان بڵاو دەکەنەوە بۆ جوانی و ئەوەی خوا دروستی کردووە دەستکاری دەکەن و دەیگۆڕن ...!)

خۆچواندنی ڕەگەزی نێرو مێ بەیەکتر لەنیشانەکانی ڕۆژی دواییە، دەرچوونی مرۆڤ لە سروشتی خۆی دنیا بەسەریەکدا تێك دەدات، حەزرەتی جوبرەئیل شوێنێکی ئاوەدانی سەرو ژێرکرد بەهۆی ئەوەی دانیشتوانەکەی

١- رواه أحمد.

لەفیطرەتی خۆیان دەرچوویوون. کەواتــە دەرچـونی مـرۆڤ لـە فیطـرەتـی خـۆی بەئاگا هێنانەوەیە بەتیاچونی گەردوون.

## شـایەتـی دانی درۆ:

یەکێکی تر لەنیشانەکان کەسێك شایەتی دەدات بۆ یەکێك بـێ ئـەوەی هـیچ زانینێکی هەبێت دەربارەی، یاخود ئـەو کەسـەیە کەشـایەتی دەدات لەبەرامبـەر کرێیەکـدا وەکــو ئەوانــەی لەبــەردەم دەروازەی دادگاکانــدا دەبیــنین ئــەوە شایەتیدانی درۆیە.

هــەروەها شــایەتی دانــی درۆ لــەزۆرێك لــە ماڵەکانمانــدا لــەکاتی کێشــە کۆمەڵایـەتی و خێزانیەکانـدا دەبیـنین هـەروەها گرفتـی ژن و مێـردو گرفتـەکانی تەڵاق. لەم باسانەشدا شـایەتی درۆ دەبیـنین. هـەروەها شـایەتی دانـی درۆ وەك ئەو باوکەی شایەتی ڕەوشت بەرزی و چاکی بۆ کوڕەکەی دەدات دەشزانێت کە مەی دەخواتەوەو نوێژیش ناکات کەچی بەفریشتە دەی چوێنێ یاخود شـایەتی دانی دایك بۆ کچەکەی کە ڕەوشت بەرزە لەکاتێکیشدا وانیە ئەوە شـایەتی دانـی درۆیە. خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿وَلَا يَجْرِمَنَّكُمْ شَنَآنُ قَوْمٍ عَلَىٰٓ أَلَّا تَعْدِلُوا۟ ۚ ٱعْدِلُوا۟ هُوَ أَقْرَبُ لِلتَّقْوَىٰ ﴾[1] واتە: ئەی ئەوانەی بەڕاستی باوەڕتـان بـە خـوداو بـە پێغەمبەر هەیە هەموو کات بە عادڵانەو دادپەروەرانە شایەتی بدەن و ڕاستگۆ بن لـەپێناوی ڕەزای خـودادا. یـا ڕق و قینتـان لـە کافرەکـان واتـان لێ نـەکات بـە ناڕاستیو ناعادڵانە بجوولێنەوە لەگەڵیان و دەسدرێژییان لێ بکـەن: دادپـەروەرو حەق گۆو حەق کردار بن. دادو ڕاستی نزیکترتان ئەکاتـەوە لـە گونـاه نـەکردن و لەخوداترسان.

---

١- المائدة: ٨

ئەگەر لە کەسێکی دووری دڵ لەکینەشەوە بێت حەق وەریگرە ڕقیشت لە ناڕەوایی بێت ئەگەر لە کەسی نزیکیشتەوە بێت ئەمە ڕێسای ئایینە.

پێغەمبەر ﷺ یەکجار تورە بووە ئەویش ئەوکاتە بوو کە حەزرەتی عەلی ویستی ژن بەسەر خاتوو فاطمەی کچی پێغەمبەر ﷺ دا بهێنێت، هۆکەشی ئەوەبوو هەرچەندە قورئان ڕێگری ناکات بەڵام ئەبووە مایەی تێکدانی بەختەوەری کچەکەی ئەوەبوو پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموی: (کچەکەم و کچەکەی دوژمنی خوا لە ژێرسەربانی یەك ماڵدا کۆمەکەرەوە) واتە: فاطمەی کچم لەگەڵ کچەکی ئەبولەهەبدا کۆمەکەرەوە کە دوژمنی خوایە ئەگەر لە ماڵێکی تردا دایبنێت هیچ زیانێکی نیە واتە: کارێکی سروشتیە ئەگەر حەرزەتی عەلی ئەو کچەی ئەبولەهەب بخوازێت.

ئەو ئافرەتە ناسکە پڕ لەهەستەوەرییە لەگەڵ ئەمەدا دانانیشێ ، پێغەمبەر ﷺ تورە نەبوو یاخود نەیفەرموو: یان ئەم بێت یان ئەو پێغەمبەر ﷺ سەراپای پڕبوو لەسۆزو خۆشەویستی نەیدەویست فاطمەی کچی بەو کارەی حەرزەتی عەلی تورە بێت چونکە ئەو کچە پێش ئەوەی موسوڵمان ببێت ئازاری پێغەمبەری خوای زۆر دابوو بەڵام ئەوەتا پێغەمبەر هەر پێغەمبەرەو لەهەموو کەسێك خۆش دەبێت.

لەوانەیە ئەگەر فاطمە ئەو ئافرەتە ببینێت شتێك لەخۆیدا هەڵگرێت بۆیە ئەوکاتە باری لەگەڵ حەزرەتی عەلی مێردیدا خراپتر دەبوو ئەوکات پێغەمبەریش ﷺ بەهۆی تورەبوونی خۆیەوە تورە ببوایە ئەوکاتە کێشەکە گەورەتر دەبوو.

ئەمە ئەو نیشانە بچوکانەن لەمەڕ بەرپابوونی قیامەت، ئەوکاتانەی ئەم نیشانانەی تێدا ڕوودەدات دەرگاکانی تەوبەکردن بۆ من و هەموو لایەکی تر کراوەن بەڵام ئەگەر نیشانە گەورەکان سەریان هەڵدا ئیتر ئەو دەرگایەش دادەخرێت.

## ئەمەش نیشانە بچوکەکانی ڕۆژی دواییە:

١- دەرکەوتنی محمدو بوونی بەپێغەمبەر ﷺ.

٢- دەرکەوتنی بەدرەوشتی و بڵاوکردنەوەیو و بانگەشەکردن بۆی.

٣- پچڕانی پەیوەندییەکانی خزمایەتی.

٤- خراپ بوونی دراوسێیەتی.

٥- کەسی ناپاك دەکرێتە ئەمینداروکەسی ئەمینداریش دەکرێتە ناپاك.

٦- بڕوا بەدرۆزن دەکرێت و ڕاستگۆ بەدرۆزن دەزانرێت.

٧- کاردانە دەستی کەسانێك کەشایستەی نین.

٨- کەسانێك قامچیان بەدەستەوەیە وەك کلکی مانگا وایەو خەڵکی پێ سزا دەدەن.

٩- بڵاوبوونەوەی ئافرەتانی پۆشتەی ڕووت.

١٠- خزمەت کردنی ئافرەتانی بێ باوەڕ لەلایەن ئافرەتانی موسوڵمانەوە.

١١- بۆیاخ کردنی قژی سەر بەڕەنگی ڕەش دوای سپیبوونی.

١٢- نەمانی بەرەکەت لەکاتدا.

١٣- مار قسە لەگەڵ مرۆڤدا دەکات.

١٤- تەرازوبازی.

١٥- ڕێگرتن لەزەکات دان.

١٦- هەڵوەشانەوەی پەیمانی خوا و پەیمانی پێغەمبەری ئازیز ﷺ.

١٧- حوکم نەکردن بەقورئانی پیرۆز.

١٨- وشك بوونی ڕووباری فورات و دەرکەوتنی گەنجینەیەکی زێڕ.

١٩- زۆربوونی قەرزو بڵاوبوونەوەی بەهەموو لایەکدا.

٢٠- شەهیدکردنی حەزرەتی عوسمانی کوڕی عەفان.

٢١- جەنگ لەگەڵ جولەکەدا.

٢٢- بڵاوبوونەوەی دوبەرەکی و فیتنە.

٢٣- زۆربوونی دەوڵەمەندی و کێبەرکێ کردن لەسەر دونیا.

٢٤- نەمانی کەسە ئەمیندارەکان.

٢٥- دارمانی ئەمانەت لە دڵەکاندا.

٢٦- بەرزبوونەوەی زانست.

٢٧- دەرکەوتنی نەفامی.

٢٨- بڵاوبوونەوەی داوێن  پیسی و مەی خۆری.

٢٩- مردنی زانایان.

٣٠- بڵاوبوونەوەی نەفامەکان.

٣١- هەڵوەشانەوەی پەیمانەکان.

٣٢- زۆربوونی خیانەت.

٣٣- خۆشبەختترین کەس لەدنیادا (ناپاکی کوڕی ناپاکە).

٣٤- زۆربوونی پیسی.

٣٥- دەرکەوتنی ئامێری مۆزیك.

٣٦- شوێنکەوتنی فەرمان و سونەتی خەڵکانێکی تر.

٣٧- ڕۆچون بە زەویدا.

٣٨- وێنەو ڕوخسار گۆڕین و شێواندن.

٣٩- زۆربوونی جنێودان.

٤٠- سەلام کردن تەنها بۆ ناسیاوەکان دەبێت.

٤١- ڕەقیی لەبازرگانیدا.

٤٢- شایەتیدانی درۆ.

٤٣- پچڕانی خزمایەتی.

٤٤- دەرکەوتنی خامەکان.

٤٥- فەرمان کردنی کچ بەسەر دایکدا.

٤٦- هەڵگەڕانەوەی تەرازووەکان.

٤٧- بەرزبوونەوەی باڵەخانەکان.

٤٨- فەرمان ڕەوایی کردن لەلایەن کەسانێکی کەم ژیرەوە.

٤٩-فرۆشتنی فەرمانڕەوایی.

٥٠- بەسوك سەیرکردنی کوشتن.

٥١- زۆربوونی پۆلیس.

٥٢- ئەوەی شارەزایی نیە پێش نوێژی دەکات.

٥٣- ئاوازی جۆراوجۆر دادەنرێت بۆ قورئان خوێندن.

٥٤- لەقورئان خوێندندا ملکەچ بوون نامێنێت (الخشوع).

٥٥- ئاسایش نامێنێ.

٥٦- دەستگیربوونی گەنجینەکانی کیسرای کوڕی هورمز.

٥٧- زۆربوونی ماڵ و سامان.

٥٨- ئەنجامدانی بەدڕەوشتی لەسەر شەقامەکان.

٥٩- ڕازاندنەوەی مزگەوتەکان بەنەخش و نیگارو زێڕ ڕێژکردنی قورئانەکان.

٦٠- دابەش نەکردنی میرات.

٦١- خۆشحاڵ نەبوون بەدەسکەوتەکان.

٦٢- کوڕ بەڕەقی هەڵسوکەوت دەکات.

٦٣- زستان گەرم دەبێت.

٦٤- زۆربوونی کەسانی بەد و ناپاك.

٦٥- کەسانی بەخشندەو خاوەن ڕێز کەم دەبنەوە.

٦٦- دەرکەوتنی زانست.

٦٧- کار نامێنێ.

٦٨- خۆشەویستی بەزوبان ڕق لێبوونەوە بەدڵ.

٦٩- خەڵکی خراپ و دڕندە کار دەگرنەدەست.

٧٠- کار دەکەوێتە دەست ئافرەت.

٧١- ماڵ و سامان دەکەوێتە دەستی ڕژدەکان.

٧٢- کەس ناڵێت الله الله.

٧٣- خاکی عەرەب دەبێتە سەوزایی و باخات.

٧٤- ئوممەت دەبێت بە (٧٣) بەشەوە.

٧٥- خەڵکی لەسەر دنیاو پارە یەکتری دەکوژن نەك لەسەر دین.

٧٦- خەڵکی کێبەرکێ دەکەن لەسەر پێشنوێژی کردن کەسیشیان دەست ناکەوێت پێش نوێژییەکەیان بۆ بکات.

٧٧- زۆر بوونی تەڵاق.

٧٨- فرۆشتنی دین بەدنیا.

٧٩- مردنی لەناکاو.

٨٠- درێژ بوون و بەرزبوونەوەی بڵند گۆکان.

٨١- پەکخستنی سنورەکان.

٨٢- داڕمانی دڵەکان.

٨٣- وێکچونی پیاوان بەئافرەتان و ئافرەتان بەپیاوان.

٨٤- شایەتیدانی کەسانێك بێ ئەوەی کرابێتن بەشاهد.

٨٥- بەرزبوونەوەی دەنگی گوناهبارو سەرپێچیکار لەمزگەوتەکاندا.

٨٦- ئەگەر کەسێك لەهۆزێکدا پەیمانێکی هەڵوەشاندەوە سەرشۆڕ دەبێت.

٨٧ - زۆر بوونی تۆمەت بارکردنی ئافرەتان لەئابڕویان.

# نیشانە گەورەکانی ڕۆژی دوایی

## ڕۆژانێکی سەیر:

نیشانەکانی ڕۆژی دوایی شەشن، لەناکاو سەرهەڵدەدەن.

ڕۆژێك خەڵکی لەخەو هەڵدەستن خۆر هەڵنایەت، خەڵکی بەدرێژایی ئەو ڕۆژە چاوەڕێ دەکەن خۆر هەڵ بێت بەڵام هەڵنایەت بۆیە لەتاریکیەکی نوتەکدا ئەو ڕۆژە دەبەنەسەر، لەڕۆژی دووەمیشدا هەڵنایەت هەروەها لەڕۆژی سێیەمیشدا بەهەمان شێوە، تەنها ئەو کەسانە بەم حاڵەتە دەزانن کەشەو هەڵدەستن... فەرمایشتەکە بەم شێوەیە باسی کردووە، بەڵام ئەوانەی کەشەو هەڵناسن هەرگیز هەستی پێناکەن یاخود هەستی پێ دەکەن بەڵام وەك ماندوبوون و تێکشکاندنێك تەماشای دەکەن.

کەی خۆر لەخولگەکەی خۆی ڕۆیشت! ئایا هاوسەنگیەکانی هێز لەگەردووندا هەڵگەڕایەوە!

ئەوەتا پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: (یەکەم نیشانەی بەرپابوونی ڕۆژی دوایی هەڵاتنی خۆرە لەخۆرئاواوە یاخود گیاندارێك دەردەکەوێت هەرکامێکیان لەپێشەوە دەرکەوتن ئەوی تریان بەدوایدا دێت)[1]

مەبەست لەوەیە پێغەمبەر ﷺ یەکێکیانی پێش ئەوی تریان نەخستووە، من لێرەدا دەمەوێت بەدواداچونی فەرمایشتەکان بکەم، سەرەتا خۆر دەردەکەوێت

---

١- رواه أبو داود في سننه.

دوو ڕۆژ یان سێ ڕۆژ بەو شێوەیە دەبێت و خەڵكی لەتاریكیەكی نوتەكدا ژیان دەبەنە سەر، لەو ماوەیەدا خۆر لە خۆرئاواوە هەڵنایەت، پاشان لەناكاو تیشكی خۆر لەخۆرئاواوە سەرهەڵدێنێت وەكو خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿لَا تَأْتِيكُمْ إِلَّا بَغْتَةً﴾[1] واتە: ڕۆژی قیامەت لەپڕو كتوپڕ نەبێ نایێ.

ئەمەش باردودۆخێكی ترسناك بۆ خەڵكی دێنێتە پێش و ماوەی ساڵێك دەخایەنێت هاوەڵان پرسیاریان لە پێغەمبەر ﷺ كرد وتیان: (یارسول الله) وەكو ڕۆژەكانی ئێمە یەك ڕۆژ دەمێنێتەوە؟ فەرمووی: نەخێر، لەیەكەم ڕۆژدا لەخۆرئاواوە هەڵدێت و یەك ساڵ دەخایەنێت (هاوەڵان سەریان سوڕما) وتیان: ئەی ئێمە لەوكاتەدا چۆن نوێژەكانمان ئەنجام بدەین، فەرمووی: (بەئەندازەی خۆیی بۆ بگرن)[2].

سەیری فەرمایشتی پێغەمبەرﷺ بكە كە فەرمویەتی: (اقدروا لهذا اليوم قدره) واتە: (بەئەندازەی خۆیی بۆ بگرن) مەبەستی لەوە بووە ئاسان كاری بكات بۆ ئوممەتەكەی واتە: (قَدِّروا بين صلاة الصبح وإلى أن تأتي صلاة الظهر) واتە: (ئەندازەی بۆ بگرن لەنێوان نوێژی بەیانی و تا نوێژی نیوەڕۆ دێت).

كاتێك خۆر لەخۆرئاواوە هەڵدێت ئیتر دەرگای پەشیمانی و گەڕانەوە دادەخرێت، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: (ڕۆژی دوایی بەرپا نابێت هەتا خۆر لەخۆرئاواوە هەڵنەیەت، ئەگەر خۆر لەخۆرئاواوە هەڵهات و خەڵكی بینیان هەموویان باوەڕ دێنن، بەڵام ئەو كاتە باوەڕهێنانی هیچ كەس سودی نابێت ئەگەر لەوەوپێش باوەڕی نەهێنابێت یاخود سودێكی لە باوەڕەكەی بینیبێت)[3].

---

١- الأعراف: ١٨٧

٢- رواه مسلم.

٣- رواه البخاري.

لەکاتی پەیدابوونی نیشانە بچوکەکانی‌دا دەرگای تەوبەکردن هەر کراوە دەبێت، بەڵام لەگەڵ سەرهەڵدانی نیشانە گەورەکانی ڕۆژیی دوایدا ئیتر دەرگای پەشیمان بوونەوە دادەخرێت، کەواتە ئەوەی لەسەر سەرپێچی کردنی خوایە ناتوانێت تەوبە بکات، بۆیە ئەو کەسانە لەسەر ئەو کارانەیان بەردەوام دەبن.

خۆر لە خۆرئاواوە دەردەکەوێت و یەك ساڵی تەواو بەردەوام دەبێت، یەکەم ڕۆژی وەك ساڵێك دەبێت دووەم ڕۆژی وەك مانگێك دەبێت سێیەم ڕۆژی وەك هەفتەیەك دەبێت، لەڕۆژیی چوارەمدا وەك ڕۆژەکانی خۆمانی لێ دێتەوە ئینجا ئەو خەڵکە بەهۆی ئەم ڕوداوە کتوپڕەوە دوچاری شۆك دەبن ئینجا باوەڕداران بەزمانی حاڵ دەڵێن: ﴿هَٰذَا مَا وَعَدَ ٱلرَّحۡمَٰنُ وَصَدَقَ ٱلۡمُرۡسَلُونَ ﴾[1] واتە: ئەم بەخەبەرهێنانە ئەوەیە کە خوای میهرەبان لە دنیادا گفتی دابوویێ و پێغەمبەرەکانی خوایش کە ئەم خەبەرەیان ئەدایێ ڕاستیان فەرموو.

هەروەها خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿قُلۡ أَرَءَيۡتُمۡ إِن جَعَلَ ٱللَّهُ عَلَيۡكُمُ ٱلنَّهَارَ سَرۡمَدًا إِلَىٰ يَوۡمِ ٱلۡقِيَٰمَةِ مَنۡ إِلَٰهٌ غَيۡرُ ٱللَّهِ يَأۡتِيكُم بِلَيۡلٍ تَسۡكُنُونَ فِيهِ ﴾[2]

واتە: دیسان ئەی موحەممەد! تۆ بەو کافرانە بڵێ کە هاوبەش بۆ خوا دائەنێن ئەگەر بهاتایە خوا ڕۆژی تا ڕۆژی قیامەت بەسەرتانەوە ڕاگرتایەو شەوی بۆ نەهێنانایە، چ خوایەکی ساختەی لە خوای ڕاستەقینە بەولاوە شەوێکی بۆ ئەهێنان تیا بحەوێنەوەو بخەون و ماندوێتیی ڕۆژتانی تیا دەرچێ؟ ئەوە بۆ ناڕوانن خوا چ لوتفێکی لەگەڵ کردوون تا باوەڕی پێ بکەن و سوپاسی ئەو بکەن؟. لەناکاو کەسێك بانگ دەکات.

---

١- يس: ٥٢

٢- القصص: ٧٢

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: (قیامەت لەکاتێکدا بەرپا دەبێت کە پیاوێك مەڕەکەی دۆشیوە فریا ناکەوێت لێی بخواتەوە، قیامەت بەرپا دەبێت کەسێك حەوزی ئاوەکەی چاك کردوەتەوە یاخود بنیاتی ناوە بەڵام بۆی تەواو ناکرێت، بەندەی خوا خەریکە پارویەك دەبات بۆ دەمی فریانەکەوێت بیخوات.

ئەم ڕوداوانە بۆ ماوەی ساڵێك لە ڕۆژەکانمان دوای ئەوەیش مانگێك دواتریش هەفتەیەك دوای ئەویش ڕۆژێك دەخایەنێت.

ئادەمیزاد بەهۆی ئەو ڕوداوانەوە بۆ ماوەی مانگێك یان دوو مانگ یاخود نزیکەی سێ مانگ ئاگای لە حسابی کات و ڕۆژگار نامێنێنێت.

کاتێکیش خۆر لە خۆرئاواوە دەرکەوت ئاژەڵێك پەیدا دەبێت خوای گەورە لەو بارەیەوە دەفەرموێت: ﴿وَإِذَا وَقَعَ ٱلْقَوْلُ عَلَيْهِمْ أَخْرَجْنَا لَهُمْ دَآبَّةً مِّنَ ٱلْأَرْضِ تُكَلِّمُهُمْ أَنَّ ٱلنَّاسَ كَانُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَا لَا يُوقِنُونَ﴾[1] واتە: کاتێ کە ئادەمزاد مووستەحەقی عەزابی خوا ئەبن و فەرمودەی هاتنی عەزاب دێتە سەریان واتە ڕۆژی قیامەت و لێپرسینەوەی تاوانباران نزیك ئەبێتەوە، شتێکیان لە زەوی بۆ دەرئەکەین ئەڕوا بەڕێداو قسە لەگەڵ خەڵك ئەکا ئەڵێ: ئەم خەڵکە باوەڕیان بە ئایەتەکانی خوا نەبوو.

ئەو ئاژەڵە وەکو ئاخاوتنی خەڵکی قسە دەکات بەجۆرێك خاوەن حەق و قەرزاربار گوێیان لێ دەبێت.

زانایان لەباس کردنیدا زۆر ڕۆچون بەڵام ئێمە ناچینە سەر ئەو باسە تەنها ئەوەندە نەبێت ئەو ئاژەڵە لەسەر چوار پەل دەڕوات وەك وشترەکەی صالح مۆر لەخەڵکی دەدات لەسەر لوتیان ، ئەوەتا خوای گەورە لەم بارەیەوە دەفەرموێت:

---

١- النمل: ٨٢

﴿سَنَسِمُهُۥ عَلَى ٱلۡخُرۡطُومِ﴾[1] واتە: لەمەوپاش سەری لووتی داخ ئەکەین و نیشانەیەکی لەسەر دائەنێین لە هەموو لایێ بەو نیشانەدا بناسرێتەوە.

گۆچانەکەی موساو مستیلەکەی سلێمان، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت گۆچانەکەی موسا و مستیلەکەی سلێمانیشی پێیە)[2]. بەو گۆچانەی دەیدات بەڕوخساری موسوڵمانداو ناوچەوانی ڕوناکیی و ڕۆشنایی دایدەگرێت و پرشنگ دەداتەوە، خەڵکی بە (ئەی باوەڕدار) بانگی دەکەن، هەروەها بە موستیلەکەی سولەیمان دەیدات بەڕوخساری کەسی کافردا تەپ و تۆز دایدەگرێت، خەڵکی بە (ئەی کافر) بانگی دەکەن.

خەڵکی دەبن بە دوو بەشەوە ئیتر ناو و نازناوەکان لەنێو مرۆڤەکاندا نامێنن، هەرچی ئادەمیزاد هەیە لەو کاتەدا لەسەر گۆڕەپانێک دەبن بەکافرو موسوڵمانەوە دواتر گۆی زەوی گۆڕانێکی سەراپاگیری لەسەرەوە بۆ خوارەوەی بەسەردا دێت ئەوەتا خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿ يَوۡمَ تُبَدَّلُ ٱلۡأَرۡضُ غَيۡرَ ٱلۡأَرۡضِ وَٱلسَّمَٰوَٰتُۖ وَبَرَزُواْ لِلَّهِ ٱلۡوَٰحِدِ ٱلۡقَهَّارِ ﴾[3]

واتە: ئەو تۆڵە سەندنەوەیشە لە ڕۆژێکدا ئەبێ کە ئەم زەوییە ئەگۆڕێ بە زەوییەکی تر و ئاسمانەکان بە ئاسمانی تر و، هەرچی ئادەمزادە لە گۆڕ دەرئەچن و لە بەردەم دادگای خودای تاکو تەنیاو بەدەستەڵاتدا ڕائەوەستن.

ئینجا ئاژەڵەکە قاچی لە ئەوپەڕی ئەو شوێنەی کە چاوی دەیبینێت دادەنێت.

---

١- القلم: ١٦

٢- رواه الترمذي.

٣- إبراهيم: ٤٨

پاشان نیشانەی سێیەم دێت ئەویش دوکەڵە خوای پەروەردگار لەم بارەیەوە دەفەرموێت:

﴿يَوْمَ تَأْتِي السَّمَاءُ بِدُخَانٍ مُّبِينٍ ﴿١٠﴾ يَغْشَى النَّاسَ هَٰذَا عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴾[1]

واتە: سا تۆ، ئەی موحەممەد! چاوەڕوانی ڕۆژێ بە ئاسمان دووکەڵێکی دیارو ئاشکرا ئەهێنێ. ئەو دووکەڵە خەڵك هەموو دائەگرێ. ئەم دووکەڵە سزایەکی بەئازارە.

ئەو دوکەڵە هەموو دنیا تاریك دەکات، هەموو جیهان دادەگرێت بەسەر کەسی باوەڕداردا وەك هەڵامەتێکی ئاسایی دەردەکەوێت بەڵام بۆ سەر بێ باوەڕ وەك ئاگرێك دەبێت بەسەر سەریەوە دەکولێت، لەو کاتەدا خەڵکی بانگ دەکەن:

﴿ رَّبَّنَا اكْشِفْ عَنَّا الْعَذَابَ إِنَّا مُؤْمِنُونَ ﴾[2] واتە: خەڵکەکە لەتاو ئەو وەزعە نابارە لە خوا ئەپاڕێنەوەو ئەڵێن: خوایە ! ئەم سزایەمان لەسەر هەڵگرە، بەڕاستی ئێمە خاوەن ئیمانین و باوەڕمان بە تۆ هەیە.

لەوکاتەدا هیچ نزایەك وەرناگرێت تەنها دوعای باوەڕداران نەبێت لەبەرئەوەی بەندە ڕاستەقینەکانی پەروەردگارن.

کاتێك ئەم نیشانانە دێن و ڕوداوەکان یەك بەدوای یەکدا دێن شەیطان دێت دەیەوێت موسوڵمان ببێت: ﴿أَنظِرْنِي إِلَىٰ يَوْمِ يُبْعَثُونَ﴾[3] واتە: تا ڕۆژی قیامەت ماوەم بدە. ئاژەڵەکە یاخود وشترەکە پێی پیادەنێت و دەیکوژێت.

ئەو دوکەڵە دوای کاتی دەرکەوتنی ئەو ئاژەڵە دەردەکەوێت هەر لەگەڵ دەرکەوتنی ئەو ئاژەڵەدا نیشانەکانی تر بەخێرایی سەر هەڵدەدەن و بەدوای

---

١- الدخان: ١٠ - ١١

٢- الدخان: ١٢

٣- الأعراف: ١٤

یەکدا دێت، پێغەمبەر ﷺ دەربارەی دەفەرموێت: (بەڵگەو نیشانەکان وەك مووروویەکی بەدوا یەکدا هاتوو دەبێت کە دەزووەکەی پچڕابێت)[1]. واتە: مەبەستی لەخێرا هاتن و دەرکەوتنی نیشانەکانن بەدوای یەکدا)[2]. ئەوکاتە قیامەت وەك ئەو سکەی لێ دێت کە کەس و کارەکەی نازانن کەی منداڵەکەی دەبێت داخۆ دوای کاتژمێرێك دەبێت یان نیو کاتژمێر یان دوو کاتژمێر، هەموان لەحاڵەتی چاوەڕوانیدا دەبن، ئەو خەڵکانەی کە لەو کاتەدا دەمرن، هەر بەو حاڵەتەوە دەمێننەوە کە لەسەری بوون.

## مەسیحی دەجال:

پاشان بەڵایەکی گەورەتر سەر هەڵدەدات ئەویش مەسیحی دەجالە هیچ پێغەمبەرێك نەهاتووە بەدڵنیاییەوە ئومەتەکەی خۆی لێ بەئاگا هێناوەتەوە پێغەمبەر ﷺ لەو بارەیەوە دەفەرموێت: (هیچ پێغەمبەرێك نەهاتووە هەتا ئومەتەکەی لەم بەڵایە ئاگادار نەکردبێتەوە، شتێکتان پێ دەڵێم کە هیچ پێغەمبەرێکی پێش من بەئوممەتەکانی خۆیان نەوتووە، پاشان دەستی لەسەر چاوی داناو فەرمووی شایەتی دەدەم کە خوای گەورە کوێر نییە)[3]. پێغەمبەر ﷺ لەسەر بڵندگۆ ئوممەتەکەی لەمە ئاگادار دەکردەوە هەتا وای لێهات حەزرەتی عومەر(ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی وامزانی ئەوەتا لەتەنیشتمەوە.

سەیری کاریگەربوونی حەزرەتی عومەر بکە بە فەرمایشتەکەی پێغەمبەر ﷺ!

---

١- تحفة الأحوذي في شرح جامع الترمذي.

٢ .- وەرگێڕ

٣- رواه احمد.

وە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: مەسیحی دەجال چەند نیشانەیەکی روونی هەیە، ئادەمیزادێك دەبێت وەکو ئێمە، لەوکاتەدا پێغەمبەر بە کەسێکی عەرەبی دەشتەکی چواند کە لە دورگەی عەرەبیدا بوو.

چاوی ڕاستی سڕاوەتەوە وەك مس وایە، ڕوخساری ترسناکە، چاوی دەڵێی دەنکە ترێی سەرئاوکەوتووە، هەموو باوەڕدارێك وشەی کافر لە نێوچەوانی مەسیحی دەجالدا دەخوێنێتەوە تەنانەت پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: هەموو کەسێکی خوێندەوارو نەخوێندەوار خوای گەورە پێیان دەخوێنێتەوە، ئەگەر بینیتان سەرەتای سورەتی (کهف)ی بەسەردا بخوێنن، چوار ئایەتی سەرەتای سورەتی (کهف)ی بەسەردا بخوێنن کە دەفەرموێت:

﴿ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ ٱلَّذِيٓ أَنزَلَ عَلَىٰ عَبۡدِهِ ٱلۡكِتَٰبَ وَلَمۡ يَجۡعَل لَّهُۥ عِوَجَاۜ﴾[1] هەتا دەگاتە: ﴿وَيُنذِرَ ٱلَّذِينَ قَالُواْ ٱتَّخَذَ ٱللَّهُ وَلَدٗا﴾[2]

بۆیە دەبێت باوەڕدار هەموو شەوێك پێش نوستن خۆی لەسەر خوێندنی ئەم (٤) ئایەتە ڕابێنێت لەبەرئەوەی زۆر چاکە بۆ موسوڵمان، بۆ نوێژی بەیانی هەڵیدەستێنێ هەروەها ئەگەر مەسیحی دەجال دەرکەوت خوای گەورە باڵادەستی ناکات بەسەریدا.

پاشان لەلایەکی ترەوە دەجال خوای گەورە بەلایەکی داوە بەسەریدا لەنیشانەکانی ئەوەیە چاوی دەرپەڕیوە قژی لول و هەڵبزرکاوە دیمەنیشی زۆر ناشیرینە لەو کاتانەدا ئاسمان باران نابارێنێ زەوی شتی لێ ناڕوێ گوانی ئاژەڵ شیری تێدا نابێت، دەجال دەڵێت: ئەی ئاسمان باران ببارێنە یەکسەر دەبارێ ئەی زەوی تۆوەکان سەوز بکە یەکسەر بەروبومەکان دەڕوێت بەئاژەڵ دەڵێت:

---

١- الكهف: ١

٢- الكهف: ٤

گوانەکانت پڕ بکە یەکسەر پڕدەبن لەشیر لەوێدا بەڵاکە ڕوودەدات و خەڵکی باوەڕی پێدێنن و دەڵێت من پێغەمبەری خوام ئەوەتا پێغەمبەر ﷺ ئێمەی لێ بەئاگا هێناوەتەوە (ئەگەر ئەوەتان بیست بڕوا مەکەن چونکە لەدوای من پێغەمبەرێکی تر نیە، پاشان دەڵێت من خوای ئێوەم، هەندێك لەخەڵکی بڕوای پێدێنن زۆرینەی شوێن کەوتوانی جولەکەو دووڕووەکان و ئافرەتن، بەجۆرێك پیاو دەگەڕێتەوە بۆماڵەکەی ژنەکەی و دایکی و کچی و پوری دەبەستێتەوە لەترسی ئەوەی شوێن دەجال نەکەون).

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: (کەس لەئێوە خوای گەورە نابینێت هەتا دەمرێت وە (مەسیحی دەجالیش) کوێرە خوای گەورەش "جل جلالە" کوێر نیە)١. پێغەمبەر ﷺ باسەکانی فێری هاوەڵان دەکرد.

لەگەڵ مەسیحی دەجالدا بەهەشت و دۆزەخ هەیە، یاخود بەخەڵکی دەڵێت: کە بەهەشت و دۆزەخی بەدەستە ئەوەی وەکو خوایەك گوێڕایەڵی بکات و بڕوای پێ بێنێت ئەوا خواردن و خواردنەوەی پێ دەدات هاوەڵان وتیان: یا رسول الله خواردنی بڕواداران لەو ڕۆژەدا چی دەبێت؟ فەرمووی: (خواردنی بڕواداران لەو ڕۆژەدا تەسبیحات و زیکرو یادو پیرۆز ڕاگرتنی خوای گەورەیە، خاتوو عائیشە(ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: ئەی عەرەب لەو ڕۆژەدا لە کوێ دەبن. فەرمووی: عەرەب ئەو ڕۆژە کەم دەبن)[٢].

جارێك پێغەمبەر ﷺ لەکاتی وتاردانیدا بوو فەرمووی: (ئەی بەندەکانی خوا دامەزراوبن، حەزرەتی عومەر(ڕەزای خوای لێ بێ) هەژانێکی بەسەردا هات، کاتێ حەزرەتی عومەری بەو شێوەیە بینی فەرمووی: ئەوە چیتە کوڕی خەتتاب ئەگەر لەکاتی دەرکەوتنیدا خۆم لەناوتاندا بم ئەوا من حوججەو بەرگریکارو

---

١- رواه الترمذي.

٢- رواه احمد.

پارێزەرم بۆ هەموو موسوڵمانیّ، وە ئەگەر لەدوای من دەرچوو ئەوا هەرکەسەو خۆی بەرگریکارو پارێزەری خۆی بێت، وە خواش خەلیفەمە لەسەر هەموو موسوڵمانێك وە ئەو لەسەرە رێیەکی نێوان شام و عێراقدا دێتە دەر)[١].

پێغەمبەر ﷺ هاوەڵانی دڵنیا کرد بەوەی ئەگەر لەسەردەمی خۆیدا پەیدا بوو ئەوا هەر خۆی دەتوانێت لەبەردەمیدا بوەستێت، خۆ ئەگەر لەدوای سەردەمی خۆی هاتە دەرەوە دەبێت هەموو کەسێك خۆی بەرگری لەخۆی بکات ئەوەش بەپشت بەستن بە تەقواو باوەڕی بەخوای خۆی، ئایا کاتی ئەوە نەهاتووە پشکی خۆت لە ئیمان زیاد بکەیت هەتا بتوانیت لەبەرامبەر مەسیحی دەجالدا بوەستی؟

مەسیحی دەجال سێ شوێنی لێ قەدەغە دەکرێت بڕواتە ناوی هەرچەندە هەوڵ دەدات خۆی و سوپاکەی بڕۆنە ناوی بەڵام فریشتەکان دەری دەکەن، (٧٠) هەزار جولەکەی ئەصفەهانی لەگەڵدایە، لە پێغەمبەرەوە گوازراوەتەوە دەفەرموێت: دەجال هەزاران کەسی پڕ چەکی لەگەڵدایە دووڕووەکان لەمەدینە دێنە دەرەوەو دەڕۆن بەرەو پیری، بەو شێوەیە شاری مەدینە لەو دووڕووانە پاك دەبێتەوە وەك چۆن کوورەچیی پیسی و خاشاك لە ئاسن دەکاتەوە.

ئەوکاتە دەجال و ئەوانەی لەگەڵیدان خراپەکاری لەزەویدا بڵاودەکەنەوە، بەجۆرێك خێراییەکەی لەڕەشەبا زیاترە کەس دەستی بەسەردا ناشکێت وەك چۆن کەس دەسەڵاتی بەسەر شەیطاندا نیە بۆیە کەس پێی ناوێرێت و کەس بوێری ئەوەی تێدا نابێت ڕووبەڕووی بێتەوەو بیکوژێ هەتا ئەو کاتەی دەروی خوایی دەکرێتەوەو حەزرەتی مەسیح دادەبەزێت ئەویش نیشانەی پێنجەمە.

---

١- سنن ابن ماجه.

## دابەزینی حەزرەتی عیسا (عليه السلام):

پێغەمبەر ﷺ شوێنی دابەزینی عیسای دیاری کردووە کە دەکەوێتە لای منارە سپییەکەی ڕۆژهەڵاتی دیمەشق: (عليه مهرودتان أي كساءان إذا طأطأ قطر من صدغيه كحب الجمان، وإذا رفع علاه نور). واتە: (دوو بەرگی زەردی لەبەردایە کاتێ سەری دادەخات سەری ئاوی لێدەتکێ بەوێنەی دەنکە مرواری، وە کاتێ سەر بەرز دەکاتەوە لای سەرووی هەمووی نورو ڕووناکی‌یە).

حەزرەتی عیسا عليه السلام لەساتی دەسپێکردنی نوێژی جەماعەتی بەیانی لەمزگەوتدا خۆی دەکات بەژووردا مزگەوتەکە بەو هاتنە دێتە هەژان، هەموو موسوڵمانان دەیناسنەوە پێش نوێژ دەیەوێت پاشەو پاش بگەڕێتەوە هەتا حەزرەتی مەسیح پێش بکەوێت بۆ نوێژکردن بەڵام مەسیح ئاماژەی بۆ شوێنی خۆی پێ دەکات و پێی دەفەرموێت: من هاتوم شوێنکەوتەی محمدی برام بم. ئینجا حەزرەتی عیسا بەموسوڵمانان دەفەرموێت: ئەم دەرگایە بکەنەوە دەجال لەپشتی ئەو دەرگایەوە دەدۆزنەوە! کاتێك دەجال بۆنی حەزرەتی عیسا دەچێت بەسەریدا وەکو خوێ دەتوێتەوە ئەمە لەفەلەستین ڕودەدات، حەزرەتی عیسا عليه السلام لەبەردەرگای شاری (لُد) لەفەلەستین، بە دەجال دەگات و دەیکوژێت، پاشان خاچ دەشکێنێت و بۆ ماوەی (٤٠) ساڵ بەدادپەروەرانە فەرمانڕەوایی دەکات و پێش نوێژی بۆ موسوڵمانان ناکات، بەڵکو مامۆستایانی مزگەوتەکان پێش نوێژی دەکەن و ئەویش لەگەڵ ئەو خەڵکەدا لەپشت مامۆستاکەوە نوێژ دەکات، پاشان خوای گەورە وەحی دەنێرێت بۆی موسوڵمانان بەرەو (طور) ببات چونکە پاشماوەی موسوڵمانان لەوێن.

## پەیدا بوونی یەئجوج و مەئجوج:

پاشان نیشانەی شەشەم دێت ئەویش هاتنە دەرەوەی (یەئجوج و مەئجوج)ە کە لە هەموو لایەکەوە زۆر دەبن بەجۆرێك بەلای دەریاچەیەکدا تێپەڕدەبن سەرەتاکەیان لێی دەخۆنەوە دواهەمینیان کە دێتە سەر دەریاچەکە دەڵێت: ئەمە لە دێرزەماندا دەریاچە بووە، ئەوەندە لەو دەریاچەیە دەخۆنەوە هەتا وشك دەکات، لەویادا حەزرەتی عیسا و ئەوانەی لەگەڵیدان لەسەر چیای طور خۆیان حەشار دەدەن و لەخوا دەپاڕێنەوە لەو کۆمەڵە ڕزگاریان بکات لەبەرئەوەی بەڵایەکی گەورەن و هێرش و پەلاماریان بۆ بەندەکانی خواو وڵاتان زۆرو ترسناکن.

خوای گەورە نەخۆشیەك دەنێرێت بۆ گەردنیان کرم و مێرووی جۆراوجۆر تێیان دەدات هەتا دەمرن، پاشان باڵندە لە ئاسمانەوە دێن گەردنیان وەکو گەردنی وشتر و گوێدرێژە، لاشەکانیان بەرز دەکەنەوە و فڕێیان دەدەنە ناو دەریاوە، پاشان ئاسمان بارانێك دەنێرێت زەوی لە لاشەی کەوتوو و بۆنی پیسیان پاك دەکاتەوە.

پاشان خوای گەورە بەزەوی دەفەرموێت: فەرو پیتەکەی جارانت بگەڕێنەرەوە تاوای لێ دێت منالان لەگەڵ ماردا یاری دەکەن، پڵنگ چاودێری مانگاکان دەکات گورگ وەکو سەگ لەگەڵ مەڕدا دەبێت و پاسەوانی دەکات، یەك پەرداخ شیر بەشی کۆمەڵێك خەڵك دەکات خەڵکی لەژێر تویکڵی هەناردا خۆیان حەشار دەدەن وتراوە سەد پیاو یان دوو سەد پیاو لەژێر سێبەرەکەیدا پشوودەدەن؟ پاشان بایەکی پاك هەڵدەکات و گیانی باوەڕداران لەژێر باڵیانەوە دەکێشێت ئیتر جگە لەخەڵکێکی بێنرخ یەك باوەڕدار لەسەر زەوی دا نامێنێت، ئەو خەڵکە وەك ئاژەڵ هەڵبەزو دابەز دەکەن.

فاطمەی کچی قەیس (ڕەزای خوای لێ بێ) کە یەکێکە لە هاوەڵە بەڕێزەکان وتی: گوێم لە پێغەمبەری خوا بوو ﷺ خەڵکی بانگ کرد بۆ (نوێژی هەینی) ئەوەبوو هەمومان ڕۆیشتین بۆ مزگەوت من لە یەکەم ریزی ئافرەتاندا بووم کە لەدوای پیاوانەوە بوون، پێغەمبەر ﷺ دوای ئەوەی دوو ڕکات نوێژی کرد چووە سەر بڵندگوو فەرمووی: سوێند بەخوا نە بۆ ترساندن و نە بۆ هاندان بانگم نەکردون بەڵکو بۆ ئەوەی کە تەمیمی داری پیاوێکی مەسیحی بوو موسوڵمان بووە باسێکی بۆ گێڕاومەتەوە کە پێشتر بۆم باسکردون، تەمیمی داری پیاوێکی مەسیحی بوو هات موسوڵمان بوونی خۆی ڕابگەیەنێت و باسی خۆی بۆ پێغەمبەرو هاوەڵان بکات وتی: ئەی پێغەمبەری خوا لەگەڵ (٣٠) پیاودا لەناو کەشتیەکدا بووین یەك مانگ لەنێو شەپۆلی دەریادا تلمان دەخوارد هەتا لە لێواری دورگەیەکدا لەنگەرمان گرت، هەر لەو شوێنەدا خۆمان حەشاردا لەناکاو گیانداڕێك پەیدابوو لەبەر پرپی مووی لاشەی پێش و دوای دیار نەبوو، پێی وتین: ئێوە کێن؟ ئێمەش زۆر لێی ترساین وامان گومان برد کە شەیطان بێت، ئێمەش وتمان: ئێمە خەڵکی دورگەی عەرەبین لەناو ئەم دورگەیە گیرساینەوە... ئەی تۆ کێیت؟ وتی: من (الجساسة)م وتمان: (جساسة) چی‌یە؟ وەڵامی نەداینەوە (الجساسة) واتە ئەو کەسەیە کە بەهەموو دنیادا دەگەڕێت وەکو خوای گەورە لەم ئایەتەدا دەفەرموێت: ﴿ فَإِذَا جَآءَ وَعْدُ أُولَىٰهُمَا بَعَثْنَا عَلَيْكُمْ عِبَادًا لَّنَآ أُوْلِي بَأْسٍ شَدِيدٍ فَجَاسُواْ خِلَٰلَ ٱلدِّيَارِۚ وَكَانَ وَعْدًا مَّفْعُولًا ﴾[1] واتە: کاتێ کە وەعدەی پاداشی خراپەکاریی یەکەم جارتان هات چەند بەندەیێکی بەهێز و ئازا لە بەندەکانی خۆمان ڕەوانە ئەکەین بۆ سەرتان بە دواتاندا ئەگەڕێن و

---

١- الإسراء: ٥

لەناوماڵاندا ئـەتانگرن و سـزاتان ئـەدەن. ئەمـە بـەڵێنێکی بڕیـار دراوەو ئـەبێ بێتەجێ.

چونە ناوەوەو بەخێرایی و توندی پیایدا گـەڕان پاشـان وتـی: کەسێك لـەناو ئەو ئەشکەوتەدایە زۆر تامەزرۆیە بۆ بینینتان، کـاتێ چـوینە بـەردەمی زۆر لێی ترساین دیمەنێکی زۆر گەورەمان بینـی دەسـتەکانی بـۆ گـەردنی بەسـترابووەوە هەروەها لەنێوان هەردو ئەژنۆیەوە بەزنجیری ئاسنین بەسـترابووەوە وتـی ئێـوە کێن؟ وتمـان ئێمـە خـەڵکی... باسـەکەمان بـۆ گێڕایـەوە وتـی: دارخورمـای دوو ماڵەکـە چـییان لێ هـاتووە؟ وتمـان: تـۆ دەتـەوێت چـیمان پـێ بڵێیـت؟ وتـی: تائێستاش هەر بەردەگرێت؟ وتمان: بەڵێ وتی: خەریکە بەر نەگرێت.

وتی: باسی دەریاچەی طەبەریەم بۆ بکەن؟ وتمان: هەواڵی چ شـتێکمان پـێ دەدەیت؟ وتی: ئاوی تیایە؟ وتمـان: ئـاوی زۆر تیایـە، وتـی: خـەریکە ئاوەکـەی دەڕوات و وشك دەبێت.

وتی: هەواڵی کانی زەورە چییە؟ وتمـان: ئـەی دەربـارەی ئـەو چـیمان پـێ دەڵێیت؟ وتی: ئاوی تێدا ماوە؟ خەڵکەکە بەدەوریدا کشتوکاڵ دەکـات؟ وتمـان: بەڵێ ئاوەکەی زۆرەو خەڵکەکەشی بەدەوریدا کشتوکاڵ دەکەن.

وتی: هەواڵی پێغەمبەری نەخوێندەوارم پێ بڵێن، وتمان: نێردراوە، وتی: چی دەکـات؟ وتمـان: لەمەککـە چـۆتە دەرەوەو لەیـەثریـب نیشـتـەجێ بـووە، وتـی: عەرەب لەدژی جەنگان؟ وتمان: بـەڵێ ئـەم ڕوودواوە لـەدوای جـەنگی (خەنـدەق) بوو، وتی: چی کرد؟ وتمـان: لـەناو عەرەبـدا دەرکـەوتووەو ئـەوانیش گوێڕایـەڵی دەکەن و هاتونەتە نێو ئـاینی خـواوە، وتـی: ئـەوە باشـترە بۆیـان بـاوەڕ بێـنن. پاشان پێی وتین: من مەسیح یان مەسیحی دەجالم...

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: لەدوای سی دەجالەوە دێت کەهەموویان بانگەشەی پێغەمبەرایەتی دەکەن یەکەمینیان موسەیلەمەیە دواهەمینیان مەسیحی دەجالە.

زانایان جیاوازییان لەسەر ڕاستیی ناوی مەسیحی دەجال هەیە یەکێك لەڕاکان دەڵێن سامرییە.

بەڵام ناوی مەسیحی دەجال نەهاتووە تەنها ئەوە نەبێت پێغەمبەر بە مەسیحی دەجال ناو بردووە.

باسکراوە کە منداڵێکی هەرزەکاری جولەکە هەبوو ناوی (ابن صیاد) بوو لە مەدینە دەژیا ئەمەش لە ساڵی شەش یان حەوتی کۆچی دابوو.

لەو کاتەدا بوو کە پێغەمبەر ﷺ نامەی نارد بۆ پادشاو سەرۆکەکانی دنیاو شاری مەدینە بووە پایتەختی ئیسلام.

هاوەڵان کاتێك گوێیان لە پێغەمبەری خوا بوو ﷺ کەچەند جارێك باسی مەسیحی دەجالی دەکرد وتیان منداڵێکمان لە شاری مەدینەدا بینیوە قسەی سەیر دەکات، ساڵێك تێپەڕی کرد لەوە دەچێت کوێر بووبێت، جولەکەکان موسوڵمانانیان پێ دەترساند، بۆیە هاوەڵان کەوتبوونە ئەو گومانەی کە ئەو هەرزەکارە مەسیحی دەجال بێت، ئەمەش بەهۆی ئەو زۆر قسەکردنەی کە پێغەمبەر ﷺ دەربارەی مەسیحی دەجال دەیفەرموو کابرایەکی یەهودیە (٧٠) هەزار جولەکەی ئەصفەهان شوێنی دەکەون.

ئەوە بوو هاوەڵان ڕۆیشتنە خزمەت پێغەمبەر ﷺ و باسی ئەو هەرزەکارەیان کرد، پێغەمبەر ﷺ بەهاوەڵێتی عومەر ڕۆیشتن بۆ لای هەرزەکارەکە لەناو منداڵاندا لەبەنی مەزار لە مەدینەدا یاری دەکرد، پێغەمبەرﷺ دەستی خستە سەرشانی و بە(ئیبن صیاد)ی فەرموو: شایەتی دەدەیت کە من پێغەمبەری خوام، وتی: بەڵێ شایەتی دەدەم کە تۆ پێغەمبەرێکی دەست پاکی، (لە ڕێگادا

بۆ لای ئیبن صیاد حەزرەتی جوبرەئیل هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ سورەتی "الدخان"ی بۆ دابەزاند)، بۆیە پێغەمبەر ﷺ ویستی ئەو هەرزەکارە تاقی بکاتەوە بزانێت کە داخۆ ئەوە مەسیحی دەجالەو وەحی بۆ دێت یاخود کەسێکە شەیطانەکەی پێی دەڵێت.

پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو: شاراوەیەکم بۆ شاردویتەتەوە ئەوەبوو: ﴿ فَٱرۡتَقِبۡ يَوۡمَ تَأۡتِي ٱلسَّمَآءُ بِدُخَانٖ مُّبِينٖ ﴾ ی بۆ شاردبوویەوە.

ابن صیاد وتی: ئەوە (الدُّخ)ە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: دۆڕایت و ڕێزت بەرز نابێتەوە شەیطانەکەت فریوی داویت. حەزرەتی عومەر فەرمووی یارسول الله ڕێگەم بدە لەگەردنی بدەم، پێغەمبەر ﷺ ڕێگەی نەداو فەرمووی: نەخێر عومەر ئەگەر ئەمە مەسیحی دەجال بێت کەس ناتوانێت بەسەریدا زاڵ بێت و بیکوژێت مەگەر حەزرەتی عیسا (عليه السلام) نەبێت، خۆ ئەگەر هەر هەرزەکارێکە ئەوا شەیطانەکەی ئەم هەواڵەی پێداوە ئەوا هیچ سودێك نیە لەکوشتنیدا.

## ڕەوشتی حەزرەتی عیسا (عليه السلام):

خەڵکی لەوکاتەی کە لاوازیی ڕووی کردووەتە ئاینەکەیان مەسیحی دەجال دەردەکەوێت، لەڕابردوودا نیشانەکانیمان باسکرد وەك هەڵهاتنی خۆر لە خۆرئاواوە، گیاندار، دوکەڵ، ژمارەیەکی زۆر لەموسوڵمانان بەکاری بێسودەوە سەرقاڵ دەبن.

خوای گەورە حەزرەتی عیسا (عليه السلام) دادەبەزێنێت هەتا فەرمایشتی پێغەمبەرەکەی ﷺ بسەلمێنێت ئەوەتا دەفەرموێت:

﴿ وَإِن مِّنۡ أَهۡلِ ٱلۡكِتَٰبِ إِلَّا لَيُؤۡمِنَنَّ بِهِۦ قَبۡلَ مَوۡتِهِۦۖ ﴾[1]

---

١- النساء: ١٥٩

واتە: قەسەم بە خودا! پێش ئەوەی عیسا وەفات بکا هەموو ئەهلی کیتاب لەم دنیایەدا ئیمانی پێ ئەهێنن، ئەنجا وەفات ئەکات.

واتە: ئەو ڕۆژەی کە خەڵکیی پێش مردنی حەزرەتی عیسا﷣ باوەڕی پێ دێنن واتە مردنی خودی خۆی.

حەزرەتی عیسا﷣ لەبەرچەند هۆیەکی دیاری کراو دادەبەزێت:

یەکەم: هەتا بۆ ئەو شوێنکەوتوانەی بسەلمێنێت کە بەخوایان دەزانی ئەو خوا نیە.

دووەم: هەتا وەڵامی ئەو جولەکانە بداتەوە کە دەڵێن ئێمە بووین عیسای کوڕی مەریەممان کوشت (حەزرەتی عیسا﷣ لە نزیک ڕۆژی قیامەتدا دادەبەزێت هەتا ئەوە پشت ڕاست بکاتەوە کە تائێستا لەژیاندا ماوەو ئەوان نەیانکوشتووە ئەوەتا خوای گەورە لەم بارەیەوە دەفەرموێت:﴿وَمَا قَتَلُوهُ وَمَا صَلَبُوهُ وَلَٰكِن شُبِّهَ لَهُمْ﴾[1] واتە: نەخەیر نەیانکوشتو نەشیانکرد بە داردا، بەڵکو کارەکەیان لێ گۆڕراو سەریان لێ تێکچوو، یەکێکی تر بوو کوژرا کە خودا ڕەنگی عیسای دا بە سەریداو بەویان زانیو کوشتیان.

کاتێك حەزرەتی عیسا﷣ لەبەردەم خەڵکیدا دەردەکەوێت دوو سەرەنجام دەردەکەوێت:

ئەنجامی یەکەم: باوەڕی موسوڵمانانی یەکتاپەرست بەوەی کە فەرمایشتی پەروەرگار ڕاستە بەمەش باوەڕی ئیمانداران زیاتر دەبێت، بەوەی کە بەهەڵە کەسێکی تریان لەجیاتیدا کوشتووە.

ئەنجامی دووەم: هەر لەبنەڕەتدا حەزرەتی عیسا﷣ بۆلای خوا بەرزبوویەوە وێکچووەکەی کوژرا ئەوکاتەی بەرزکرایەوە تا ئەمڕۆ لەباوەڕی

---

١- النساء: ١٥٧

موسـولّمانانـدا هـەر زينـدوو بـووە ئـەويش مـژدەی شـوێنەكانيان پـێ‌دەدات لەبەهەشتدا.

كاتێك حەزرەتی عيسا ﷺ دادەبەزێتە سەر زەوی هەرگيز نابێتە پێشنوێژی موسولّمانان، لەبەرئەوەی ئەگەر پێش نوێژييان بۆ بكات ئەوا كارێكی ناڕاست ڕويداوە، بەلاّم لەدوای پياوێكی ئاسايی ئوممەتی موسولّمانانەوە نوێژ دەكات ئەوەش ئەدەب و ڕێزی حەزرەتی عيسا دەگەيەنێت لەبەرامبەر حەزرەتی (رسول الله)دا ﷺ ئەوەبوو ئەو هەموو ژاوە ژاوە گەورەيەی خرايە سەر گوايە عيسا خوايە ياخود كوڕی خوايە، بۆيە دەبوو وەلاّمێكی كردەيی بداتەوە چونكە زۆرجار خەلّكيی باوەڕ بەشتێك ناكەن هەتا بەچاوی خۆيان نەيبينن بۆيە حەزرەتی عيسا دادەبەزێت درێژترين تەمەنی دەبێت لەسەر زەوی دا.

هەموو مرۆڤەكان لەڕۆژی قيامەتدا لەيەك ئاستی تەمەندا دەبن پياو و ئافرەت و مندالّ و بەسالاّچوو هەمويان لەتەمەنی حەزرەتی عيسادا دەبن كە سی و سێ سالّە ئەو كاتەی بۆ ئاسمان بەرزكرايەوە.

پێغەمبەران بران لەچەند دايكێكی جياواز بەلاّم ئاين و بيروباوەڕيان بەخوا يەكێكە، لەقورئانی پيرۆزدا وشەی ئاينەكان نابينيت، لەبەرئەوەی ئەم زاراوەيە ناوزەدێكی ناشەرعيە، خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿ شَرَعَ لَكُم مِّنَ ٱلدِّينِ مَا وَصَّىٰ بِهِۦ نُوحًا وَٱلَّذِيٓ أَوۡحَيۡنَآ إِلَيۡكَ وَمَا وَصَّيۡنَا بِهِۦٓ إِبۡرَٰهِيمَ وَمُوسَىٰ وَعِيسَىٰٓۖ أَنۡ أَقِيمُواْ ٱلدِّينَ وَلَا تَتَفَرَّقُواْ ﴾[1] واتە: ئەوەی بۆ داناون لە دين و ئايين كە كاتی خۆی نووح پێغەمبەريشی ڕاسپاردبوو لەسەری بڕواو، ئەوەی كە وەحيمان كردووە بۆ خۆت و ئەوەی بە ئيبراهيم و مووساو عيسامان سپاردبوو لەسەری بڕۆن كە ئەوەتە دينی خوا ڕابگرن و پشتگوێی مەخەن و بەش بەش و كۆمەلّ كۆمەلّ مەبن تياياو گشت لەسەر يەك ڕێ بڕۆن.

---

١- الشوری: ١٣

فەرمویەتی ئاین ڕابگرن نەك ئاینەکان، هەروەها دەفەرموێت:

﴿ وَوَصَّىٰ بِهَآ إِبْرَٰهِـۧمُ بَنِيهِ وَيَعْقُوبُ يَـٰبَنِىَّ إِنَّ ٱللَّهَ ٱصْطَفَىٰ لَكُمُ ٱلدِّينَ فَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسْلِمُونَ ﴾[1] واتە: ئیبراهیم و یەعقووبی کوڕەزاشی هەر بەمە وەصیەتیان کرد بۆ کوڕەکانیان: کوڕەکانم خودا ئەم ئایینەی بۆ ئێوە هەڵبژاردووە، ئاگاتان لێی بێوله کیسی مەدەن و لەسەر غەیری ئاینی ئیسلام مەمرن.

هەروەها: ﴿ وَمَا تَنقِمُ مِنَّآ إِلَّآ أَنْ ءَامَنَّا بِـَٔايَـٰتِ رَبِّنَا لَمَّا جَآءَتْنَا ۚ رَبَّنَآ أَفْرِغْ عَلَيْنَا صَبْرًا وَتَوَفَّنَا مُسْلِمِينَ ﴾[2] واتە: تۆ ئەوەت لا خراپە کە ئێمە ئیمانمان هێنا بە موعجیزەکانی پەروەردگارمان کە هاتن بۆمان. ئەوەش ئەوپەڕی چاکییەو هی ئەوە نییە ئینسان پێی ناخۆش بێ. خودایا تۆیش سەبرو خۆگری بەسەر دڵماندا بڕێژەو بە موسوڵمانی بمانمرێنە.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ إِنَّ ٱلدِّينَ عِندَ ٱللَّهِ ٱلْإِسْلَـٰمُ ﴾[3] واتە: بێگومان ئاین لای خوا ئایینی ئیسلامە کە خودا بەیەك زانینەو پەیڕەوی کردنی ئەو شەریعەتەیە کە حەزرەتی محمدﷺ هێناویەتی.

لەبەرئەوە سەرجەم پێغەمبەران کاتێك نێردراون بۆ ناو گەلەکانیان فەرمویانە:

﴿ يَـٰقَوْمِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَـٰهٍ غَيْرُهُۥٓ ﴾[4] واتە: قەومینە! خودا بپەرستن، بێجگە لەو خودایەکی ترتان نییە.

ئەمانە شەریعەتەکانن نەك ئاینەکان کەواتە جیاوازیەکە لەشەریعەتەکاندایە نەك ئاینەکان، دیارە جیاوازی شەریعەتەکان لەئاکامی ژینگەوەیە.

---

١- البقرة: ١٣٢

٢- الأعراف: ١٢٦

٣- آل عمران: ١٩

٤- الأعراف: ٥٩

بەڵێ حەزرەتی عیسای کوڕی مەریەم (عليه السلام) دادەبەزێت لەبەرئەوەی دواکەسە لەپێش پێغەمبەرەوە ﷺ. دیارە لەنێوان حەزرەتی عیسا (عليه السلام) و پێغەمبەری ئیسلامدا پێغەمبەری تر نیە لەبەرئەوە نزیکترە لە پێغەمبەرەوە ﷺ.

پێغەمبەر ﷺ باسی سیماو ڕوخساری حەزرەتی عیسامان بۆ دەکات دەفەرموێت: ڕەنگی پێستی نە گەنم ڕەنگەو نە زۆر سپیەو لەو نێوەندەدایە، دوو بەرگی لەبەردایە سەری ئاوی لێ دەتکێ تەڕیش نەبووە. هەر لەگەڵ موسوڵمانان چاویان پێی دەکەوێت دەیناسنەوە، ئاو لەقژیەوە وەك دڵۆپە دەتکێتە خوارەوە بەسەر ڕوخساریدا بۆنێکی زۆر خۆشی لێ دێت خاچ دەشکێنێت کە کرابووە سومبولێك و ئەمەش لەخاچدان و کوشتن نیە، بەراز دەکوژێت، لەکاتێکدا خواردنیان کردبووە حەلاڵ بۆ خۆیان، لەکاتێکدا ئینجل لێی حەرام کردبوون، سەرانە دادەنێت، بۆ ماوەی (٤٠) ساڵ ئاشتی سەراپای زەوی دادەپۆشێت و بانگەواز بۆ ئیسلام دەکات، خوای گەورە لەو سەردەمەدا زۆرێك لەدینەکان لەناو دەبات جگە لە ئیسلام، هەر لەو سەردەمەشدا خوای گەورە مەسیحی دەجال لەناو دەبات.

ئارامی لەزەوی دا بەرپا دەبێت بەجۆرێك شێر لەگەڵ وشتردا یاری دەکات، پڵنگ لەگەڵ مانگادا، گورگ لەگەڵ مەڕدا، منالان یاری بەمار دەکەن و زیانیان پێ ناگەیەنێت. ئەو بارودۆخە ماوەی (٤٠) ساڵ دەخایەنێت پاشان حەزرەتی عیسا (عليه السلام) کۆچی دوایی دەکات و موسوڵمانان نوێژی لەسەر دەکەن.

## بەڵای گەورە:

دەرکەوتنی بەڵای هەرە گەورە لەپەیدابوونی (یەئجوج و مەئجوج) دایە لەسەردەمی حەزرەتی عیسادا ﷺ کاتێك ئەو گەلە دێن خەڵکیی دەکوژن و بەدڕەوشتی و خراپەکارییەکی زۆر لەسەر زەوی دا بڵاودەکەنەوە.

خوای گەورە وەحی بۆ حەزرەتی عیسا ﷺ دەنێرێت هەتا بەندەکانی لەلای (طور)دا ڕزگار بکات، زانایان زیاتر جەخت لەسەر ئەوە دەکەنەوە کە ئەو گەلە چینیەکان بن لەڕۆژهەڵاتی ئاسیاوە دێن، پێغەمبەر ﷺ پێناسەیانمان بۆ دەکات دەفەرموێت: (گەلی یەئجوج و مەئجوج) دێن ناوچەوانیان پانە و چاویان بچووکە، دەڵێی فیشەکە شێتەن ئەودالّ و سەوداسەرن).

جارێك پێغەمبەر ﷺ بەترسەوە لەخەو هەڵسا خاتوو عائیشە ترساو پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: وەیل بۆ عەرەب لەو شەڕەی کە لێیان نزیك بۆتەوە، ئەمڕۆ ئەو بەربەستەی (یەئجوج و مەئجوج) درزێکی تێکەوت دەڵێن بەیانی دەکرێتەوە، هەتا دەوترێت بەویستی خوا بەیانی دەکرێتەوە، دەکرێتەوە.



# یەکەم شوێنگەی ڕۆژی دوایی

## گەورە و بچوك وەکو یەکیان لێ دێت:

حەزرەتی عوسمان(ڕەزای خوای لێ بێ) دەفەرموێت یەکەم شوێنگەی ڕۆژی دوایی گیان دەرچون و ڕۆیشتنە ناو گۆڕە، ئەگەر ئەوە بەئاسانیی بوو ئەوا ئەوەی بەدوای ئەوەدا دێت ئاسانتر دەبێت، ئەگەر توند بوو ئەوا توند تر دەبێت

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ إِنَّكَ مَيِّتٌ وَإِنَّهُم مَّيِّتُونَ ﴾[1] واتە: بێگومان، ئەی موحەممەد! تۆ سەرەنجام ئەمریو ئەوانیش هەموو ئەمرن.

هەموو ئادەمیزادێك لەم دنیایەدا دەژی پاشان ساتی کۆچکردنی دێت، بۆیە دەبێت لەم ماڵەوە بڕوات بۆ ماڵی سەرەکی هەمیشەیی .

﴿ يَٰقَوْمِ إِنَّمَا هَٰذِهِ ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَا مَتَٰعٌ وَإِنَّ ٱلْءَاخِرَةَ هِىَ دَارُ ٱلْقَرَارِ ﴾[2]، واتە: ئەی خێڵەکەی خۆم! ئەم ژیانی دنیایە لە هۆیەکی ڕابواردن بەولاوە نییەو، خانەی بەردەوام و جێگای ئۆقرەگرتن ئەو دنیایە.

لەبەرئەوەی ئەوێ ژیانی سەرەکییەتی، خوای گەورە نیشانە بۆ هەندێك کەسی دەنێرێت وەکو پیر بوون، یاخود نەخۆشییەکی ئالۆز، ڕوداوێکی دیاری کراو وای لێ دەکات بەخۆیدا بچێتەوە، لەوانەیە گوناهێکت بۆ بنێرێت هەتا تەوبە بکەیت و بگەڕێیتەوە ئەوەش ببێتە هۆکارێك بۆ گەیشتن بەخوا.

---

١- الزمر: ٣٠

٢- غافر: ٣٩

مـردن لەکەسـی بەساڵاچـووەوە نـزیکتر نیـە وەك لـە کەسـی گـەنج یـاخود فریشتەی مـەرگ لەنەخۆشـەوە نـزیکتر نیـە وەك لەکەسـێکی تەندروسـت بـاش، وادەکانی فریشتەی مەرگ دیاری کراون و لەساتی خۆیانـدا کـاری خـۆی ئـەنجام دەدات:

﴿فَإِذَا جَآءَ أَجَلُهُمۡ لَا يَسۡتَأۡخِرُونَ سَاعَةٗ وَلَا يَسۡتَقۡدِمُونَ﴾[1]

مەرگ و مردن بـۆ بـاوەڕدار حەوانەوەیـە بـۆ بێبـاوەڕو تاوانبـار نائومێدییـە، نەخۆشی مەرگ لەدەروازەکانی ڕەحمەتی پەروەردگارە بـۆ بەنـدەکان، هۆکـاری دوورکەوتنەوەیـە لەخراپەکاریـەکان و سـڕینەوەی گوناهـەکان، بەرزبوونـەوەی پلەی منەتبارییە لەلایەن خوای پەروەردگارەوە بۆیە لانی کەم لەهەموو نوێژێکدا ئادەمیزاد لەیادی مردندا بێت واتە کاتێك نوێـژی کـرد وا بزانێـت دوای نوێژەکـە دەمرێت.

## نیشـانەکانی مردن:

مـردن بـە چـەند نیشـانەیەك دەناسـرێتەوە، لەوانـە زمـان دەبەسـتێت لـە قسـەکردن، ئـادەمیزاد دەباتـە جیهـانێکی تـرەوە، شـتانێك دەبینـێ کـە ئێمـە نابینین و لەژیانیشداین خوای گەورە دەفـەرموێت: ﴿فَكَشَفۡنَا عَنكَ غِطَآءَكَ فَبَصَرُكَ ٱلۡيَوۡمَ حَدِيدٞ﴾[2] واتە: وا ئێستا ئێمە پەردەی سەرچـاوتمان لاداو، چـاوت ئێسـتا زۆر تیژەو هەموو شتێ بە باشی ئەبینی. واتە: ئەوپەڕی ڕاستی شتەکان و گـەورەیی ڕۆژی دوایی دەبینێت.

شێخ حەسەنی بەصری بەلای کۆمەڵێکدا تێپەڕی دەگریان فەرمووی: لەوانەیە کەسـێکیان لێ مردبێـت، پاشـان فـەرمووی سـبحان الله: بـا بـۆ خۆیـان بگـرین،

---

١- الأعراف: ٣٤

٢- ق: ٢٢

مردووەکەیان لەسێ شت ڕزگاری بووە ئەمانە هێشتا لەدەستی دەرباز نەبوون: هاتنی فریشتەی مەرگ، ناڕەحەتیەکانی مردن، شوێنی لە بەهەشت یاخود دۆزەخ دا، با بۆخۆیان بگرین.

ژوورەکەت پڕ دەبێت لە فریشتەی مەرگ و هاوکارانی، دەبن بەدوو بەشەوە فریشتەی ڕەحمەت، فریشتەی سزا.

ئەگەر کردەوەکانی چاك بوون فریشتەی ڕەحمەت دادەبەزێت ئەگەر خراپیش بوو ئەوا فریشتەی سزا دێتە سەری.

فریشتەکان نازانن داخۆ کردەوەکانی کەسی مردوو چاك بووە یان خراپ هەتا لای پەروەردگارەوە سروشتیان بۆ نەیەت ئەوەتا خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿كَلَّآ إِذَا بَلَغَتِ ٱلتَّرَاقِيَ ۝٢٦ وَقِيلَ مَنْۜ رَاقٖ﴾[1] واتە: نەکەن دنیاتان لا لە قیامەت لەپێشتر بێ. کاتێ کە گیان ئەگاتە وردەگرێی ژوور قەفەزەی سنگ و، لە لایەن ئەوانەوە کە هاتوونەتە سەر کابرای حاڵی سەرەمەرگ، ئەوترێ: کێ نووشتەیەکی بۆ ئەکا بەڵکو نەمرێ.

فریشتەی مەرگ لە فریشتەی ڕەحمەت و فریشتەی سزا دەپرسێت دوای ئەوەی ڕۆحی ئەو کەسە بەرزدەبێتەوە. ئینجا فریشتەی ڕەحمەت دەڵێت: ئەو لەگەڵماندایە لەگەڵ چاکەکاراندا بۆیە لەگەڵ خۆیاندا دەیبەن، یاخود فریشتەی سزا دەڵێت: لەگەڵ ئێمەدایەو خەڵکی دۆزەخە، دەیبەن. ئەگەر ڕزگاری بێت ئەوا لە سەرەنجامێکی گەورە ڕزگاری بووە. ئەگەر ڕۆح پاك بوو ئەوا زۆر بەئاسانی لە جەستە جیا دەبێتەوە، ئەگەر پاکیش نەبوو ئەوا زۆر بە ئازارەوە دەردەچێت.

---

١- القيامة: ٢٦ - ٢٧

## شمەکەکانت درانەوە بەسەرتدا:

ڕۆح تایبەتمەندییەکە لای پەروەردگارو ئادەمیزاد دەرك بەهیچ شتێکیی ناکات ئایا ڕۆح دروستکراوێکی جوان و نورانییە؟ ئایا دروستکراوێکی بەرجەستە بووە؟ ئایا گەردونە؟ خوای گەورە لەو بارەیەوە دەفەرموێت:

﴿ وَيَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلرُّوحِ قُلِ ٱلرُّوحُ مِنْ أَمْرِ رَبِّى وَمَآ أُوتِيتُم مِّنَ ٱلْعِلْمِ إِلَّا قَلِيلًا ﴾[1]

واتە: لە بارەی ڕۆحەوە لێت ئەپرسن کە چیە؟ بڵێ: ڕۆح لەو مەخلووقانەیە کە بە ئەمرو فەرمانی خودای من پەیدابوون و، هەر خودا خۆی ئەزانێ چیە، ئێوە ئەندازەییێکی کەم نەبێ زانیاریتان پێنەدراوە، دیارە عەقڵی ماددیی کەموکوڕی ئێوە پەی بە شتی نامەحدوود ناباو نایزانێ.

دیارە ڕۆحە دەسەڵاتدارە بەسەر جەستەدا، بۆیە ناتوانین بڕیاری ئەوە بدەین داخۆ ئەو کەسە دۆزەخییە یان بەهەشتییە، هەروەها هیچ شتێك دەربارەی دەرچونی ڕۆح لەجەستە نەوتراوە تەنها بەم ئایەتە نەبێت کە ئاماژەی پێ داوە:

﴿ قُلْ يَتَوَفَّىٰكُم مَّلَكُ ٱلْمَوْتِ ٱلَّذِى وُكِّلَ بِكُمْ ﴾[2]

واتە: تۆ پێیان بڵێ: فریشتەی مەرگ کە کراوە بە بەرپرسی گیانکێشانتان، گیانتان ئەکێشێ و، پاش گیانکێشانتان ئەگێڕرێنەوە بۆ لای خوای خۆتان و لێتان ئەپرسێتەوە.

کاری دابڕینی ڕۆحەو دەرهێنانیەتی لەجەستە.

دەوترێت کاتی سەرەمەرگ حاڵەتێکە باس ناکرێت، ئیبن عباس(ڕەزای خوای لێ بێ) باسی ساتی سەرەمەرگی عەمری کوڕی عاصمان بۆ دەکات. وتی: عەمر هەست بەچی دەکەیت؟ وتی: وەکو چۆلەکەم لێ هاتووە لەهێلانەکەیدایەو ڕۆنی

---

١- الإسراء: ٨٥

٢- السجدة: ١١

تیایه لەژێریشیدا ئاگرێکی زۆر سوتێنەرە، ناتوانێت بفڕێت و خۆی دەرباز بکات و ناشمرێت هەتا بحەوێتەوە. پاشان فەرمووی: ڕۆحم وای لێ هاتووە دەڵێی بەکونی دەرزیدا ڕادەکێشرێت.

ئینجا فریشتەکانی ڕەحمەت دێن بەکاڵای بۆندارو کفنەوە کە لە بەهەشتەوە هێناویانە پاشان بەرەو ئاسمان بەرز دەکرێتەوەو دەروازەکانی ئاسمانی بۆ واڵا دەکرێت، بۆنێکی خۆشی لێ دێت، فریشتەکان بە خۆشەویسترین ناو کە خۆی پێی خۆشە بانگی دەکەن و سڵاوی لێ دەکەن، پاشان بەرەو (ملأ الأعلی) بەرزدەکرێتەوە ئەو کەسە بەو شێوەیە دەمێنێتەوە هەتا خوای گەورە دەفەرموێت: گۆڕی ئەم بەندەیەم بۆ فراوان بکەن بە ئەندازەی بینایی چاو، دەرگایەکیشی لێ بکەنەوە هەتا شوێنی خۆی لەبەهەشتدا ببینێت، لەو ساتەدا ئەو بەندەیە دەفەرموێت: خوایە زوو قیامەت بەرپا بکە.

ڕۆح لەگەڵ فریشتەکانی ڕەحمەتدا دێتە دەرەوە و بۆنێکی خۆشی هەیە، بەکردەوە چاکەکانی خوای گەورە بەرزی دەکاتەوە، ئەوەتا دەفەرموێت: ﴿ وَرَفَعۡنَٰهُ مَكَانًا عَلِيًّا ﴾[1]، بەڵام روحی خراپ بۆنێکی ناخۆشی لێ دێت لەبەر ئەو فەسادەی کە بڵاوی دەکاتەوە لە وشکانی و ئاویدا. ﴿ ظَهَرَ ٱلۡفَسَادُ فِي ٱلۡبَرِّ وَٱلۡبَحۡرِ بِمَا كَسَبَتۡ أَيۡدِي ٱلنَّاسِ ﴾[2] واتە: خراپە لە زەوی و لە دەریادا دیاری داوە بە هۆی ئەو شتانەوە کە دەستی ئادەمزاد ئەیانکا.

گوناه بۆنێکی هەیە تەنها فریشتەکان هەستی پێ دەکەن دیارە کردەوەی چاکیش بۆنی هەیە.

---

١- مريم: ٥٧

٢- الروم: ٤١

ڕۆحی بەندەی خراپەکار بەبۆنی زۆر ناخۆشەوە دەردەچێت بۆیە دەرگاکانی ئاسمانی بەسەردا دادەخرێت فریشتەکانی مەرگ دەڵێن ئەوە کێیە؟ !! دەڵێن: فلانی کوڕی فلان بەخراپترین ناوی دنیای ناوی دەبەن خوای گەورە دەفەرموێت: گۆڕی ئەم بەندەیەم بێننەوە یەك هەتا جەستەی لەبەریەك هەڵدەوەشێت و پڕی بکەن لەمارو دوپشك ئینجا دەرگایەکی بۆ بکەنەوە هەتا شوێنی خۆی لەدۆزەخدا دەبینێت، ئەو بەندەیە دەڵێت: خوایە قیامەت پێش مەخە، قیامەت پێش مەخە.

خەڵکیی لاشەکەی زۆر بەخێرایی بەرەو گۆڕستان هەڵدەگرن ئەگەر پیاوچاك بێت خێراییەکەی کەم دەبێتەوەو ئەویش دەڵێت: دوام مەخەن، ئەگەر دەزانن چ خێرێك چاوەڕێم دەکات ئەوا زۆر پەلەتان دەکرد لە بردنم. ئەگەر کەسێکی خراپ بوو دەڵێت بۆچی وا بەخێرایی دەمبەن ئەگەر دەزانن چ شەڕێك چاوەڕێم دەکات ئەوا لاشەکەمتان بەخێرایی نەدەبرد خاك بەسەر خۆم خاك بەسەر خۆم!!!

دەڵێن لەوساتەدا کەسی مردو لەکەسی زیندو چاکتر گوێی لەقسەیە لەوکاتەدا باشترین نزا بۆ کەسی مردوو ئەوەیە (اللهم اغفر له وثبته عند السؤال) واتە: خوایە لێی خۆشبەو لەکاتی پرسیار لێ کردنیدا ڕاوەستاوی بکە. کاتێك دەیخەنە ناو گۆڕەکەیەوە داوای لێخۆشبوونی لەخوا بۆ دەکەین چونکە لەو ساتەدا پرسیاری لێ دەکرێت.

## ئامادەکردنی مردوو:

یەکەم شت کە دەکرێت لەدوای مردنی کەسێك وەسیەتە (بۆیە دەبێت وەسیەت بنوسێت) گرنگترین بەندەکانی وەسیەت: کێ دەیشوات، کێ دەیخاتە گۆڕەوە، کێ نوێژی لەسەر دەکات.

نابێت مردوو شۆری زۆر لەو ژوورەدا هەبن کە لێی دەشۆرێت، پاشان ئەندامەکانی لاشەی دەجوڵێنرێت وەکو هەردوو قاچی و دەستی هەتا ئامادەی بکەین بۆ شتن، پاشان بە ئاوێکی شلەتێن نە ساردو نە گەرم چونکە هەستی پێ دەکات، پاشان دەست دەهێنرێت بەسەر سکی‌دا، هەتا ئەگەر پیسییەك لەسکی‌دا بێت بێتەدەرەوە، ئەو کونانە دەگرین کە ئەگەری ئازاری لێ دەکرێت، هەتا کەسی زیندوو ئازار نەدرێت لۆکە دەخرێتە دەم و لوت و چاوەکانی و هەردوو گوێیەوە تەنانەت دەرچەی کۆمی.

تەواوی جلەکانی لەبەر دادەکەندرێت و جلی تری لەبەر دەکرێت ئینجا وەك چۆن زیندوو خۆی دەشوات ئاوا ئەو مردووە دەشۆرێت، سەرەتا بەلای ڕاستی دەست پێ دەکرێت ئینجا لای چەپی، پاشان دەست نوێژی بۆ دەگیرێت بێ ئاو وەردان لەدەمی پاشان بەکفنی شەرعی بەرگ پۆش دەکرێت.

حەزرەتی ئەبوبەکر دەفەرموێت: هەر بەجلەکانی خۆمەوە کفنم بکەن چونکە کفن بۆ کرم و مارە بەرگە نوێیەکە بۆ زیندوو بهێڵنەوە.

کفنی شەرعیش بریتییە لەپارچە کاڵایەکی سپی کە پێویستە هەرزان بەهاو سادە بێت و ئاوریشم نەبێت، بۆ پیاو سێ پارچەیەو بۆ ژنیش پێنج پارچە، ئینجا مردوەکە بۆن خۆش دەکرێت و دەخرێتە ناو گۆڕەکەیەوە.

دیارە ئەو کەسەی کە مردووەکە دەشوات دەبێت دەستکێشی لەدەستدا بێت هەتا دەستی بەر لاشەی مردووەکە نەکەوێت.

لێرەدا جیاوازی لەنێوان زانایاندا هەیە لەسەر شتنی ئافرەت لەلایەن مێردەکەیەوە یاخود پیاو لەلایەن ژنەکەیەوە زۆرینەی زانایان لەسەر ئەم ڕایەن، بەڵام پێشەوا ئەبوحەنیفە پێی وایە دروست نییە چونکە گرێبەستیی هاوسەرییان بەمردنیان کۆتایی دێت، ئەگەر هەرکامێکیان وەسیەتیان کردبوو بۆیان جێبەجێ دەکرێت. هیچ قسەیەك نیە لەسەر شتنی بەتەواوی.

پاشان هەڵدەگیرێت ئەگەر ئافرەت بوو ئەوا کەسە مەحرەمەکانی هەڵیدەگرن (واتە ئەوکەسانەی کە بۆی نەشیاون ببێتە هاوسەریان) ئەمەش لەبابی ئەدەبە بۆ مەحرەمانی مردووەکە، ئەگەر مردوو دانی زێڕی لەدەمدا بوو دەردەهێنرێت.

ئەو کەسەی کە بە بۆمبێك یاخود تەقینەوەیەك یاخود گوللەی بەردەکەوێت یان لەفڕۆکەیەکدا دەکەوێتە خوارەوە یاخود لەئاودا دەخنکێت لەگەڵ ئەوکەسەی لەسەر پێخەفەکەی دەمرێت هیچ جیاوازییەکی نیە، لەو ساتەدا فریشتەی مەرگ دادەبەزێتە سەری و بەویست و دەسەڵاتی خوا گیانی دەکێشێت ئەگەر هەزاران کەس لەیەك ساتدا بمرن خوا ئەو توانایەی داوە بەفریشتەی مەرگ و ئەوەی لەگەڵیدایە کە بتوانێت ڕۆحەکان بکێشێت هەرچەند ناوی فریشتەی مەرگ لەقورئان و سوننەتدا نەهاتووە.

دیارە جوبرەئیل و ئیسرافیل و میکائیل و ئیزرائیل لەگەورە فریشتەکانی خوای پەروەردگارن جوبرەئیل سەرداری فریشتەکانەو ئەمینداری سروشتی خواییە، باشتر وایە بڵێن فریشتەی مەرگ لەجیاتی ئەوەی بڵێین عەزرائیل.

## سیمای فریشتە:

پێغەمبەر ﷺ فریشتەی مەرگی بینیوە. سەری لەئاسماندا بوو قاچەکانی و باڵی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوای زەوی داگرتبوو کاتێك پێغەمبەر ﷺ سەری سوڕما لەبینینی، فریشتەی مەرگ پێی فەرموو: ئەی ئەگەر ئیسرافیل ببینی چی دەڵێیت من لەچاو ئەودا وەك ئەڵقەیەکی فڕێدراو لەناو بیاباندا وام لەترسی خوا بچوك دەبمەوە وەکو چۆلەکەیەکی بچوك.

فریشتەکان ئێمە دەبینن ئێمە ئەوان نابینین، لەبەرئەوەی ئێمە هیچ پێویستییەکمان بەوە نیە بیانبینین بەڵام ئەوان ئێمە دەبینن بۆ چاودێری و

پاراستنمان و نوسینی کردەوە چاکەکانمان و بەشداری کردن لە جەنگەکاندا بەلاّم لەڕۆژی قیامەتدا دەیانبینین.

فریشتەی مەرگ گیان کێشانی سەرجەم زیندەوەران دراوەتە دەستی لەهەر کات و ساتێکداو هەر ژمارەیەك بێت، لاشەی پارچە پارچە بوو ڕزیو خوای گەورە کۆی دەکاتەوە، لەصەحیحی موسلیمدا هاتووە دەڵێت جولەکەیەك هەبوو لەپێش ئێمەدا وەسیەتی بۆ کوڕەکانی کردو وتی: ئەگەر مردم لاشەکەم بسوتێنن و نیوەی بلاّو بکەنەوە لەوشکاییداو نیوەکەی تریشی بخەنە دەریاوە، ئەوانیش وەسیەتەکەی باوکیان جێبەجیّ کرد، خوای گەورە فەرمووی ئەی وشکانی ئەوەی لەئامێزتدایە کۆی بکەرەوە تۆش ئەی دەریا ئەوەی لەناختدایە کۆی بکەرەوە ئینجا پێی فەرموو چی وای لێکردی ئەو وەسیەتە بکەیت؟ وتی: لەترسی تۆ خوایە خوای گەورە پێی فەرموو: ئەوا لێت خۆشبوم خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿ قَدْ عَلِمْنَا مَا تَنقُصُ ٱلْأَرْضُ مِنْهُمْ وَعِندَنَا كِتَٰبٌ حَفِيظٌ ﴾[1] واتە: ئێمە بەڕاستی ئەزانین زەوی چەند لە لەشی ئەوان کەم ئەکاتەوە کە ئەیڕزێنیّ و ئەیکا بە خۆلّ و، کتێبیّ لای ئێمە هەیە بەدرێژی بەسەرهاتی هەموو کەسێکی تیایە چیی لیّدیّ و چیی بەسەردیّ.

هەموو شتێکی ئینسان لەناو دەچێت تەنها (عجب الذنب) نەبێت بریتی‌یە لەئێسقانێکی بچوك دەکەوێتە بەشی خوارەوەی بڕبڕەی پشت، هەموو مردویەك دەشۆرێت تەنها شەهید نەبێت، شەهید کاتێك دەمرێت هەست بەئازاری مردن ناکات بەئەندازەی دەرزییەك نەبێت کەدەچێت بەجەستەدا. نابێت بەدەنگی بەرزەوە زیکر بکرێت ڕۆژێك کوڕەکەی حەزرەتی عومەر لەدوای جەنازەیەکەوە

---

١- ق: ٤

دەڕۆیشت پیاوێك بەدەنگی بەرز وتی: یادی خوا بکەن و داوای لێخۆشبوونی لێ بکەن. ئەویش فەرمووی: بێ دەنگبە خوا لێت خۆش نەبێت.

عەمری کوڕی عاص (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: کاتێك مردم ڕێگە مەدەن ئەو کەسانە بێنە ژورەوە بۆ لام کە جلی سوریان لەبەردایە. وتیان بۆچی، وتی لەوە دەترسم ڕۆحەکەم وا بزانێت ئاگرە، چونکە هەر جوڵەیەکی ناسروشتی مردوو دەترسێنێت.

لەبەرائی کوڕی عازبەوە(ڕەزای خوای لێ بێ) هاتووە دەڵێت لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ چوینە دەرەوە بەدوای جەنازەیەکی ئەنصاریدا گەیشتینە لای گۆڕەکەی هێشتا بەردی نەدرابوو بەسەریدا، پێغەمبەر ﷺ لەسەر گۆڕەکەی دانیشت و ئێمەش لە دەوروبەریدا دانیشتین لەوکاتەدا باڵندە بەسەر سەرماندا دەسوڕایەوە، چیلکەیەکی بەدەستەوە بوو دەیهێنا بەسەر زەویەکەدا، پاشان فەرمووی، پەنا بەخوا بگرن لەسزای ناوگۆڕ ئەمەی دوو سێ جار دووبارە کردەوەو فەرمووی کاتێك بەندەی خوا لەدنیا دادەبڕێت و بەرەو ڕۆژی دوایی دەڕوات فریشتەی ئاسمان دادەبەزنە سەری ڕوخساریان سپی وەکو خۆر وایە کفن و بۆنی تایبەتی بەهەشتیان پێیە هەتا بەئەندازەی بینایی چاو بەدەوریدا دادەنیشن پاشان فریشتەی مەرگ لە ڕاسەریەوە دادەنیشێت و دەڵێت: ئەی ڕۆحە پاکەکە وەرە دەرەوە بۆلای لێخۆشبوون و ڕەزامەندنی خوای پەروەردگار.

لە گێڕانەوەیەکی تری ترمذی دا هاتووە دەفەرموێت: وەرە دەرەوە بۆلای لێخۆشبون و ڕەزامەندی خوایەکی لێ خۆشبووی تورە نەبوو، فەرمووی: ڕۆحی وەکو ئەو قەترە ئاوەی کە بەلێوانی دەفرێکەوەیە دەتکێت ئاوا لەدەستیدا بەئەندازەی چاو تروکانێك ناهێڵێتەوەو دەیدات بەفریشتەکانی ڕەحمەت ئەوانیش لەو کفنەو بۆنە خۆشەدا هەڵی دەگرن کەبۆنی لەخۆشترین عەتر کە

لەزەویدا هەیە بەهەر شوێنێکیدا کە دەڕوات هەر کۆمەڵە فریشتەیەکی پێ دەگات و دەڵێن: ئەو ڕۆحە پاکە کێیە؟ دەڵێن هی فلانی کوڕی فلانەو بەجوانترین ناوی خۆی بانگی دەکەن. هەتا دەیگەیەننە کۆتایی ئاسمانی دونیا لەهەر ئاسمانێکدا بەدوای جەنازەکەوە دەبن وەکو ئەوەی لە کۆچی میعراجدا بن هەتا دەگاتە ئاسمانی حەوتەم، خوای گەورە دەفەرموێت نامەی کردەوەکانی ئەم بەندەیەم لە (علیین)دا بنوسن و پاشان بیگێڕنەوە بۆ سەر زەوی چونکە من لەوێوە بەدیم هێناون وە دەیانگێڕمەوە بۆ ئەوێ و جارێکی تریش لەوێدا دەریان دەهێنمەوە.

فەرمووی: ڕۆحەکەی دەگەڕێتەوە ناو جەستەی و پاشان دوو فریشتە لەناو گۆڕەکەیدا دادەنیشن و دەڵێن: خوای تۆ کێیە. دەڵێت الله خوامە، خوای گەورە دەفــــــــەرموێت: ﴿ يُثَبِّتُ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ بِٱلْقَوْلِ ٱلثَّابِتِ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَفِى ٱلْءَاخِرَةِ وَيُضِلُّ ٱللَّهُ ٱلظَّٰلِمِينَ وَيَفْعَلُ ٱللَّهُ مَا يَشَآءُ ﴾[1] واتە: خوا لە دنیاو لە ڕۆژی قیامەتدا ئەوانە دامەزراو ئەکا کە باوەڕیان بە وتەی چەسپاوی (لا الە الا الله) هەیە. لە دنیادا ناهێڵێ پێیان هەڵخلیسکێ و لە باوەڕی خۆیان پەشیمان ببنەوەو، لە ڕۆژی قیامەتیشا ناهێڵێ لە کاتی وەڵامدانەوەدا زمانیان تەتەڵە بکاو وەڵامیان پێ نەدرێتەوە. ستەمکارانیش کە ستەمیان لە خۆیان کردووە، خوا گومڕایان ئەکات چونکە بیریان نەئەکردەوە تا ڕێی ڕاست بدۆزنەوەو هەر لەسەر چاولێکەریی باوو باپیرانیان ئەڕۆیشتن. خودا هەرچی مەیل لێ بێ ئەیکات.

هەروەها دەفەرموێت: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ قَالُوا۟ رَبُّنَا ٱللَّهُ ثُمَّ ٱسْتَقَٰمُوا۟ تَتَنَزَّلُ عَلَيْهِمُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ أَلَّا تَخَافُوا۟ وَلَا تَحْزَنُوا۟ وَأَبْشِرُوا۟ بِٱلْجَنَّةِ ٱلَّتِى كُنتُمْ تُوعَدُونَ ﴿٣٠﴾

---

١- إبراهيم: ٢٧

﴿نَحْنُ أَوْلِيَآؤُكُمْ فِي ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَفِي ٱلْآخِرَةِ﴾[1] واتـه: بەڕاستی ئـەو كەسـانەی وتوویانە: پەروەردگاری ئێمە زاتی خوایەو، پاش ئەو دان پیانانەیان لەسەر باوەڕ بەو قسەیان و فەرمانبەرداری كردنی خوا بەردەوام بوون، ئەوانە فریشتە دێنە خوارەوە بۆ سەریان و پێیان ئەڵێن : لە هیچ مەترسن و خەفەتی هیچ مەخۆن و خۆش مژدە بن بەو بەهەشتەی لەسەر زمانی پێغەمبەران گفتتان پێ ئەدرا كە بۆتان ئەبێ. هەروا پێیان ئەڵێن : ئێمە لە ژیانی دنیاو لە قیامەتا دۆستی ئێوەین.

هەروەها لە فەرمایشتی پێغەمبەری خواوە ﷺ هاتووە دەفەرموێت: ((بەندە پێش ئەوەی ئەو دوو فریشتەیە بچنە ناو گۆڕەكەیەوە فریشتەیەكی ڕوخسار جوان دەچێتە لای مردووەكە پێی دەڵێت تۆ كێیت؟ ئەم جوانییەی تۆ خێر نەبێت هیچی تری پێوە نیە، پێی دەڵێت من كردەوە چاكەكانی خۆتم، من دەبمە هاوڕێ و هاونشینیت هەتا ڕۆژی دوایی، ئێستا دوو فریشتە دێنە لات لە دایك و باوكت میهرەبانترن بۆت، ئەوەو ئەوەت لێ دەپرسن و تۆش واو وا وەڵامیان بدەرەوە)).

## گۆڕ و هاتنەوەیەكی گۆڕ...

كاتێك فریشتە لەپاڵ باوەڕداردا دادەنیشێت، دانیشتێكی ویژدانییە، تیشكی خۆر لەساتی ئاوابوونیدا زەردەخەنەی بۆ دەكات ئەو كاتەی كەبەو دوو فریشتەیە دەڵێت: وازم لێ بێنن خەریكە نوێژی عەسرم لەدەست دەچێت ئەوانیش پێی دەڵێن: ئەی بەندەی خوا تۆ ئێستا لە خاكی بەرزەخدایت، لێرەدا لێپرسینەوە هەیە نەك كردەوە.

---

١- فصلت: ٣٠ - ٣١

کردەوە چاکەکانی دێتە لای و گۆڕەکەی دێتـەوە یـەك و زەوی دەڵێـت: ئـەی بەندەی خوا ئەی فلانی کوڕی فلان تۆ خۆشەویستترین بەندەی خوا بووی لـەلام کە لەسەر پشتم دەژیایت، ئێستا دەبینیت چیت لێ دەکەم، گۆڕەکەی بۆ فـراوان دەکات بەبینایی چاو.

هەروەها دێتە لای بێباوەڕی خراپەکارو پێی دەڵێت: ئەی بەندەی خـوا ئـەی فلانی کـوڕی فـلان تـۆ خـراپترین بەنـدەی خـوا بـووی لـەلای مـن وە لـە هـەموو بەندەکانی خوا زیاتر ڕقم لەتۆ بـوو ئەوکاتانـەی لەسـەر پشـتم دەژیایـت، ئێسـتا دەبینیت چـیت لێ دەکـەم گۆڕەکـەی لێ دەهێنێتـەوە یـەك هـەتا جەسـتەی وردو خاش و لەیەك جیادەکاتەوە.

کەواتـە ئـەوەی لەگۆڕدایـە ئـەم شـوێنە تـەنگ و تاریکـەی لێ دێتـەوە یـەك وکەسیش لێی دەرباز نابێت، ئەوەتا پێغەمبەر ﷺ دەفـەرموێت: ئەگـەر کەسـێك لێی دەرباز ببوایە ئەوا سەعدی کـوڕی مـەعاز(ڕەزای خـوای لێ بـێ) لێـی دەربـاز دەبوو گۆڕ بەتوندی باوەڕدار دەگوشێت بەخۆیەوە وەك چۆن دایك ڕۆڵەی خـۆی لەساتی سۆزو شیرپێدانیدا کۆرپەی بەسـنگیەوە دەنوسـێنێ، بـەلام بـۆ کەسـی خراپەرکار بەجۆرێك دێتەوەیەك جەستەی شەقار شەقار دەبێـت بۆیـە پێغەمبـەر ﷺ دەفـەرموێت: (داوای لێخۆشـبوون و دامـەزراوی بکـەن بـۆ براکـەتان چـونکە ئێستا پرسیاری لێ دەکرێت)[1].

## پرسـیاری نـاو گـۆڕ:

مردوو چوار پرسیاری لێ دەکرێت ئەویش بەزمانی حاڵ وەلام دەداتـەوە نـەك بەزمانی قسە پێکردن ئینجا هەردوو فریشتەی نـەکیرو مونکـەر پرسـیارەکانی لێ دەکـەن: کـێ پەروەردگارتـە؟ دەڵێـت: خـوا پەروەردگارمـە (ئەمـە لـەکردەوە

---

١- سنن أبو داود.

چاکەکانیەوە دەبێت) دەڵێن: ئاینەکەت چیە؟ دەڵێت: ئاینی ئیسلامە. دەڵێن: چی دەڵێی لەبارەی ئەو پیاوەی بۆتان نێردرابوو؟ ئەویش دەڵێت: ئەو پێغەمبەری خوایە ﷺ. دەڵێن: زانینت چیە؟ دەڵێت: قورئانی خوام خوێندەوەو باوەڕم پێهێناوەو بڕوام پێ کرد.

ئینجا لە ئاسمانەوە بانگەواز دەکرێت بڕوا بەو بەندەیەم بکەن لەو وەڵامانەی کەدایەوە گۆڕەکەی لە بەهەشت بۆ ڕابخەن هەر لە بەهەشت بەرگی پێ بپۆشن و دەرگایەکی بەهەشتی بۆ بکەنەوە ڕۆحەکەی پێ ئاشنا بکەن پاشان بەئەندازەی بینایی چاو گۆڕەکەی بۆ گەورە بکەن پیاوێکی ڕوخسار جوانی ڕێك پۆش و بۆن خۆش دێت بۆلای و مژدەی دەداتێ و پێی دەڵێت: ئەوە ڕۆژی تۆیە. ﴿هَٰذَا يَوْمُكُمُ الَّذِي كُنتُمْ تُوعَدُونَ﴾[1] واتە: ئەمە ئەو ڕۆژەی خۆتانە کە گفتتان ئەدرایێ پێی.

کەسی مردووش پێی دەڵێت: تۆ کێیت، تۆ ئەو ڕخسارەیت کە تەنها خێرت پێیە. ئەویش دەڵێت: من کردەوە چاکەکانی خۆتم. دەڵێت: خوایە قیامەت بەرپا بکە هەتا بگەڕێمەوە ناو کەس و کارو ماڵی خۆم.

کاتێك بەندەی بێباوەڕ لەدنیا دادەبڕێت و ڕوودەکاتە ڕۆژی دوایی، چەند فریشتەیەکی ڕەش و ناوچەوان تاریك دادەبەزنە سەری، پۆشاکی زۆر بۆن ناخۆشیان پێیە و دڕکی تیایەو لەڕاسەریەوە دادەنیشن دەڵێن: ئەی ڕۆحە پیسەکە بڕۆرە دەرەوە بەرەو خەشم و تووڕەبونی خوایی. وتی: جەستەی لەیەك جیادەبێتەوە بۆ یەك چاو تروکاندن جێی ناهێڵن پاشان ڕۆحی لێ دەردەکێشن وەك چۆن سیخ لەخوری تەڕکراو دابماڵی بەلای هەر کۆمەڵە فریشتەیەکدا تێ

---

١- الأنبياء: ١٠٣

دەپەڕن دەڵێن: ئەم ڕۆحە پیسە چىیە؟! دەڵێن: ئـەم ڕۆحـە هـی فلآنـی کـوڕی فلآنەو بەخراپترین ناوی لەدنیادا بانگی دەکەن.

هەتا دەگاتە کۆتایی ئاسمانی دونیا دەیانەوێت دەرگایان بۆ بکرێتـەوە بـەڵام ناکرێتەوە پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ ئەم ئایەتەی خوێندەوە:

﴿لَا تُفَتَّحُ لَهُمْ أَبْوَابُ السَّمَاءِ وَلَا يَدْخُلُونَ الْجَنَّةَ حَتَّىٰ يَلِجَ الْجَمَلُ فِي سَمِّ الْخِيَاطِ﴾[1]

واتە: بێگومان ئەوانەی باوەڕ بە ئایەتەکانی ئێمە ناکـەن و خۆیـان بـە گـەورەتر ئـەزانن لـەوەی ئیمانیـان پـێ بهێـنن، ئەوانـە هـەرگیز دەرگـای ئاسمانیـان بـۆ ناکرێتەوەو، ڕەحمەتی خودا ڕوویـان تـێ ناکـات و، تـا وشـتر نەچێت بـە کونی دەرزیدا ئەوانیش ناچنە بەهەشت، کە مەحاڵە وشتر بچێ بە کونی دەرزیدا.

ئینجـا خـوای گـەورە دەفـەرموێت: نامـەی کردەوەکـانی لەچـاڵی چـاڵایی (سجین)دا بـۆ بنوسـن ﴿كَلَّا إِنَّ كِتَابَ الْفُجَّارِ لَفِي سِجِّينٍ﴾[2] واتـە: بـا ناتـەواوپێوو ناتەواوکێشـەکان دەسـبەرداری ئـەم کـارە خراپـەیان بـبن، سـیاهەی کـردەوەی پیاوخراپان لە (سیجین) دایە.

ئینجا ڕۆحی وەکو بـەردێك فـڕێ دەدرێـت وا هەسـت دەکـات لەشـوێنێکەوە فڕێ درابێتە خوارەوە پاشان ئەم ئایەتـەی خوێنـدەوە: ﴿وَمَن يُشْرِكْ بِاللَّهِ فَكَأَنَّمَا خَرَّ مِنَ السَّمَاءِ فَتَخْطَفُهُ الطَّيْرُ أَوْ تَهْوِي بِهِ الرِّيحُ فِي مَكَانٍ سَحِيقٍ﴾[3] واتـــــە: هەرکەس هاوبەش قەرار بـدا بـۆ خـوا وەك ئـەوە وایـە لـە ئاسمانـەوە بەرببێتـە خوارەوەو پەلەوەر بێنە سەر کەلاکەکەیو گۆشتەکەی بفـڕێنن و بیخـۆن، یـاخود

---

١- الأعراف: ٤٠

٢- المطففين: ٧

٣- الحج: ٣١

وەك کەسێك وایە بایەكی توند هەڵگاو بیبا فڕێی بداتە شوێنێكی دووری وا كەس پێی نەزانێ. مەبەست لەوەیە ئەو كەسە كابرایەكی بێ سەرو شوێنە.

ئینجا ڕۆحەكەی دەگەڕێتەوە جەستەی ئینجا دوو فریشتە دێنە لای و پێی دەڵێن: خوای تۆ كێیە؟ ئەویش دەڵێت: نازانم پێی دەڵێن ئەی ئاینەكەت چیە؟ دەڵێت: نازانم پێی دەڵێن: ئەی دەربارەی ئەو پیاوە چی دەڵێیت كەنێردرا بۆ لاتان. هەر دەڵێت: نازانم.

ئینجا كەسێك بانگ دەكات درۆی كرد، دەی ئاگری دۆزەخی بۆ ڕاخەن دەرگایەكی دۆزەخی بۆ بكەنەوە، گەرمایی و ئازاری بۆ دێت و گۆڕەكەی لێ دێنێتەوە یەك بەجۆرێك لاشەی لە یەك دەبچڕێنێت ئینجا پیاوێكی ڕوخسار ناشرین و بۆن ناخۆش دێت بۆ لای و پێی دەڵێت: مژدەت لێ بێ بەوەی كە پێت ناخۆشە، ئەمە ئەو ڕۆژەیە كە وادەت پێ دەدرا.

## چەند هەڵوێستێك لەسەر غەیب (نادیار):

* جارێك سوفیانی ثەوری (ڕەزای خوای لێ بێ) بەلای گۆڕستانێكدا تێدەپەڕی بەرەو نوێژی هەینی دەڕۆیشت وتی: ئەی خەڵكی گۆڕەكان سڵاوتان لێ بێت، ئێوە پێشكەوتن و ئێمەیش بەویستی خوا پێتان دەگەین، داوا لەخوا دەكەم منیش و ئێوەش سەلامەت بكات، لە تەنیایی دەربازین لە كاتی غەریبیتاندا لەگەڵتان بێت، چاكەكانتان وەربگرێت، لە خراپەكارەكانیشتان خۆش بێت، لە خەویدا خەڵكانێكی بینی كفنەكانیان ڕادەكێشان دەیانوت: مامۆستا، بۆچی سەردانمان ناكەیت ئێمە بەهاتنت زۆر خۆشحاڵ دەبووین.

* لە جەنگی یەمامەدا هەر لەگەڵ جەنگ دەستی پێ كرد موسوڵمانان ڕایانكرد ئەوەبوو ثابتی كوڕی قەیس و حوزەیفەی كوڕی یەمان(ڕەزای خوایان لێ بێ) فەرموویان: ئێمە لەگەڵ پێغەمبەری خوادا وانەبووین ئینجا چاڵێكیان

هەڵكەند هەتا كەس بیر لە ڕاكردن نەكاتەوە چونكە سوپاكەی موسەیلەمە هێرشیان بردە سەر موسوڵمانان، خالید سوێندی خوارد ئەگەر بچێتە ناو باخچەكەوە بۆیان كارێكیان پێ دەكات با بەدەواری شڕی نەكردبێت ئەوە بوو هەردووكیان شەهید بوون واتە ثابت و حوزەیفە، یەكێك لەناو موسوڵمانان قەڵغانەكەی ثابتی لەقۆڵی داكەندو ڕایكرد، یەكێكی تر لەهاوەڵان بەهۆی زۆر ماندوبوونیەوە لەقۆناغی یەكەمی جەنگەكە وەنەوز بردیەوەو خەوی لێ كەوت ثابتی كوڕی قەیسی بینی، ثابت وتی: فلان وا نەزانی ئەمە خەوە، من قسەت لەگەڵدا دەكەم قەڵغانەكەم پیاوێك دزی و ڕایكردو خستیە چاڵێكەوە لای خێمەكەی خۆی قاپێكی بەسەرەوەیەو بەردێكی گەورەی خستۆتە سەری. ئەمە بەخالید بڵێ، ئەگەر خالید قەڵغانەكەی هێنایەوە بابیبات بۆ حەزرەتی ئەبوبەكر(ڕەزای خوای لی بێ) جێنیشنی پێغەمبەری خوا ئەویش بیفرۆشێت قەرزاری دوو كەسم، با خزمەتكارەكەشم ئازادبێت لەپێناوی خوادا.

ئەو هاوەڵە لەخەوەكەی هەڵسا ئەمەی بۆ خالید گێڕایەوە، خالیدیش ڕۆیشت بۆ كۆتایی سەربازگەكەی و بەو ناونیشانە بەردەكەی بەرزكردەوە مەنجەڵەكەی بینیو قەڵغانەكەی دۆزییەوە، كاتێ گەڕایەوە بۆ مەدینە قەڵغانەكەی دایەوە بەحەزرەتی ئەبوبەكر ئەویش فەرمووی: سوێند بەخوا وەسیەتەكەی جێبەجێ دەكەم.

* سەعیدی كوڕی زەید هاوسەری فاطمەی كچی خەتاب بوو(ڕەزای خوایان لێ بێ) یەكێكە لە (١٠) مژدە پێدراوەكەی بەهەشت لەجەنگدا بوو كە تەواو بوو ڕۆیشت كەمێك بخەوێت براكەی پاسەوانیی دەكرد، لەناكاو ئەو برایەی گوێی لەسەعید بوو بەدەنگی بەرز هاواری دەكرد: وەڵلاهی ئەی عەیناو مەرضیە نامەوێت بگەڕێمەوە، براكەی گومانی برد سەعیدی برای بەهۆی كەم خەوییەوە وڕێنە دەكات بۆیە لەخەوەكەی بەئاگای هێنایەوە، سەعید پێی وت: خوا

پاداشتی خێرت بداتەوە، براکەی پێی وت: خێر بوو؟ سەعیدیش وتی: خەوێکم بینی، براکەی پێی وت: ئادەی بۆم بگێڕەرەوە سەعیدیش وتی: سوێندت دەدەم بەخوا هەتا نەمرم بۆ کەسی نەگێڕیتەوە، وتی: بەڵێ

سەعیدیش وتی: کاتێک خەوم لێ کەوت وەکو ئەوەی ڕۆژی قیامەت بەرپابووبێ کەسێك لەئاسمانەوە بانگی کرد خوا لەسەعیدی کوڕی زەید خۆش بووە، ئینجا دوو فریشتە هاتن (٣) ئەسپیان پێ بوو پێیان وتم: سواربە. وتم: بۆ کوێ؟ وتیان: بەرەو شوێنەکەت لەبەهەشتدا لەبەردەرگای بەهەشتدا چەند ئافرەتێکی زۆر جوان وەستابوون لەمانگی تابان دەچوون وتم: ئەمە ئەو حۆریانەن کە خوای گەورە لەقورئاندا بۆی باس کردوین، وەڵامیان دامەوە نەخێر ئێمە کارەکەری یەکێك لەکارەکەرەکانی ئەوانین چەند زیاتر نزیك دەبومەوە ئافرەتی جوانترم دەبینی هەتا گەیشتم بە (٣) ئافرەتیان لەناو ئەو سێ ئافرەتەدا یەکێکیان وەکو خۆر وابوو!!! پێی وتم: بەخێربێی سەعید تۆ ئێستا لەدنیادایت بەڵام دوای سێ ڕۆژ لەلای ئێمە دەبیت. منیش وتم: نەبەخوا نامەوێت بڕۆمەوە بۆ دنیا، بەخوا نامەوێت بگەڕێمەوە بۆ دونیا سڵاوت لێ بێ عەیناو مەرضیە ئیتر تۆ هەڵت ساندم.

ئیتر لەوکاتەوە ئەو برایەی چاودێریی سەعیدی دەکرد، لەڕۆژی پێنج شەممەدا بەڕۆژو بوو تیشکی خۆر خەریك بوو دەکەوتە پشتی چیاکەوە لەناکاو ڕمێکی بۆ هات یەکسەر کەوت بەزەویدا براکەی بەرەو لای ڕایکرد وتی: کوا بەریانگەکەت سەعید؟ وتی: لەشوێنێکی ڕاست دایە لای خوای باڵادەست، بەخێربێی عەیناو بەخێربێی مەرضیە.

* حەنزەڵەی کوڕی عامر(ڕەزای خوای لێ بێ) یەکەم شەوی زاوایەتی بوو پێش بانگی بەیانی بانگەواز کرا بۆجەنگ، ئەویش لەبەر پەلەیی خۆی لەبیری چوو لەشگرانی خۆی دەربکات و ڕۆشت بۆ جەنگەکە، ئەوەبوو خوای گەورە

شەهیدبوونی پێ بەخشی، کاتێك هاوەڵانی لاشەکەیان بینی تەڕ بوو ئاوی لێ دەچۆڕا وتیان: ئەمە چیە ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ خۆ ئێمە لە بیاباندابن؟!! فەرمووی فریشتەکان شتویانە. پێغەمبەر ﷺ لەلای نوکی پەنجەیەوە نوێژی لەسەرکرد! وتیان: سەیرە ئەی پێغەمبەری خوا، فەرمووی: بەهۆی زۆری فریشتەکان کە لەسەری نوێژدەکەن.

## سزای گۆڕ لە قورئان و سوننەتدا:

پێغەمبەر ﷺ لە جەنگی بەدردا بانگی مردووی کافرەکانی دەکرد فەرمووی: (من ئەوەی خوا وادەی پێ دام هاتە دی ئەی ئەوەی خوا وادەی بە ئێوە دابو هاتە دی)[1]. هاوەڵان وتیان: یارسول الله مردوو گوێی لەقسە دەبێت؟ فەرمووی: بەڵێ گوێیان لێیەتی بەڵام ناتوانن وەڵام بدەنەوە.

تاقمی موعتەزیلە بڕوایان بەسزای گۆڕ نیە هەندێك لە ظاهری و خەوارجەکانیش بەهەمان شێوە هەروەها قورئانیەکان کە بەتەواوی نکۆڵی لە سوننەت دەکەن خوای گەورە سەربارەت بە (آل فرعون) دەفەرموێت: ﴿ ٱلنَّارُ يُعۡرَضُونَ عَلَيۡهَا غُدُوّٗا وَعَشِيّٗاۚ وَيَوۡمَ تَقُومُ ٱلسَّاعَةُ أَدۡخِلُوٓاْ ءَالَ فِرۡعَوۡنَ أَشَدَّ ٱلۡعَذَابِ ﴾[2]

واتە: سزا بەدو ناهەموارەکەیش ئاگری دۆزەخە کە بەیانی و ئێوارە ئەبرێنە سەیرو تەماشایو گوزەریان پێئەکرێ بەلایاو، کە ڕۆژی قیامەتیش دێ فەرمان لای خواوە دێ کەوا دەستەو دائیرەی فیرعەون بخەنە ناو سەختترین سزاوە.

پێغەمبەر ﷺ کاتێك ئەنصاریەك مردو خستیانە ناو گۆڕەوە چیلکەیەك کە بەدەستیەوە بوو هێنای بەزەویەکەدا و فەرمووی: پەنا دەگرم بەخوا لەسزای گۆڕ.

---

١- رواه مسلم.

٢- غافر: ٤٦

## لەهۆكارەنی بەد ڕەوشتی و تیاچوون:

لەجەمرەی كوڕی جەندەلەوە هاتووە پێغەمبەر ﷺ نوێژی بەیانی بۆ كردین كە تەواوبووین فەرمووی: كێ لەئێوە ئەمشەو خەوی بینیوە؟ بۆیە هەریەكێك لەئێمە هەر خەوێكی بینیبو گێڕایەوە.

ڕۆژێك لەڕۆژان وتیان: نەخێر، فەرمووی: بەڵام ئەمشەو دوو پیاو هاتن بۆ لام و دەستیان گرتم بردیانم بۆ ناو خاكی پیرۆز پیاوێك دانیشتبوو، پیاوێكیش بەپێوە وەستا بوو قولاپێكی ئاسنی بە دەستەوەبوو، ئەو قولاپەی دەكردە ناو ڕوومەتیەوەو لەپشتە ملیەوە دەری دەهێنایەوە، پاشان هەمان شتی دەكرد بەلا ڕوومەتەكەی تریدا. هەردوو لاڕوومەتی یەكیان دەگرتەوەو دیسانەوە هەمان كاری دووبارە دەكردەوە.

وتم: ئەمە چیە؟ وتی: دەرچۆ، دەرچوین. هاتین بەسەر پیاوێكدا لەسەر پشت ڕاكشابوو پیاوێكی تر بە بەردێكەوە لەسەر سەری وەستابوو سەری دەشكاند و چاك دەبوەوەو دیسانەوە دەگەڕایەوە بەردەكەی پیا دەكێشایەوە.

وتم: ئەمە كێیە؟ وتی: دەرچۆ. چوینە سەر دەلاقەیەك وەكو تەنور وابوو دەمەكەی تەسك بوو ناوەوەی فراوان بوو لەژێریەوە ئاگرێك هەڵگیرسابوو كاتێك ئاگرەكەی بەرز دەبووەوەو دەكەوتنە هاوارو بگرەو بەردە هەتا وایان لێدەهات خەریكبو دەهاتنە دەرەوە پاشان ئاگرەكە خامۆش دەبوو دەگەڕانەوە ناوی.

وتم: ئەمە كێیە؟ وتی: برۆ، ڕۆیشتین هەتا چوینە سەر ڕووبارێكی خوێنین پیاوێكی تیابوو لەسەر ناوەڕاستی ئاوەكە وەستابوو، لە ڕۆخی ڕووبارەكەش پیاوێكی لێ بوو بەردێك لەنێو دەستیدابوو كاتێك ئەو پیاوە دەیویست لە ئاوەكە بێتە دەرەوە پیاوی سەر ڕۆخی ڕووبارەكە بە بەردەكەی دەستی دەیدا بەدەمیداو دەیگێڕایەوە ناو دەریاكە.

وتم: ئەمە كێیە. وتی: دەرچۆ. دەرچوین هەتا گەیشتینە باخچەیەكی سەوزو درەختێكی زۆر گەورە لەژێریدا پیاوێكی بەتەمەن و دوو منداڵی تیابوو پیاوێكیش لەنزیكی درەختەكەوە بوو دارێك بەدەستیەوە بوو ئاگری دەدا بەسەر درەختەكەدا سەریان خستم بردیانمە ماڵێكەوە هەرگیز لەوە چاكترم نەبینبوو پیرو گەنج و ئافرەت و منداڵی تێدا بوو پاشان هێنایانمە دەرەوە.

وتم: ئەمە چی بوو ئەمشەو منتان ترساند ئەوەی بینم پێم بڵێن چی بوو.

وتی: ئەوەی كە بینیت شەویلگەی دووكەرت دەكرا درۆزن بوو درۆی دەكرد، ئەوەی كەبینیت سەری بە بەرد دەشكێنرا ئەو پیاوە بوو خوای گەورە قورئانی فێركردبوو بەهۆیەوە شەو دەخەوت بەڵام بەرۆژ كاری پێ نەدەكرد، ئەوەشی كە لەتەنورەكەدا بوو داوێن پیس بوو، ئەوەشی كە لە رووبارى خوێنەكەدا بوو سوخۆر بوو، ئەوانەشی لەژێر درەختەكەدا بوون پیرو دوو منداڵەكە ئەوە ئیبراهیمی باوكی پێغەمبەران و دوو منداڵەكەش كە بەدەوریدا بوون ئەو كوڕی باوەڕداڕانن، ئەوەشی ئاگرەكەی دەكردەوە خاوەنی گەنجینەی ئاگر بوو، ئەو ماڵەشی كە بینیت لەژێر درەختەكەدا بەهەشت بوو.

بنەمای بەلاو بەدڕەوشتی لەنێو كۆمەڵگادا ئەو چوار پێش هاتەیە هەر بەهۆشیانەوە شارستانیەت و ئوممەتەكان و وڵاتانێكی زۆر بەهۆی ئەم چوار دەردەوە دادەڕوخێن (درۆ، وازهێنان لەقورئان وكارپێنەكردنی لەلایەن ئەوانەی كە لەبەریانەو شارەزان لێی، سووخواردن و، داوێن پیسی).

## کەمترین سزاو گەورەترین سزا:

دوو وەحی و سرووش بۆ سەر پێغەمبەری خواﷺ دابەزیوە قورئان و دانایی، ئەوەتا دەفەرموێت: (من قورئان و ئەوەی کە لەوە بۆم دابەزیوە)[1].

واتە: سوننەتەکانی کە لێکدانەوەی مانای قورئانە.

خوای گەورە فەرمانی پێکردوین نوێژ بکەین، نیوەڕۆ (٤) ڕکات، مەغریب (٣) ڕکات، بەیانی (٢) ڕکات، ئەمەمان لە زاری ڕاستگۆی پارێزراو لەو گوناهەوە پێ گەیشتوە هەروەها زەکات و ئاستی بڕی دیاری کراو بۆ دەرکردنی ئەمەشیان نەزانیوە مەگەر بەدانایی نەبێت لەزاری پێغەمبەری خواوە ﷺ.

ئەم سروشی داناییە لەوەحی پێغەمبەرانەوەیە، خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿هُوَ ٱلَّذِى بَعَثَ فِى ٱلْأُمِّيِّـۧنَ رَسُولًا مِّنْهُمْ يَتْلُوا۟ عَلَيْهِمْ ءَايَـٰتِهِۦ وَيُزَكِّيهِمْ وَيُعَلِّمُهُمُ ٱلْكِتَـٰبَ وَٱلْحِكْمَةَ﴾[2] واتە: خوا ئەو خوایە لەناو نەخوێندەوارەکانا پێغەمبەرێکی ناردووە ئایەتەکانی خوایان بەسەرا ئەخوێنێتەوەو پاکیان ئەکاتەوە لە کوفرو لە خووی بەدو، قورئان و حیکمەت و قسەی بەجێیان فێرئەکا کە حەدیثی پێغەمبەرە.

دانایی سوننەتێکە کە لەپێغەمبەرەوە هاتووە هەروەها ئەو فەرمایشتانەی کەباسی دەکات بۆمان، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَمَا يَنطِقُ عَنِ ٱلْهَوَىٰٓ ۝٣ إِنْ هُوَ إِلَّا وَحْىٌ يُوحَىٰ﴾[3] واتە: لە ئارەزووی نەفسی خۆیشیەوە قسە ناکا. ئەوەی کە ئەو ئەیخوێنێتەوە بەسەرتانا لە وەحی بەولاوە نییە کە لە خواوە وەحیی بۆ ئەکرێ.

---

١- سنن أبو داود.

٢- الجمعة: ٢

٣- النجم: ٣ - ٤

هەروەها دەفەرموێت: ﴿وَمَآ ءَاتَىٰكُمُ ٱلرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَىٰكُمْ عَنْهُ فَٱنتَهُوا۟﴾[1]

واتە: هەر دەسکەوتێ خوا گێڕابێتیەوە لە خەڵکی ئەو دێهاتانەوە کە موسوڵمانان دایان بەسەریاناو داگیریان کردن، ئەوە بۆ خواو بۆ پێغەمبەری خواو بۆ خزم و خوێشانی پێغەمبەرو بۆ هەتیوو هەژارو ڕێبوارانی موسوڵمانانە، بۆئەوەی دەست بەدەستی پێ نەکرێ لەنێوان دەوڵەمەندەکانتاناو ببێ بۆ خۆیان و، پێغەمبەریش هەرچیی دانێ لێی وەربگرن و هەرچییشی نەدانێ و وتی لێی گەڕێن، لێی گەڕێن و لە خوا بترسن، خوا سزای سەختە.

هەروەها لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێت: ﴿قُلْ إِن كُنتُمْ تُحِبُّونَ ٱللَّهَ فَٱتَّبِعُونِى يُحْبِبْكُمُ ٱللَّهُ﴾[2]، واتە: ئەی موحەممەد! بە خەڵکی ڕابگەیێنەو پێیان بڵێ: ئەگەر ئێوە خوداتان خۆش ئەوێ پەیڕەوی من بکەن تا خودا خۆشتانی بوێ و لە گوناهتان ببووری.

ئەمەش لەو سەرەتایانەیە کە خوای گەورە فەرمانی پێ کردوین.

بۆ ئەوەی بزانین کە سزاو ڕابوردنی ناوگۆر لەناو قورئان و سوننەتدا هەیە بەوردی بیر لەم ئایەتە قورئانییە بکەرەوە:

﴿وَلَوْ تَرَىٰٓ إِذِ ٱلظَّـٰلِمُونَ فِى غَمَرَٰتِ ٱلْمَوْتِ وَٱلْمَلَـٰٓئِكَةُ بَاسِطُوٓا۟ أَيْدِيهِمْ أَخْرِجُوٓا۟ أَنفُسَكُمُ ۖ ٱلْيَوْمَ تُجْزَوْنَ عَذَابَ ٱلْهُونِ﴾[3]

واتە: خۆزگا ئەو ستەمکارانەت ئەدی لەکاتی غەرغەرەی سەرەمەرگدا، کە قورسایی مەرگ سەرو دڵیان ئەگرێت و، مەلائیکە گیانکێشەکانیش دەستیان

---

١- الحشر: ٧

٢- آل عمران: ٣١

٣- الأنعام: ٩٣

ڕائەکێشنو بە زۆرو ئازار گیانیان دەرئەکێشن و پێیان ئەڵێن: دە گیانەکەتان دەرکەن و بماندەنێ! ئەمڕۆ تۆڵەتان لێ ئەسەنرێتەوەو سزاو سووکیو بێنرخیتان ئەکرێ بە قوڕگا.

(الیوم) واتە گۆڕ یاخود ئەو ڕۆژەی کەتیایدا دەمریت، فریشتەکان کەڕۆح دەکێشن بەمردوو دەڵێن: ﴿ٱلۡيَوۡمَ تُجۡزَوۡنَ عَذَابَ ٱلۡهُونِ بِمَا كُنتُمۡ تَقُولُونَ عَلَى ٱللَّهِ﴾[1]

واتە: ئەمڕۆ تۆڵەتان لێ ئەسەنرێتەوەو سزاو سووکیو بێنرخیتان ئەکرێ بە قوڕگا، چونکە لە کاتی زیندووییدا قسەی ناڕەواتان بەدەم خوداوە هەڵئەبەست و، لووتتان لە ئایەتەکانی هەڵئەکردو باوەڕتان پێ نەئەکردن!

ئەم دەقە زۆر واتاکەی ئاشکرایە (الیوم) واتە ڕۆژی مردن.

حاڵی دووەم لەسەر فیرعەون و دارو دەستەکەیەتی، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ٱلنَّارُ يُعۡرَضُونَ عَلَيۡهَا غُدُوّٗا وَعَشِيّٗاۚ وَيَوۡمَ تَقُومُ ٱلسَّاعَةُ أَدۡخِلُوٓاْ ءَالَ فِرۡعَوۡنَ أَشَدَّ ٱلۡعَذَابِ﴾[2] واتە: سزا بەدو ناهەموارەکەیش ئاگری دۆزەخە کە بەیانی و ئێوارە ئەبرێنە سەیرو تەماشایو گوزەریان پێئەکرێ بەلایاو، کە ڕۆژی قیامەتیش دێ فەرمان لای خواوە دێ کەوا دەستەو دائیرەی فیرعەون بخەنە ناو سەختترین سزاوە.

دەقی سێیەم:

﴿وَلَنُذِيقَنَّهُم مِّنَ ٱلۡعَذَابِ ٱلۡأَدۡنَىٰ دُونَ ٱلۡعَذَابِ ٱلۡأَكۡبَرِ لَعَلَّهُمۡ يَرۡجِعُونَ﴾[3]

واتە: ئێمە بەڕاستی لە دنیادا هەندێ ئازاری سووك، ئازاری قورس نا، بەو بێ باوەڕانە ئەچێژین بەڵکو بیرێ لە حاڵی خۆیان بکەنەوەو لە بێباوەڕیی خۆیان

---

١- الأنعام: ٩٣

٢- غافر: ٤٦

٣- السجدة: ٢١

بکشێنەوەو پەشیمان ببنەوە. نزمترین سزا سزای گۆڕە (جگە لە سزای هەرە گەورە) کە سزای ڕۆژی قیامەتە، خوای گەورە لەم ئایەتەدا دەفەرموێت:

﴿ وَإِنَّ لِلَّذِينَ ظَلَمُوا عَذَابًا دُونَ ذَٰلِكَ ﴾[1] واتە: بەڕاستی ئەوانەی کە ستەمکار بوون و لە دنیادا ئازاری خەڵکیان داوە سزایەکی تریشیان هەیە جگە لە سزای ڕۆژی قیامەت، بەڵام بەشی زۆریان ئەوە نازانن. واتە: سزای ڕۆژی دوایی.

ئەم دەقە قورئانیانە بەڵگە گەلێکی ڕۆشن و ئاشکران لەسەر سزای ناو گۆڕ هەروەها خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿سَنُعَذِّبُهُم مَّرَّتَيْنِ ﴾[2]واتە: ئێمە هەر لە دنیادا دوو جاریان سزا ئەدەین.

## سزای گۆڕو ئەو هۆکارانەی کە لێی دەرباز دەبیت:

هەروەها بەڵگەی سوننەت لەم بارەیەوە زۆرە ئەوەتا پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: (پەنا بەخوا بگرن لەسزای گۆڕ): (استعيذوا بالله من عذاب القبر) ئەم دەقە لەبوخاریەوە هاتووە. ئەوەتا دوای شایەتومان دەڵێت: (خوایە پەنا دەگرم بە تۆ لەتاقیکردنەوەی ژیان و تاقیکردنەوەی مردن و تاقیکردنەوەی ناو گۆڕ). ڕۆژێك پێغەمبەر ﷺ بەلای دوو گۆڕدا تێپەڕی فەرمووی: (ئێستا خاوەنی ئەو دوو گۆڕە سزا دەدرێن بەڵام لەسەر گوناهی گەورە نا، یەکێکیان خۆی لەمیز نەدەپاراست، ئەوەی تریشیان لەنێو خەڵکیدا قسەی دەهێناو دەبرد)[3] ، پەلکێك گەڵای پێ بوو فەرمووی: (ئومێد دەکەم خوای گەورە سزایان لەسەر سوك بکات هەتا ئەم پەلکە سەوزە وشك دەبێتەوە).

---

١- الطور: ٤٧

٢- التوبة: ١٠١

٣- رواه النسائي.

پێغەمبەر ﷺ ڕۆژێك لەپشتی گۆڕێکەوە بەتەنیشت عبدالرحمانی کوڕی عەوفەوە دەڕۆیشت، فەرمووی: (ئۆف بۆ تۆ، ئۆف بۆ تۆ، ئۆف بۆ تۆ، عبدالرحمن وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ لەمن؟. فەرمووی: نەخێر، بەڵکو بۆ خاوەنی ئەم گۆڕە ! ! ئەگەر دەبینی گۆڕەکەی لێ بووە بەئاگر ئەمیش بەهۆی پارچە قوماشێکەوە کە بەناڕەوا بردویەتی. ئەمە سەربازێك بوو لەجەنگدا لەکاتێکدا مافی خۆشی بوو ببیات بەڵام لەبەرئەوەی پرسی بە بەرپرسەکەی نەکرد بۆیە ئەم گۆڕەی لێ بووە بەئاگر (غَلّها) واتە: نرخی بەرزکردەوە یاخود دزی.

ئەم دەقە ماناکەی زۆر ئاشکرایەو سزای گۆڕ دەسەلمێنێت دەق لەسەر ڕابواردنی ناو گۆڕ نیە بەڵام دەقمان لەسەر چەند ڕزگارکەرێك هەیە لە سزای گۆڕ پاشان ئەو دەقانەش دێنین کە باس لە ڕابواردنەکانی دەکات.

ئەمە سزای گۆڕە، سزای یەکەمە بەڵام سزای ڕۆژی قیامەت جیاوازەو توندترە، خوای گەورە ئێمەش و ئێوەشی لێ بپارێزێت.

## وێنەیەکی بچوككراوە لەسزای ڕۆژی دوایی:

دەمەوێت باسی جۆرێك لەسزای ناو گۆڕ بکەم، بۆ نموونە کەسی درۆزن لغاوێك دەخرێتە دەمیەوە لەناو گۆڕەکەیدا سزا دەدرێت هەروەها لەڕۆژی قیامەتیشدا سزا دەدرێت. واتە گوناه هەیە بەهۆیەوە سزای ئەنجامدەرەکەی دەدرێت لەنێو گۆڕدا، وە گوناهیش هەیە لە گۆڕداو لەڕۆژی دوایدا بەهەمان شێوە بەهۆیەوە سزادەدرێت. بۆنموونە ئەوکەسەی خۆی لە میز ناپارێزێت لەنێو گۆڕداو لە قیامەتدا بەهۆیەوە سزا دەدرێت بۆچی؟ لەبەرئەوەی نوێژەکەی بەهۆیەوە وەرنەگیراوە.

دیارە سزای گۆڕ وێنەیەکی بچوك کراوەی سزای ڕۆژی دواییە بەڵام بەهەمان شێوە، بۆیە هەندێك لە موسوڵمانان خوای گەورە سزاکەی بۆ خستونەتە نێو

گۆڕەکانیانەوە. پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: ئەم ئومەتە لە گۆڕەکانیاندا سزا دەدرێن)[1]. هەر بەفەزڵی خوا سزاکەی لەنێو گۆڕەکەیدا لەسەر هەڵدەگیرێت پێش ڕۆژی دوایی.

سزای ناو گۆڕ هیچ لە گوناهەکان کەم ناکاتەوە، بەڵام هەندێك سزای دیاری کراو هەیە بۆ خەڵکانێك لەسەر تەمەڵیان بۆ هەندێك پەرستش یاخود ئەنجامدانی چەند گوناهو تاوانێك بەمەش سزای خۆی لەگۆڕدا وەردەگرێت لەڕۆژی قیامەتدا بە پاکی و بەفەزڵی خواوە دێتە دەر: ئەمەش مژدەیەکە بۆ ئومەتی محمد ﷺ.

بەڵام بێ باوەڕان و ئومەتەکانی پێشوو دەبینین خوای گەورە سزایان دەدات و تۆڵەیان لێ دەسێنێت بەسزای سوك، وەکو لافاو، یاخود باران نەبارین، ئەوی تر لەگۆڕەکانیاندا سزایان دەدات بەڵام بۆ ڕۆژی دوایی ئەوا سزا لەسەریان هەتا هەتاییە.

## جیهانی بەرزەخ:

دەمانەوێت تێڕوانینی شەریعەتی ئیسلامی بزانین سەبارەت بەجیهانی بەرزەخ ئایا ڕۆحەکان تیایدا بەیەك دەگەن یان نا.

باسی هەندێك لە بەیەگەیشتنی ڕۆحیانەتی مردووەکان دەکەین لەگەڵ زیندووەکاندا، وە کێ بەیەك دەگات و کێ بەیەك ناگات، لەم بارەیەشەوە چەند شتێك دەگێڕنەوە.

ئەوەبوو ئەبو دەرداء هەموو نزایەکی ئەوەبوو دەیوت: خوایە عەبدوڵای کوڕی ڕەواحەی خاڵۆزام سەرشۆڕ نەکەیت بەهۆی منەوە کە شەهیدی جەنگی (مؤتة)

---

١- رواه مسلم.

بوو، پێی وترا: ئەی ئەبو دەرداء لە هەموو نوێژێکدا گوێم لێتە ئەم نزایە دەکەیت مردوو بەهۆی کردەوەی زیندوەکانەوە سەرشۆڕ نابێت.

ئەمەش ڕەواحەی کوڕی عەبدوڵای کوڕی ڕەواحەیە (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: هەر کاتێك کردەوەیەکی چاکم دەکرد باوکمم لەخەودا دەبینی ڕوخساری بەزەردەخەنەوە بوو دەیوت: خوا پاداشتت بداتەوە کوڕی خۆم، ئەمڕۆ لەناو خەڵکی گۆڕەکاندا سەرت بەرزکردمەوە، خۆ ئەگەر کردەوەیەکی نەشیاوم ئەنجامبدایە باوکمم لەخەودا دەبینی گازی لەدەستی خۆی دەگرت و دەیوت: کوڕی خۆم لەنێو خەڵکی گۆڕستانەکەدا سەرت شۆڕکردم، وەڵاهی ئەمڕۆ ناتوانم بەبراکانم بگەم.

ڕۆحیانەتی باوەڕداران بەیەك دەگەن لەدوای مردنیان خوای گەورە کۆیان دەکاتەوە وەك چۆن بۆ نوێژکردن کۆدەبوونەوە یاخود لەبۆنەکاندا. بەڵام نازانین لەکوێ بەیەك دەگەن.

## زیاتر لە هاوڕێیەکی چاك (کردەوەی چاك):

ئەو کردەوە چاکانەی کە کەسی باوەڕدار ئەنجامیان دەدات لەسزای گۆڕ ڕزگاری دەکات، کاتێك دوو فریشتە دێنە سەری بۆ لێپرسینەوە، نوێژ لەبەردەمیاندا دەوەستێت کە ئەنجامیداون دەڵێت: لای منەوە نایەن. پاشان لەلای دەمیەوە دێن قورئان دێت و دەفەرموێت: شەو و ڕۆژی بەمن کردەوە شەو و ڕۆژ خستمە گریان لای منەوە نایەن. ئینجا لای ڕاستیەوە دێن زەکات دێت و دەڵێت نابێ لای منەوە بێن، پاشان لەلای چەپیەوە دێن حەج دێت و دەڵێت: نابێ لای منیشەوە بێن، ئینجا لای قاچەکانیەوە دێن، ئەوانیش دەڵێن: فەرمان بەچاکەو نەهی لە خراپەی پێکردووە نابێ لای ئێمەشەوە بێن. وازی لێ دێنن، ئینجا گۆڕەکەی لە ئاوریشم بۆ ڕادەخەن و شوێنی خۆی لە بەهەشتدا دەبینێت.

بۆیـە دەبێـت کـردەوە چـاکەکان زیـاتر بکـەین، دوعـای نـەوەکان دەبێتـە بارسوکیەك بۆ باوکیان لـە گۆڕەکانیانـدا بـەپێی فەرمایشـتی پێغەمبـەر ﷺ کـە دەفەرموێت: (ئەگەر ئادەمیزاد مـرد کردەوەکـانی لێـی دادەبڕێـت مەگـەر لەسـێ ڕێگەوە نەبێت: خێرێکـی بـەردەوام، زانسـتێك سـودی لێ وەربگیرێـت، منـداڵێکی صالح نزای خێری بۆ بکات)[1].

## ئەو کـارانـەی کـە سـزای گـۆڕ مسـۆگـەر دەکـەن:

وەکـو لـەڕابردودا باسمـان کـرد سـزای گـۆڕ زۆرن بـۆ نموونـە درۆزن یـاخود ئەوکەسەی کار بە قورئان ناکات، داوێـن پیسـی، ئـەنجام دەرانـی بەدڕەوشـتی، هەروەها باسی ئەوکەسانەمان کرد کـە خۆپـارێزی لـەمیز ناکـەن، وەکـو وتمـان: لەبەرئەوەی لە مەرجەکانی پاکییە بۆ لاشـەو جلوبـەرگ... ئـەی داخـۆ ئەوانـەی هـەر لەبنەڕەتـدا نوێـژ ناکـەن، ئەوانـەی زەکـات دەرناکـەن، ئـەو وتاربێژانـەی دوبەرەکی دەخەنە نێوان موسوڵمانانەوەو ڕیزەکانیان دەشـێوێنن، وە خـواردنی ماڵی بێ باوك.

حەزرەتی عومەر(ڕەزای خوای لێ بێ) لەکاتی گیان کێشانی هاوەڵێکدا ئامادە بوو، کاتێك گیانی کێشرا چراکەی کوژاندەوە. ئەو خەڵکەی لەوێدا بـوون وتیـان: ئەی گەورەی باوەڕداران لەتاریکیدا دامان دەنیشـێنی؟! فـەرمووی: ئـەم چـرایە تازە بووە ماڵی میراتگرەکانی. دەتانەوێ ئاگر بخۆن لـەڕۆژی قیامەتـدا؟! ئـیبن حـەزم کـە هـەڵگری مەزهـەبی ظـاهریەکانـە دەڵێـت: (ئـەو کەسـەی دەبێتـە سەرپەرشتیار (باوك) دەبێت کار بۆ گەنج بدۆزێتەوە ئەگـەر کـاری نـەبوو ئەگـەر ئەسپی نەبوو دەبێت بیگەیەنێتە ئەو شوێنەی خۆی دەیەوێت وە ژنی بۆ بهێنێت ئەگەر نەیبوو خانوی بۆ بکات ئەگەر خانووی نەبوو).

---

[1] – رواه الترمذي.

هەروەها ئەو کەسانەی باس لەناموسی خەڵکیی دەکەن و لەکەداریان دەکەن ئەوەش لەوانەن کە سزای گۆڕ دوچاری ئادەمیزاد دەکەن.

## بیدعـە و بەرتیل خـۆر:

هــەروەها لــەو کارانــەی کــە ســزای گــۆڕ مســۆگەر دەکــەن بــۆ مــرۆڤ ئــەو بانگخوازانــەن کــە بانگەشــە بــۆ بیدعــە دەکــەن، بیدعــە ئــەو ڕا زیادەیەیــە کــە هەرکەس دەیخاتە سەر ئــەم دینــە، واتــە بیدعــە لــە پەرستشــەکاندا نــەك لــەباوو نەریتەکاندا ئەوەتا پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: (ئەوەی شتێك زیاد بکات لــەوەی ئێمەدا نەبێت لێی وەرناگیرێت)[1].

دیاره بیدعه پێچەوانەی سوننەتی چاکە بەپێی فەرمایشتی پێغەمبەر ﷺ کە دەفەرموێت: (ئەوەی سوننەتێکی چاك لەئیسلامدا دابهێنێت ئەوا پاداشتی خـۆی و ئەوەش کاری پێ دەکات وەردەگرێت)[2]. حــەزرەتی عومــەر یەکــەم کــەس بــوو موسـوڵمانانی کـۆکردەوە بـۆ نوێـژی تــەراویح ئەمــەش نابێتــە کەسـێك بیدعــەی ئەنجام دابێت بەڵکو موسوڵمانانی بۆ ئەو ڕۆژانە گێڕایەوە کە پێغەمبــەری خـوای ﷺ لەسەر بوو.

بەڵام باسی دیاری وەرگرتنی کەسی بەرپرس پیاوێك زەکاتی خەڵکی یەمــەنی کۆکردبووەوە دای بەپێغەمبەری خواو وتی: ئەمانــە بـۆ ئێـوە، بــەدیاری بـۆ مـن هاتون. پێغەمبەر ﷺ هەڵساو چووە سەر بڵندگۆو فــەرمووی: کەسـانێك لــەئێوە دەنێرێت خێری خــەڵکی دێنن و دەڵێن ئەمــە بـۆ ئێـوەو ئەمــەش بــەدیاری بـۆم هــاتووە، ئایــا ئەگــەر لــەماڵی بــاوکی و دایکدا دابنیشـتایە هــیچ دیارییــەکی بـۆ

---

١- رواه مسلم.

٢- رواه مسلم.

دەهات. کەواتە دیاری وەرگرتن وەك لغاو وایەو خاوەنەکەی بەئاگر دەسوتێنێت لەڕۆژی قیامەتدا...

عومەری کوڕی عەبدولعەزیز کاتێك عەترو بۆنی خۆشی (بیت المال)ی موسولمانانیان دابەش دەکرد لوتی گرت. وتیان: ئەوە بۆ وادەکەیت ئەی گەورەی باوەڕداران؟ فەرمووی: ئایا بەبۆنەکەی سودی لێ وەرناگیرێت... حەزرەتی عومەری کوڕی خەتاب چووە ژورەوە بۆلای ام کلثومی خێزانی بۆنێکی زۆر خۆشی لێوە دەهات پێی فەرموو: ئەمە چی‌یە ئوم کلثوم؟ ئوم کلثوم ئەمینداری (بیت المال) بوو، دەیفرۆشت بەخەڵکی وتی: لەوکاتەدا کەدەمکێشا کەمێکی بەپەنجەکانمەوە مایەوە منیش سڕیم بەسەرپۆشەکەمدا، بۆیە یەکسەر سەرپۆشەکەی لەسەری کردەوەو خشاندی بەخۆڵەکەداو دوایی خستیە ناو ئاوێکەوەو توند گوشی و ئینجا بۆنی کرد هێشتا هەر پێوەی مابووەوە بۆیە جارێکی تر ئەو کارەی دوبارە کردەوە هەتا بۆنەکەی تەواو نەما ئینجا پێی فەرموو: ئەی ئوم کلثوم دەتەوێت ئاگر لەڕۆژی قیامەتدا بەگەروماندا بڕواتە خوارەوە.

جیاوازی لەنێوان دیاری و بەرتیلدا دیارە، دیاری نیشانەی خۆشەویستی‌یە بێ ئەوەی چاوەڕوانی دەستکەوتێك بێت یاخود قازانجێك، بەلاّم بەرتیل بۆئەوەیە هەتا دەستکەوت و قازانجێکی چنگ بکەوێت (ئایا ئەگەر لەماڵی باوکیدا دانیشێت هیچ دیاریەکی بۆ دێت).

## ناپاکی و ئازاردانی موسوڵمان:

لەو کارانەی کە سزای گۆڕ مسۆگەر دەکەن خیانەت کردنە لە ئەمانەت، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: (الخائن الذي لايخفي لە طعما ولو دق) واتە: (ئەو ناپاکەی تەماعکاریەکی بۆ ناشارێتەوە هەرچەندە بچوکیش بێت) ئەوەی لەشتی

بچوكدا خیانەت بكات لەگەورەشدا دەیكات واتە ئەوەی خیانەت لە (حي على الصلاة) بكات خیانەت لە (حي على الفلاح)یش دەكات.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ يُخَـٰدِعُونَ ٱللَّهَ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَمَا يَخۡدَعُونَ إِلَّآ أَنفُسَهُمۡ وَمَا يَشۡعُرُونَ ﴾[1] . واتە: ئەوانە فێڵ ئەكەن لەگەڵ خوداو لەگەڵ خاوەن ئیمانەكاندا، بەڵام لە ڕاستیدا فێڵەكەیان هەر بۆ سەر خۆیان ئەگەڕێتەوەو نافامن.

حەزرەتی عەلی دەفەرموێت: (من فێڵباز نیم و فێڵبازیش ناتوانێ فریوم بدات).

ئازاردانی موسوڵمانان و باس كردنی هاوەڵان بەخراپە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: (باوەڕ حەفتاو ئەوەندە بەشە باشترینیان (لاالە الا الله)یە خوارترینیان لابردنی بەردێكە لەسەر ڕێگا)[2].

یەكێك لەهاوەڵان دوای ئەوەی خوشكەكەی مردو نێژرا بیری كەوتەوە كە جزدانە پارەكەی كەوتۆتە ناو گۆڕەكەیەوە بۆیە كەوتە هەڵدانەوەی گۆڕەكەی هەتا زیاتر هەڵیدەكەند زیاتر گۆڕەكەی گەرمتر دەبو هەتا گەشت بە جزدانەكەی و دەستی سوتا دوای ئەوەی كارەكەی تەواو كرد گەڕایەوە بۆلای دایكی لێی پرسی خوشكەكەم چی دەكرد؟ دایكی وتی: بەشەو شەونوێژی دەكردو بەڕۆژ بەڕۆژوو بوو بەڵام خراپەیەكی هەبوو سیخوڕی بەسەر دراوسێوە دەكرد.

خەڵكانێك هەن قسەی نادروست بە پێشینانی صالح دەڵێن. باسكردنی هاوەڵان بەخراپی وەكو ئەوەی گاڵتەیان پێ بكەی كەسایەتییان بەكەم بگری یاخود چەند سیفەت و خەسڵەتێك بخەیتە پاڵیان كە تیایاندا نیە. دەبێت باس

---

١- البقرة: ٩

٢- رواه مسلم

لەو ئاشوب و جەنگانە نەکەین کە کەوتۆتە نێوانیانەوە ئەو ئاشوبانەی کە خوای گەورە دەستی ئێمەی لێ پاك ڕاگرتووە با زمانیشمانی لێ بەپاك بگرین، ئەوەتا ئاینی ئیسلام هانی داوین ڕێز لە زانایان بگرین ئەی ئەگەر هاوەڵان بن دەبێ چی بڵێت.

ئیمام ئەحمەد نەخۆش بوو پاڵ کەوتبوو باسی شافعی کرا یەکسەر زۆری لەخۆی کردو دانیشت، فەرمووی ئیمامی ئەهلی سوننەیە دەبێ ئەم ڕێزو شکۆیە لەخۆماندا بروێنین.

یەکێکی تر لەو کردەوانەی کە سزای گۆڕ مسۆگەر دەکەن کۆمەك و یارمەتی دانە لەسەر تاوان و پەلاماردان خوای گەورە لەم بارەیەوە دەفەرموێت:

﴿وَتَعَاوَنُوا۟ عَلَى ٱلْبِرِّ وَٱلتَّقْوَىٰ ۖ وَلَا تَعَاوَنُوا۟ عَلَى ٱلْإِثْمِ وَٱلْعُدْوَٰنِ﴾[1] واتە: لەناو یەکدا لەسەر کاری چاکەو خێرو لەخوداترسی هاوکاری بکەن، لەسەر گوناەو دەستدرێژی گەلەکۆمەکێ مەکەن.

جارێك حەزرەتی عومەر(ڕەزای خوای لێ بێ) (٧) پیاوی یەمەنی کوشت لەسەر یەك کەس، وتیان: ئەی گەورەی باوەڕداران حەوت کەست کوشت لەبەر کەسێك فەرمووی: سوێند بەخوا هەموو خەڵکی یەمەن لەو تاوانەدا بەشداربونایە هەموویانم دەکوشت.

هەروەها کەسێکی بێ باوەڕ لەحەرەمدا بێت. خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿وَمَن يُرِدْ فِيهِ بِإِلْحَادٍۭ بِظُلْمٍ نُّذِقْهُ مِنْ عَذَابٍ أَلِيمٍ﴾[2] واتە: هەرکەسیش ئارەزووی لەوە بێ بەهۆی ستەمکاریی خۆیەوە لە ڕێگای ئاین لابدا سزایەکی سەختی پڕئازاری پێ ئەچێژین.

---

١- المائدة: ٢

٢- الحج: ٢٥

هەروەها ئەو کەسەی ڕای خۆی پێش قورئـان و سوننەت دەخـات هـەروەها ئـەو کەسـەی هـاوارو نالّـە دەکـات لەسـەر مـردو ئەوەشـی گـوێی لـێ دەگرێـت. (هەرکەسێك شین و فیغان لەسەر مردو بکـات و تـەوبـەی لەسـەر نـەکات لـەڕۆژی قیامەتدا بەقـڕی ئالّۆزکـاو و پـڕاوەوە زینـدوو دەکرێتـەوە فریشـتەکان دەیخەنـە دۆزەخەوە پێی دەڵێن ئـادەی شـین بکـە بـۆ کەسـوکارت وەك لـەدنیادا شـینت دەکرد).

هەرکەسـێك شـین و نالّـە بکـات بـۆ مـردوو وەکـو ئـەوە وایـە خەنجـەرێکی هەلّگرتبێ لەدژی خوا بجەنگێ یاخود وەکو ئەوە وایە کەعبەی ڕوخاندبێت.

ئەوەتا پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: (ئـەو کەسـە لەئێمـە نییـە جلـی بـدڕێنێت ڕومەتی دابڕنێت و وەکو نەفامەکان بانگەشە بۆ نەفامی بکات)[1]

## مزگـەوت لـە گـۆڕستـانـەکـانـدا...!!!

هەروەها لەو کارانەی سزای گۆڕ مسۆگەر دەکەن بنیاتنـانی مزگـەوت لەسـەر گۆڕسـتان هـەروەها تـەرازوو بـازی، خـوای گـەورە دەفـەرموێت: ﴿وَيْلٌ لِّلْمُطَفِّفِينَ ۝١ ٱلَّذِينَ إِذَا ٱكْتَالُوا۟ عَلَى ٱلنَّاسِ يَسْتَوْفُونَ ۝٢ وَإِذَا كَالُوهُمْ أَو وَّزَنُوهُمْ يُخْسِرُونَ﴾[2]

واتە: هاوار بۆ ئەوانەی لە کێشانەو پێوانەدا زیادوکەم ئەکەن. ئەوانەی کـە شـتی خەلّکیان بۆ خۆیان پێوا بەتەواوی حەقی خۆیـان وەرئـەگرن. کـە شتیشـیان بـۆ ئەوان پێوا یا کێشا زەرەریان لێ ئەدەن و کەمیان بۆ دائەنێن.

---

١- رواه مسلم.

٢- المطففين: ١ - ٣

هەروەها ئەوانەی تانەو تەشەرو دەمەلاقرتێ دەکەن لەخەڵکی، ﴿وَيْلٌ لِّكُلِّ هُمَزَةٍ لُّمَزَةٍ﴾[1]، واتە: هاوار بۆ هەموو ئەوانەی عەیب و عار لە خەڵك دەردێنن و هەموو ئەوانەی ناووناتۆرە لە خەڵك ئەنێن.

(الهمان) ئەو کەسانەن بەرەو ڕووی خۆت تەشەرت لێ دەدەن، (اللمان)یش ئەو کەسانەن لەپشتی سەری خۆتەوە لاقرتێت پێ دەکەن.

هەروەها خەڵکانێك هەن باس لە ناموسی خەڵکی دەکەن، ئامۆژگاریتان بم ئاگاتان لە ناموسی خەڵکی بێت، چی دەکەن بیکەن چونکە بەویستی خوا دەرگای تەوبە کراوەیە بەڵام وریای زمانت بە لە ئاست خەڵکیدا بیگرە.

کۆمەڵگەی ئیسلامی بەهیچ شتێك تیانەچو و لاینەداو ڕوخان ڕوی تێنەکرد وەکو بەرەڵاکردنی زمانمان نەبێت لەناموسی یەکتر دیارە شەرع بەهیچ شێوەیەك ڕێگەی نەداوە باس لە ناموسی خەڵکیی بکەیت مەگەر لە چەند جێگەیەکدا نەبێت کە دوایی باسیان دەکەین.

* هەروەها لە بەردەمی دادوەردا باسی نەنگیەکانی بەرامبەرەکەت بکەیت.

## مەترسی کەوتنە ناو ناموسی خەڵکییەوە:

ئیسلام گرنگییەکی زۆری داوە بە باسی ناموس و پاراستنی، بۆ نموونە سزای لێدانی داناوە بۆ هەرکەسێك کە باسی ناموسی یەکێك دەکات ئەگەر چوار شاهید نەهێنێت لەسەر ئەو کەسەی کە تۆمەتەکەی خستۆتە پاڵی، دیارە ئەگەر ڕاستیشی وت ئەوا سزای هەشتا قامچی داناوە .

﴿إِنَّ الَّذِينَ يَرْمُونَ الْمُحْصَنَاتِ الْغَافِلَاتِ الْمُؤْمِنَاتِ لُعِنُوا فِي الدُّنْيَا وَالْآخِرَةِ وَلَهُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ﴾[2] واتە: بەڕاستی ئەوکەسانەی بوختان بۆ ئافرەتانی داوێن پاکی لە

---

١- الهمزة: ١

٢- النور: ٢٣

تاوان بێئاگای خاوەن باوەڕ ئەکەن، لە دنیاو لە قیامەتا لەعنەتیان لێکراوەو سزایەکی قورسیان بۆ هەیە. وشەی (لُعِنُوا) واتە: لە ڕەحمەتی خوا دەرکراون.

جارێک حەزرەتی عومەر(ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: ئەگەر عومەری گەورەی موسوڵمانان پیاوێکی بەد ڕەوشتییەک بکات سزای شەلاقی لێ دەدەن؟ حەزرەتی عەلی فەرمووی ئایا گەورەی باوەڕداران سێ شاهیدی تری هەیە؟ حەزرەتی عومەر هاتەوە بەخۆیداو سەری دانەواند فەرمووی: دەکەواتە دەبێت شەلاق لەگەورەی باوەڕداران بدەیت لەسەر ناوزڕاندن و بوختان کردن بۆ ئەو دووکەسە.

بۆیە شەریعەتی ئیسلام هانی داوین و پێغەمبەری خوا ﷺ فێری کردوین و بۆی ڕوون کردوینەتەوە کە چەندێ بەرەنجامی باسکردنی ناموسی خەڵکی مەترسیدارە، لە بەسەرهاتی ماعزو غامدیدا، هاتووە دەڵێت ماعز دانی بەو بەدڕەوشتیەدا نا کە ئەنجامی داوە، پێغەمبەریش ﷺ بەردبارانی کرد، دوو هاوەڵی پێغەمبەری خوا بەڕێگادا دەڕۆشتن و پێغەمبەریش لەدوایانەوە بوو گوێی لێ بوو یەکێکیان وتی خوا بیباتەوە ئەگەر بیشاردایەتەوە چاکتربوو بۆ خۆی (مەبەستی ماعز) بوو پێغەمبەر ﷺ هیچی نەفەرموو هەتا گەیشتنە کەلاکێکی بۆگەن کردوو ئینجا پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموون ئادەی لەو کەلاکە بۆگەنە بخۆن، وتیان چۆن دەبێ ئەی پێغەمبەری خوا، ئەویش فەرمووی ﷺ ئەوەی کە خواردتان لە ناموسی براکەتان زۆر خراپترە لەوەی گۆشتی ئەم کەلاکە بۆگەن کردووە بخۆن: ﴿أَيُحِبُّ أَحَدُكُمْ أَن يَأْكُلَ لَحْمَ أَخِيهِ مَيْتًا فَكَرِهْتُمُوهُ﴾[1] واتە: ئایا یەکێ لە ئێوە حەزئەکا گۆشتی برای خۆی بە مردوویی بخوا؟ ئەوەتان پێ خۆش نییە.

---

١- الحجرات: ١٢

بـەڵام لەلایـەکی تـرەوە شـەریعەتی ئیسـلامی هانمـان دەدات کـە نـەنگی موسوڵمان دابپۆشین، پیاوێك هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ وتی یارسول الله فلانە شتت بینی؟ فەرمووی ئەگەر بەجلەکەت داتپۆشیایە بۆ تۆ چاکتربوو.

دیـارە هـەرگیز کۆمـەڵگا پایـەدار نابێـت ئەگـەر هەریەکـەمان زمـانی خۆمـان نەگرینەوە لە باس و لەکەدارکردنی ناموسی یەکتری.

هـەروەها نابێـت موسـوڵمان سـیخوڕی بەسـەر بـرای موسـوڵمانیەوە بکـات. ئەوەتا خوای گەورە دەفـەرموێت: ﴿وَلَا تَجَسَّسُوا وَلَا يَغْتَب بَّعْضُكُم بَعْضًا﴾[1] واتـە: مەکەونە پەیجۆری زانینی شتی پەنامەکیی موسوڵمانان کە تایبەت بە خۆیانە.

دیارە سیخوڕی کـردن دروسـت نیـە تـەنها لـەدژی کـافرو بـێ بڕوایـان نـەبێت لەکاتی جەنگدا.

جارێـك حـەزرەتی عومـەر(رەزای خـوای لێ بـێ) چـاودێری بەسـەر کۆمەڵـە گەنجێکـەوە دەکـردو لـەناکاو خـۆی کـرد بـەژووردا لێیـان، کاتێـك بـە بەڵگـەوە نیشانیاندا کە کارێکی ناشەرعی کردووە لـە شـوێنی خۆیـدا وەسـتاو پێیـان وت ئێمە هەڵەیەکمان کرد تۆ سێ هەڵە حەزرەتی عومەر وەستا دەستی کرد بەداوای لێخۆشبون لە خوا پاشان پێی فەرمون: لەو گوناهە ناگەڕێنەوە؟ وتیـان: نـەخێر ناگەڕێینەوە دیارە هەڵە لە لێبوردندا چاکترە لە هەڵەیەك لە سزاداندا.

کۆمەڵگای موسوڵمان قەوارەیەکی دەوێت کەتیایدا ئەندامانی یەکتری بپارێزن و هەڵەو نەنگیەکانی یەکتر دابپۆشن و ڕێگـە نیشـان دان و ئامۆژگـاری پیشـەیان بێت نەك لەکەدار کردن و حەیا بـردن، خـوای گـەورە فـەرمانی پـێ کـردوین لـەو شوێنانەدا دانەنیشن کە باسـی ناموسـی خـەڵکی تیـادا دەکرێـت، ئـەوەتا خـوای گەورە دەفەرموێت:

---

١- الحجرات: ١٢

﴿فَلَا تَقۡعُدُواْ مَعَهُمۡ حَتَّىٰ يَخُوضُواْ فِي حَدِيثٍ غَيۡرِهِۦٓ إِنَّكُمۡ إِذٗا مِّثۡلُهُمۡۗ﴾[1] واته: لەگەڵیان دامەنیشن تا ئەو باسە ئەگۆڕن و ئەچنە سەر باسێکی تر. ئەگەر دانیشتن و گوێتان لێ گرتن ئەوا ئێوەیش وەك ئەوان ئەبن.

## بانگەشە کردن بەزانینی نادیار (غەیب):

ئەوەی بڕوات بۆلای فاڵچییەك یاخود ئەستێرەناسێك و بڕوای پێ بکات ئەوا بەرییە لە پێغەمبەری خوا ﷺ واتە: لەئایین دەرچووە.

هەر ئەم دووانە بکەرە پێوەرێك بۆ خوێندنەوەی کوپی قاوەو ناو لەپی دەست چونکە بەم کارەمان ئەوە دەسەلمێنین کەبڕوامان بەزانینی نادیارێك کرد لە مرۆڤێکەوە لەکاتێکدا تەنها خوایە شتە نادیارەکان دەزانێت.

ئەوانە درۆ دەکەن ئەگەر بیانزانیایە ئەوا پێغەمبەری خواش دەیزانی ئەوەتا خوای گەورە لەسەر زمانی پێغەمبەرەکەی ﷺ دەفەرموێت: ﴿وَمَآ أَدۡرِي مَا يُفۡعَلُ بِي وَلَا بِكُمۡۖ﴾[2] واتە: ئیددیعای زانینی عیلمی غەیب ناکەم و نازانم چیم لێ ئەکرێو چییش لە ئێوە ئەکرێ.

﴿وَلَوۡ كُنتُ أَعۡلَمُ ٱلۡغَيۡبَ لَٱسۡتَكۡثَرۡتُ مِنَ ٱلۡخَيۡرِ وَمَا مَسَّنِيَ ٱلسُّوٓءُۚ﴾[3] واتە: ئەگەر غەیبیم بزانیایە خێرو قازانجی زۆرم بۆ خۆم کۆئەکردەوەو هەرگیز تووشی زیان نەئەبووم.

---

١- النساء: ١٤٠

٢- الأحقاف: ٩

٣- الأعراف: ١٨٨

﴿قُل لَّا يَعۡلَمُ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ ٱلۡغَيۡبَ إِلَّا ٱللَّهُۚ﴾[1] واتـه: تـۆ بڵـێ: تێکـڕای ئەوانەی لە ئاسمان و لە زەویدان هیچیان غەیب نازانن و ئاگایان لـێ نیـیە، هـەر خوا خۆی ئەیزانێ.

تەنها خوایە زانستی نادیارو بەرپا بوونی ساتی ڕۆژی دوایی لایە:

﴿إِنَّ ٱللَّهَ عِندَهُۥ عِلۡمُ ٱلسَّاعَةِ وَيُنَزِّلُ ٱلۡغَيۡثَ وَيَعۡلَمُ مَا فِي ٱلۡأَرۡحَامِۖ وَمَا تَدۡرِي نَفۡسٞ مَّاذَا تَكۡسِبُ غَدٗاۖ وَمَا تَدۡرِي نَفۡسُۢ بِأَيِّ أَرۡضٖ تَمُوتُۚ﴾[2] واتە: بێگومـان هـەر خـوا خۆی ئەزانێ کەی ڕۆژی قیامەت دێ و، هەر ئەوە باران ئـەبارێنێ و ئـەزانێ چـی لە منداڵدانی ئافرەتایە کوڕ یا کچ، کەس نازانێ سبەینێ چی ئەکاو کەس نـازانێ لە کوێ ئەمرێ.

ئیمامی مالك کاتێك لەخەویدا فریشتەی مەرگی بینی پێی فەرموو کـەی گیـانم دەکێشیت ئەویش بە پێنج پەنجەی ئاماژەی بـۆ کـرد، دوایـی لـە ئـیبن سـیرینی زانای لێکدانەوەی خەوی پرسی ئەو خەوە مانای چیـیە؟ ئەویش فەرمووی: ئـەو پێنج پەنجەیەیە کە کەس نایزانێت خوا نەبێت ئەی زانای مەدینە.

﴿إِنَّ ٱللَّهَ عِندَهُۥ عِلۡمُ ٱلسَّاعَةِ وَيُنَزِّلُ ٱلۡغَيۡثَ وَيَعۡلَمُ مَا فِي ٱلۡأَرۡحَامِۖ﴾[3]

بـەڵام خـەڵکانێك هـەن لـەنێو موسـوڵمانان‌دا ژیانیـان هـەمووی لەسـەر ئەستێرەناس و بەخت و سیحر و فالگرەوە بنیات ناوە بەو بڕوایەی ئەوانە شـتی نادیار دەزانن یاخود هەندێکی، هەروەها بەو بڕوایـەی کـە فاڵچـی و سـاحیرەکان پەیوەنـدییان بـە پەریەکانـەوە هەیـە ئـەوانیش هەنـدێك هـەواڵی ئاسمانیـان بـۆ دێنێت.

---

١- النمل: ٦٥

٢- لقمان: ٣٤

٣- لقمان: ٣٤

ئەمەش بنەماو ڕیشەیەکی هەیە، گوایە پەرییەکان پێش هاتنی پێغەمبەر ﷺ گوێیـان لـەئاسمان دەگـرت، بـەڵام بـەناردنی پێغەمبـەر ﷺ هـەموو ئـەو شـتانە کۆتایی هـات و دەرگاکـەیان لەسـەر دادەخـەن: ﴿وَأَنَّا كُنَّا نَقْعُدُ مِنْهَا مَقَاعِدَ لِلسَّمْعِ فَمَن يَسْتَمِعِ الْآنَ يَجِدْ لَهُ شِهَابًا رَّصَدًا﴾[1] واتـە: ئەیشـیانوت: ئێمـە جـاران لـە چـەند شوێنێکی ئاسمانا دائەنیشـتین بـۆ گـوێگرتن تـا بـزانین فریشـتەکان باسـی چـی ئەکەن، بەڵام ئێستا هەرکەس گوێ بگرێ گـڕ- ئەسـتێرەی فـەزا سـم خـۆی بـۆ مەڵاس داوە.

هەندێك کەس لەو بڕوایەدان کە حەزرەتی سولەیمان خوای گەورە پەرییەکانی بۆ ڕام کردووە وەك وتراوە هەرچی بەڵگەنامـەو پەیمانـەکان کـە لەسـەر پەرییـەکان بووە لە ژێر کورسییەکەی بـووە ئـەوەی ئاشـکرا نـەبوو تـا دوای ئـەوەی کرمـی زەوی خواردبووی بەمەش پەیماننامەو بەڵگەنامەکانیان ئاشکرابوو دیارە ئەمەش هـەمووی شـتانێکن دوورن لـە ڕاسـتیەوە. ﴿وَأَنَّهُ كَانَ رِجَالٌ مِّنَ الْإِنسِ يَعُوذُونَ بِرِجَالٍ مِّنَ الْجِنِّ فَزَادُوهُمْ رَهَقًا﴾[2] واتە: ئەیشیانوت: چەند پیاوێك لە ئادەمزاد پەنایان ئـەگرت بە چەند پیـاوێ لـە سـەرکردەکانی پـەرییان کـە لـە شـەڕو ئافـەتی پەرییـەکانی ژێردەستیانیان بپارێزن، کەچی ئەم ئادەمزادانە، بەم پەناگرتنەیان بە پـەرییان، ئەو پەرییانەیان زیاتر گومڕا کرد کە بەڕاستی خۆیان بە شتێکی وا بزانن شـایانی پەنا پێگرتن بن. ئەمە خاڵێك.

---

١- الجن: ٩

٢- الجن: ٦

خاڵی دووەم، ئەمە تەنها تایبەت بووە بە حەزرەتی سولەیمانەوە واتە ڕام کردنی پەرییەکان ﴿لِكُلٍّ جَعَلْنَا مِنكُمْ شِرْعَةً وَمِنْهَاجًا﴾[1] واتە: ئێمە بۆ هەرکۆمەڵێکتان شەریعەتو ڕێبازێکمان داناوە لەسەری بڕۆن و لێی لانەدەن.

دیارە هەموو ئوممەتێك شەرع و پرۆگرامی خۆی هەیە.

پێغەمبەر ﷺ لەسەر ڕووپۆشێکی سپی جێی هێشتوین دیارە شەرع و ژیریمانی بۆ تەواو کردوین، بۆیە ئەوە ژیریی نیە بەشوێن فاڵچی و ساحیر بکەوین، ئەو کەسە خوا دەناسێت کە شارەزای قورئان و سوننەتی پێغەمبەر بێت ﷺ و خەڵکیی بەرەو چاکەو خێر بەرێت.

## هەرکەسێك مرد و حەجی نەکردبێت و دەسەڵاتیشی هەبوو بێت:

یەکێکی تر لەو هۆکارانەی کە سزای گۆڕ مسۆگەر دەکەن کەسێکە بتوانێت حەج بکات بەڵام ئەو فەرزە ئەنجام نەدات، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: (هەرکەسێك توێشوی سەفەرو ئەسپ یان هەر گیاندارێکی تری گواستنەوە کە بیبات بۆ ماڵی خواو حەج نەکات ئەوا وەکو جولەکەو مەسیحی دەژی)[2].

حەزرەتی عومەر(ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: (هەر مردویەك بهێنن توانیبێتی حەج بکات بەڵام نەیکردبێت نوێژی لەسەر ناکەم).

نەخۆش بیانوی خۆی هەیە یاخود موسوڵمان بیەوێت حەج بکات بەڵام بۆی ئاسان نەبێت یاخود ناوی بچێتە هەڵبژاردنەوە بەڵام دەرنەچێت ئەمانە هەموویان بیانوی زۆر دروستن چونکە ویستویەتی ئەنجامی بدات بەڵام بۆی

---

١- المائدة: ٤٨

٢- رواه الترمذي.

نەكراوە بەڵام سەرقاڵ بوون یاخود پارە یان هەرشتێكی تر نابنە بیانویەكی دروست بۆ ئەنجام نەدانی ئەم فەرزە خواییە.

وەكو باسمان كرد حەج لەسەر ئەو كەسەیە كە دەتوانێت ئەنجامی بدات ئەوەی نەتوانێت لەسەری دەكەوێت، ئەگەر ویستت حەج بۆ دایك و باوكت بكەیت بەمەرجێك خۆت حەجت كردبێت ئەگەر لەژیاندا بن یاخود مرد بن، خۆ ئەگەر تەنها هەر بۆ خۆت توانیت حەج بكەیت ئەوا هەر بۆ خۆت بیكە، ئەو كاتە حەج كردن لەسەر دایك و باوكت دەكەوێت چونكە توانایان نیە، بەڵام ئەگەر توانیت حەج بكەیت و خاوەنی ماڵ و دارایی بیت و كاتت بەدەستەوە بێت ئەوا دەتوانیت حەجیان بۆ بكەیت بەڵام وتمان دوای ئەوەی خۆت حەجەكەت كرد.

ئەگەر نیەتت وابوو حەج بۆ دایك و باوكت بكەیت وەكو چاكەیەك بەڵام خۆت لە ڕابردوودا نەتكردبوو یاخود نەتتوانیوە بەڵكو دەتەوێت فەزڵی ئەوان بدەیت بەسەر خۆتدا ئەوا خوای گەورە بەرەكەتدارت بكات، بڕۆ بیانبە بەڵكو بەو نیەتە بەهۆی بەرەكەتی ئەوانەوە خوای گەورە ڕۆزی خۆی بڕێژێت بەسەرتدا بەهۆی ئەو كارەتەوە.

## بێ ئاگابوون لە نوێژ:

هەندێك كەس هەن نوێژەكانیان دوا دەخەن ئەوەش دەبێتە هۆكارێك بۆ كەوتنەبەر سزای گۆڕ بەتایبەتی نوێژی بەیانیان و عەسران كەدەیخەنە كۆتایی كاتەكانیەوە.

حەزرەتی ئەبوبەكر(ڕەزای خوای لێ بێ) دەفەرموێت: نوێژكردن لەكاتی خۆیدا ڕەزامەندی خوای تیایە ناوەڕاستەكەی ڕەحمەتە كۆتاییەكەیشی لێخۆشبوونە، لەبەرئەوە پێغەمبەر ﷺ كاتێك پرسیاری لێ كرا (چ كارێك زۆر

باشە ئەی پێغەمبەری خوا ئەگەر بمانەوێت ئەنجامی بدەین فەرمووی: نوێژ لەکاتی خۆیدا)[1] .

ڕەزامەندی واتە ڕەزامەندی خوا ڕەحمەت واتە لەخواوە لێخۆشبوونیش هەر لەلایەن خواوەیە لەبەرئەوە بانگ وێژ دەڵێت: (حي على الصلاة – حي على الفلاح) وەڵام نەداتەوەو لەپەرستش بێ ئاگابێت، لێخۆشبوونیش هەر لای خواوەیە.

بۆ نموونە ئاوێنەیەکت هەیە لەناو دەروازەی چونە ژوورەوەی ماڵەکەتاندا ئاوێنەیەکی تریشت هەیە لەگەرماوەکەتاندا ئاوێنەی گەرماوەکە دیارە هەڵم دایدەپۆشێت دەیسڕیت و دایدەگرێتەوە دەیسڕیت و هەڵم دایدەگرێتەوە بەوشێوەیە، بەڵام ئاوێنەی چونە ژورەوەی ماڵەکەت هەروا بەڕوونی و تەواوی دەمێنێتەوە، دڵەکانیش هەر بەو جۆرەن دڵێك گوناهی نەکردبێت وەکو ئاوێنەی دەروازەی چونە ژورەوەی ماڵەکەت وایە دڵێکیش گوناه ئەنجام بدات و داوای لێ خۆشبوون بکات وەك ئاوێنەی گەرماوەکە وایە، کەواتە کام ئاوێنەیەت دەوێت کاتێك لەکاردایت و گوێت لەبانگ دەبێت (حي على الصلاة، حي على الفلاح) واز لەکارەکەت بهێنەو هەڵسە بۆ نوێژەکەت، مەگەر ئەوکاتە نەبێت کە جێهێشتنی کارەکەت زیانت پێ بگەیەنێت وەکو (دکتۆری نەشتەرگەری نابێت ژووری نەشتەرگەری جێ بهێڵێت هەروەها چاودێرەکان) پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: (لاضرر ولا ضرار) واتە: (نەزەرەرو نە زەرەر گەیاندن) واتە: (دروست نییە بۆ مرۆڤ زەرەر لەکەس بدات لەماڵی یان لە خودی خۆی، چونکە زەرەر دان ستەمە، وە دروست نییە زەرەر بە زەرەر وەڵام بدرێتەوە)[2] .

---

١- رواه البخاري.

٢- رواه ابن ماجه.

دیاره بەرژەوەندی لەمەدایە بڕۆیت بۆ نوێژەکەت و ترست نەبێت لە لەدەستدانی ڕۆزی، دیارە ڕۆزیدەر تەنها خوای گەورەیە، بنەما ئوصولیەکە دەڵێت: لەهەر شوێنێکدا بەرژەوەندی هەبوو شەریعەت لەو شوێنەدایە، لەبەرئەوەی شەریعەت بۆ بەختەوەرکردنی خەڵکیە کەواتە هەرگیز نوێژەکەت جێ مەهێڵە.

تەنانەت لەجەنگدا نوێژی ترس هەیە. حەزرەتی عومەر فەرمووی: ئێوە چۆن دەست نوێژ دەگرن بەجوانی بۆی ڕوونکردنەوە؛ چۆن ملکەچی لە نوێژدا نیشان دەدەن ئەمەشی بۆ ڕون کردنەوە یەکێك لەو موسوڵمانانە هاتە هەژان و وتی: ئەی گەورەی باوەڕداران ئەمە حاڵی نوێژخوێنان بێت ئاخۆ حاڵی ئەوانە چۆن بێت کە نوێژ ناکەن، ئەویش بەتوورەیی‌یەوە سەیری کردو فەرمووی: من باسی موسوڵمانانت بۆ دەکەم.

(ئیسلام دانە دانە هەڵدەوەشێت، یەکەمیان دەسەڵاتە کۆتاییەکەی نوێژە)[١].

هەروەها خوای گەورە دەفەرمویت: ﴿إِنَّ ٱلصَّلَوٰةَ كَانَتۡ عَلَى ٱلۡمُؤۡمِنِينَ كِتَٰبٗا مَّوۡقُوتٗا﴾[٢] واتە: بێگومان نوێژ لەسەر ئەهلی ئیمان فەرزێکەو کاتی تایبەتی بۆ دانراوەو پێویستە بکرێ.

ئەوەی سەرقاڵ بێت بەنەنگییەکانی خەڵکییەوە کەم و کورپییەکانی خۆی بیر دەچێتەوە ئەوەی بەگوناهەکانی خەڵکیەوە خۆی خەریك دەکات گوناهەکانی خۆی بیردەچێتەوە.

---

١- رواه الترمذي.

٢- النساء: ١٠٣

غەیبەت کردن واتە: باسکردنی براکەت بەوەی کەپێی ناخۆشە، نەمیمە واتە: قسە هێنان و بردن لەنێوان خەڵکیدا بەمەبەستی تێکدانی پەیوەندی نێوان دووکەس.

## سزایەك گیانداران گوێیان لێیە:

سزای گۆڕ بەشێوەیەکی گشتی هەموو زیندەوەران گوێیان لێیەتی تەنها مرۆڤ و پەریەکان نەبێت. ڕۆژێك هاوەڵان لەدوای پێغەمبەری خواوە دەڕۆیشتن پێغەمبەریش ﷺ بەسواری ئێسترەکەیەوە بوو لەناکاو سەرسمێکیدا خەریك بوو لەسەر پشتی بکەوێتە خوارەوە کەبەلای گۆڕستانی بەقیعدا دەڕۆشت، وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ئێسترەکەت خراپ بوو جم و جوڵیشی بەهەمان شێوە. پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: نەخێر خراپ نەبووە، چۆن بازنەدات کەگوێی لەلێدانە لەمردووەکان لەنێو گۆڕەکانیاندا بەچەکوشی ئاسن لەسەریان دەدەن! وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا، ئێستریش گوێی لێیانە؟ فەرمووی: هەموو زیندەوەران گوێیان لە سزای ناو گۆڕە تەنها مرۆڤەکان و پەری نەبێت.

خوای گەورە لە میهرەبانی خۆی گوێکانی ئێمەی لە ئاسن و سزای ناو گۆڕ بەستووە هەتا بتوانین ژیان بەخۆشی بگوزەرێنین خۆ ئەگەر گوێمان لێی بوایە ئەوا نەمان دەتوانی نان و ئاو بخۆینەوە، لە خراپیەکانی ڕەوشتی ئێمە ناشیرین کردنی یەکترە. وە (المقمعة) واتە: ئەو چەکوشە گەورەیەی کە دەدرێت بەسەری مرۆڤدا (٧) قات دەیبات بەناخی زەویدا.

لە دادپەروەری پەروەدگارە کە پاداشتی چاکەکارانی موسوڵمانان دەداتەوەو سزای سەرپێچیکارو لادەران دەدات، دیارە چاکەکارو تەوبەکار لەگەڵ سەرپێچیکاری گومڕا وەك یەك نابن، دیارە جیاوازی هەیە لەنێوان ئەوەی گوناە دەکات و پێدەکەنێت و ئەوەی گوناە دەکات و دەگری، خەڵکانێك هەن گوناە

ئـەنجام دەدەن و پێدەكـەنن و سـوورن لەسـەر سەرپێچـی كـردن و گاڵتـەش بەتەوبـەكاران دەكـەن، خـوای گـەورە دەفـەرموێت: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ أَجْرَمُواْ كَانُواْ مِنَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ يَضْحَكُونَ ۝٢٩ وَإِذَا مَرُّواْ بِهِمْ يَتَغَامَزُونَ﴾[1] واتە: تاوانبارەكان لـە دنيـادا بە خاوەن باوەڕەكان پێ‌ئەكەنین. كە بەلای موسوڵمانانیشا تێپەڕینایـە بـە چـاو ئەكەوتنە ئیشارەتی گاڵتە پێ‌كردنیان.

هەتا دەگاتە: ﴿فَٱلْيَوْمَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مِنَ ٱلْكُفَّارِ يَضْحَكُونَ﴾[2]، واتە: بۆیە ئـەمڕۆیش موسـوڵمانەكان بـە كافرەكـان پێئەكـەنن كـە تووشـی چارەنووسـێكی وا ڕەش هاتوون.

ئەو ڕۆژەی باسی دەكات ڕۆژی قیامەتە. ئەوەتا لوقمان بەكوڕەكەی دەڵێت:

﴿وَأْمُرْ بِٱلْمَعْرُوفِ وَٱنْهَ عَنِ ٱلْمُنكَرِ وَٱصْبِرْ عَلَىٰ مَآ أَصَابَكَ﴾[3] واتـە: ئـەمر بـە چاكە بكەو نەهی لە خراپە بكەو چیت هاتەڕێ لە ناڕەحەتی و گیروگرفت خۆتی لە بەرابەردا ڕاگرە.

## سـەیركـردنی ناشـەرعـی ڕێگـایەكـە بۆ داوێن پیسـی:

مـرۆڤ دەبێـت لـەخوای بەنـدەكان بترسـێت لـە سـەیركردنەكانیدا چـونكە (سەیركردن تیرێكە لەتیرەكانی شەیطان – ئەوەی لەبـەرخوا خـۆی لێ بپارێزێت خوای گەورە شیرینی ئیمانی پێ دەبەخشێت). واتە: سـەیری ئەوانـە ناكـات كـە خوا لێی حەرام كردووە، پیاو سەیری ژن نەكات و ژنیش سەیری پیاو نەكات.

كاری دووەم: ئەوەی چاوی دابخات خوای گەورە ژیریی زیاد دەكات.

---

١- المطففين: ٢٩ - ٣٠

٢- المطففين: ٣٤

٣- لقمان: ١٧

کاری سێیەم: ئەگەر ئادەمیزاد مەسەلەی سەیرکردنی ناشەرعی بەسوک تەماشا کردو لەسەری ڕاهات ئەو کاتە سەرپێچی کردنیشی بەلاوە ئاسان دەبێت و ویژدانی لاواز دەبێت و لۆمەکردنی دەروونی خۆی لانامێنێت دیارە ئاین بۆ کۆمەڵگا دابەزیوە بۆیە دەبێت کۆمەڵگا دژایەتی خراپەکاری بکات. ئەو کۆمەڵگەیەی بەستەمکار نالێت ئەی ستەمکار ئەو کۆمەڵگەیە مردووە.

یەکێکی تر لەوکارانەی کە سزای گۆڕ مسۆگەر دەکات داوێن پیسییە دیارە ئەم کارە قێزەونەش قۆناغ و هەنگاوی هەیە وەکو سەیرکردنی ناشەرعی و حەرام، ئەو کۆمەڵگایەی کە خراپەکاری ناگۆڕێت ئەو فەرمایشتەی پێغەمبەری خوای بەسەردا جێبەجێ دەبێت کە دەفەرموێت: (نموونەی ئەو کەسەی سنورەکانی خوا دەپارێزێت و ئەوەی دەکەوێتە ناوی وەکو ئەو کۆمەڵەن لەناو کەشتیەکدا هەندێکیان لەسەرەوەی کەشتییەکەدان و هەندێکی تریشیان لە ژێرەوەی، ئەوانەی کە لەنهۆمی ژێرەوەدان ئەگەر پێویستیان بە ئاو بێت بۆ خواردنەوە بچن بەکەسەکانی سەرەوە بڵێن ئێمە لەژێرەوە کەشتیەکە لەبەشی خۆمان کون دەکەین و ئازاری ئێوە نادەین لەسەرەوە، ئەگەر ئەوانەی سەرەوە ڕێگەیان دان کون بکەنە ئەو کەشتییە لەژێرەوە ئەوا هەموویان پێکەوە تیادەچن ئەگەر دەستیشیانگرتن و نەیانهێشت هەموویان ڕزگاریان دەبێت)[1].

پاشان دەبێت تێکەڵاویی سنوری هەبێت، تێکەڵاویی لە کارەکاندا یاخود لە شتە گشتیەکاندا دروست نیە، ئەمەش جۆرێکە لەتاقیکردنەوە. ئەوەتا خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿مَا خَطْبُكُمَا قَالَتَا لَا نَسْقِي حَتَّىٰ يُصْدِرَ الرِّعَاءُ وَأَبُونَا شَيْخٌ كَبِيرٌ﴾[2] واتە: پێی وتن: بۆ مەڕەکانتان لائەدەن؟ ژنەکان وتیان: ئێمە ئاوی

---

١- رواه البخاري.

٢- القصص: ٢٣

مەڕەکانمان نادەین تا شوانەکان لائەچن لەسەر بیرەکەو تەنها خۆمان ئەمێنینەوەو باوکیشمان پیرێکی بەساڵاچووە ناتوانێ بێ لەگەڵ خەڵکەکەدا ئاوی مەڕەکان بدا.

ڕۆڵی سەرەکی ئافرەت گەورەترین بەرهەمە لەجیهاندا، چاودێری کردنی کوڕو کچەکانمان کۆمەڵگایەکی باڵا پێك دێنێت، ئەوەش دژ نییە بەئازادی تاکەکەسی و ڕێگری نییە لەوەی ژیانی خۆی بژی، دیارە ژیان هەمووی وابەستەیە بەشەرعەوە دیارە حەرام و حەڵاڵ، باڵاپۆشی فەرزێکە بۆ کۆمەکی کردنی پیاو لەسەر چاو داخستن لەحەرام و یارمەتی نادات بۆ سەرپێچی، نابێت ئافرەت ملکەچ بکات بەبیانوی خۆ گونجان لەگەڵ سەردەمدا یاخود داواکاریەکانی کاردا (شوێن سوننەتەکانی پێش خۆتان دەکەون)[1].

چەند کردەوەیەك هەیە یاخود چەند پێشەکییەك بۆ ئەنجامدانی سەرپێچی کردن، سەیرکردن ئاکامەکەی بەد ڕەوشتییە، سەیرکردنی ناشەرعی ئەگەر چی بچوك بێت بە زۆرکردنی گەورە دەبێت، گەورەیی ئاگر لە پزیسکێکەوەیە.

بەڵام ئەگەر ئادەمیزاد کەوتە ناو بەد ڕەوشتییەوە تەوبە بکات و داوای لێخۆشبون بکات و چاکەکردن زیادبکات و واز لەگوناهکردن بێنێت و بڕیار بدات نەگەڕێتەوە سەر ئەو گوناهانە هەروەها نزای خێر بۆ ئەو کەسەی لەگەڵیدا کەوتۆتە تاوانی داوێن پیسیەکەوە، لەبەرئەوەی مافی ئەو ئافرەتەی پێشێل کردووە، ئەو چاکانەی لەڕۆژی قیامەتدا دەگێڕدرێتەوە بۆ ئەو کەسەو فریشتەکان ئەو چاکانەی دەدەنەوە کاتێك لەڕۆژی قیامەتدا مافەکانی خۆی داوا دەکات.

---

١- رواه البخاري.

## سووخۆری و خواردنی ماڵی بێ باوك:

خواردنی ماڵی هەتیو یەکێکی ترە لەو کارانەی کە سزای گۆڕ مسۆگەر دەکات، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: (پەروەردگارم من دڵ تەنگ دەبم لەسەر ونبوونی  مافی بێ باوك و ئافرەت، سوریشم لەسەر پاراستنی مافیان)[1].

ئەگەر هەتیوێك گریا خوای گەورە دەفەرموێت: (کێ ئەو منداڵەی خستۆتە گریان کەباوکی لەژێر گڵدایە؟ فریشتەکانم ئێوە بەشایەت بن ئەوەی هەتیوێك ڕازی بکات و نیشتەجێی بکات لێی ڕازی دەبم ئەوەی دەست بەسەر بێ باوکێکدا بهێنێت بەئەندازەی تاڵە مووەکانی سەری ئەو منداڵە بێ باوکە لەتەوقی سەریەوە تانوکی پێی ڕەحمەتی خوای بەسەردا دەڕژێت) باشترین ماڵ ئەو ماڵەیە کە بێ باوکێکی تێدابێت ڕێزی لێ بگیرێت خراپترین ماڵیش ئەو ماڵەیە کە بێ باوکێکی تیابێت و بەخراپ مامەڵەی لەگەڵدا بکرێت.

سووخۆری کارێکی زۆر ترسناکە ئەوەتا خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَأۡذَنُواْ بِحَرۡبٖ مِّنَ ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ﴾[2] واتە: جا ئەگەر وا ناکەن و وازناهێنن، ئەوا بانگەوازی جەنگ بدەن لەگەڵ خوداو پێغەمبەری خودادا.

ئەوەی سوو دەخوات لەگەڵ خوادا دەجەنگێت دیارە ئێمەش توانای جەنگمان نییە لەگەڵ خوادا، دەرکەوتنی سووخۆری لەکۆمەڵگاکاندا فەرو پیت ناهێڵن.

سووی خراپ و سوی چاك نیە، سوخۆریی هەمووی خراپە، هەروەها سوخۆرەکە و نوسەرەکەی و ئەو کەسەی دەکرێتە وەکیل و ئەوەی دەکەوێتە نێو ئەو کارەوە هەموویان دەکەونە بەر ئەو هەڕەشە خواییە.

---

١- رواه أحمد.

٢- البقرة: ٢٧٩

لەم دواییانەدا ئەوە سەلمێنراوە کە ڕۆژئاوا دەیانەوێت مامەڵە کردن بە (سوو)ەوە نەهێڵن لەبەرئەوەی لەنێو مامەڵەکاندا شکستی خواردووە، لەکۆنگرەی پاریسی (١٩٨٨)دا هاتووە دەڵێت: (دەبێت خۆمان لە مێژووی هەڵاوسان ڕزگار بکەین و سودی پارە بگەڕێنینەوە بۆ سفر).

ئەگەر خوای کاربەجێ شتێکت لێ قەدەغە بکات چەند دەرگایەکی ترت لێ دەکاتەوە، ئەوەتا پێشبڕکێی کارو هاوبەشی کردن، قازانج پەیداکردن و قەرزی حەسەنە هەیە، باشتر وایە مامەڵەت لەگەڵ بانکە ئیسلامییەکاندا بێت خۆ ئەگەر بڕێك سودی لەسەر بێ لەوە باشترە کە هەمووی سوبێت، ئەوەی بکەوێتە نێو مامەڵەی سووخواردنەوە دەبێت لای خوا پەشیمان ببێتەوە، ئەوەتا پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: (هەر سوویەك لەسەردەمی نەفامیدا کرابێت لابرا، یەکەم سوویەك کە لەسەر خەڵکی هەڵگیرابێت لە خۆمانە سووی عەباسە) [١].

## تەمەڵی کردن لەنوێژدا:

پاشان تەمەڵی کردن لەئەنجامدانی نوێژدا، یەکەم پرسیار کە لەبەندەی خوا دەکرێت دەربارەی نوێژە ئەگەر تەواو بوو ئەوا لێی وەردەگیرێ و دواتریش هەموو کارەکانی تریشی لێ قبوڵ دەکرێت، ئەگەر کەموکوڕ بوو ئەوا دەدرێتەوە بەسەریداو بەهەمان شێوە سەرجەم کارەکانیشی لێ وەرناگیرێ.

دایکی عەلقەمە (ڕەزای خوای لێ بێ) بەشەودا مزگەوتی پاك دەکردەوە، ڕۆژێك پێغەمبەر ﷺ بەتەنیشت بەقیعدا دەڕۆیشت گۆڕێکی نوێی بینی، فەرمووی: ئەم گۆڕە خاوەنەکەی کێیە وتیان گۆڕی دایکی عەلقەمەیە ناسی و فەرمووی: بۆچی پێتان نەوتوم؟! وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا لەدوای نوێژی نیوەڕۆ کۆچی دوایی کرد وتمان: زۆر گەرمە حەزمان نەکرد ئازار بخۆیت.

---

١- رواه ابن ماجه.

پێغەمبەر ﷺ تورەبوو فەرمووی: ئەی نەتانزانی ئەوەی نوێژی لەسەر بکەم شەفاعەتی منی بەردەکەوێت. دواتر نوێژی مردووی لەسەر کردو، پاشان فەرمووی: ئەی دایکی عەلقەمە چ کارێکت بینی کە ئێستا چاك بێت بۆت. پاشان کەمێك بێ دەنگ بوو فەرمووی: گوێتان لێیە. وتیان: نەخێر ئەی پێغەمبەری خوا. فەرمووی: بەو زاتەی منی بەحەق ناردووە بۆ پێغەمبەرایەتی دەڵێت، چاکترین کارێك کە کردومە تۆزەن کردنەوەی مزگەوتەکان بوو.

ئەمە پاداشتی ئەو کەسەیە کە خزمەتی ماڵی خوا دەکات ئەی داخۆ پاداشتی ئەوانە چۆن بێت کە دروستی دەکەن.

﴿ وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّن مَّنَعَ مَسَٰجِدَ ٱللَّهِ أَن يُذْكَرَ فِيهَا ٱسْمُهُۥ وَسَعَىٰ فِى خَرَابِهَآ ﴾[1]، واتە: کێ ستەمکار ترە لەو کەسەی رێگای مزگەوتەکانی خودا ئەگرێونایەڵێ ناوی خودایان تیا ببرێو عیبادەتی بۆ تیا بکرێ، هەوڵ ئەدا کاولیان بکات.

پێغەمبەر ﷺ نەفرینی لەکەسێك کردووە پێش نوێژی بۆ کۆمەڵێك بکات و رقیان لێی بێت یاخود پێیان ناخۆش بێت[2] . نوێژی سونەت ناچارت دەکات نوێژە فەرزەکانت ئەنجام بدەیت و شەیتانت لێ دوور دەخاتەوە، بەڵام ئەوەی لە رابردوودا نوێژی نەکردووە ئەوا پێویستە لەگەڵ هەرنوێژێکی فەرزدا نوێژێك یان دوو نوێژ بکات، ئەم نوێژە زیادەیەش سونەت واجب دەکات (فقهاء)یش لەسەر ئەمە هاوڕان. ئەو کەسەش کە نوێژ ناکات بەبێ باوەڕ دادەنرێ ئەمەش لەسەر ڕای ئیمام ئەحمەد، ئەوەی نوێژ نەکات لای ئەو بە بێ باوەڕ لەقەڵەم دەدرێت.

---

١- البقرة: ١١٤

٢- رواه الترمذي.

ئیسلام پەیوەندیە لەنێوان بەندەو پەروەردگاریدا، ئەوەی نوێژی لەکیس چووە با نائومێد و دڵتەنگ نەبێ و نوێژەکانی قەزا بکاتەوە، بەهەمان شێوە بۆ ڕۆژوو و زەکات و پەرستشەکانی دیکەش.

## زەکات نەدان:

یەکێکی تر لەوکارانەی کەدەبێتە مایەی سزای گۆڕ زەکات نەدانە، ئەوەی زەکاتی ماڵەکەی دەرنەکات یاخود لەغەیری خەرجی خۆیدا دەریبێنێ لەگۆڕەکەیدا لەسەری سزا دەدرێت، زەکات نادرێت بەباوك یاخود (باپیرو گەورە هەروەها دایك، نەنك) بەڵام زەکات لەسەر مێرد هەیە.

زەینەبی خێزانی عەبدوڵای کوڕی مەسعود بیلالی بینی و پێی وت: بە پێغەمبەری خوا بڵێ ئایا دروستە ئافرەت زەکات بدات بەمێردەکەی، بیلالیش ڕۆشتە ژورەوە بۆلای پێغەمبەری خوا ﷺ و پێی فەرموو: یارسول الله ئافرەتێك لەدەرەوەیە پرسیاری هەیە.

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بەزەینەب بڵێ با زەکاتەکەی بدات بە عەبدولا ی مێردی).

لەبەرئەوەی ئافرەت خەرجی کێشانی لێ داوانەکراوە بۆ مێردەکەی وە دەبێت بەشداربێت لەخەرجییەکدا کەخۆی پێی ڕازییە ئەمەش گەورەیی ئیسلام دەگەیەنێت.

## بانگخوازی خراپ:

بانگخوازانێکی کاراو دڵسۆز هەن کەکار بەقورئان و سوننەت دەکەن ڕەوشتی جوان لەژیان و هەنگاوەکانیان و گوفتارو کردارو مامەڵەیاندا لەگەڵ خەڵکی دەبینین، هەمیشە بۆ قورئان و سوننەت دەگەڕێنەوە.

لەهەمان کاتدا بانگخوازی خراپیش دەبینین کە لەنێو خەڵکیدا ئاشوب و دوبەرەکی دەنێتەوەو باس لەو شوێنانە دەکەن کەڕای جیاوازیان لەسەرەو ئاژاوەیان بەدواوەیە.

(ئەبو ذەری غەفاری) لەهەندێ شتدا ڕووبەڕووی حەزرەتی عوسمان دەبووەوە حەزرەتی عوسمانیش بەشەرمێکەوە وتی: ئەی (ئەبو ذەر) بۆ دەرمناکەیت دام نابڕیت (هەتا کێشە دروست نەبێت) لەوکاتەدا حەزەتی عوسمان جێنشینی پێغەمبەری خوا بوو ﷺ ئەوە بوو (ئەبو ذەر) خۆی مەدینەی جێ هێشت، پاش ماوەك بەخێزانەکەی وت ساتی مەرگم نزیك بۆتەوە بۆیە سندوقەکەی کردەوەو کفنەکەی بردو پێی وت: بەم جلەوە جیهادم لەگەڵ پێغەمبەری خوادا کرد هەر بەمەیشەوە کفنم بۆبکەن و بمنێژن ئەوە بوو (ئەبو ذەر) گیانی دەرچوو.

لەوکاتەدا کاروانێك هات عەبدوڵای کوڕی مەسعودی تێدابوو خێزانەکەی (ئەبو ذەر) بانگی کردن مردنی (ئەبو ذەر)ی پێ ڕاگەیاندن ئەوانیش هەرلەوێدا شتیان و هەر لەبەرگەکەی خۆیدا ئەسپەردەیان کرد ابن مسعود لەوساتەدا دەستی کرد بەگریان و وتی: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (کەسم نەدیوە بەقەدەر ئەبوذەر ڕاستگۆبێت)[1]

حەزرەتی جوبریل دابەزی و بەحەزرەتی محەمەدی فەرموو: (السلام) واتە خوای پەروەردگار سەلامت لێ دەکات، وە سڵاوی من بگەیەنە بە (ئەبو ذەر) ئەویش فەرمووی: ئەی جوبرەئیل ئایا دەیناسیت؟ جوبرەئیل فەرمووی: بەوکەسەی تۆی بەحەق ناردووە بۆ پێغەمبەرایەتی، ئێمە لەسەر ڕێگاکانی

---

١- رواه ابن ماجه.

ئاسمانەوە باشتر دەیناسین لەئێوە لەسەر ڕێگاکانی مەدینە. فەرمووی: بەچی؟ فەرمووی: بەهۆی ئەوەی زۆر دەیوت (لا إله إلا الله).

ئەوانە بانگخوازانی خێرو وتاربێژانی چاکن ئەوانە پێشینانی چاکی ئێمە بوون.

خیانەت کردنی مرۆڤ کارەساتە بەڵام خیانەت کردن لە خواو پێغەمبەرەکەی گەورەترە، خیانەت کردنی مرۆڤ ئەوەیە لە پەرستشەکاندا خیانەت بکات مرۆڤ لەسەیرکردنی ناشەرعیدا خیانەت بکات، خیانەت کردنی مرۆڤ لەپارەدا خیانەت کردنی مرۆڤ لەمامەڵەکاندا.

## ئافرەتان قژی خۆیان دەردەخەن لەبەرامبەر پیاواندا:

وەکو لە ڕوداوی ئیسراء و میعراجدا هاتووە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: کاتێك لە میعراجدا بەرەو ئاسمان بەرز بوومەوە کۆمەڵە ئافرەتێکم بینی بە قژیان هەڵواسرا بوون وتم: ئەی جوبرەئیل ئەمانە کێن؟ فەرمووی: ئەمانە ئافرەتانی ئوممەتەکەی تۆن کە قژیان بۆ خەڵکی بیانی دەردەخست، بیانی واتە: هەرکەسێك کە بتوانێت و دروست بێت ببێتە هاوسەری. کەواتە ئەی خوشك و برای خوێنەرم بیر لەوە بکەرەوە ئەمە تەنها سزای دەرخستنی قژە ئەی ئاخۆ دەرخستنی قۆڵ و سنگ و زۆرێکی تر لە لاشە سزاکەی چۆن بێت، هەر لەبەر ئەوەیە ئیسلام بالاپۆشی فەرز کردووە لەسەر هەموو ئافرەتێکی موسوڵمان.

﴿وَلْيَضْرِبْنَ بِخُمُرِهِنَّ عَلَىٰ جُيُوبِهِنَّ وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا لِبُعُولَتِهِنَّ أَوْ ءَابَآئِهِنَّ أَوْ ءَابَآءِ بُعُولَتِهِنَّ﴾[1] واتە: جوانیی لەشی خۆیان دەرنەخەن ئەوەی نەبێ کە بۆخۆی بەدەرەوەیە، وەك دەموچاوو دەستیان تا ئەگاتە مووچیان، ئەوی تری داپۆشن و با سەرپۆش بدەن بەسەر گەردن و مل و سنگ

---

١- النور: ٣١

و بەرۆکیانداو جوانیو خشڵ و متوموورووی خۆیان دەرنەخەن لای مێردەکانیان، یا باوکیان، یا باوکی مێردەکانیان و.....نەبێ.

ئیسلام ئافرەتی نەبەستۆتەوە هەتا جوانی و لاوی خۆی بشارێتەوە، بەڵام دەیەوێت ئەو جوانی و گەنجییە لەڕەزامەندی خوادا بێت.

کاتێك کچ باڵاپۆش دەبێت تەنها کەسێکی دامەزراو داوای دەکات. بەڵام بە پێچەوانەی ئەمەوە مێش داوای دەکات.

## ڕێگر:

ئەوانەی ڕێگا لەخەڵکی دەبڕن و ماڵ و داراییەکەیان لێ دەدزن بەم کارەیان سزای گۆڕ بۆ خۆیان مسۆگەر دەکەن.

## ترسان لە بەدیهێنراوان و نە ترسان لە بەدیهێنەر:

بۆ نموونە ئەو کارمەندەی کە لەکاتی دیاربوونی بەڕێوەبەرەکەیدا کار دەکات، کاتێکیش ئەو دیارنەما کارناکات، ئەم کارەی وا دەگەیەنێت کە خۆی بەندەی خوا نیەو بەندەی بەڕێوەبەرەکەیەتی.

## بەدڕەفتاری و بەدزمانی:

ئەوە تەنها ئازاری مرۆڤەکان نادات بەڵکو فریشتەکانیش ئازار دەخۆن، چونکە فریشتەکانیش بەم کارانە وەکو مرۆڤەکان ئازار دەکێشن.

خوای گەورە خوێندنی قورئانی کردۆتە چارەسازی ئەم کارە خراپە، هەروەها ئامادەبوون لە دانیشتنی زاناو زانستخوازدا.

ئەبو موسای ئەشعەری(ڕەزای خوای لێ بێ) دەفەرموێت: سوێند بەخوا دنیام لەبەر سێ شت خۆش دەوێت:

ئایـەتێك کـە لـەقورئانی خـوادا بیخوێنمـەوە یـان گـوێم لـە فەرمایشـتێکی پێغەمبەر ﷺ بێـت، یـاخود لەگـەڵ خەڵکانێکدا دابنیشم قسـەی جوان و چاك هەڵدەبژێرن وەك چۆن بەری چاك هەڵدەبژێرن.

## فتوادانی بێ زانست:

ئەمـەش کارەسـاتێکە بـۆ موسـوڵمانان وتـراوە ئـەوەی بـوێرێ فتـوا بـدات بەئاگریش دەوێرێت، هـەروەها وتـراوە: ئـەوەی وتـی خـوا زانـاترە ئـەوە فتـوای داوە..

ئەوە ئیمامی مالیکە (٤٠) پرسیاری لێ دەکرێت تەنها شەش پرسیاریان وەڵام دەداتەوەو بۆ ئەوانی تر وتی: نازانم.

دەیوت: دەڵێم خوا زاناترە بەسەلامەتی بڕۆمـە بەهەشتەوە چاکترە لـەوەی فتوایەك بدەم بەبێ زانست و بەهۆیەوە بچمە ئاگرەوە.

ئەوە ئیمام ئەحمـەد کوڕی حەنبەلـە کـە دەفـەرموێت: ڕا لای مـن قورئـان و سوننەیە لەگەڵ نازانم. ئەوەش حەزرەتی عومەر ﷺ دەڵێـت: ئـەوەی دەیـەوێ پرسیار دەربارەی (فِقـه) بکـات بـا بێـت بـۆ لای معـازی کـوڕی جەبـەل، ئـەوەی دەیەوێ دەربارەی قورئان پرسیار بکات با بێت بۆلای عەبدوڵای کوڕی مەسعود، ئەوەی دەیەوێ دەربارەی زانستی الفرائض (زانسـتی مـیرات) پرسـیار بکـات بـا بێت بۆلای حەزرەتی عەلی کوڕی ئەبو طالیب، ئەوەشی دەیەوێ دەربارەی پـارە پرسـیار بکـات بـا بێـت بـۆ لای خـۆم خـوای گـەورە کردومیەتـە خەزنـەدارو دابەشکەری.

## ئەشکەنجەدانی گیانداران:

ئەوە ئافرەتێکە بەهۆی پشیلەکەوە دەخرێتە ئاگرەکەوە، خوای گەورە لەڕۆژی دواییدا گیانداران کۆدەکاتەوە: ﴿وَإِذَا ٱلْوُحُوشُ حُشِرَتْ﴾[1] واتە: کە گیانلەبەرانی کێوی لە هەموو جۆرێ کۆکرانەوەو کەوتنە ناویەك.

ئەوە بەسەرهاتێکی گەورەیە: حەزرەتی عومەری کوڕی خەتاب بەناو مەدینەدا دەڕۆیشت سەیری کرد چەند منداڵێك یاری بەچۆلەکەیەکی هەژار دەکەن کە بە پەتێکەوە بەستراوەتەوە.. پەتەکەی بڕی و چۆلەکەکەی بەرەڵاکرد. دوای ساڵێك لە پاش مردنی خەڵکێك خەویان پێوە بینی پێیان وت: خوای بەندەکان چی لێ کردی ئەی گەورەی بڕواداران؟ (طاحت تلك الاشارات وضاعت تلك العبارات) واتە: (وتی: ئەو ئاماژانە لە ناوچوون و ئەو دەستەواژانەش ونبوون نەمان).

فەرمووی: خەریکبوو تیابچم ئەگەر بەلێخوشبوو و میهرەبانیم نەزانیایە.

فەرمووی: خوایە بەدادپەروەری خۆت لێم خۆشبوویت؟ فەرمووی: نەخێر فەرمووی: بەزانستت؟ فەرمووی: نەخێر فەرمووی: ئەی بەچی؟ خوای گەورە فەرمووی: لەیەکێك لە شەقامەکانی مەدینەدا دەڕۆشتیت کۆمەڵە منداڵێکت بینی یارییان بەچۆلەکەیەکی بەستراوە دەکرد تۆش ئازادت کرد لەدەستیان و بەرەڵات کرد خوای گەورە پێی فەرمووم: ئەی کوڕی خەتاب چۆلەکەیەکت لەدیلی ڕزگارکرد ئەوا منیش لەدۆزەخ ڕزگارت دەکەم و دەتخەمە بەهەشتەوە.

کەواتە براکەم هیچ کاتێك چاك بەسوك تەماشا مەکە ئەگەر چی کەمیش بێت. هەروەها هیچ گوناهێکیش بەکەم مەزانە بەڵام سەیری ئەوە بکە گوناهەکەت لەبەرامبەر کێدا کردووە.

---

١- التكوير: ٥

نەرم و نیانی لەبەرامبەر گیانداراندا یەکێکە لە تایبەتمەندیەکانی ئومەتی ئیسلامی. ڕۆژئاواییەکان ڕەحم بەگیانداران دەکەن بەڵام بەمرۆڤی ناکەن، ئەوەتا دەبینین چی دەکەن لە ئومەتی ئیسلامی.

## کردەوەی گەلی لوط:

لەڕۆژی دواییدا سزاکەی ئەوەیە لەدرەختێکی بەرزەوە فڕێ دەدرێتە خوارەوە هەتا دەگاتە خواری خوارەوە ئەوە جارێکی تر دووبارە دەکرێتەوە.

سزای گەلەکەی لوط ئاوا دەبێت: ﴿جَعَلْنَا عَلِيَهَا سَافِلَهَا وَأَمْطَرْنَا عَلَيْهَا حِجَارَةً مِّن سِجِّيلٍ مَّنضُودٍ﴾[1] واتە: کە فەرمانمان هات بۆ سزادانیان شوێنەکەمان سەرەوژێر کرد و کاولمان کرد بەیەکاو بەردەبارانمان کردن بە بەردێ لە جۆری قوڕی بەبەردبوو کە بەتایبەتی یەك لە دوای یەك ڕیزکرابوون بۆ سزادانیان.

سەیری فەرمانی شەریعەت بکە ئەو کەسانەی هەمان کارەکەی گەلی لوط دەکەن لەبەرزترین تاوەری شارەکەوە فڕێ دەدرێنە خوارەوە.

## دز:

پاداشتەکەی لەدنیادا بڕینی هەردوو دەستیەتی، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَٱلسَّارِقُ وَٱلسَّارِقَةُ فَٱقْطَعُوٓاْ أَيْدِيَهُمَا جَزَآءَۢ بِمَا كَسَبَا نَكَٰلًا مِّنَ ٱللَّهِ ۗ وَٱللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ﴾[2] واتە: ئەو پیاوەی دزی ئەکات و ئەو ژنەی دزی ئەکات، بە مەرجێ باڵغ و عاقڵ بن و، شوبهەیان نەبێ لە حەرامیی ماڵەکە بۆیان، نەك وەك ماڵی شەریکی یا ماڵێ کە وەقفی عاممە بێ کە گومانی حەڵاڵی تێدایە بۆیان، هەروەها

---

١- هود: ٨٢

٢- المائدة: ٣٨

بەو مەرجەی دزراوەکە نرخی چواریەکی دینارێکی ئاڵتوون بێو، لەشوێنی خۆیدا دانرابێو پارێزراو بێ، ئەوە دەستیان ببڕن لە مووچا تا ببێتە تۆڵەی ئەو گوناهە نالەبارە کە کردوویانە، کە ئەمەیش عوقووبەتێکە لە لایەن خوداوە. خودا توانـاو بەدەستەڵاتەو کارەکانی پڕ حیکمەتن.

## بۆ حەڵاڵکەرو بۆ حەڵاڵکراو:

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: (ألا أدلكم على التيس المستعار؟ قالوا: وما التيس المستعار يا رسول الله؟ قال: المحلِّل والمحلَّل له) واتە: ئایا پێتان بڵێم بزنی دەستەوا(یان دەستیاو کراو) چیـیە؟ وتیان: بزنی دەستەوا چیـیە ئەی پێغەمبەری خواﷺ ، فەرمووی: ئەو کەسەی کە مارە بەجاش دەکات و ئەوەشی کە بۆی حەڵاڵ دەکات.[1]

واتە: ئەو کەسەی کە هاوسەرگیری دەکات هەتا گەڕانەوەی ژنەکەی حەڵاڵ بکات بۆلای هاوسەری پێشووی کە سێ جار تەڵاقی داوە. شەرعیش ئەم کارەی ڕەت کردووەتەوەو پێغەمبەریش ﷺ پێوەری داناوە بۆ ئەم هاوسەرگیریە: (حتى يذوق عسيلتها وتتذوق عسيلته) واتە: هەتا پیاو چێژ لەژنەکەی وەردەگرێت و ژنیش چێژ لەو وەردەگرێت).

## ساختەکاری لەسەر داڕمانی فەرزەکان:

ئەمە کاری بەنی ئیسرائیل بوو لە بەسەرهاتی (أصحاب السبت)، خوای گەورە فەرمانی پێدان کە لەڕۆژی شەممەدا کارنەکەن ئەوەبوو لەڕۆژی هەینیدا تۆڕەکانیان داخست دیارە نەهەنگەکان لەڕۆژانی شەممەدا دەهاتن و دەبوون

---

١- رواه ابن ماجه.

بەتوڕەکانیانەوە پاشان لەڕۆژی یەک شەممەدا دەهاتن توڕەکانیان پڕدەبوو لەماسی.

## کۆمەکی نەکردنی ستەم لێکراو:

لەگەورەیی ئیسلام کۆمەکی کردنە بەستەم لێکراو تەنانەت ئەگەر کافریش بێت: ﴿وَإِنِ ٱسۡتَنصَرُوكُمۡ فِي ٱلدِّينِ فَعَلَيۡكُمُ ٱلنَّصۡرُ﴾[1] واتە: ئەگەر موحتاجی یارمەتی بوون و داوای یارمەتییان لێ کردن ئەوە واجبە لەسەرتان یارمەتییان بدەن دژی دوژمنەکانیان.

## فەرمانکردن بەپێچەوانەی ئەوەی خوای گەورە دایبەزاندوە:

ئەمەش ئەو کەسانە دەگرێتەوە کە بەیاسا دەستکردەکان ڕازی دەبن و واز لەشەریعەتی ئیسلام دێنن کەلای خواوە دابەزیوە.

. گەورەی باوەڕداران ڕۆژێك دەربارەی نوێژی بەیانی هەواڵی یەکێك لەهاوەڵانی پرسی ئەوە بۆ دیارنییە، وتیان لەوە دەچێت نەخۆش بێت، دوای ئەوەی نوێژی بەیانی تەواوبوو گەورەی باوەڕداران لەمزگەوت دەگەڕایەوە ئەو هاوەڵەی پێ گەیشت وتی: لەخزمەتتدام ئەی گەورەی باوەڕداران. ئەویش فەرمووی: خوای گەورە پێت دەفەرموێت: (الصلاة خير من النوم) نالێیت بەڵێ لەخزمەتتدام خوایە گیان. بەڵام گەورەی باوەڕداران پێت دەڵێت فلانە کەس تۆش پێی دەڵێی بەڵێ گەورەم لە خزمەتتدام، بەڕاستی پیاوێکی خراپیت.

---

١- الأنفال: ٧٢

## ئازاردانی دراوسـێ:

ئەو ئافرەتەی ئازاری دراوسێکەی دەدات و زیاد لەسنور فشار دەخاتـە سـەر هاوسەرەکەی و زمان لەبەرامبەریدا درێژ دەکـات، هـەموو ئەمانـە دەبنـە مایـەی سزای گۆڕو وێنەیەك لەوێنەکانی سزا.

خوای گەورە لە فەرمایشتێکی قودسیدا دەفـەرموێت: ئـەوەی تەویـە بکـات و بگەڕێتەوە بۆلام لـەدوورەوە بـەرەوڕووی دێـم ئـەوەش لـەئێوە بەسەرپێچییەوە بڕوات لەنزیکەوە بانگی دەکەم. ئایا جگە لەمن خوایەکی تـرت دۆزیوەتـەوە یـان میهرەبـانێکی تـرت دۆزیوەتـەوە؟ ئەوانـەی یـادی مـن دەکـەن لەکۆمـەڵی مـنن، ئەوانـەی گوێڕایـەڵیم دەکـەن خۆشەویسـتانی مـنن، ئەوانەشـی کـە سەرپێچـیم دەکەن لە ڕەحمەتی خۆم نائومێدیان ناکەم، ئەوەی تەوبە بکات ئەوا من دەبمـە خۆشەویسـتی ئـەوەش تەویـە ناکـات ئـەوا دەبمـە پزیشـك و چارەسـازی، مـن لـەدایکیان میهرەبـانترم بۆیـان. چـاکە لای مـن دە هێنـدی خۆیـەتی و زیادیشـی دەکەم خراپەش لای من یەك دانە دەنوسرێت و لێشی خۆش دەبم.

## ئەوکـارانەی سـزای گـۆڕ مسـۆگـەر دەکـەن:

ئەمانە چەند گوناه و تاوانێکن کە سزا بۆ خاوەنەکانیان لەناو گۆڕدا مسۆگەر دەکەن لەوانە:

١- دوو زمانی و قسە گێڕانەوە.

٢- خۆپاك نەکردنەوە لە پێشاو (لە میز).

٣- درۆکردن.

٤- کار نەکردن بە قورئانی پیرۆز.

٥- زینا کردن.

٦- خواردنی ماڵ و سامانی بێ باوکان.

٧- سووخواردن.

٨- تەمەڵی لە نوێژکردندا.

٩- ڕێگر لە زەکات دان.

١٠- وتارخوێنی ئاژاوە گێڕ.

١١- غەیبەت کردن.

١٢- وردبوونەوە لە ناموسی خەڵکی.

١٣- ناپاکی و ساختەکاری .

١٤- ئـەو کەسـەی ئـیش بـەپارەی خەڵکی‌یـەوە دەکـات و دەسـتی بەسـەردا دەگرێ.

١٥- بانگخواز بۆ داهێنراوەکان (بیدعە).

١٦- بەرتیل خواردن.

١٧- ناپاکی کردن.

١٨- خەڵەتاندن.

١٩- فێڵ کردن.

٢٠- ئازاردانی موسوڵمانان.

٢١- بەدوادا چوونی عەورەت.

٢٢- پاڵپشتی کردن لەسەر خراپەو دوژمنکاری.

٢٣- بێ باوەڕی بە حەرام و قەدەغەکراوەکان.

٢٤- ئەو کەسەی ڕاو بۆچوونی خۆی دەخاتە پێش قورئان و سونەت.

٢٥- شیوەنکەرو ئەو کەسەشی کە گوێی لێدەگرێت.

٢٦- دروستکردنی مزگەوت لەسەر گۆڕەکان.

٢٧- تەرازوبازی.

٢٨- گەڕان بەشوێن کەم و کوڕی خەڵکی و قسەکردن لە عەیب و عاریاندا.

٢٩- ئەو کەسانەی قسە بە پێشینان و چاکەکاران دەڵێن.

٣٠- چوونە لای دەستگرەوەو فالچی.

٣١- پشتیوانی کردنی ستەمکار.

٣٢- هەرکەسێك مرد و حەجی نەکردبێت و دەسەلاتیشی بووبێت.

٣٣- دواخستنی نوێژو نەکردنی لەکاتی خۆیداو، سەرقالبوون بە عەیبی خەلکیەوە.

٣٤- ئافرەتان قژی خۆیان دەردەخەن لەبەرامبەر پیاواندا.

٣٥- گرتنی ڕێگا.

٣٦- ترسان لەدروستکراوەکان و نەترسان لەبەدیهێنەری ئەو دروستکراوانە.

٣٧- بەدڕەوشتی و بەدزمانی.

٣٨- فتوادانی بێ زانست.

٣٩- ئەشکەنجەدانی گیانداران.

٤٠- کاری گەلی لوط.

٤١- دزی.

٤٢- بۆ حەلالکەرو بۆ حەلالکراو.

٤٣- فریودان و ساختەکاری لەسەر میرات نەدان.

٤٤- کۆمەکی نەکردنی ستەم لێکراو.

٤٥- فەرمانکردن بەپێچەوانەی ئەوەی خوای گەورە دایبەزاندووە.

٤٦- ئازاردانی دراوسێ.

# ڕزگـارکـەری سـزای گـۆڕ

* یەکەم ڕزگارکەری سزای ناوگۆڕ دورکەوتنەوەیە لەو کـارو ڕەفتارانـەی کـە دەبنە مایەی سزای گۆڕ کەواتە لیستێکی لێپرسینەوە بۆ خـۆت ئامـادە بکـە بـۆ دەربازکردن لەو کارو ڕەفتارانەی کە دەبنە مایەی مسۆگەرکردنی سزای گۆڕ.

**لەو ڕزگاریکارانە:**

## چاکـەکـردن لـەگـەڵ دایك و باوکـدا:

پێغەمبەر ﷺ دەفـەرموێت: (ئەمشـەو شـتێکی زۆر سـەیرم بینـی: پیـاوێکی ئوممەتەکـەمم بینـی فریشـتەی مـەرگ هاتـە لای هـەتا گیـانی بکێشـێت بـەڵام چاکەکردنەکانی لەگەڵ دایك و باوکیدا لەبەردەمیدا وەستان فریشتەی مـەرگیش گەڕایەوە).

بەڵێ ئەمە تەنها حاڵەتە کە فریشتەی مەرگ تیایدا دەگەڕێتـەوە، حەسرەت بۆ ئەو کەسەی کە چاکە لەگەڵ دایك و باوکیدا ناکات ... وە مـژدە بـۆ ئەوانـەی دوای ئـەم وشـانە چـاکە لەگـەڵ دایـك و باوکیـان دەکـەن و لـە دنیـادا بەچـاکی هاوڕێیـەتیان دەکـەن. وە هـاوەڵانی چـاك شـەفاعەتدەرن بـۆ ڕۆژیـی دوایـی، چاکەکاران لە دنیادا چاکەکارانن لە ڕۆژیی دوایدا.

## دەسـت نوێژ:

پێغەمبـەر ﷺ دەفـەرموێت: (پیـاوێکی ئوممەتەکـەمم بینـی سـزای گـۆڕ بەسەریدا سەپێنرا بەڵام دەستنوێژەکانی هاتن و لەو حاڵەتە ترسناکە ڕزگاریـان کرد).

ئـەو ڕوناکییـەی کـە دەسـتنوێژ دەیـدات بەکەسـی دەسـتنوێژگر چـەند لێکۆڵینەوەیـەك دەریـان خسـتووە کـە دەسـتنوێژ باشـترین ڕێگەیـە بـۆ چارەسەرکردنی دڵە ڕاوکێی دەروونی.

لـه ئامـارێکی ڕێکخـراوی تەندروسـتی جیهـانیدا هـاتووه کـه دەبوایـه نەخۆشـی سـەرەتانی پێسـت لەناوچـەی ڕۆژهـەڵاتی ناوەڕاسـتدا بڵاوببوایەتـەوه لەبەرئـەوەی تیشـکی خـۆر لـەو نـاوەدا زۆر سـوتێنەره کەچـی ئـەم نەخۆشـییه لـەولاتانی دوور لـەم ناوچـەیه زیـاتر بـڵاوه بەرێـژەی ٣٪ بـەڵام لـه ڕۆژهـەڵاتی ناوەڕاستدا له هەزار کەسدا سێ کەس دوچاری ئەم نەخۆشیه بوون پاشان بۆیان دەرکـەوتووه کـه ئەمـەش بـەهۆی دەسـتنوێژ گرتنەوەیـە، دەسـتنوێژ گـرتن گوناهـەکان لـه لاشـه هەڵـدەوەرێنێت بۆیـه هەمیشـه دەسـتنوێژگر ناوچـەوانی نورانییه.

وتیان ئەی پێغەمبەری خوا ئەوا ئێمه دەناسیتەوه ، بەڵام ئەی ئەوانەی دوای خۆمـان چـۆن دەناسـیتەوه؟ پێغەمبـەر ﷺ فـەرموی: مـن لـه خـاوەنی ئـەو ئەسـپەتان کـه ئەسـپەکەی خـۆی لـەناو ڕەوه ئەسـپێکدا دەناسـێتەوه باشـتر دەیانناسمەوه. وتیان چۆن؟ فەرموی: بەدرەوشانەوەی ڕوخساریان و ئاسەواری دەستنوێژەکانیان.

## یادی خـوا:

پێغەمبـەر ﷺ دەفـەرموێت: (پیـاوێکم لەئوممەتەکـەم بینـی شـەیطانـەکان ناخیان داگرتبوو کاتێك یادی خوا کەوته سەر زمانی شـەیطانـەکان ڕایـان کـردو لێی دورکەوتنەوه).

کەواته دەبێت هەمیشه زمانت پاراوبێت بەیادی خوا، نـەمامێك لـه بەهەشـتدا بۆ خۆت بڕوێنه هەرکەسێك دەڵێت: (سبحان الله والحمدلله ولاإلـه إلا الله) ئـەوا دار خورمایەکی له بەهەشتدا بۆ دەڕوێندرێت)[1].

(دوو وشه هەن لەسەر زمان ئاسانن و لەسـەر تـەرازو قورسـن خـوای الـرحمن زۆر خۆشی دەوێن ئەوانیش (سبحان الله وبحمـده و سـبحان الله العظـیم)[1]. ئـەوه

---

١- رواه إبن ماجه.

داوده ﷺ فەرمووی: (یا ربی لك الحمد كما ینبغی لجلال وجهك وعظیم سلطانك) فریشتەكان وتیان داودی بەندەت زیكرێكی كردوە هیچمان دەست ناكەوێت لە پاداشت هەتا بۆی دابنێین. خوای گەورەیش فەرمووی ئەوەی داود وتی بۆی بنوسن خۆم لە ڕۆژی قیامەتدا پاداشتی دەدەمەوە.

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: (باشترین زیكرێك كە من و پێغەمبەرانی پێش منیش وتبێتمان زیكری (لا إله إلا الله)یە.

كەواتە زیكرێك بۆخۆت دیاری بكە، لەكاتی ئەنجامدانی گوناهێكدا ئیستغفار بكە لەكاتی نیعمەتیشدا سوپاسگوزاربە لەكاتی بەڵاشدا بڵێ: (حسبي الله ونعم الوكیل).

## نوێژ:

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: (پیاوێكم بینی لە ئوممەتەكەم فریشتەكانی سزادان دەوریان گرتبوو بەڵام نوێژەكەی هات و ڕزگاری كرد).

ئاگری سەرپێچی كردن بەنوێژەكانت بكوژێنەرەوەو زۆر لەخۆت بكە.

یەكێك لە پیاوچاكان دەڵێت: بیست ساڵ ژیام هانی خۆم دەدا لەسەر نوێژكردن هاندانێك كەچوومە ناوی نەتوانم بێمە دەرەوە لێی، پاشان بیست ساڵی تر ژیام هانی خۆممدا بێمەدەر لێی نەمتوانی.

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: نوێژەكانم كردوەتە سۆمای چاوەكانم. كاتێك غەم و پەژارەیەك ڕووبەڕووی دەبووەوە دەیفەرموو بیلال بانگێكمان بۆ بدە با بحەوێینەوە.

ئەوە ئەبوحەسەنی شازلیە لەخەویدا پێیان وت: مامۆستا حاڵت چۆنە؟ فەرمووی: نەمامۆستاو نەغەیری مامۆستا، هەموو شتێك تیاچوو! وتیان: ئەی

---

١- رواه البخاري.

چـی ماوەتـەوە؟ فـەرمووی: ئـەو دوو ڕکاتـە نوێـژەی کـە لـەقوڵایی شـەودا ئەنجاممانداو خەڵکی نوستبوون.

## ڕۆژووگـرتـن:

پێغەمبـەر ﷺ دەفـەرموێت: (پیـاوێکی ئوممەتەکـەمم بینـی لـەتینوێتیدا هەناسە بڕکێی پێ کەوتبوو هەر کە دەمی دەبرد بۆسەر حەوزێك دەریان دەکرد بەڵام ڕۆژووەکانی مانگی ڕەمەزانی هاتن و تینوێتیان شکاند).

بەڵێ، پاداشت بەپێی کردەوەیە ئەگەر لەدنیادا خۆت تینو کردووە ئەوا لەڕۆژی تینوێتیە گەورەکەدا پاراو دەکرێیت، ئـەوە شێخ حەسـەنی بەصری لـە ئـاوی زەم زەمـی دەخـواردەوە فـەرمووی: بـەو نیەتـەی لـەڕۆژی تینوێتیـە گەورەکەدا تێرئاو بم.

## خـۆشـۆردن لـە لـەشـگـرانی:

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: (پیاوێکم بینی لە ئوممەتەکەم وە پێغەمبەرانیشم بینی بازنە بازنـە دانیشـتبوون هـەرکاتێك ئـەو پیـاوە دەیوسـت بچێتە نـاو ئـەو بازنانەوە دەریان دەکـرد بـەڵام بـەهۆی ئـەوەی خێـرا لـە لەشگرانی خـۆی پـاك دەکردەوە فریای کەوت و لەتەنیشتەوە دایـان نیشـاند). ﴿وَسَارِعُوٓاْ إِلَىٰ مَغۡفِرَةٍ مِّن رَّبِّكُمۡ وَجَنَّةٍ عَرۡضُهَا ٱلسَّمَٰوَٰتُ وَٱلۡأَرۡضُ أُعِدَّتۡ لِلۡمُتَّقِينَ﴾[1] واتـــە: ئـــەی موسوڵمانینە! پێشدەستی بکـەن و بەپەلـە کـردەوەی بـاش بکـەن و زوو دەس بدەنە کاری خێر. ئەو بەهەشتە دەست خۆتان بخەن کە زۆر گەورەو بەر بـڵاوەو بەقەدەر ئەرزو ئاسمانەکانەو ئامادەکراوە بۆ ئەوانەی لەخودای خۆیـان ئەترسـن و نزیکی گوناه و نافەرمانیی خودا ناکەونەوە.

---

١ - آل عمران: ١٣٣

## حەج و عەمرە:

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: (پیاوێکی ئوممەتەکەمم بینی بەردەمی تاریکی بوو دوایەوە هەر تاریکی بوو لای ڕاستی تاریکی بوو لای چەپی تاریکی بوو بەسەر سەریشیەوە هەر تاریکی سەری لێ شێوابوو بەڵام حەج و عەمرەکەی هاتن لەو تاریکیە ڕزگاریان کردو خستیانە نێو ڕووناکیەوە).

## خێرکردن:

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: (پیاوێکم بینی لە ئوممەتەکەم خۆی لە ئاگرو پریشك دەپاراست گۆڕەکەی ببوە ئاگر بەڵام خێرەکانی هاتن و بوونە بەربەستێك لەنێوان خۆی و ئاگرەکەداو بوونە سێبەر بەسەر سەریدا).

- ئەوەتا دەفەرموێت: (خۆتان بپارێزن لەئاگر ئەگەر بە لەتە خورمایەکیش بێت).

## پەیوەندی خزمایەتی:

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: (پیاوێکم بینی لە ئوممەتەکەم قسەی لەگەڵ باوەڕدارانـدا دەکـرد بەڵام ئەوان قسەیان لەگەڵدا نەدەکرد، پەیوەندییە خزمایەتیەکانی هات و پێی وتن: ئەی کۆمەڵی بڕواداران ئەم پیاوە پەیوەندی پتەو بوو لەگەڵ خزم و دەوروبەریدا ئێوەش لەگەڵیدا بن، ئەوانیش قسەیان لەگەڵدا کرد تەوقەی لەگەڵدا دەکردن و تەوقەیان لەگەڵدا دەکرد).

ئێمە کاتێك قسە لەسەر ئەو حاڵەتانە دەکەین کە دەمانترسێنن ئەوە وەستانێکە بۆئەوەی بیری لێ بکەینەوە، ئەوەتا بە إبن عەباسیان وت: لەگەڵ خەڵکانێکدا دادەنیشیت دەمان ترسێنن! ئەویش فەرمووی کاتێك دادەنیشن لەگەڵ ئەوانەی دەتانترسێنن ئەوا هێوری ڕۆژی قیامەتتان دەست دەکەوێت نەك لەگەڵ ئەوانەدا دابنیشن کە هێورتان دەکەنەوە بەڵام بەهۆیانەوە لەڕۆژی

قیامەتدا دەکەونە ترسەوە (خوای گەورە نەهەردوو ئارامی و نەهەردوو ترسەکە ناخاتە سەر بەندەیەکی خۆی).

دیارە ئەم هەڵوێستەی بیرکردنەوە دەبێت گەڕانەوەیەکی ڕاستگۆیانەی بەدوادا بێت بۆلای خوای گەورە. ڕەحمەت و میهرەبانی خوا نزیکە لە چاکەکارانەوە سەیری ڕەحمی خوا بکە لە وەرگرتنی تەوبەی عەبدەکانی: پیاوێك هاتە خزمەت حەزرەتی موسا ﷺ و وتی: بیستساڵ گوێڕایەڵی خوام کردووەو بیستساڵیش سەرپێچیم کردووە ئێستا دەمەوێ بگەڕێمەوە بۆلای خوا ئایا تەوبەم لێ وەردەگرێت؟ خوای گەورە بەحەزرەتی موسا ﷺ ی فەرموو: بەو بەندەیەمان بڵێ ئێمەت خۆشویست ئێمەش تۆمان خۆشویست گوێڕایەڵیت کرد نزیکمان کردیتەوە سەرپێچیشت کردین ئێمە ماوەمان پێدایت، خۆ ئەگەر بگەڕێیتەوە لامان وەکو جاران ئەوا وەرت دەگرینەوە.

ئێستاش هەر لەگەڵ فەرمایشتی پێغەمبەری خوادابین و ئەو خەوەی کەبینی، دەڵێت خەوی پێغەمبەران هەمووی ڕاستەو خەوی پێغەمبەرمان محمد ﷺ وەسیەتە بۆ ئێمە. ئەم خەوە لە (١٧) ڕەنگ لەڕەنگەکانی دەربازبوون لەسزای گۆڕ پێکدێت ، ئەویش مژدەیەکی گەورەیە چونکە کارێکن تایبەتن بە پەرستشەکانی ئادەمیزادو هەڵسوکەوتەکانی.

کاتێکیش پەرستشەکان و هەڵسوکەوتەکان یەك دەگرن ئەوا موسوڵمانێکی تەواومان دەست دەکەوێت کە (إن شاء الله) لەدنیاو ژیانی ناو گۆڕو ڕۆژی قیامەتیش ڕزگاری دەبێت.

## فەرمان کردن بە چاکەو نەهی کردن لە خراپە:

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: (پیاوێکی ترم بینی لە ئوممەتەکەم فریشتەکانی دۆزەخ کە پێیان دەوترێت (الزبانیة) دەوریان دابوو ﴿ فَلْيَدْعُ نَادِيَهُ، سَنَدْعُ ٱلزَّبَانِيَةَ ﴾[1]، واتە: جا با ئەوکاتە دانیشتووانی کۆڕەکەی خۆی بانگ کا یارمەتیی بدەن. ئێمەیش کلیلەوانەکانی دۆزەخ بانگ ئەکەین بە قژی پێشەسەری بەکێشیکەن.

بەلام فریشتەکانی بەهەشت پێیان دەوترێت فریشتەی ڕەحمەت یاخود فریشتەی (رضوان)، هەروەها پێیان دەوترێت (الزبانیة) واتە چەند ئامێرێکیان پێیە ئازارو ئەشکەنجەی ئادەمیزاد دەدەن ئەوەتا خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ وَلَهُم مَّقَـٰمِعُ مِنْ حَدِيدٍ ﴾[2] واتە: گورزی ئاسنیشیان بۆ هەیە بۆ سزادانیان، بەدەست مەئمووری سزادانیانەوەن.

کەلەپچەو زنجیری ئاسنیان لەدەستدایەو دەیانخەنە (السعیر)ەوە کە شوێنێکە لە دۆزەخ و دەیانبەستنەوەو خواردنی (زەقوم)یان دەدەنێ (مالك)یش سەرۆکیانەو (١٩) یارمەتیدەری هەیە: ﴿ عَلَيْهَا تِسْعَةَ عَشَرَ ﴾[3] واتە: نۆزدە فریشتە یا نۆزدە تاقم فریشتەی بەسەرەوەیە. هەموویان سەرپەرشتی هەموو ڕێگاو دەرچەکانی دۆزەخ دەکەن. ﴿ وَنَادَوْا۟ يَـٰمَـٰلِكُ لِيَقْضِ عَلَيْنَا رَبُّكَ ﴾[4] واتە: ئەوانەی لەناو ئاگری دۆزەخان هاوار ئەکەنە دەرگاوانی دۆزەخ کە ناوی (مالیك)ەو پێی ئەڵێن: ئەی مالیك! بەڵکو کارێ بکەی خوا گیانمان بکێشێو بمرین و بحەسێینەوە، (المالك) دوای

---

١- العلق: ١٧ – ١٨

٢- الحج: ٢١

٣- المدثر: ٣٠

٤- الزخرف: ٧٧

هەزار ساڵ وەڵامیان دەداتەوە: ﴿ قَالَ اخْسَئُوا فِيهَا وَلَا تُكَلِّمُونِ ﴾[1] واتە: خوایش ئەفەرموێ: بە سەرشۆڕیی خۆتانەوە بێدەنگ بن بۆخۆتان لەناو ئاگری دۆزەخداو لەم بارەوە قسەم لەگەڵ مەکەن چونکە ئەو جێگەیە هەڵبژاردەی خۆتانە.

ئیتر لە هاتنە دەرەوە نائومێد دەبن، (لەوکاتەدا ئەو فەرمان بەچاکەو نەفرین لە خراپەیە لە دەست ئەو فریشتەی سزایانە دەربازی دەکەن و دەیگەیەنن بە فریشتەکانی ڕەحمەت).

دیارە سێ بنەمای سەرەکی هەیە بۆ فەرمان بەچاکەو نەهی لەخراپە سێ خاڵی لاوەکی تر لێرەدا ڕیز دەبێت ئەوانیش:

یەکەم: زانابم بەوانەی فەرمانی پێ دەکەم و نەفرینی لێ دەکەم.

دووەم: ئەوانەی فەرمانی پێدەکەم خۆم ئەنجامی دەدەم و ئەوەشی نەفرینی لێ دەکەم خۆشم ئەنجامی نادەم.

سێیەم: هێمن بم لەگەڵ ئەوەی فەرمانی پێدەکەم و نەفرینی لێ دەکەم.

## درێژەدان بەمەرجەکانی فەرمان بەچاکەو نەفرین لەخراپە:

**یەکەم:** باسەکە بەجۆرێك درێژ دەکەینەوە کەزیاتر ڕوون بێتەوە، ئەو زانستەیە هانای پێ دەبرێت لەسەر فەرمان بەچاکەو نەفرین لەخراپە، لەو شارەزاییە پێویستانەی کە بۆ ژیانی گشتی دەمانەوێ واتە کاتێك پێویست بوون داوای دەکات بۆ پەرستشەکان و باوو نەریت و هەڵسوکەوتە گشتییەکان، وەکو نوێژو ڕۆژو و زەکات و بازرگانی و قەرزە جۆراو جۆرەکان و زۆری تر، ئەوەی دروستەو ئەوەی دروست نیە، هەروەها کامەیە ئەوانەی بەتاڵیان دەکاتەوەو

---

[1] - المؤمنون: ١٠٨

کامەیە پایەکانی، هەروەها زۆری تر هەیە وەکو پاکیەکان و جۆرەکانی ئاو و فرۆشتنەکان.

ئەوەش دەبێتە نزمترین ئەو ئاستەی کە ئادەمیزاد دەبێت ڕۆڵی خۆی بگێرێت لە فەرمان بەچاکەو نەفرین لەخراپە ئەویش وەك کەمترین ئاست بۆ هەموو ئادەمیزادێك پێویستە.

دووەم: ئەوەی فەرمانی پێدەکەم خۆم ئەنجامی بدەم، خوای گەورە دەفەرموێت:﴿وَمَآ أُرِيدُ أَنۡ أُخَالِفَكُمۡ إِلَىٰ مَآ أَنۡهَىٰكُمۡ عَنۡهُۚ إِنۡ أُرِيدُ إِلَّا ٱلۡإِصۡلَٰحَ مَا ٱسۡتَطَعۡتُۚ وَمَا تَوۡفِيقِيٓ إِلَّا بِٱللَّهِۚ عَلَيۡهِ تَوَكَّلۡتُ وَإِلَيۡهِ أُنِيبُ﴾[1] واتە: ئەوەی پێتان ئەڵێم مەیکەن خۆیشم نایکەم، من بەم ئەمر بە چاکەو نەهی لە خراپەیە هیچم مەبەست نییە ئەوە نەبێ بە قەدەر توانم چاکە لەگەڵ ئێوە بکەم و بتانخەمە سەر ڕێی ڕاست و لە سزا دوورتان بخەمەوە. من کەس تەوفیقم نادا خودا نەبێ تەنها پشت بەو ئەبەستم و بۆ لای ئەو ئەگەڕێمەوە.

شێخ حەسەنی بەصری بانگی بەندەیەك لەو بەندانەی کرد کە کڕین و فرۆشتن دەکەن یەکەم ڕۆژی ڕەمەزان بوو لەناو مزگەوتی بەصرەدا، بەندەکە پێی فەرموو لای گەورەکەمان باسی چاکەو خێری ئازادکردنی بەندەمان بۆ بکە بەڵکو گەورەکەمان گوێی لێبێت و ئازادمان بکات، شێخ حەسەن قسەی نەکرد دووەم ڕۆژ باسی نەکرد سێیەم ڕۆژیش هەر باسی نەکرد ئیتر بەندەکە بێدەنگ بوو.

ئەو ساڵە تێپەڕی و ڕەمەزانێکی نوێ هاتەوە شێخ حەسەن یەکەم ڕۆژ باسی چاکەو خێری ئازادکردنی بەندەی کرد ئیتر هەر کەسێك بەندەی هەبوو هەر لە مزگەوتەکەدا ئازادی کرد، ئینجا هەمان بەندەی ساڵی ڕابردوو ڕۆشتە خزمەتی

---

١- هود: ٨٨

شێخ حەسەنی بەصری و پێی وت: قوربان ئەم داوایەم پار لێکردی نەك ئەمساڵ ئەویش فەرمووی هەژار بووم خوای گەورە بەفەزڵی خۆی هەندێك سامانی پێدام هەتا چەند بەندەیەکم کڕی کاتێك بینیم چەند بەوەفان بۆم هەموویانم ئازاد کرد بۆیە بەچاکم زانی ئەمساڵ باسی ئازاد کردنی بەندە بکەم چونکە قسەکان بەڕاستگۆیی لە دڵەوە دەرچوو بۆیە گەیشتە دڵی ئەو خەڵکە.

واتە دەبێت ئەوەی کە فەرمانی پێ دەکەم لەپێشدا خۆم بیکەم و ئەوەیشی نەرێی بۆ دەکەم خۆشم ئەنجامی نەدەم واتە شتێك بکەم پێش ئەوەی بەخەڵکی بڵێم خۆم ئەنجامی بدەم، وە شتێکیش نەکەم پێش ئەوەی بە خەڵکی بڵێم مەیکەن.

**سێیەم:** نەرم و نیانی لە فەرمان کردن و نەرێ کردن دا: خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ ٱدۡعُ إِلَىٰ سَبِيلِ رَبِّكَ بِٱلۡحِكۡمَةِ وَٱلۡمَوۡعِظَةِ ٱلۡحَسَنَةِ ﴾[1] واتە: خەڵك بانگ بکە بۆ ڕێگای خوداو بۆ ئیسلام بوون بە شێوەیێ کە موافیقی عەقڵ و هۆشی ساغ بێ، واتە بۆ زانا بە دەلیلێ کە قەناعەتی پێ بکاو بۆ نەزان بەشێوەیێ کە لێی حاڵی ببێ‌و بچێتە دڵیەوە.

پێغەمبەر ﷺ فێری کردوین چۆن بانگەواز بکەین بۆ خوا بە خۆشەویستی و نەرم و نیانی و لەسەرخۆیی ئەوەتا پێغەمبەری خوا ﷺ ڕێگە لەهاوەڵان دەگرێت ئازاری ئەو پیاوە بدەن کە لەمزگەوتەکەیدا میزی کرد ئەوەبوو فەرمووی: قسە مەکەن میزەکەی پێ مەبڕن.

باشترین ئامۆژگاری ئەوەیە کە بەسۆزو خۆشەویستیەوە بێت هەر ئامۆژگارییەك بە نەرم و نیانی بکرێت خەڵکی وەری دەگرن ئەوەشی بەتوندوتیژی بکرێت خەڵکی لێی ڕادەکەن، هەرشتێك بە نەرم و نیانی ئەنجامدرا

---

١- النحل: ١٢٥

ڕێك و ڕاوەستاو دەبێت هەرشتێکیش بەتوندو تیژی کرا ئەوا لارو لەرزۆك دەبێت...

ئامۆژگاری بەخۆشەویستی و نەرم و نیانی بەرهەمی خۆی دەدات بەڵام بە توندو تیژی هەرگیز بەرهەمی نابێت، نابێت بەهیچ شێوەیەك کەس کافر بکەین مەگەر بە بەڵگەو ڕونکردنەوەی دروست نەبێت، بەڵکو دەبێت خەڵکی بەدانایی و ئامۆژگاری جوان بانگ بکەین (بالحکمة) واتە بەژیری و بەڵگەی ڕوون، نابێت زۆر لەخەڵکی بکرێت بۆ وەرگرتنی دینی خواو دەبێت لەگەڵیاندا بەئارام بیت.

ئەگەر ویستت خراپە بگۆڕیت وەك جێبەجێ کردنی فەرمانێکی پێغەمبەری خوا ﷺ (هەریەکێك لەئێوە خراپەیەکی بینی با بەدەستی بیگۆڕێت ...)[1]. واتە کارە ڕاستەکە بکات و ببێتە سەر مەشقی خەڵکی، وە فەیلەسوفەکان وتویانە مۆمێك دابگرسێنیت باشترە لەوەی نەفرین لەتاریکی بکەیت.

دەبێت بانگخواز کەسێکی بەئارام و دەم بەزەردەخەنە بێت، پێغەمبەر ﷺ کەسێکی ڕوخۆش بوو هەمیشە زەردەخەنە بەلێویەوە بوو، هەروەها حەزرەتی عومەریش(ڕەزای خوای لێ بێ) هەروابوو هەروەها بانگخواز دەبێت چۆنیەتی چونە ناو خەڵك بزانێت و شێوازی بانگەواز کردن شارەزابێت چونکە هەرکەسەو بۆخۆی کلیلێکی هەیە.

ڕوکانە پیاوێکی بەهێز بوو کەس نەیدەتوانی زۆرانی لەگەڵدا بگرێت پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو ڕوکانە ئەگەر زۆرانت لەگەڵدا بگرم موسوڵمان دەبیت؟ ڕوکانە وەڵامی نەدایەوە پێغەمبەری خوا ﷺ زۆرانی لەگەڵدا گرت و دای بەزەویدا، بۆ دووەم جاریش هەر سەرکەوت بەسەریدا ڕوکانە وتی بەهێزی خواوە نەبێت

---

١- رواه مسلم.

بەسەر مندا سەرنەدەكەوت لەبەرئەوە شايەتی دەدەم كە هيچ خوايەك نيە جگە لە (الله) وە (محمد)يش پێغەمبەری خوايە... ئەوەبوو ڕوكانە موسوڵمان بوو.

ڕۆژێك پێغەمبەر ﷺ لەبازاڕدا بوو لەدوای ڕوكانەوە دەڕۆشت دەستی خستە سەر چاوی ڕوكانەو، فەرمووی كێ ئەم بەندەیە دەكڕێت، ڕوكانە هەستی كرد كە پێغەمبەری خوايەو بۆنی كرد پاشان وتی: يارسول الله ئايا هيچ دەكەم؟ فەرمووی: بەڵام تۆ لای خوا زۆر بەنرخيت... ئەوەيە ئەو دەروازەيەی كە پێويستە لە پێغەمبەری خواوە فێربين.

## ڕەوشت جوانی:

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: (پياوێكم بينی لە ئوممەتەكەم لەسەر هەردوو ئەژنۆی دانيشتبوو لەنێوان ئەو و خوادا بەربەستێك هەبوو (خۆی هێنابووەوە يەك) بەڵام ڕەوشتە جوانەكانی هاتن و ڕزگاريان كردو برديانە خزمەتی خوای پەروەردگار). دیارە پاكيزەيی و ڕەوشت جوانی لەكارە هەرە گرنگەكانی پەيامی پێغەمبەری خوايە ﷺ ديارە ڕەوشت بەديش زەم كراو و يەكێكە لەگوناهە هەرەگەورەكان و كردەوە چاكەكان لەناو دەبات ئەوەتا پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: (خۆشەويستترين كەستان لای من بەڕەوشترينتانە ئەوانەی داڵدەی كەسانی ماف خوراو و بێنەوا دەدەن و ئەوانەی تێكەڵی خەڵكی دەبن و يەكيان دەخەن وتەبان لەگەڵيان، بێزراوترين و دورترين كەسيشتان لێمەوە لەڕۆژی قيامەتدا ئەوانەن كە زۆر بڵێ و چەنەبازن...)[1]. خوای گەورە ڕقی لەهەموو ڕەوشت بەد و دەنگ بەرزو مامەڵە ناشرينێكە كە خەڵك لێی بترسێت.

پياوێك چووە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ و پێی وت: يارسول الله ئامۆژگاريم بكە ئەويش فەرمووی: سڵاو لەهەموو كەسێك بكە بيناسی يان

---

١- رواه الترمذي.

نەیناسی. پاشان یەکێکی تر هاتە خزمەتی و وتی: یارسول الله ئامۆژگاریم بکە ئەویش پێی فەرموو: تورە مەبە. پاشان کەسی سێیەم هات وتی: یارسول الله ئامۆژگاریم بکە. فەرمووی: خواردن بدە بە هەژارو برسی. پاشان چوارەم کەس هات و، پێی فەرموو: شەونوێژ بکە ئەوکاتەی خەڵکی نوستون.

ئەوە بانگخوازە کە دەزانێت ئەوکەسەی ڕێنمویی دەکات چی پێویستە. دیارە باوەڕدار ئاوێنەی برا باوەڕدارەکەیەتی ئەگەر بەبێ ئاگایی بینی ئاگاداری دەکاتەوە ئەگەر بینیشی هەمیشە خوای لەیادە کۆمەکی دەکات.

ناکرێت کەسی بانگخواز لەماڵەکەی خۆیدا مۆن و ڕوخساری درێو بێت بەڵام لەدەرەوەی ماڵەکەیدا ڕووخۆش، ئەو جۆرە کەسانە لەڕۆژی قیامەتدا بەدوو ڕوخساریەوە حەشر دەکرێن لەئاگردا.

## ترسان لەخوا:

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: (پیاوێکم بینی لە ئوممەتەکەم نامەی کردەوەکانی بەدەستی چەپیەوە بوو بەڵام ترسان لە خواکەی نامەکەی لێ سەندو دای بەدەستی ڕاستیەوە) کەواتە ترسان لەخوا لە هۆکارەکانی ڕزگاربوونە لە سزای گۆڕ، ترسان لەخوا واتە: خوای گەورە لەوشوێنەدا بتبینێ کە فەرمانی پێکردویت و لەوشوێنەشدا نەتبینێ کە نەفرینی لێکردووە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَأَقِيمُواْ وُجُوهَكُمْ عِندَ كُلِّ مَسْجِدٍ﴾[1] واتە: هەروەها ئەمری کردووە بەوەی کە ڕووبکەنە خوداپەرستی لە هەموو کاتێکی سوجدەبردندا، یا لەهەر شوێنە نوێژێکدا بۆتان هەڵکەوێ.

کەواتە دەبێت ئاوا نوێژ بکەم و بەو شێوەیە.

---

١- الأعراف: ٢٩

ترسان لەخوا شەیتان لەناودڵی بەندەدا دەسوتێنێت بۆنموونە کاتێك سوجدە دەبەیت شەیتان بچوك دەبێتەوە ئاخ و ئۆف دەکات و دەڵێت: فەرمان بەو کراوە سوجدە بەرێت ئەوەتا دەیبات بەڵام فەرمان بە من کرا کە سوجدە بەرم کەچی نەمبرد.

دیارە هیچ کاتێك ترسان لەخواو ئەنجامدانی ئەوکارانەی کە خوا نەهی لێکردوە کۆنابنەوە چونکە لەوانەیە ترسانەکەی لەخوا لە ئاستی پێویستدا نەبێت، یان لەوانەیە ئەو بەندەیە زیاتر پشت بەلێبوردەیی و پۆشینی خوا ببەستێت ئەمەش جار لەدوای جار لەوانەیە هۆکاری بردن بەرەو تیاچوون بێت لەخواوە بۆ بەندەکەی.

﴿سَنَسْتَدْرِجُهُم مِّنْ حَيْثُ لَا يَعْلَمُونَ﴾[1] واتە: ئەوانەیش کە بێ باوەڕن بە ئایەتەکانی ئێمەو ئەیانخەنەوە بە درۆوە پلەپلە بەرزیان ئەکەینەوەو ئەدەین بە دەمیانەوەو بەجۆرێ کە بە خۆیان نەزانن لەناویان ئەبەین و تۆڵەیان لێ ئەکەینەوە.

یا لەوانەیە ترسانی ئەوکەسە لەخوا لەترسی دڵەڕاوکێی شەیتان بێت و ترسان لەئاگرو ترس لەمردنی لەناکاو بێت، ترسان لەگۆڕو تاریکیەکەی، هەروەها ترس لەخاوەن قەرزو مافەکان کە لەچاکەکانم ببەن.

بۆیە دەبێت ئادەمیزاد ترسان لەخوا لەدڵیدا گەشە پێ بدات و زۆران لەگەڵ خوادا نەگرێت بەسەرپێچی کاری. کەسانێك هەن خوا دەپەرستن لەبەر ئەوەی لێی ترساون و تۆقاون خەڵکانێکیش هەن هەتا بەڵایەك یان تاقیکردنەوەیەکی خوایی بەسەردا نەیەت بەئاگا نایەن بۆیە دەبێت چاودێری خوایی لەدەروونماندا زیندوو ڕابگرین.

---

١- الأعراف: ١٨٢

## ئارامگرتن لەسەر مردنی رۆڵەکان:

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: (پیاوێکم بینی لە ئوممەتەکەم تەرازووی کردەوەکانی سوك بووبوو هاتن و تەرازووەکانیان بۆ قورس کرد) (ألافراط) واتە ئەو منداڵەی کە هەر بە منداڵی مردووە، لەبەردەم دەرگای بەهەشت رادەوەستێت ناچێتە ناوی هەتا بە هاورێیەتی باوك و دایکی نەبێت. خوای گەورەش دەفەرموێت: بەو باوك و دایکانەی ئارامیان گرتووە لەسەر مردنی رۆڵەکانیان با بە رۆڵەکانیان بگەن و لێیان خۆشدەبێ لەسەر ئەو ئارامگرتنەیان، خوای گەورە دەفەرموێت: (گیانی منداڵی بەندەکەمتان کێشا؟ ئەوانیش دەڵێن: بەڵێ خوایە، خوای گەورە دەفەرموێت: ئەو بەندەیەم چی کرد؟ ئەوانیش دەڵێن: سوپاس و ستایشی زاتی تۆی دەکردو گەڕاوەتەوە، خوای گەورە دەفەرموێت: خراپەکانی ئەم بەندەیەم بۆ بسڕنەوەو کۆشکێکی لەبەهەشتدا بۆ بنیات بنێن و ناوی بنێن کۆشکی ستایش ئێستاش گۆڕەکەی بە ئەندازەی بینایی چاوەکانی بۆ فراوان بکەن).

## ئومێدبوون بەخوا:

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: (پیاوێکم بینی لە ئوممەتەکەم لەسەر رۆخی دۆزەخ بوو، ئەو ئومێدانەی کە بەخوا هەیبو لەو شوێنە رزگاری کردو رۆیشت). دیارە ئومێدبوون پێچەوانەی ترسە هەروەها جیاوازی هەیە لەنێوان بەئومێدبوون و هیوا خواستن، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: (کۆمەڵێك هەبوون هیوابوونیان بەخوا لەخۆبایی کردبوون دەیان وت گومانمان بەخوا باشە، سوێند بەخوا ئەگەر گومانیان باش بوایە کردەوەی چاکیان دەکرد). خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ لَّيْسَ بِأَمَانِيِّكُمْ وَلَآ أَمَانِيِّ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ ﴾[1] واتە: چوونە بەهەشت و بەختیاری

---

١- النساء: ١٢٣

له ڕۆژی قیامەتدا نە بە ئارەزووی ئێوەیەو نە بە ئارەزووی گاورو جوولەکەکانەو نە بە قسەو گەزافی موشریکەکانە.

بەڵام ئومێد بوون بەخوا ئەوا هیواخواستنە بەکردەوە ئەوەش گومانی باش بردنە بە خوا لەگەڵ کارکردن بەوەی کە خوا فەرمانی پێ کردوەو ئەنجام نەدانی ئەوانەی کەحەرامی کردووە. پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: (پیاوێکم بینی لە ئوممەتەکەم فرێ درابووە دۆزەخەوە بەڵام ئەو فرمێسکانە هاتن کە لەبەر خوا ڕشتبوونی لە ئاگرەکە دەریان هێنا). هەروەها لەفەرمایشتی قودسیدا هاتووە (ئەوەی ڕۆژێك یادی منی کردووە یاخود لە شوێنێکدا لێم ترساوە لەدۆزەخ دەریان بهێنن)[1]، هەروەها دەفەرموێت: (هەر بەندەیەکی خوا فرمێسك لە چاوەکانی هات و لە ترسی خوا گریا ڕوخساری گەرمایی بەرکەوت خوای گەورە لە ئاگری دۆزەخ دەیپارێ...)[2]. یەك فرمێسك دەریایەك لە گڕی دۆزەخ دەکوژێنێتەوە، ئەوەتا دەفەرموێت دوو چاو هەن ئاگر نایانسوتێنێ، ئەو چاوەی پاسەوانی دەگرێت لەپێناو دینی خوادا هەروەها ئەوچاوەی لە ترسی خوا فرمێسك دەڕێژێت، هەروەها لە گێڕانەوەیەکی تردا هاتووە (ئەو چاوەی لەپێناو خوادا لە ئاست حەرامدا دادەخرێت)[3]. کەواتە ئەندامەکانی جەستەت بپارێزە ( پارێزگاری لە سنورەکانی خوا بکە خواش پارێزگاریت لێدەکات) ئەوەش شتانێکی هەروا ئاسان نین و دەبێت خۆمانی لەسەر ڕابهێنین.

---

١- رواه الترمذي.

٢- رواه ابن ماجه.

٣- سنن الدارمي.

## گـومانی باش بردن بەخـوا:

پێغەمبـەر ﷺ دەفـەرموێت: (پیـاوێکم بینـی لـە ئوممەتەکـەم بەسـەر پـردی سیراطدا ڕادەکێشرا وەکو گـەڵای دارخورمـا دەلـەرزی لـەڕۆژێکی زریانـدا ، چـاك گومان بردنەکەی بەخوا هات و گیانی ئارام کردەوەو ڕۆیشـت). کەواتـە گومـانی چاك بـردن بـەخوا دەبێـت لەگـەڵ کـردەوەی چـاکدا بێـت: (مـن لەگـەڵ گومـانی بەندەکەمدام با بەئارەزووی خۆی گومانم پیێ ببات)[١] .

## سـەڵاواتـدان لـەسـەر پێغـەمبـەر:

پێغەمبـەر ﷺ دەفـەرموێت: (پیـاوێکی ئوممەتەکـەم بینـی بەسـەر پـردی سـیراطـدا ڕادەکێشـرا جارێـك بەسـنگی و جارێـك هەڵدەواسـرا پێـوەی بـەڵام سڵاواتدانەکانی کە لەسەر من دەیدا هەڵیانساندەوەو ڕۆشت) "اللهم صلي وسلم وبارك عليه"، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: (ڕژدترین کەس ئـەو کەسـەیە کـەناوی من دەهێنرێ سڵاواتم لەسەر نادات)، سڵاواتدان لەسـەر ئـەو پێغەمبـەرە نـازدارە ئەوەندە گەورەیە لـە سـزای گـۆڕ ڕزگـارت دەکـات، باشـترین سـڵاواتدان لەسـەر پێغەمبەر ﷺ یاخود باشترین دەربـڕین دەربڕینـی ئیـبراهیم پێغەمبـەرە ﷺ کـە نیوەی دووەمی شایەتومانە.

هـەروەها پێغەمبـەر ﷺ دەفـەرمووی: (پیـاوێکی تـری ئومەتەکـەمم بینـی گەیشـتە بـەردەم دەرگـای بەهەشـت بـەڵام دەرگاکـانی لەسـەر داخـرا بـەڵام شـایەتومانەکانی کـە (لاإلـه إلاالله) بـووە دەرگاکـانی بەهەشـتیان بـۆ کـردەوەو ڕۆیشتە ناوی). بەڵام دەبـێ بەڕاسـتگۆیی بـوترێ واتـە بـەکردارو بـەگوفتار واتـە لەپاڵ شەرعی خوادا شەرع دانەر نەبیت ئەوەشی خوای گەورە حـەرامی کـردووە حەڵاڵی نەکەیت و ئەوەشی حەڵاڵی کردووە حەرامی نەکەیت و بەوشێوەیە.

---

١- رواه أحمد.

## کۆی ئەو هۆکارانەی کە دەبنە ڕزگارکەری سزای گۆڕ:

ئەمە حەڤدە ڕزگارکەرە لە ڕزگارکەرەکانی سزای ناو گۆڕ وەك یاد خستنەوەیەك دەینوسین:

١- چاکە کردن لەگەل دایك و باوك.

٢- دەستنوێژ.

٣- نوێژ.

٤- یادی خوای گەورە.

٥- ڕۆژوی مانگی ڕەمەزان.

٦- پەلەکردن لەشتنی لەش گرانی.

٧- حەج و عەمرە.

٨- پەیوەندی خزمایەتی.

٩- فەرمان بەچاکە و نەهی کردن لەخراپە.

١٠- ڕەوشتی جوان.

١١- ترسان لەخوای گەورە.

١٢- الافراط (ئەو منداڵانەی کە زوو دەمرن).

١٣- ئومێد بوون بە خوا.

١٤- گریان لەترسی خوا.

١٥- گومانی چاك بردن بەخوا.

١٦- سلاوات دان لەسەر پێغەمبەر.

١٧- زۆر وتنی (لا إله إلاّ الله).

# عاقیبەت خێری

## لەوانەیە بەدەست خۆت بێت....

ئاخر خێریی ئەو سیفەتەیە کە بەدوایدا دەگەڕێین و دەبێت بەدوایدا بگەڕێین تۆ تۆوێك دەچێنیت چاوەڕێی بەرەکەی دەبیت.

ئاخر خێری چەند تەوەرەیەکی هەیە وە چەند هۆکارێکیشیی هەیە، لەوانەیە ئادەمیزاد سەری بسوڕمێنێت بلێت ئایا بۆم هەیە خۆم کۆتاییەکان هەڵیان بژێرم یاخود ئاکامێکی دیاریکراوە؟ هەندێك هەن وا دەزانن کەئەمە دیاریکراوەو لەسەرمان نوسراوە..!!

بەڵام ئێمە لێرەدا دەگەڕێین و وردبینی دەکەین هەوڵدەدەین بەڕاستی و تەواوی لەدینەکەمان تێبگەین ئەوەتا جەعفەر صادق دەفەرمووی: (خوای گەورە ئیرادەی قەزاو قەدەری بۆ داناوین، وەویستیشی وایە لەسەرمان کاربکەین و خۆمان سەرقاڵ نەکەین بەوەی ئیرادەی خوایە لەسەرمان کە بۆی داناوین ئەوەش فەرامۆش نەکەین کە لێی داواکردوین).

ئادەمیزاد لەهەموو شتێکدا مۆڵەتی پێدراوە ئازاد بێت لەهەموو شتێکدا لێپرسینەوەی لەگەڵدا دەکرێ وە خوای گەورە ستەم لەهیچ کەسێك ناکات.

کەواتە ئاخر خێری و ئاخر شەڕی لەکردەوەی بەندەکان خۆیانە، چی بڕوێنی ئەوە دەدوریتەوە.

بەڵام فەرمایشتی پێغەمبەری خوا ﷺ کە دەفەرمووی: (پاشان خوای گەورە فریشتەیەك دەنێرێت فەرمانی پێ دەکرێت چوار شت لەسەر بەندە بنوسێ ڕۆزیەکەی و ئەجەلەکەی و خراپ و سەرپێچیکارە یان چاك و خواناسە)[1]. ئێمە دەڵێین هیچ شتێك نیە لەم گەردونەدا خوای گەورە نەیزانێت، وە هیچ کاتێك

---

١- رواه البخاري.

خوای گەورە لەسەر کافری نەنوسیوە کە کافر بێت، بەڵکو ئەوکەسە خۆی لەسەر خۆی نوسیوە بێ باوەڕ بێت خوای گەورەش بەوە دەزانێت بەڵامناچاری ناکات لەسەر کوفر: ﴿ إِنَّكَ لَا تَهْدِي مَنْ أَحْبَبْتَ وَلَٰكِنَّ اللَّهَ يَهْدِي مَن يَشَاءُ ﴾[1]

واتە: بێگومان تۆ ناتوانی هیدایەتی هەرکەسێ بدەی کە حەزت لێ بێ هیدایەت وەرگرێ. ئەمە کاری خوای خۆیەتیو ئەو هیدایەتی هەرکەسێ ئەدا کە مەیلی لێ بێ هیدایەتی بداو، ئەو خۆی باشتر ئەزانێ کێ ئامادەیە بۆ ئەوەی هیدایەت وەربگرێ.

هەرکەسێك لەمرۆڤەکان بیانەوێت ڕێنمویی پەروەردگاریان دەست بکەوێت خوای گەورە ڕێنمویان دەداتێ، ئەوەشی گومڕایی بوێت ئەوە خوای (الرحمن) ماوەی دەداتێ:

﴿ إِنَّا هَدَيْنَاهُ السَّبِيلَ إِمَّا شَاكِرًا وَإِمَّا كَفُورًا ﴾[2] واتە: ئێمە ئادەمزادمان شارەزا کردووە بە ڕێگای خێرو شەڕ، جا یا وەری ئەگرێو سوپاسی خوای خۆی ئەکا یا ئینکاری ئەکاو گوێی بۆ ناگرێ.

کەواتە دەبێت بەندە لەدەرگا بدات بەدڵنیاییەوە بۆی دەکرێتەوە بەڵام فەرمایشتی پەروەردگارە کە دەفەرموێت: ﴿ أُولَٰئِكَ الَّذِينَ هَدَى اللَّهُ ﴾[3] واتە: ئەوانەن کە خودا هیدایەتی داون.

ئەوکەسانەی کە لەدەرگایان داوە بۆیان کراوەتەوەو ئامادەییان دەربڕیوە بۆ ڕێنمویی خوایی، خوای گەورەش سەریخستون.

کەواتە ویستی پەروەردگار لەسەر ویستی بەندەیە لەبەرئەوەی خوای گەورە شەرعی دابەزاندووە بۆمان و پێغەمبەریش ﷺ پێی ڕاگەیاندوین و لەسەر

---

١- القصص: ٥٦

٢- الإنسان: ٣

٣- الأنعام: ٩٠

ڕێگایەکی ڕاستی سپی و ڕۆشن جێی هێشتوین، کەواتە بەندە دەبێت یەکێك لەم دوو ڕێگەیە هەڵبژێرێت یان ڕێگەی هیدایەت یان ڕێگەی سەر لێشێوان.

بۆ نموونە پێغەمبەر ﷺ بانگی خەڵکی دەکرد شتێکی تایبەت نەدەکرد بەسەر یەکێکداو شتێکی تر بەسەر کەسێکی تردا بەڵام بەدەمەوە هاتنەکانیان جیاواز بوو، ئەو زانیاریانەی دەیدا بەحەزرەتی ئەبوبەکر دەیگەیاند بە ئەبوجەهلیش بەڵام ئەبوبەکر هەوڵیداو لەدەرگایداو بۆی کرایەوەو هاتە ژورەوە، بەڵام ئەبوجەهل پشتیکردە بانگەکەو ڕۆیشت و نرخی پشت تێکردنەکەیدا، خۆی ڕێنمویی خوایی نەدەویست، ئەوەتا پێغەمبەر ﷺ دەیفەرموو: (خوایە ئەم ئیسلامە بەیەکێك لەم دوو عومەرە سەربەرز بکە، ئەبوجەهل و عومەری کوڕی خەتاب)[1]

سەرەتا بە ئەبوجەهل دەستی پێ کرد پاشان بە حەزرەتی عومەر چونکە دەیزانی بە موسوڵمان بوونی ئەو دوانە هۆزەکانیشیان موسوڵمان دەبن.

کەواتە ڕێنموویی خوایی کورت نەکراوەتەوە لەسەر کەس ئەگەر لەسەر یەك کەس بووایە ئەوا مافی ئەوەمان نەدەبوو پرسیار لەکەس بکەین نوێژ دەکات یان نا بالاپۆشە یان نا لەبەرئەوە پێت دەڵێت ئەگەر خوا بەرەو لای خۆی ڕێنمویی کردم ئاواو ئاوادەکەم هیچ هەنگاوێکی باش بەرەو هیدایەت ناگرێتە بەر.

بەندە دەیەوێت خوا تاقی بکاتەوە بەڵام خوا تاقی دەکاتەوەو تاقی ناکرێتەوە.

لە بەسەرهاتی بەنی ئیسرائیلدا شەیتان بەحەزرەتی عیسای ﷺ وت: تۆ ڕۆحی خوایت ئەگەر خوات خۆشدەوێت ئەوا لەو شاخە خۆت فڕێبدەرە خوارەوە با بزانین خوا چۆن ڕزگارت دەکات.. حەزرەتی عیسا ﷺ فەرمووی: ئەی نەفرین

---

١- رواه الترمذي.

لێ کراو، ئەوە مافی خوایە بەندەکانی تاقی بکاتەوە نەك بەندە خوا تاقی بکاتەوە.

کاتێك یەکێك لە هاوەڵان بە پێغەمبەری خوای فەرموو لە خوا داوا بکە ببمە هاوڕێت لە بەهەشتدا فەرمووی: زۆر سوجدە ببە بۆ خوا واتە بە کردەوە نەك تەنها بە ئاوات خواستن.

## ئەوەی دەیەوێ عاقیبەت خێر بێت با ئەمانەی خوارەوە ئەنجام بدات:

**یەکەم: ڕاستگۆ بوون لەگەڵ خوادا:**

ڕاستگۆ بوون لەگەڵ خوادا بەڕاستی نیەتە لە هەموو کارێکدا، ئەگەر ڕۆشتم بۆ لای هاوڕێیەکم ئایا لەبەر ڕەزامەندی خوا سەردانی بکەم یاخود لەبەر ئەوەی کەسێکی خاوەن پلەو پایە دەناسێت کە بەرژەوەندییەکم پێیەتی؟

دەبێت ڕاستگۆیی نیەت زوو زوو نوێ بکرێتەوە، بۆیە خوای گەورە نوێژەکانی بەسەر کاتەکاندا دابەش کردووە، بەیانی و نیوەڕۆو عەسرو مەغریب و عیشا، هەتا لەگەڵ هەموو نوێژێکدا دەروونی خۆم ڕاپێچی لێپرسینەوە بکەم، لە نێوان نوێژەکاندا چیت کرد، بۆ نموونە ئەگەر لە دوای نوێژی نیوەڕۆ غەیبەتی یەکێکت کردووە ئەوا لە نوێژی عەسردا داوای لێخۆش بوون بکە لە خوا هەتا لێت ببورێت، نوێژەکانی تریش هەر بەو شێوەیە بەمەش کۆڵ نەدەین و ماندوو نەبین، هەتا ئەوەی لەسەرمانە یەك بەیەك بیسڕینەوە. کاتێ فریشتەکان لێپرسینەوەی بەندەیەك دەکەن کە نیەتی خۆی نوێ دەکاتەوە دەڵێت: (کفانا مؤنته) واتە: پێویستی بەداڵدەدان نییە پێش ئەوەی لێپرسینەوەی لەگەڵدا بکرێت لە خۆی پرسیوەتەوە.

من بۆ ئەوە لە ژیاندام هەتا خێر بڕوێنم، خوای گەورە دەفـەرموێت: ﴿وَٱبۡتَغِ فِيمَآ ءَاتَىٰكَ ٱللَّهُ ٱلدَّارَ ٱلۡأٓخِرَةَۖ وَلَا تَنسَ نَصِيبَكَ مِنَ ٱلدُّنۡيَاۖ وَأَحۡسِن كَمَآ أَحۡسَنَ ٱللَّهُ إِلَيۡكَ﴾[1] واتـە: لـەو مـاڵی دنیایـەدا کـە خـوا پێـی بەخشـیوی لـەدووی مـاڵی قیامەتیشت بگەڕێ واتە: خێرو چاکە بۆ ئەو دنیایشـت پاشـەکەوت بکـەو بەشـی ژیانی ئەو دنیایەیشت لەیادنەچێ کە بەخۆشی بژیت و، وەك چۆن خـوا چـاکەی لەگەڵ تۆ کردووەو خێرو بەرەکەتی بەسەرا ڕشتووی تۆیش چـاکە لەگـەڵ خـەڵك بکەو خراپەکردنت نەوێ لە سەرزەویدا.

ئەگەر لەسەر ڕێگە لامدا ئەوا نیەتەکانم ڕاسـت دەکەمـەوە جـارێکی تـر داوای لێخۆش بوون لە خـوای گـەورە دەکـەم و لاپەڕەیـەکی نـوێ هەڵدەدەمـەوە بـەم شێوەیە دەبم ئەگەر سـەد جـاری تـریش بگەڕێمـەوە سـەر گونـاه دەگەڕێمـەوەو پەشیمان دەبمەوەو داوای لێخۆشبوون لە خوا دەکەم و نیەتم نوێ دەکەمەوە.

خوای گەورە لە فەرمایشتێکی قودسیدا دەفەرموێت: (ئەی ئـادەمیزاد ئەگـەر بە ئەندازەی پانتایی زەوی گوناه بکەیت پاشان بگەیتەوە بـە مـن و هـاوەڵم بـۆ بڕیار نەدەیت ئەوا هەر بەو ئەندازەیە لێت خۆش دەبم)[2].

یەکێك لە پیاوچاکان دەڵێت: خوایە مـن مـنم تـۆیش تۆیـت مـن دەگەڕێمـەوە سەر گوناه تۆش زۆر لێخۆش بوویت بە فەزڵی خۆت مامەڵەم لەگەڵدا بکە نەك بە دادت... ئا بەم شێوازە دەپاڕێتەوەو بنەو بارگەی خۆی دەخات و چۆك دائەدات لەبـەردەم بارەگـاو دەرگاکـەی خـوای پـەروەردگاردا. بزانـە ئێمـە لەسـەر نیەتەکانمان لێپرسینەوەمان لەگەڵدا دەکرێت، نیـەت پـێش کـردەوە دەکـەوێت، ئەگەر نیەتم هێنا بڕێك پارە بکەم بە خێـر پاشـان بـە هـۆی کارێکـەوە نـەمکرد،

---

١- القصص: ٧٧

٢- رواه الترمذي.

لەگەڵ نیەتی خۆمدا ڕاستگۆ بووم، ئەوا خوای گەورە پاداشتی تەواوم بۆ دەنوسێت.

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: (هەر یەکێك لە ئێوە ویستی کارێکی چاك بکات بەڵام بۆی نەکرا ئەوا ئەو چاکەیەی بۆ دەنوسرێت)[1].

پیاوێکی دەوڵەمەندی بەنی ئیسرائیلی لە ساڵێکی برسیەتیدا بە ناو کێو و بیابان و بەردەڵانەکاندا دەگەڕاو ئەوەی پێی بوو دەیبەخشییە هەژاران، پاشان وتی: خوایە بە گەورەیی و دەسەڵاتی خۆت ئەگەر ئەو کێوانە خۆراك بوونایە هەموویم بەسەر بەندەکانتدا دابەش دەکرد لەبەر ڕەزامەندی زاتی تۆ، خوای گەورە فەرمووی ئەی موسا بەو بەندەیەمان بڵێ ئەوا خێرەکەیمان لێ وەرگرت.

وە لەو ڕاستگۆییانەی تر کە لەگەڵ خوادا دەبێت بکرێت ڕاستگۆیی ئەندامەکان بۆ نموونە ئەگەر لە نوێژ وردبینەوە ئەوا ئێمە کاتێك دەستمان دەشۆین ئەوا لە هەموو گوناهێك پاك دەبینەوە، کاتێك ئاو وەردەدەینە دەممان دەبێت ئەوەمان بیر بکەوێتەوە کە ئیتر پێویستمان بەوە نیە غەیبەت و دوو زمانی پێوە بکەین کاتێك لوتمان پاك دەکەینەوە واتە بۆنی ئەو شتانە ناکەین کە خوای گەورە لەسەری حەرام کردوین وە کاتێ ڕوخسارمان دەشۆین واتە چاوو گوێچکەمان ئیتر گوناهیان پێ ئەنجام نادەین، کاتێ دەستێکی تەڕ دێنین بەسەرماندا واتە تەنها بیر لە خواو ڕەحم و میهرەبانییەکەی دەکەینەوە وە لە سەرکەوتنی ئایینەکەی و غەمخۆری بۆ بڵاوکردنەوەی، کاتێکیش قاچم دەشۆم بیر لەوە دەکەمەوە بڕۆم بۆ مزگەوت و شوێنی فێربوونی زانست و زانیاری سەردانی خزم و کەس و کارو سەردانی نەخۆش و شوێن کەوتنی بۆ گۆڕستان

---

١- رواه مسلم

دەستنوێژگرتنی تەواو لەسەرناخۆشی کەواتە دەستنوێژ تەنها چەند جوڵەیەك نیە کە مانایەك نەبەخشێت.

یەکێکی تر لەو ڕاستگۆییانەی کە دەبێت لەگەڵ خوای گەورەدا بەجێی بهێنین ئاوەدانکردنەوەی کاتە بە پەرستشەکان، نیەتی چاك کردەوەکان دەکاتە پەرستش، یەکێك لە پیاوچاکان دەڵێت: چاوەڕوانی پاداشتی خوای گەورەم بەوەی کاتەکانی نوستنم بە ئاگایی بۆم ئەژمارد بکات.. واتە ئەو کەسە بە نیەتی ئەوە دەخەوێت کە بە چالاکانە هەڵسێتەوە بۆ بەندایەتی کردنی خوای گەورەو ئاوەدانکردنەوەی ژیان.

چەندێك کاتەکانم بە پەرستشی پەروەردگارەوە بەسەربەرم ئاسەوارەکانی بە ڕەفتارەکانمەوە لەگەڵ خەڵکیدا دیار دەبێت ئەمەش لەبەرئەوەی بە نوێژەکانمەوە پابەندم و لەهەموو خراپەو نەهی کراوێك دوورم خاتەوە.

**دووەم: نوێکردنەوەی تەوبەکردن:**

وەك چۆن نیەتمان نوێ کردەوە ئاواش تەوبەکردن نوێ دەکەینەوە تەنها نیعمەتی عاقیبەت خێریمان دەست دەکەوێت دەبێ تەوبە بکرێت لەسەرپێچی ئەندامەکانی لەش و سەرپێچی دڵەکان.

دڵ چەندین گوناهی گەورە ئەنجام دەدات لەوانە (خۆ بەگەورە زانین و لەخۆ ڕازی بوون و ڕیابازی).

هەروەها ئیرەیی بردن بە خەڵکی و نائومێد بوون لە ڕەحمی خواو کینە گرتن ڕیاکاری واتە لەبەردەمی خەڵکیدا بەغەیری ڕاستی خۆی دەرکەوێت وە لە کارەکانیدا هاوەڵ بۆ خوا پەیدا بکات.

خۆت بە گورگ دەزانیت و خەڵکیش بەمەڕو ماڵات وە خۆتیان لێ مەلاس دەدەیت هەتا لە کوێدا دەلاقەیەکت بۆ دەرکەوێت لەوێوە هێرشیان بۆ بەریت.

دیاره کینه لەدڵی خەڵکیدا هەیە، ئەو کەسانە گەشەی پێ دەدەن کەدڵیان پڕ نەبووە لە ئیمان، کینە وەکو شەمشەمەکوێرە لە دڵی ئادەمیزاددا دەژی چونکە حەز دەکات لە ماڵی وێرانەدا بێ بەڵام ئەگەر دەروازەکان کرانەوەو تیشکی خۆرو هەوای پاك هاتە ژوورەوە شەمشەمەکوێرەکان زۆر بە خێرایی خۆیان حەشار دەدەن، باوەڕیش بەو شێوەیە ڕۆیشتە هەر دڵێکەوە کینە دەر دەکات، ئیرەیی بردن یاخود حەسودی واتە خواستن بەوەی نیعمەتەکانی خەڵکانی دەوروبەرت لە ناو بچن ئەمەش جۆرێکە لە بێ ئەدەبی لە بەرامبەر خوادا لەبەرئەوەی بە قەزاو قەدەری خوا ڕازی نیە بەوەی کە پێی دراوە، ئەو کەسەی ئیرەیی دەبات دوچاری دوو بەڵای گەورە دەبێت:

**یەکەم:** ئەو کەسە تووڕەیە لە دادپەروەری خوا لەم گەردونەدا.

**دووەم:** ئەو کەسە خۆی دەکوژێت بەو نیعمەتەی کە تۆ لای خواوە پێت بەخشراوە بەبێ ئەوەی تۆ ئاگات لە خۆت بێت، کەسی لەو جۆرە وەکو ئاگرە ئەگەر کەسی دەست نەکەوت خۆی دەخوات.

| | |
|---|---|
| اصبر على كيد الحسود | فإن صبرك قاتله |
| النار تأكل نفسه | إن لم تجد ما تأكله |

واتە:

| | |
|---|---|
| ئارام بگرە لەبەرامبەر فێڵی حەسودا | چونکە ئارام گرتنەکەت دەیکوژێ |
| ئاگر خۆی دەخوات | ئەگەر هیچی دەست نەکەوت بیخوات |

کەسی حەسود هەرگیز حەز بە ڕازی بوون ناکات تەنانەت بۆ خۆشی وەکو ئەو کەسە وایە هەتا زیاتر مەی بخواتەوە زیاتر تینوی دەبێت.

بەڵام دەبێت جیاکارییەك بکەین لە نێوان حەسودی بردن و ئاوات خواستن (الغبطة)، الغبطة: واتە ئاوات خواستن بە شتێك بەبێ ئەوەی هیوا بخوازێت بە

لەناوچوونی لە لای خەڵکی، بۆ نموونە ئاساییە ئەگەر ئاوات لەوە بخوازم بەوەی وەکو فلانە زانا وابم.

عەرەب جیاوازیەکیان هەبوو لەباسی حەسودی یاخود ئێرەیی بردندا بۆ نموونە دەیانوت فلانە کەس حەسودی بە وشتری فلانە کەسی هاوڕێی برد دەیانوت ئاماژەی بۆ وشترەکەی کردووە، بەیەك سەیر کردن دەیدات بە زەویدا پێیان وا بوو حەسودی بردن پیاو دەباتە ناو گۆڕەوەو وشتریش دەخاتە ناو مەنجەڵەوە.

بۆ ئەوەی کە لە کەسی حەسود خۆم بپارێزم ئەگەر ناسیم هەر کاتێ بینیم دەڵێم "ما شاء الله لا قوة الاّ بالله" ئەم زیکرە حەسودی بە تاڵ دەکاتەوە وەکو لە سورەتی (الکهف)دا هاتووە: ﴿ وَلَوْلَآ إِذْ دَخَلْتَ جَنَّتَكَ قُلْتَ مَا شَآءَ ٱللَّهُ لَا قُوَّةَ إِلَّا بِٱللَّهِ ﴾[1] واتە: ئەوە بۆ کەچوویتە باغەکەت و سەیری ئەو هەموو جوانییەت کرد، نەت وت: (ما شاء الله)، خودای گەورە بە دەستەلاتەو هەرچی مەیلی لێ بێ دروستی ئەکات و، هەرچی نازو نیعمەتە هەمووی هی ئەوەو، هەر چی هێزو توانە هەمووی هەر لە خوداوەیە.

واتە: کەسی باوەڕدار ئاوات دەخوازێت بۆ ئەو نیعمەتانەی کە خوا بە براکەی داوە بەلام حەسودی نابات.

خراپترین نەخۆشیەك کەدوچاری دڵەکان دەبێت (زۆر بێ خەمە لە پەروەردگاری) نە نوێژ دەکات نە ڕۆژو دەگرێت نە زەکاتی ماڵی دەردەکات ئەگەر پرسیاریشی لێ بکەیت بارت چۆنە لەگەڵ خوادا پێت دەڵێت سوپاس بۆ خوا ئەوەندە باوەڕم هەیە بە خوا ئەگەر دابەشی بکەیت بەسەر موسوڵماناندا

---

[1] - الکهف: ٣٩.

دەیانخاتە بەهەشتەوە. ئەمە ئەو جۆرە کەسانەن کە بێ باکن لەخوای گەورە ئەمەش بەڵایەکە لە بەڵا گەورەکان.

هاوەڵان خوا لێیان ڕازی بێت مژدەی بەهەشتیان پێ درابوو کەچی ترسی خوا لە دڵیاندا هەبوو، بێ باك نەبوون لەخوا ئەوە ئەبوبکری صدیق(ڕەزای خوای لێ بێ) دەفەرموێت: (بێ باك نیم لە خوا ئەگەر قاچێکیشم لەبەهەشتدا بێت).

کاتێك پرسیار کرا لە حەزرەتی عوسمان کەی دەحەوێیتەوە؟ فەرمووی ئەو کاتەی قاچی ڕاستم دەچێتە پاڵ قاچی چەپم لەبەهەشتدا.

یەکێکی تر لەو نەخۆشیانەی کە دوچاری دڵ دەبن (نائومێد بوونە لە ڕەحمی خوا) واتە بێ هیوابوون لە ڕەحمی خوا لەوانەیە زیاتر بەهۆی زۆری گوناهەوە بێت بەڵام ئەو پرسیارە لە خۆی بکات گوناهەکانم گەورەن یاخود لێبوردنی خوا؟ دیارە لێبوردەیی خوا گوناهەکان نغرۆ دەکات، ئەوەتا خوای گەورە دەفەرموێت:﴿وَرَحْمَتِي وَسِعَتْ كُلَّ شَيْءٍ﴾[1] واتە: ڕەحمەتو میهرەبانیشم زۆر فراوانەو هەموو شت ئەگرێتەوە.

یەکێکی تر لە نەخۆشییەکانی دڵ (نەترسانە لەخوا) کاتێ ترسی خوا لە دڵەکاندا دەبێتە هەڵم، ئیتر دەکەونە هەموو جۆرە گوناهێکەوە، هۆکاری هەموو گوناهێك نەترسانە لەخوا، ترسان لەخوا لەسەر هیچ بەندەیەك نەنوسراوەو لە قەزاو قەدەری خوادا نیە، ئارەزوو وەکو منداڵێك وایە ئەگەر ڕێگەی بدەیت هەتا پیری شیر دەخوات ئەگەر لێشی بگریتەوە زوو وازی لێ دێنێت.

ئێستا دێینە سەر باسی جیاوازی نێوان قەزاو قەدەر، دیارە قەزا لە لایەن خواوەیە و خۆی زانیاری ڕودانی هەیە لە گەردوندا، بەڵام قەدەر ئەو هەنگاوەیە کە بەندە خۆی دەیگرێتە بەر، هیچ کاتێ خوای گەورە کەس ناچار ناکات کە

---

[1] الأعراف: ١٥٦

کافر بێت بەڵکو ئەوە دەزانێت کە ئەو ئادەمیزادە کافر دەبێ چونکە هەر خۆی زاناو شارەزایە بە هەموو شتەکان.

**سێیەم: خێرا کردن لە چاکەکاریدا:**

هیچ دوو دڵیەك نانوێنم لەبەرامبەر ئەنجامدانی هەر کردەوەیەکی چاکدا ئیتر ئەگەر وانەیەك بێت لە مزگەوتێکدا یاخود کاری خێر یان گرتنە ئەستۆی منداڵێکی بێ باوك.

ڕۆژێك پێغەمبەر ﷺ هاتە دەرەوە حەزرەتی ئەبوبکرو عومەرو عەباسی مامی بینی لەبەردەم دەرگای ماڵەکەیدا فەرمووی: باسی چیتان دەکرد؟ وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا باسی چاکەمان دەکرد، فەرمووی چیتان وت: حەزرەتی ئەبوبکر(ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: وتم باشترین چاکە ئەوەیە خێرا ئەنجام بدرێت، حەزرەتی عومەر(ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: وتم باشترین چاکە ئەوەیە بە نهێنی بێت، عەباسیش(ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: وتم باشترین چاکە ئەوەیە بچوکی بکەیتەوە وەکو ئەوەی هیچت نەکردبێ، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: چاکە کردن سێ جۆرە: ئەگەر بە خێرایی کردت پیرۆزت کردووە ئەگەر شاردتەوە بە نرخت کردووە، ئەگەر بچوکیشت کردەوە گەورەت کردووە.

کەواتە فەرمایشتەکەی حەزرەتی ئەبوبەکر(ڕەزای خوای لێ بێ) کە فەرمووی باشترین چاکە خێرا ئەنجام دانێتی واتە ئەگەر ئەتەوێ کارێکی چاك بکەیت ئەوا پەلە بکە لە ئەنجامدانیدا، فەرمایشتەکەی حەزرەتی عومەر(ڕەزای خوای لێ بێ) کە فەرمووی داپۆشین و شاردنەوەی کردەوە چاکەکانە واتە هەموو دنیا تێ نەگەیەنێ بەو کردەوە کە ئەنجامت داوە، فەرمایشتەکەی عەباس(ڕەزای خوای لێ بێ) کە فەرمووی باشترین چاکە بچوك کردنەوەیەتی واتە لە دەروونی خۆتدا گەورەی نەکەیت هەتا دوچاری لە خۆبایی بوون نەبیت.

ئەوەی دەیەوێ عاقیبەت خێربێ با چاکسازی لە نەنگییەکانی نەفسیدا بکات، کەواتە خۆت نیشانی قورئانی پیرۆزو سونەتەکانی پێغەمبەر بدە، خۆت نیشانی زانایەکی خواناس یاخود برایەکی موسوڵمانت بدە ئەو کاتانەی تۆی دەبینی بێ ئاگای بە ئاگای دەهێنایتەوە ئەو کاتەشی کە دەیبینی لەیادی خوادایت کۆمەکی دەکردیت، یەکێ لە پیاوچاکان دەڵێت: ئەگەر بۆ یەك سەعات یادی ڕۆژی دوایی لەدەست بدەم، دڵم خراپ دەبێ.



# عاقیبەت شەڕی

## بەتەواوی بەندە بە ژیانەوە:

بێگومان باس کردنی ڕۆژی دوایی دەروون دێنێتەوەیەک، ئادەمیزاد لە کۆتایی تەمەنیدا یان عاقیبەت خێرە یان بەپێچەوانەوە، دیارە عاقیبەت خێری بەرەو بەهەشت دەڕوات و عاقیبەت شەڕی بەرەو دۆزەخ، ئەگەر خوای گەورە ویستی چاکەی بە بەندەیەکی هەبێ ئەوا لە کۆتاییەکانی تەمەنیدا فریشتەیەکی بۆ دەنێرێت بەرەو باوەڕ ڕێنمایی دەکات، ڕایدەگرێت و بەرەو چاکبوونی دەبات ئەو کاتە لەسەر چاکە دەمرێت بۆیە دەبینین یان لە شوێنی فێر بوونی زانست و زانیاریدا یاخود لە گۆڕەپانی تێکۆشان لە پێناوی خوادا یاخود لە فەرمان کردن بەوەی کە خواو پێغەمبەرەکەی ڕەزامەندییان لەسەرە دەمرێت.

خۆ ئەگەر خوای گەورە ویستی خراپی بە بەندەیەکی هەبوو ئەوا ئەو بەندەیەی کە ژیانی هەمیشە لە خراپە بەسەر بردووە شەیتانێکی بۆ دەنێرێت گومڕاو بێ ئاگای دەکات هەر بەو حاڵەتەوە سەردەنێتەوە کە سەرپێچی خوا دەکات و ناگەڕێتەوە، لەناکاو مردن یەخەی پێ دەگرێت، لەوانەیە فریای وتنی لا اله الاّ الله نەکەوێت.

دیارە عاقیبەت شەڕی بەند نیە بە دوا ساتەکانی ئادەمیزادەوە، بەڵکو بەندە بەسەراپای ژیانییەوە، ئەو ساتانەی کردەوەکانی بەخراپەکاری چاندوەو دروێنەکەشی هەر بەجۆری چاندنەکەی دەبێ وەک درەختی کوژاڵك ماوەیەکی پێ دەچێت هەتا گەورە دەبێت پاشان کوژاڵکێکی تاڵ بەرهەم دێنێت، عاقیبەت شەڕی بەند نیە بەدوا کۆتاییەکانی تەمەنەوە، بەڵام ئەگەر بەندەیەك بە بێ تەوبەکردن مرد ئەوا لەسەر گومڕایی یان ستەم یاخود خۆبەزلزانی دەمرێت.

زۆرترین کردەوەیەك کە پەڕاوی کردەوەکانی ڕەش دەکاتەوە بەرەو عاقیبەت شەڕیی دەبات هیوا درێژییە، ئەو کەسە وا گومان نابات کە تەمەنی

کۆتای دێت لەبەرئەوەی باوکی نەوەد ساڵ ژیاوە یاخود باپیری سەد ساڵ ژیاوە تەمەن بە بۆماوەیی نیە، ئەوەی تریش وا گومان دەبات کەخوا لەکۆتایی تەمەنیدا هیدایەتی دەدات، خۆشی نازانێ دواڕۆژی تەمەنی لەچ ساتێکدا دەبێ.

## بەڵاکانی هیوا درێژی:

هیوا درێژی وا لە ئادەمیزاد دەکات کە زۆر بە توندی دەست بە دونیاوە بگرێت ببێتە تەنها ئامانجی نەك هۆکار، ئەو ڕێسایەی لەسەر جێبەجێ دەبێت کە دەڵێت: (الغاية تبرر الوسيلة) (ئامانج و مەبەست پاساوە بۆ هۆکار) ئەو کەسەی دەیەوێ ببێتە دەوڵەمەند ئەوا بە سوخۆری مامەڵە دەکات، ناموسی خەڵکی عەیبدار دەکات هەتا بە هۆیەوە بەسەر خەڵکیدا بەرز بێتەوە، هەموو ئەم بەڵایانە بەهۆی هیوا درێژییەوە دەبێت بۆ ژیان.

لەبەرئەوە وتویانە کەسی ژیر ئەو کەسەیە سێ جۆر کردەوە هەیە ئەنجامی بدات: دنیا بەجێ بهێڵێت پێش ئەوەی ئەو جێی بهێڵێ، خوای خۆی ڕازی بکات پێش ئەوەی پێی بگات، گۆڕەکەی ئاوەدان بکاتەوە پێش ئەوەی بخرێتە ناوی.

نەفامیش ئەو کەسەیە شوێن ئارەزووەکانی دەکەوێت و هیوای زۆر دەخوازێت، ژیر ئەو کەسەیە سەرزەنشتی نەفسی خۆی دەکات کار بۆ دوای مردنی دەکات.

پێغەمبەری خوا ﷺ بەلای ئوسامەی کوڕی زەیدا تێپەڕی جوانە وشترێکی کڕیبوو فەرمووی: ئوسامە ئەمەت لە کوێ بوو؟ ئەویش وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئەمەم بۆ دوو مانگ کڕیوە. پێغەمبەری خوا فەرمووی: ئوسامە زۆر هیوا درێژە.

هەر بەو ژیرییەوە هاوەڵانی پەروەردە کرد.

هیوا درێژی دڵ ڕەق دەکات، ڕۆژی دوایی لە یاد دەکات، بـاوەڕداران حـەق و ڕۆژی دواییان خۆش دەوێ بـەڵام ئەوانـەی تـر رقیـان لـە باسـی هەنـدێ حـەق و باسی ڕۆژی دواییە لەبەرئەوەی دەرچوونی لـەم دنیایـەی دێنێتـەوە یـادو مـاڵ و سامانەکەی لـە دەسـت دەدات دەسـەڵات و پلـەو پایـەو بـانق و تـەلارو کۆشـکە بەرزەکانی لەدەست دەچێت.

هیوا درێژی ئادەمیزاد وا لێ دەکات ببێتە ستەمکار، ستەم کردن سێ جـۆرە، **یەکەمیان:** ستەم لەخۆی دەکات، **دووەمیـان:** سـتەم کـردن لـە ئیسـلام بـەوەی فەرزەکانی لە دەست دەدات و سنورەکانی خوا دەشکێنێت، **سێیەمیان:** ستەم لە دەوروبەری دەکات هەرچییەك بێت، ئاژەڵ بێ یاخود ڕوەکەکان.

ئادەمیزاد بەو هیـوا درێژیـیـەی دان نانێـت بـەوەی کـە کەسێکی سـتەمکارە وەکو ئەو کەسەی هەموو میراتییەکەی باوکی دەخوات و هیچ نـادات بـە براکـانی بە بیانوی ئەوەی لەگەڵ باوکیدا کاری کردووە هەر ئـەو مانـدوو بـووە لەگەڵیـداو ئـەمیش بـە مـافێکی خـۆی دەزانێـت و خـۆی بـە کەسێکی دادپـەروەر لەقەڵـەم دەدات ئەمەش بەڵایەکی گەورەیە.

خراپترین ستەم ئەوەیە ستەم لە کەسێك بکرێت کـە جگـە لـە خـوای گـەورە هیچ پشتیوانێکی تری نیە وەکو ئەو کەسەی کچێ دەخوازێ پاش ماوەیەك دایك و باوکی دەمرێت لە کەس و کاری دوور دەکەوێتەوە کەچـی سـزاو ئەشـکەنجەی دەدات لەبەرئەوەی کەسی نیە پشتیوانی لێ بکات.

هیوا درێژی بێ ئاگایی لە یادی خوا بەرهەم دێنێت ئەوەتا خـوای گـەورە بـە پێغەمبەرەکـەی دەفـەرموێت: ﴿وَٱصۡبِرۡ نَفۡسَكَ مَعَ ٱلَّذِينَ يَدۡعُونَ رَبَّهُم بِٱلۡغَدَوٰةِ وَٱلۡعَشِيِّ يُرِيدُونَ وَجۡهَهُۥۖ وَلَا تَعۡدُ عَيۡنَاكَ عَنۡهُمۡ تُرِيدُ زِينَةَ ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَاۖ وَلَا تُطِعۡ مَنۡ

﴿أَغْفَلْنَا قَلْبَهُۥ عَن ذِكْرِنَا وَٱتَّبَعَ هَوَىٰهُ وَكَانَ أَمْرُهُۥ فُرُطًا﴾[1] واتـه: نەفسـی خـۆت لەگـەڵ ئەوانەدا ڕابگرە بەیانیان و ئێواران لە خودای خۆیان ئەپاڕێنەوەو نـاوی ئەبـەن و ڕەزامەندیی ئەویان مەبەستە. چـاوت لـە موسـوڵمانان وەرمەچـەرخێنەو لامـەدە بروانیتە کافرەکانو مەبەستت جوانیی ژیانی دنیاو سامانی دنیا بێ. بەگوێی ئەو کەسە مەکە کە دڵیمان لەیادی خۆمـان بێئاگا کـردووەو دوای ئـارەزوو نەفسـی خۆی کەوتووەو لە حەق پێش ئەکەوێت و پشتی تێ ئەکاو بەگوێی ناکات.

فرط: واتە هەرچی کاروباری هەیە بێ سەروبن و لە سنور دەرچووە، کاتێ کە کەسێك بانگ دەکرێت بـۆ ئاهـەنگێك کـە گـۆرانی و سـەمای تێدایـە هـەروەها بـۆ گوێگرتن لەوانەی مامۆستایەکیش بانگ دەکرێت ئـادەمیزاد لـەو کاتـەدا بـەراورد دەکات ئەگەر بێ ئاگا بوو واز لە زیکرەکە دێنێت.

یادکردن و یادکردنەوە هەیە، یادکردن (الذکر) ئەوەیە بەئەندامەکانی جەستە دەکرێت چاو سەیری قورئان دەکات دەست خێـر دەکـات ئەمـە (زیکـرە)، بـەڵام یادکردنەوە (التذکر) ئەمەیان بـە دڵ دەکرێـت و بـە بیرلێکردنـەوەو وردبوونـەوە ئەمەشیان بەهێزترو بەڵگەدار ترەو هەر ئەویش داواکراوە، بۆ نموونە من قورئـان دەخوێنم ئەگـەر بـە وردبوونـەوەو بـیر لێ کردنـەوە نـەیخوێنم دەبێتـە شـایەت و بەڵگە بەسەرمەوە: ﴿أَلَا بِذِكْرِ ٱللَّهِ تَطْمَئِنُّ ٱلْقُلُوبُ﴾[2] واتە: بێگومان دڵ هەر بە یادی خودا دائەمەزرێو لە دڵەڕاوکێ ئەکەوێ.

هەروەها هیوا درێژی فریودانت بەدنیا بۆ فەراهەم دێنێت ئادەمیزاد ئامادەیە لە پێناوی بەدیهێنانی ئامانجە دنیاییەکانیدا پێ بنێت بەسەر هەموو کەسێکدا.

---

١- الكهف: ٢٨

٢- الرعد: ٢٨

هەروەها هیوادرێژی بێباکبوون له (مَكْر)ی خوایی لێ دەکەوێتەوە، ئەمەش گەورەترین نەخۆشییەکانی دڵە ئەو کەسە نابینیت بە شێوەیەکی دروست بیر لە پەرستشەکان بکاتەوە هۆکاری سەرەکی ئەم نەخۆشییە داپۆشینی خوایە بۆ بەندە، ئەو کەسە بە سەرپێچییەکان زۆران لەگەڵ خوادا دەگرێت حەرام دەخوات داوێن پیسی دەکات و دەست پیسی دەکات و ستەم لەبەندەکانی خوا دەکات پاشان خوای گەورە دەیداتێ تا دەگاتە قۆناغی (الإستدراج) لێ نزیك بوونەوەو بەرزکردنەوە هەتا ئەو کاتەی وا هەست دەکات کە خوا لێی ڕازی بووە ئیتر ئەو کەسە له خۆی ڕازی دەبێت.

ئەمە گەورەترین بەڵایە، کە لەخۆت ڕازی بیت و ئەو هەستەت لا دروست بێت لەگەڵ ئەو کردەوە خراپانەی هەتە خوا لێت ڕازییە، هاوەڵێك یاخود تابعییەك یاخود هیچ کەسێك له پیاوچاکانمان نەبینی بێ باك بێت له (مَكْر)ی خوا یاخود دڵخوازی خۆی بێت بەڵکو هەموویان لەسەر ترس بوون لە بەرامبەر خوای گەورەدا.

خوای گەورە بە میهرەبانی و بەخشندەیی خۆی بەندەی خۆی دەپۆشێ و ماوەی دەداتێ، خۆ ئەگەر لێپرسینەوەی بکردایە لەگەڵمان وەك چۆن لەیەکتری دەپرسینەوە ئەوا زیندەوەرێك لەسەر زەویدا نەدەما، کەواتە چۆن سەرپێچیکار لەخوا بێ باك دەبێ، لەکاتێکدا بەشێنەیی پێش دەخرێ بێ ئەوەی بەخۆی بزانێت، لەبەرئەوەی لەخۆباییە پاشان له ناکاو خوا دەیبات.

﴿ بَلِ ٱلْإِنسَٰنُ عَلَىٰ نَفْسِهِۦ بَصِيرَةٌ ۝١٤ وَلَوْ أَلْقَىٰ مَعَاذِيرَهُۥ ﴾[1] واتە: بەڵکو ئادەمزاد خۆی بەڵگەیە لەسەر خۆی کە چیی کردووەو چیی نەکردووە. با هەرچی بروبیانوویشی هەیە هەمووی بهێنێتەوە.

---

[1]- القيامة: ١٤ - ١٥

خوای گەورە عەقڵی پێ داوەو ئەویش ئەو ئەمانەتەی هەڵگرتووە.

دێینــە ســەر فەرمایشــتی پــەروەردگار: ﴿ وَإِذَآ أَرَدْنَآ أَن نُّهْلِكَ قَرْيَةً أَمَرْنَا مُتْرَفِيهَا فَفَسَقُوا۟ فِيهَا فَحَقَّ عَلَيْهَا ٱلْقَوْلُ فَدَمَّرْنَٰهَا تَدْمِيرًا ﴾[1] واتە: کاتێ بمانـەوێت ئاوەدانییـەك بفــەوتێنین فــەرمان بــە خــاوەن نیعمەتــەکان و دەســتەڵاتدارەکانی ئــەدەین پەیڕەویی پێغەمبەرەکەیان بکەن و، لە ڕێی ڕاست لانەدەن. ئەوانیش بـێگوێیی فەرمانەکە ئەکەن و لە ڕێی ڕاست لائەدەن، ئەنجا سزایان لەسەر پێویسـت ئـەبێ و بە تەواوی وێرانی ئەکەین.

خوای گەورە بـە بەخشـندەیی خـۆی پێغەمبـەرانی نـاردوە هـەتا خـەڵکی لـە تاریکیەوە ببەن بەرەو ڕێنمایی خوایی، پێغەمبەران مـژدەدەرو ترسـێنەر بـوون، خەڵکیش یان بڕوایان پێ دەکات بـەوەش بەرەکـەت دایـان دەگرێـت یـاخود بـە پێچەوانەوە بە درۆیان دەخەنەوە هەتا دوچاری سزا نـەبن وەکـو باسـەکەی نێـو سورەتی یاسین کە لە قورئاندا یاداشت کراوە خوای گـەورە دوو پێغەمبـەری بـۆ شارێك نارد پاشان کردی بە سێ پێغەمبەر پاشان پیاوێك لەولای شارێکەوە هات بۆ کۆمەکی ئەو سێ پێغەمبەرە، بەڵام گەلەکەی کوشتیان و شەهید بوو بەمـەش سزا دابەزییە سەر ئەو گەلـە ئـەوەتا خـوای گـەورە دەفـەرموێت: ﴿ وَٱضْرِبْ لَهُم مَّثَلًا أَصْحَٰبَ ٱلْقَرْيَةِ إِذْ جَآءَهَا ٱلْمُرْسَلُونَ ﴾[2] واتــە: بــە نموونــە باســی خــاوەن و دانیشتووانی دێی (ئینتاکییە ) بۆ ئەهلی مەککە بکـە کـاتێ کـە فروسـتادەکانی عیسا پێغەمبەر هاتنە لایان.

---

١- الإسراء: ١٦

٢- یس: ١٣

خوای گەورە هیچ گەلێك لە ناو نابات هەتا ئەو گەلە ستەم نەكەن و روونەكەنە لەخۆبایی بوون و تێكدان و دووركەوتنەوە لەڕێگەی پەروەردگار، دیارە ویستی پەروەردگار وابەستەیە بەكردەوەی بەندەوەو پێشی ناكەوێت.

﴿وَلَوْ أَنَّ أَهْلَ الْقُرَىٰ آمَنُوا وَاتَّقَوْا لَفَتَحْنَا عَلَيْهِم بَرَكَاتٍ مِّنَ السَّمَاءِ وَالْأَرْضِ وَلَٰكِن كَذَّبُوا فَأَخَذْنَاهُم بِمَا كَانُوا يَكْسِبُونَ﴾[1] واتە: ئەگەر ئەهلی ئەو دێیانە لەباتی كافریو بێگوێیی ئیمانیان بهێنایەو بەگوێی پێغەمبەرانیان بكردایەو لە خودا بترسانایە ئێمە لە هەموو لایێكەوە دەرگای ڕزق و ڕۆزی و بەرەكەت و خۆشیمان بۆ ئەكردنەوە، بەلام ئەوان پێغەمبەرانیان بەدرۆئەخستەوەو كافر بوون، بۆیە ئێمەیش بەهۆی ئەو كردارە خراپانەیانەوە تۆڵەمان لێ سەندن و سزامان دان.

كەواتە ئەو كاتە ویستی خوا دەكەوێتەكار كە بەندەكان درۆ دەكەن و سوپاسگوزار نابن.

بەلام ئادەمیزاد كاتێ گوێڕایەڵی پەروەردگاری دەبێت هەست بە رازی بوون دەكات لە خۆی، ئەوەی گوێڕایەڵی پەروەردگار دەكات دنیا بە دوایدا رادەكات، ئەوەش لەسەر ڕێگای پەروەردگاری لادەدات دەبێت بە دوای دنیادا ڕابكات، بۆیە كاتێك ئەو كەسانە دەبینیت كە زۆر سەرقاڵی دنیان غەم و پەژارە لەسەریان كەڵەكە بووەو هیچ هەست بە نرخی ئەو ماڵ و سامانە ناكات كە كۆی كردوەتەوە.

---

١- الأعراف: ٩٦

## سوور بوون لەسەر ستایشی خەڵکی:

یەکێکی تر لە هۆکارە گەورەکانی عاقیبەت شەڕی ڕیاکارییە، ڕیاکاری وەکو دووڕوویی نیە دووڕوویی دەرخستنی شتانێك جگە لەوەی لە ناخیدایە، دووڕوویی چەند نیشانەیەکی هەیە لەوانە ئەگەر قسەی کرد درۆ دەکات ئەگەر وادەیەکی دا نایباتە سەر ئەگەر ئەمانەتێکیش درایە دەستی خیانەتی لێ دەکات ئەگەر پەیمانێکیشی دا فێڵی لێ دەکات.

بەڵام ڕیاکاری واتە خۆ جوان کردن لەبەردەم خەڵکیدا وەکو ئەو پیاوەی لەنێو ماڵەکەی خۆیدا لەگەڵ خێزانەکەیدا زمانی زۆر خراپە دەست درێژەو لە منداڵەکانیەوە دورە پاشان کاتێ لە دەرەوەی ماڵ دەیبینی یاخود لەبەردەم خەڵکیدا زۆر پێچەوانەی ئەوەیە، یاخود ئەو کەسەی لە ماڵەکەی خۆیدا بەیەك خولەك نوێژەکانی دەکات بەڵام لە نێو خەڵکیدا لە ناو مزگەوتدا یەك کاتژمێری پێ دەچێت کەواتە دەبێت بە خۆماندا بچینەوەو ڕەزامەندیی پەروەردگار بەرزترین ئاواتتان بێت.

کێشەی ڕیا زۆر گەورەیەو شیرك دەرەئەنجامەکەیەتی، ئیبن عەباس(ڕەزای خوای لێ بێ) دەفەرموێت: (ئەگەر وتم سەگەکان نەبوونایە دزیمان لێ دەکرا ئەوا دەبومە ئەو کەسەی هاوبەش بۆ خوا پەیدا دەکات)

## کۆتا بوون و دڵەکان:

عاقیبەت شەڕی سەرەتا وابەستەیە بە کاری دڵەکانەوەو دوایش بە ئەندامەکانی جەستەوە، لەبەرئەوەی ئەگەر دڵ چاك بوو جەستەش ڕێك دەبێت.

خەڵکی کاتێ دوچاری ئازارێکی دڵ دەبن خێرا ڕوودەکەنە دکتۆر لەبەر سووربوونیان لەسەر دنیا، بەڵام ئەگەر دڵ دوچاری ملکەچ بوون نەبوو بۆ پەروەردگاری و کەوتە نواندنی خۆ بەزلزانی و دڵ ڕەقی لە بەرامبەر خەڵکیداو ڕق و کینە و ئێرەیی بردن پێیان بۆ ئەم نەخۆشییانە ناڕۆن بۆ لای دکتۆر.

**دڵەکان چوار جۆرن:**

**یەکەم:** دڵێك کەتەنها خوای گەورەی خۆش دەوێت، ئەمە دڵی هاوەڵان بوو؛ بۆیە هەمیشە دەبینین خۆ بەکەم زان بوون، دەروون گوشاد بوون، دەم بە زەردەخەنە بوون.

**دووەم:** دڵێك دنیا داگیری کردووە ئەگەر پێی بەخشرا ڕازی دەبێت ئەگەر پێشی نەدرا ئەوا تووڕەو نیگەران دەبێت.

**سێیەم:** هەرجارەو بەجۆرێکە وەکو کەسێك لە رەمەزاندا خوا دەپەرستێت بەڵام دوای رەمەزان بەردەوام نابێت.

**چوارەم جۆر:** دڵێکە هەندێ جار بەرەو رۆژی دوایی بەرز دەبێتەوە، دەهەژێت و ئاوێتە دەبێت و هەندێك جاریش دنیا بۆ لای خۆی دەبات و ئەمەش پێی دەوترێت دڵێکی ڕاڕا.

کەواتە عاقیبەت شەڕی سەرەتا بە دڵەوە بەندە، کاری بەندەش ئەوەیە دڵ لەو نەخۆشییە زۆرانە پاك بکاتەوە کە دوچاری دەبێت دوایش نیەتی هەبێت تەوبەیەکی راستگۆیانە بکات ئەمەش ئەوەی لە رابردوو ئەنجامی داوە دەسڕێتەوە.

سەیری ئەو هاوەڵە بەرێزە بکە لە جەنگی (الخندق)دا موسوڵمان بوو شایەتومانی هێناو هەر پاش ماوەیەکی کەم ڕۆشتە ناو جەنگەکەوەو تیرێکی بەر کەوت و شەهید بوو، پێغەمبەر ﷺ پێکەنی و فەرمووی فیردەوسی باڵا بووە نشینگەی و سوجدەشی بۆ خوا نەبرد، سەیری ئەو عاقیبەت خێرییە بکە بەڵام هۆکارەکەی نیەت باشی و کار بۆکردنە.

**کەواتە چۆن ئامادەبین بۆ گەیشتن بە خواو ئاکامی کارەکانمان بەخێر کۆتای بێنین:**

باری ئەم ئومەتە چاك نابێت هەتا بەو قورئان و سونەتە نەبێت کە پیاوچاکانی پێشین خۆیان پێ چاك کرد ئێمە تا ئێستاش ژێریمان لە شوێنێکدا دادەنێین کە نابێت تیایدا دابنرێت، تا ئێستاش دەمانەوێت یاسا گەلێك دابڕێژین کە ژیانمان چاك ناکات بە وێنەی شەرعی خوا.

خەڵکیش وا دەزانن بوونی مزگەوتەکان و نوێژ خوێن و باڵا پۆشی هەموو شتێکە لە شەریعەتداو هیچی تر نیە جێبەجێ بکرێت. ئەمانەش وێنای لەسەدا سێی ئاینەکەمان نیشان نادات، بەڵام جێبەجێ کردنێکی ڕاستەقینەی ئەم ئاینە شانبەشانی ئەو دەستەواژانەی کە لەسەرەوە ئاماژەمان پێ دا ئەوا هەموو موسوڵمانێك دەبینیت بۆتە قورئانێکی زیندوو.

بەڵام خەڵکی دوچاری دووفاقەیی بوون بۆ نموونە دەبینیت پیاوێك قورئان لەبەر دەکات کەچی خێزانەکەی باڵاپۆش نییە یاخود میراتی براکانی دەخوات یاخود مافی دراوسێکەی دەخوات کەواتە لەبەرکردنی قورئان چ سودێکی هەیە ئەگەر ماناکانی جێبەجێ نەکەیت، بەم جۆرە لە ڕۆژی دوایدا قورئان دەبێتە بەڵگە بەسەریانەوە.

کەواتە ژیانی ڕاستەقینە تەنها بە قورئان و سوننە زیندوو ڕاگرتنی دڵەکان دەبێت چونکە دڵەکان لەگەڵ قورئان و سونەتدا زیندوو دەبن ئیتر لە مانگی رەمەزاندا بێت یان هەر کاتێکی تر، لە شەودا بێت یاخود لە رۆژ بە ئاشکرا بێت یان نهێنی ئەمە ژیانە.

گەیشتن بەو جۆرە ژیانە کارێکی ئاسان نیە بەڵام دەبێ دەست پێ بکەین و هەنگاوی بۆ هەلگرین ﴿ وَٱلَّذِينَ جَٰهَدُواْ فِينَا لَنَهۡدِيَنَّهُمۡ سُبُلَنَاۚ ﴾[1] واتە: ئەوانەیش کە لە ڕێگای ئێمەدا تێکۆشاون و خواپەرستیی ڕاستییان کردووە، ئێمە لە پاداشی چاکەیانا شارەزای ڕێگەکانی خۆمانیان ئەکەین و خوایش لەگەڵ ئەو کەسانەیە کە چاکە ئەکەن.

هەندێك لە هاوەڵان مەی خۆر بوون پێش حەرامکردنی، کاتێ ئەنەس بە شەقامەکانی مەدینەدا دەگەڕا وتی: ئەی موسوڵمانان خوای گەورە لە سەرووی حەوت ئاسمانەوە مەی حەرام کردووە لەسەرمان موسوڵمانانیش یەکسەر مەیەکانیان ڕشت بە جۆرێ شەقامەکان بە تەواوی تەڕبوون بۆ ماوەی هەفتەیەك، بۆنی مەی کوچەو کۆڵانی داگیر کردبوو. ئەم حاڵەتەش خێرا بەدەمەوە چوونی فەرمانەکانی خوا بوو لە لایەن موسوڵمانەکانەوە.

بەڵام ئێمە ئێستا شتەکان بە فەلسەفە دەکەین وە هەریەکەو بە پێی بۆچوون و رای خۆی دەژی نەك بە فەرمانی خوا کەواتە دەبێ پیلان داڕێژین بۆ گەڕانەوەمان بەرە و پەروەردگارو قورئان و سونەتەکانی پێغەمبەرمان ﷺ.

---

١- العنكبوت: ٦٩

# سامناكی زیندووبوونەوەو بەرپابوونی قیامەت

## زیندووبونەوەو هەڵسانەوە لە گۆڕ:

هول المطلع: واتە هاتنە دەرەوە لە گۆڕ واتە دیسانەوە زیندبوونەوەو هاتنە دەرەوە لە گۆڕ بەم جۆرە ناونراوە لەبەرئەوەی سەیری دیمەنەكانی دەكەین ئەوانەی كە لەڕێی قورئانی پیرۆزەوە بیستومانە سەبارەت بە نارەحەتیەكانی رۆژی دوایی، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: (ئەوەی حەز دەكات سەیری رۆژی دوایی بكات وەكو ئەوەی بە چاوی خۆی با تەماشای "إذا الشمس كورت وإذا السماء انفطرت" بكات)١

كاتێ لە گۆڕەكانمان دێینەدەرەوە كەسمان یەكتر ناناسین ئەگەر كەسێك ببینین نایناسین ئادەمیزاد دایك و باوكی تەنانەت براكەی و هاوسەرەكەی ناناسێتەوە لەبەرئەوەی لەو رۆژەدا هەریەكەو سەرقاڵی خۆیەتی.

نارەحەتیەكانی ڕۆژی دوایی زۆرن كاتێك: ﴿إِذَا زُلْزِلَتِ ٱلْأَرْضُ زِلْزَالَهَا﴾[٢] واتە: كە زەوی بوومەلەرزەی پێكەوت ئەو بوومەلەرزەیەی خوا بۆی بڕیارداوە.

دەخوێنیتەوە ئەوە زەمین لەرزەی راستەقینەیە، ﴿وَأَخْرَجَتِ ٱلْأَرْضُ أَثْقَالَهَا﴾[٣] واتە: زەوی هەرچی شارراوەی ناو خۆی هەیە هەمووی هەڵڕشتە دەرەوە، یا هەرچی مردووی تیا نێژراوە هەمووی خستە دەرەوە.

وە هەروەها كێوەكان دەبینی وەكو خوری شیكراوەیان لێ دێت ئەوە نیشانەی بەرپابوونی قیامەتە! ئەمانە لە سەروی ئەندێشەی مرۆڤەكانەوەیە،

---

١- رواه الترمذي.

٢- الزلزلة:١

٣- الزلزلة:٢

پاشان ئامادەباشی گشتی دێت و زەوی لە دوای کۆتا نیشانە لە نیشانەکانی ڕۆژی دوایی هیچی تیا نامێنێ.

کۆتا نیشانەش هەڵکردنی بایەکە کە گیانی موسوڵمانان لە ژێر باڵەکانیەوە لە جەستەیان جیا دەکاتەوە ئەگەر لە چیاش بێت کەس لەسەر زەوی نامێنێ جگە لە (ناپاکی کوڕی ناپاک).

پاشان ئاگرێکی گەورە لە عەدەنەوە دێتەدەر ئەمەش دەقی فەرمایشتی بوخاری و موسلیمە خەڵکی بەرەو زەوی حەشر کۆدەکرێتەوە وەك وتراوە لە خاکی شامدایە خاکی (بیت المقدس).

لەم میانەیەدا خەڵکی گوێیان لە هاواری یەکەم دەبێت (الصعقة الاولى) دەبێت. ئەمانە هەموویان دەربڕینی قورئانین، وەکو الطامة، الصیحة، الصاخة، القارعة، التی تقرع الناس، خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموێت:

﴿يَوْمَ يُنَادِ ٱلْمُنَادِ مِن مَّكَانٍ قَرِيبٍ يَوْمَ يَسْمَعُونَ ٱلصَّيْحَةَ بِٱلْحَقِّ ذَٰلِكَ يَوْمُ ٱلْخُرُوجِ﴾[1]

واتە: گوێ شل کە لەو ڕۆژەدا کە بانگکەر لە شوێنێکی نزیکەوە، بانگ ئەکا، واتە هەر کەس گوێی لێ ئەبێ وائەزانێ لەنزیکی خۆیەوە بانگی لێ ئەکەن. ئەو ڕۆژە ئەو ڕۆژەیە کە خەڵك بەڕاست گوێیان لە دەنگە دەنگ و هاوار هاوارە. ئەو ڕۆژە ڕۆژی لەگۆڕهاتنەدەر و ڕووکردنە سەحرای مەحشەرە.

جبرەئیل یاخود ئیسرافیل فو دەکەن بە کەڕەنادا: ئەی ئێسکە ڕزیوەکان ئەی گۆشتە شیبووەکان هەستەرەوە بۆ وەستانت لەبەردەم (الجبار)دا بۆ دادوەری پەروەردگار.

---

١- ق: ٤١ - ٤٢

پێش ئەم فوکردنە فووی یەکەم هەیە هەرچییەك لەسەر زەوییە دەمرێت مەگەر ئەوانە نەبێت کەخوایٚ گەورە ویستی لەسەرنەبێت، لەوانەیە شەهیدانیش بیٚ لەبەرئەوەی ئەوانە لای خوا زیندون.

ئەوانە نەبێت کە خوا ویستی لەسەریەتی، هەروەها دەفەرموێت: هەر چوار فریشتە گەورەکە جبرەئیل و ئیسرافیل و میکائیل و فریشتەی مەرگ.

هەروەها دەکرێت پێغەمبەرانیش بن چونکە ئەوەتا پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: (خەڵکی هەموو دەمرن لەپاش فوکردن بەکەرەنادا، منیش یەکەم کەسم هەڵدەستمەوە، لەوکاتەدا دەبینن موسا پێغەمبەر ﷺ هەردوو دەستی بە پێچکەی عەرشی خوادا گرتووە نازانم ئایا ئەو لەپێش مندا زیندووبۆتەوە یان لەگەڵ ئەو کەسانە حیساب کراوە کە خوا جیای کردونەتەوە)[1]

صەعقەی یەکەم (٤٠) ساڵ دەخایەنێت هەتا فووی دووەم بەڵام ئەی لە ماوەی ئەو چل ساڵەدا چی ڕوودەدات، ئاسمانەکان وەکو پەڕەی کتێبەکان دەپێچرێنەوە خۆر لەخولگەی خۆی دەردەچێت: ﴿وَإِذَا ٱلْكَوَاكِبُ ٱنتَثَرَتْ﴾[2] واتە: کاتێ کە ئەستێرەکان پرژوبڵاو بوونەوە.

زەوی ئەوەی لە کرۆکیایەتی دەری دەکات، پاشان:

﴿ يَوْمَ تُبَدَّلُ ٱلْأَرْضُ غَيْرَ ٱلْأَرْضِ وَٱلسَّمَٰوَٰتُ وَبَرَزُوا۟ لِلَّهِ ٱلْوَٰحِدِ ٱلْقَهَّارِ ﴾[3]، واتە: ئەو تۆڵە سەندنەوەیشە لە ڕۆژێکدا ئەبێ کە ئەم زەوییە ئەگۆڕێ بە زەوییەکی تر و ئاسمانەکان بە ئاسمانی تر و، هەرچی ئادەمزادە لەگۆڕ دەرئەچن و لە بەردەم دادگای خودای تاك و تەنیاو بەدەستەڵاتدا ڕائەوەستن.

بەڵام بۆ کویٚ؟ بۆ خاکی مەحشەر.

---

١- رواه البخاري

٢- الانفطار: ٢

٣- إبراهيم: ٤٨

زەوی مەحشەر زەوییەکی سپی پاکە وەکو زیوی تواوە هیچ شتێکی تێدا شاراوە نابێت ﴿لَّا تَرَىٰ فِيهَا عِوَجًا وَلَآ أَمۡتًا﴾[1] واتە: لاری و لەواری و بەرزیو نزمیی تیا بەدی ناکەی.

چاڵی تیا نییە هەرگیز سەرپێچی تیادا نەکراوە ئیتر لەوێدا دادپەروەری تەواو دەردەکەوێت ﴿لَّا تَرَىٰ فِيهَا عِوَجًا وَلَآ أَمۡتًا﴾[2]

## وەستان لەبەردەم خوای (القهار)دا:

پاشان فووی دووەم دەکرێت هەرچی مردوو هەیە هەڵدەسنەوە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَٱسۡتَمِعۡ يَوۡمَ يُنَادِ ٱلۡمُنَادِ مِن مَّكَانٖ قَرِيبٖ﴾[3] واتە: گوێ شل کە لەو ڕۆژەدا کە بانگکەر لە شوێنێکی نزیکەوە، بانگ ئەکا، واتە هەر کەس گوێی لێ ئەبێ وائەزانێ لەنزیکی خۆیەوە بانگی لێ ئەکەن.

هەتا دوورو نزیك گوێیان لێ بێت، خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿وَإِذَا ٱلنُّفُوسُ زُوِّجَتۡ﴾[4] واتە: کە گیاندارانی ئادەمزاد هەموو هاوجووت کران چاك لەگەڵ چاك و خراپ لەگەڵ خراپ.

واتە هەرچی ڕۆحەکان هەیە دەگەڕێنەوە جەستەکانیان.

زانایان دەڵێن لەوانەیە بەندەیەك لە دەریادا بمرێت و نەهەنگەکان بیخۆن یاخود لە ئاسماندا دەمرێت (فڕۆکەکەی لە ئاسمانەوە تێك دەشکێت) مار دەیخوات، هەموو ئەوانە زیندوو دەکاتەوە.

---

١- طه: ١٠٧

٢- طه: ١٠٧

٣- ق: ٤١

٤ التكوير: ٧

پێغەمبەر ﷺ بە خاتوو عائیشە دەفەرموێت: لە گۆڕەکانماندا بە رووتی و بە خەتەنە نەکراوی دێینەدەر ﴿كَمَا بَدَأْنَا أَوَّلَ خَلْقٍ نُّعِيدُهُۥ﴾[1] واتە: ئێمە وەك چۆن دنیامان یەکەمجار دروستکرد هەروەها تازەیشی ئەکەینەوە.

هەر زاتی خۆیەتی کە شارەزایە بە دروستکراوەکانی، خاتوو عائیشە دەستی دا بەسەریداو فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوا پیاوان جەستەی ئافرەتان دەبین؟! پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: نەخێر عائیشە هەر یەکە ئەوەندە سەرقاڵی خۆیەتی کە نەیپەرژێتە سەر سەیرکردنی دەوروبەرەکەی.

کاتێ زەمین لەرزەیەك ڕوودەدات دایك ڕادەکات و منداڵەکانی جێ دەهێڵێت، ئەی ئاخۆ زەمین لەرزەی رۆژی دوایی چۆن بێت.

پاشان خەڵکی بەبێ ڕێنمویی دێنەدەرەوە بۆیە لێرەدا خەڵکی دەبن بە دوو بەشەوە: یەکەمیان کافرو خراپەکار دەڵێن: ﴿مَنۢ بَعَثَنَا مِن مَّرْقَدِنَا﴾[2] واتە: ئەڵێن: ئەی هاوار بۆ ئێمە ! ئەوە کێ لەم شوێنەدا بە خەبەری هێناین کە تیا نووستبووین !

وەڵامی باوەڕداران دەداتەوە:

﴿هَٰذَا مَا وَعَدَ ٱلرَّحْمَٰنُ وَصَدَقَ ٱلْمُرْسَلُونَ﴾[3] واتە: ئەم بەخەبەرهێنانە ئەوەیە کە خوای میهرەبان لە دنیادا گفتی دابوویێ و پێغەمبەرەکانی خوایش کە ئەم خەبەرەیان ئەدایێ ڕاستیان فەرموو.

---

١- الأنبياء: ١٠٤

٢- يس: ٥٢

٣- يس: ٥٢

ئەمانە خوای گەورە دەربارەیان دەفەرموێت: ﴿ يُثَبِّتُ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ بِٱلْقَوْلِ ٱلثَّابِتِ ﴾[1] واتە: خوا لە دنیاو لە ڕۆژی قیامەتدا ئەوانە دامەزراو ئەکا کە باوەڕیان بە وتەی چەسپاوی خوابەیەکزانین (لا اله الا الله) هەیە.

لەبەرئەوەی لە دنیادا لەسەر ئایینی خوا راوەستابوو بۆیە خوای گەورەش دڵی لە رۆژی ترسی گەورەدا دادەمەزرێنێت، هەریەکە و بە پێی ئاستی باوەڕی خۆی.

پاشان زەوی بە نوری خوا ڕۆشن دەبێتەوە، ئینجا هەر لە ئادەمەوە هەتا دوا کەس کە لەسەر زەوی ژیاوەو مردووە هەموویان بەرەو گۆڕەپانی مەحشەر دەڕۆنە دەرەوە هەموویان بەپێ بەرەو شوێنی ناوبراو دەڕۆن، تیایاندایە فریشتەکان لەسەر روخساری رای دەکێشێت هەشیانە بە سواری گوێ درێژ دەڕوات یان دوان یان سێ کەس لەسەر یەک گوێدرێژ، هەروەها پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: هەندێکیان بەپێ لەسەر روخساریان دەڕۆن لەبەر ئەوەی روخسارییان دوور بووە لە قورئانی پیرۆزو شەرعی خوا ئیتر چاوەڕوانی چی بێت.

ئەو کاتە ستەمکارو ستەم لێکراو حاکم و حوکم دراو گەورە و بچوک تەنانەت ئەو منداڵەی بەبێ تاوان دەکوژرێت بە دەنگی خۆی لە گۆڕەپانی مەحشەردا هاوار دەکات پرسیار لەمە بکەن بۆ منی کوشت:

﴿ وَإِذَا ٱلْمَوْءُۥدَةُ سُئِلَتْ ﴿٨﴾ بِأَيِّ ذَنۢبٍ قُتِلَتْ ﴾[2] واتە: کاتێ کە کچی زیندەبەچاڵ کراو لێی پرسرا: تاوانی چی بوو کوژرا؟

---

١- إبراهيم: ٢٧

٢- التكوير: ٨ - ٩

﴿ وَإِذَا ٱلْوُحُوشُ حُشِرَتْ ﴾[1] واتـە: کـە گیانلەبـەرانی کێـوی لـە هـەموو جـۆرێ کۆکرانەوەو کەوتنە ناویەك ، لە گۆڕەپانی مەحشەر.

فریشتەکان دەوری گۆڕەپانی مەحشەر دەدەن یەك ڕۆژ لەوێدا هەزاران ساڵە، ئـەوەتا سـەلمانی فارسـی دەفـەرموێت سـێ شـت گریانـدمی: دابـڕان لـە خۆشەویستانی پێغەمبەرو هـاوەڵانی و بـەرپابوونی قیامـەت و لەگۆڕهاتنـە دەر، لەگەڵ وەستان لەبەردەم خوادا.

ئـەو سـورەتانەی کـە بـاس لـە ڕۆژی دوایـی دەکـەن پێغەمبـەریان پـیر کـرد ئێمەش گوێمان لێیەتی و دەیخوێنینەوە وەکو ئەوەی شتێکی ئاسایی بێت بەڵام دەبێـت پەنـدو ئامۆژگـاری لێ وەرگـرین هەریەکـەمان بـە حسـاباتەکانی خۆمانـدا بچینەوە چونکە ئێمە تا ئێستا لە دنیادابن و دەکرێت تەوبە بکەین.

هـەروەها سـەلمانی فارسـی دەڵێـت: سـەرم سـوڕماوە لـە سـێ کـەس: ئـەو کەسەی بە هەموو هێزی خـۆی بـە قاقـا پێکەنینیـەتی و نـازانێ داخـۆ خـوا لێـی تووڕەیە یان نا، ئەو بێ ئاگایە کە خوا لێی بێ ئاگا نیە، هەروەها ئەو کەسەی کە هیوا درێژە بە دنیاو مردنیش داوای دەکات.

کاتێکی دیاری کـراو بـۆ نیشـانە گـەورەکان نیـە بـەڵام (٤٠) سـاڵ دەکەوێتـە نێوان فووی یەکەم و فووی دووەمەوە.

## چیمان بۆ ئەو ڕۆژە پێش خستوە؟!

ئەو کاتە زەوی خاڵی دەبێت لـە سەرنشـینەکانی و هۆکارەکـانی ژیـان ئینجـا فریشتەی مەرگیش خوای گەورە بـە فـوی ئیسـرافیل دەیمرێنێـت پاشـان خـوای گـەورە ئیسـرافیلیش دەمرێنێـت، لـە نێـو خەڵکیـدا وا بەناوبانگـە دوا کـەس کـە دەمرێت فریشتەی مەرگە، بەڵام کاتێ کـە بەدواداچـون دەکـەین بـۆ گێڕانەوەکـە

---

١- التكوير: ٥

ئەوە دەسەلمێنێت کە دوا کەس کە دەمرێت ئیسرافیلە، لەبەر ئەوەی زەوی خاڵی دەبێت لە فریشتە نزیکەکانی خوای گەورەو لە پێغەمبەران و مرۆڤەکان و بە سەرپێچی کارو گوێڕایەڵیەوە، بە موسوڵمانان و کافریانەوە ئیتر لەوێدا خوای گەورە بانگ دەکات: ﴿لِّمَنِ ٱلۡمُلۡكُ ٱلۡيَوۡمَ﴾[1] واتە: فەرمانڕەوایی و دەسەڵات و لەدەس دەربازنەبوون لەو ڕۆژەدا بۆ کێیە؟ کەس نیە وەڵام بداتەوە، ئینجا خوای گەورە خۆی وەڵام دەداتەوە: ﴿لِلَّهِ ٱلۡوَٰحِدِ ٱلۡقَهَّارِ﴾[2] واتە: بۆ ئەو خوایەیە کە تاك و تەنیایەو هەمووکەسێ لەژێر دەسەڵاتی ئەوایە.

کوان دەسەڵاتدارە ستەمکارەکان؟ کوان فیرعەونەکان؟ کوان عەبقەرییەکان؟

کوان ئەوانەی زەوییان ئاوەدان کردەوە؟ کوان ئەوانەی زەویان داڕوخاندو بەندەکانیان سەر شۆڕ دەکرد؟ لەکوێن؟!!

﴿كُلُّ مَنۡ عَلَيۡهَا فَانٖ ۝٢٦ وَيَبۡقَىٰ وَجۡهُ رَبِّكَ ذُو ٱلۡجَلَٰلِ وَٱلۡإِكۡرَامِ﴾[3] واتە: هەموو ئەوانەی بەسەر ئەرزەوەن فەوتاوو لەناوچوون. تەنها زاتی خوای پەروەردگاری تۆ ئەمێنێتەوە کە لە هەموو کەسێ و لە هەموو شتێ بێئیحتیاجەو فەزڵ و گەورەیی بەسەر هەموانا هەیە.

پاشان ئەگەر خوای گەورە ویستی وا بوو لەسەرەتای حەشرەوە فریشتەکان زیندوو دەکاتەوە پاشان ئیسرافیل فویەکی تر دەکاتەوە بە کەڕەنادا هەموو هەڵدەسنە سەر پێ و سەیر دەکەن ئادەمیزادیش چاودێری دەکات و بەڵکو ئەویش لەگەڵ خەڵکیدا دەڕوات، ئینجا دەهێنرێتە بەرچاو ئاخۆ مرۆڤەکان لە

---

١- غافر: ١٦

٢- غافر: ١٦

٣- الرحمن: ٢٦ - ٢٧

گۆڕەپانی مەحشەردا ژمارەیان چەند بێت؟ ئێستا مرۆڤەکان شەش ملیارو نیوە، ئاخۆ ڕۆژی دوایی بگەنە چەند کەس؟!

ئێستا گرنگترین پرسیار کە هەریەکەمان لە خۆی بکات ئەوەیە: چیم بۆ ئەو ڕۆژە پێشکەش کردووە؟ پرسیاریان لە حەزرەتی ئیبراهیم﷤ کرد: ئایا لە بینینی ڕۆژی قیامەت دەترسیت؟ فەرمووی: بەڵێ، وتیان: خۆ تۆ (الخليل)ی؟! فەرمووی: نەهامەتیەکانی ڕۆژی قیامەت هاوڕێیەتی خوام لە بیر دەباتەوە.

لە حەزرەتی موساوە﷤ هاتووە فەرمووی: خوایە داوای هارونی برامت لێ ناکەم، حەزرەتی عیساش﷤ دەفەرموێت: منیش داوای مەریەمی دایکمت لێ ناکەم، هەمووان دەڵێن خۆم خۆم.

تاکە کەسێك کە دەفەرموێت ئومەتەکەم ئومەتەکەم (محمد المصطفى) یە، ئایا دەبێت واز لە سوننەتەکانی بێنین، ئایا دەبێت مافەکانی بەسەرمانەوە لە یاد بکەین کە هەر ئەوە دەستی گرتووین، ئەی بۆچی ناتوانین بچینە سەر ڕێگەی خوایی، چیمان دەداتێ و بەڵگەی ئێمە چییە؟.

ئەی ئەو کەسەی نوێژت لە کاتی خۆیدا دواخستووە، بیانووەکەت چیە؟ ئەی ئەو خوشکەی کە ناتەوێ باڵاپۆش بیت بیانوت چیە؟ ئەم فەلسەفە درۆیە چیە.

تاوانباران دەڵێن: وەیل بۆ ئێمە کە بێ ئاگا بووین، کەسی بێ ئاگا دەڵێت: ئەم هەموو ترسە، ئەم کاتەو ئەم هەموو ڕووداوە گەورە و ترسناکانە بۆچی، خوای گەورە بەهەر شتێك بڵێت ببە دەبێت. ئەویش بۆ چارەسەری دڵی کۆمەڵی باوەڕدارانە.

بۆنموونە چۆن خوای گەورە چارەسەری حەزرەتی نوح دەکات کە بۆ ماوەی نۆسەد و پەنجا ساڵ بانگەوازی گەلەکەی خۆی کرد تەنها هەشتا پیاو و ئافرەت بڕوایان پێ هێنا، چەندێك خەم و پەژارەی خوارد، ئەوانەی قسەی ناشیرینیان بە پێغەمبەر وت و ئازاریان دا ئایا خوا بە دادپەروەری خۆی سزایان نادات...!!

باوەڕدار (إن شاء الله) لە دنیاو ڕۆژی دوایشدا دامەزراوە، ئەوە بزانە سەرپێچی کاری ناخەمخۆر کەس ناچاری ناکات بەوەی کەم و کورِ بێت، ئەگەر لەگەڵ برادەرو خوشکە موسوڵمانەکانیدا کۆبێتەوە ڕێگەی باوەڕداران بگرێتەبەر و شوێن قورئان و سونەت بکەوێت، خوای گەورە ڕێنمویی دەکات و باوەڕی زیاد دەکات، لەوانەیە کەم و کورِی هەبێت یاخود گوناهێ بکات خوای گەورە سەرکەوتوی دەکات بەوەی بە خێرایی تەوبە بکات.

لە وێنەی سوربوون و سەرسەختی بێ باوەڕان ئەوانەی کە سزای باوەڕدارانیان دەدا:

ئەوە جەنناب بوو هەڵیانواسی، کەوتنە تیر باران کردنی هەتا بەوپەڕی ئارامگرییەوە شەهید بوو، ئەوانە بۆ کوێ دەچن؟ ئەوانەی نهێنییەکانی ئەم ئومەتەیان ئاشکراو پێشێل کردو تەواوی گەلانیان سەرشۆڕ کرد، دەبێ ڕۆژی قیامەت بێت هەتا خوای گەورە ڕاستی ئەوە دەرخات و ناڕاستیش پوچەڵ بکات.

## باشترین توێشوو لە خوا ترسانە...

دەگەڕێینەوە بۆ دیمەنەکانی ڕۆژی دوایی: ﴿إِنَّ زَلْزَلَةَ السَّاعَةِ شَيْءٌ عَظِيمٌ ۝١ يَوْمَ تَرَوْنَهَا تَذْهَلُ كُلُّ مُرْضِعَةٍ عَمَّا أَرْضَعَتْ وَتَضَعُ كُلُّ ذَاتِ حَمْلٍ حَمْلَهَا وَتَرَى النَّاسَ سُكَارَىٰ وَمَا هُم بِسُكَارَىٰ وَلَٰكِنَّ عَذَابَ اللَّهِ شَدِيدٌ﴾[1] واتە: خەڵکینە! لە خوا بترسن، بەڕاستی بوومەلەرزەی زەوی کە لەپێش قیامەتدا ڕوودەدا شتێکی گەورەو سامناکە. ئەو ڕۆژەی ئەو بوومەلەرزەیە ئەبینن، هەرچی ئافرەتی منداڵبەبەرە کە شیر بە منداڵەکەی ئەدا، ئاگای لە منداڵە شیرە

---

١- الحج: ١ – ٢

خۆرەکەی نامێنێ و، هەرچی ئافرەتی دووگیانە تووشی لەبارچوون ئەبێ و، ئەبینی خەڵك سەرخۆشن و لە ڕاستییشدا سەرخۆش نین، بەلأم سزاکەی خوا زۆر سەختەو لەتاواندا خەڵکەکە وایان لێ بەسەرهاتووە.

خەڵکی دوای فووی کەڕەنای دووەم زۆر زیاتر لە جاران بە برسێتی دێنەدەر لە حاڵەتی برسێتییەکی توند تینویەتییەکی پڕوکێندا.

ئەوەی لە دنیادا خەڵکی تێر کردبێت خواش لەو ڕۆژەدا ئەو کەسە تێر خواردن دەکات ئەوەی لە دنیادا تینویەتی کەسێکی شکاندبێ خوای گەورە تینویەتی ئەو کەسە دەشکێنێتەوە ئەوەی کە کەسێکی پۆشتە کردبێ خوای گەورە لەو ڕۆژەدا پۆشتەی دەکاتەوە.

ئینجا خوای گەورە دەفەرموێت من زۆر گوێم بۆ ئێوە گرت دەی ئێوەش ئەمڕۆ گوێم بۆ بگرن ئەمڕۆ من پشتێکم بۆ خۆم داناوە بۆ ئێوەش بە هەمان شێوە، پشتی منتان دابەزاند پشتی خۆتان بەرزکردەوە، پێم وتن:

﴿إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ﴾[1] واتە: بەڕاستی بە قەدرو حورمەترتان لای خوا ئەوەتانە زۆرتر لە خوا بترسێ و خۆی لە گوناه بپارێزێ.

ئێوە وتتان بەڕێزترینمان یاخی بوانن. بۆیە ئەمڕۆ پشتەکانتان نەوی دەکەم و پشتی خۆم بەرز دەکەمەوە، کوان لەخوا ترساوان؟ کۆمەڵێکی کەم هەڵدەسنەوە.

پاشان خوای گەورە ئادەم بانگ دەکات، ئەی ئادەم هەڵسە لەسەر هەزار کەس (٩٩٩) کەس لە ئاگر دەربهێنە.

﴿اقْتَرَبَ لِلنَّاسِ حِسَابُهُمْ وَهُمْ فِي غَفْلَةٍ مُّعْرِضُونَ ﴿١﴾ مَا يَأْتِيهِم مِّن ذِكْرٍ مِّن رَّبِّهِم مُّحْدَثٍ إِلَّا اسْتَمَعُوهُ وَهُمْ يَلْعَبُونَ ﴿٢﴾ لَاهِيَةً قُلُوبُهُمْ﴾[1]،

---

١- الحجرات: ١٣

واتە: نزیکبووەتەوە بۆ خەڵك لێپرسینەوەی بیروباوەڕو گوفتارو کرداریان کە لەڕۆژی قیامەتا ئەبێ، کەچی ئەوان لە بێئاگاییدان و خۆیان لە لێپرسینەوەی ئەو ڕۆژە لائەدەن. هیچ وەبیرهێنانەوەیەکی نوێیان لە خواوە بۆ نایەت ئیللا کاتێ ئەیبیسن گاڵتەی پێئەکەن. حاڵیان وایە دڵیان بێ ئاگایە لە کاتی بیستنی ئەو وەبیرهێنانەوەی خوادا.

لەخوا ترساوان ئەو کەسانەن لە دنیادا بە پەنهانی لە خوا دەترسان، ئەوانە بوون کە شەرعی خوایان رادەگرت ئەوانە بوون لەپێناوی خوادا تێکۆشانیان دەکرد.

سەیری میقداد بکە لە جەنگی بەدردا، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەوە چیە گوێم لە ئەنصار نیە، میقداد وتی: سوێند بە خوا ئەی پێغەمبەری خوا ئەگەر بمانخەیتە ناو ئەو دەریایەوە لەگەڵتدا دێینە ناوی، ئەگەر بەرەو (غمار)مان ببەیت ئەوا بە دواتەوە دەبین و یەك کەسمان دوا ناکەوێت، ئێمە لە جەنگدا زۆر ئارام گرین لە کاتی ڕوبەڕووبوونەوەدا راستگۆین، ئەوەی چاوت پێی گەش دەبێتەوە لە ئێمەی دەبینیت، ئێمە وەکو جولەکە نابین کە بە موسایان وت: ﴿فَٱذْهَبْ أَنتَ وَرَبُّكَ فَقَٰتِلَآ إِنَّا هَٰهُنَا قَٰعِدُونَ﴾[2] واتە: جا ئەگەر تۆ حەزت لە ڕۆیشتنە ئەوا تۆو خوداکەت بڕۆن بجەنگن و، ئێمەیش ئا لێرە دانیشتووین. ئەمەیش گاڵتەکردن بوو بە خوداو بە مووسای پێغەمبەری.

سەیری ئەو پیاوانە بکەن هەموو مرۆڤێ لەسەر چ حاڵەتێ مردووە هەر بەو شێوەیە زیندوو دەکرێتەوە هەندێ هەن بەسەرخۆشی مردوون هەر بەو شێوەیە

---

١- الأنبياء: ١ - ٣

٢- المائدة: ٢٤

زیندوو دەکرێنـەوە، هەیـە بـە وتنـی (لبیـك اللـهم لبیـك)ەوە زینـدوو دەبێتـەوە، چونكە لە حەجدا مردووە.

کەواتە دەبێت ئاگام لەو ناڕەحەتیانەی ڕۆژی دوایی بێت و خۆمانی بۆ ئامادە بکەین، ڕۆژێك خاتوو عائیشە(ڕەزای خوای لێ بێ) فـەرمووی: (ئـەی پێغەمبـەری خوا هەڵسـە بـا بـڕۆین بخـەوین). فـەرمووی: عائیشـە چۆن بخـەوم لـە کاتێکـدا خاوەنی کەڕەنا دەمی خسـتۆتە سـەر کەڕەناکـەی خـۆی و لـە ئامادەباشـیدایەو چاوی بڕیوەتەوە عەرشی پەروەردگار هـەتا فـەرمانی لـە ئاسمانـەوە بـۆ بێـت و فووی پیا بکات.

ئەوەتا دەفەرموێت: ﷺ (ئەگـەر ئـەوەی مـن دەیـزانم ئێـوە بتانزانیبایـە زۆر دەگریان و کەم پێدەکەنین)[1]

ئەمە بانگەشە نیە بۆ نائومێدی بەڵکو بانگەوازێکە بـۆ خێـرا بـەئاگابوون لـەم دنیایەدا، چـاك مامەڵـە کـردن لەگـەڵ موسـوڵمانانداو ناموسـوڵماناندا، هـەتا کـە کۆچمان کرد ئاینەکەمان پێشکەش کردبێ بەخەڵکی و شـەفاعەتی پێغەمبـەرمان دەست بکەوێت.

---

١- رواه البخاري

# حەشر

## ترس و بیم سیمای ئەهلی حەشرە:

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَكُلَّ إِنسَٰنٍ أَلْزَمْنَٰهُ طَٰٓئِرَهُۥ فِى عُنُقِهِۦ ۖ وَنُخْرِجُ لَهُۥ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ كِتَٰبًا يَلْقَىٰهُ مَنشُورًا ﴿١٣﴾ ٱقْرَأْ كِتَٰبَكَ كَفَىٰ بِنَفْسِكَ ٱلْيَوْمَ عَلَيْكَ حَسِيبًا ﴾[1] واتە: هەموبنیادەمیٚ کردەوەی خۆیمان کردووەتە گەردنی، واتە: کردەوەی خۆی لەسەر خۆیەتی و، لە ڕۆژی قیامەتدا پەڕەی کردەوەکانی بۆ دەرئەکەین و بە کراوەیی و ئاشکرایی پێیئەگات و سەیری ئەکات و خۆی ئەزانێ لە ژیانی خۆیدا چیی کردووە؟ لە لایەن فریشتەی مەئموورەوە پێی ئەوترێ: کتێبی کردەوەکانی خۆت بخوێنەرەوەو بزانە چیت کردووە؟ ئەمڕۆ خۆت بەسیت بۆ لێپرسینەوەی خۆت، واتە پێویست ناکات کەس شایەتیت لێ بدات.

قسەکردن لەسەر حەشر شتێکی گەورەو بەرچاوە، لەبەرئەوەی بەهۆیەوە هەموو ئادەمیزادێك لەکاتی کرانەوەی نامەکاندا کۆتایی و دەرەنجامی کردەوەکانی خۆی دەزانێت.

حەشر لە دوای هاتنە دەرەوەی خەڵکی لە گۆڕەکانیان ڕوو دەدات، خوای گەورە بەم شێوەیە پێناسەیان دەکات، ﴿ كَأَنَّهُمْ جَرَادٌ مُّنتَشِرٌ ﴾[2] واتە: ئەڵێی کوللەی بە زەویدا بڵاوە لێ کردوون.

سەیری پۆلی کوللە بکەن چۆن دەڕۆن ئایا لە ناختدا ترسێك دروست نابێت.

---

١- الإسراء: ١٣ - ١٤

٢- القمر: ٧

خۆر لەسەری مرۆڤەکان تەواو نزیك دەبێتەوە، ئاسمان دەبێت بەچەند پارچەیەکەوە پاشان وەکو زیوی تواوە دەڕژێت و وەکو گوڵێکی سور دێتە بەرچاو یان وەکو ڕۆنی قرچاوی لێ دێت، هەموو ئەمانە بەبەرچاوی خەڵکیەوە دەبێت، ئەمەش بۆ یەکەمجار دەیانخاتە ترس و تۆقینێکی زۆرەوە.

لەو ڕووداوە ترسناکانەی کە خەڵك لەڕۆژی حەشردا بیری لێ دەکەنەوە دابەزینی فریشتەکانە بۆ سەرزەوی، ئایا دەتوانیت قەبارەی فریشتەکان بێنیتە بەرچاوت لە کاتێکدا بە قەبارەی سروشتی خۆیان دەردەکەون، خەڵکی ئاسمانی یەکەم دادەبەزن و دەوری زەوی مەحشەر دەدەن، پاشان خەڵکی ئاسمانی دووەم دەوری خەڵکی ئاسمانی یەکەم و زەوی مەحشەر دەدەن پاشان خەڵکی سێیەم......هەتا دەگاتە ئاسمانی حەوتەم، هەموویان دەوری زەوی مەحشەر دەدەن.

لەگەڵ هەموو ئەو پاڵنانە قاچەکان دەکەونە سەر یەك و قەرەباڵغییەکە زۆر زیاد دەبێت، ئاژەڵە دڕندەکان دێن لە ترسی خوا سەریان دانەویوەو بەچکەکانیان لەگەڵدا نیە، ئاژەڵی دڕندە وەکو (شێرو گورگ و دەیناصور و فیل و پڵنگ) بەڵام ترس سیمای خەڵکی داگیرکردووە لە ڕۆژی حەشردا.

ئەو ترس و تۆقینە لەبەرئەوەیە کە بەزۆر کۆکراونەتەوە نەك بەڕەزامەندی خۆیان، لەبەرئەوە مانای حەشر واتە کۆکردنەوەی خەڵکی لە شوێنێکدا بەزۆر، سەیری فەرمایشتی پەروەردگار بکە ﴿ فَأَرْسَلَ فِرْعَوْنُ فِي ٱلْمَدَآئِنِ حَٰشِرِينَ ﴾[1] واتە: فیرعەونیش مەئموری سوپا کۆکردنەوەی دەرکرد بۆ شاران بێن بچن بەدوایانا بیانگرنەوە.

---

١- الشعراء: ٥٣

واته: به بێ ئارەزووی خۆیان کۆیان بکەینەوە، ئێمە بە ناچاری دەبێت برۆین بۆ گۆرەپانی مەحشەر. قورئانی پیرۆز وشەی (وحشرناهم ونحشرهم)ی بۆ نەوەکانی ئادەم بەکارهێناوە هەروەها هەمان وشەشی بۆ ئاژەڵ و گیاندارە درندەکان بەکارهێناوە.

﴿ وَإِذَا ٱلْوُحُوشُ حُشِرَتْ ﴾[1]

کەواتە ترس و تۆقین بۆ ئێمەو ئەوانیشە، بیهێنە بەرچاوت کە بەتەنیشت شێرەوە بیت کە بەسەری نەویەوە وەستاوە بیر لەوە ناکاتەوە پەلامارت بدات دەیناسۆرەکان بە تەنیشتتەوە بەسەر شۆڕییەوە وەستاون.

﴿وَخَشَعَتِ ٱلْأَصْوَاتُ لِلرَّحْمَٰنِ فَلَا تَسْمَعُ إِلَّا هَمْسًا ﴿١٠٨﴾ يَوْمَئِذٍ لَّا تَنفَعُ ٱلشَّفَٰعَةُ إِلَّا مَنْ أَذِنَ لَهُ ٱلرَّحْمَٰنُ وَرَضِيَ لَهُۥ قَوْلًا ﴿١٠٩﴾ يَعْلَمُ مَا بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَمَا خَلْفَهُمْ وَلَا يُحِيطُونَ بِهِۦ عِلْمًا ﴿١١٠﴾ وَعَنَتِ ٱلْوُجُوهُ لِلْحَىِّ ٱلْقَيُّومِ ۖ وَقَدْ خَابَ مَنْ حَمَلَ ظُلْمًا ﴾[2]

واتە: لەو ڕۆژەدا ئەم خەڵکە گشت ئەکەونە دوای ئەو بانگەوازکەرەی بە فەرمانی خوا بانگیان ئەکا بۆ مەیدانی حەشرکردنیان و هەموو خاوەن دەنگێ مل کەچ ئەکا لە ترسی خواداو لە دەنگی ژێرلێو بەولاوەت بەرگوێ ناکەوێ. لەو ڕۆژەدا تکاکردنی هیچ کەسێ سوود نابەخشێ تەنها تکاکردنی ئەوانە نەبێ کە خوای میهرەبان خۆی ڕێگای دابن و ڕازی بێ لە قسەکردنیان لە حوزووریا لەبەر پایە و پلەیان لای خوا. خوا ئەوزاع و ئەحواڵی بەرودواو و داهاتووی ئەو خەڵکە ئەزانێ، بەڵام ئەوان ئەوە نازانن کە خوا ئەیزانێ. هەموو چیهرە و ڕوخساری دائەنەوێتەوەو سەر شۆڕو مل کەچ ئەکا بۆ خواوەندی هەمیشە زیندووی جیهان ڕاگر و هەرکەسێ باری تاوانی هەڵگرتبێ نائومێد ئەبێ.

---

١- التكوير: ٥

٢- طه: ١٠٨ - ١١١

هـەموو لایـەك چـاوەڕوانن بـزانن جـارێكی تـر چـی ڕوودەدات، بـاوەڕدار بـە ئـارەزوو ترسـەوە كۆكراوەتـەوەو بـێ بـاوەڕیش بەسەرشـۆڕی و زۆرەوە ملكـەچ كراون هیچ دەنگێك لەكەسـەوە نایـەت تەنانـەت فریشـتەكانیش گوێـت لـە هـیچ نابێت چرپە نەبێت دیارە چرپەش لێمـان ڕوون نابێـت، چـرپە بەڵگەیـە لەسـەر تـرس لـە دەرخسـتنی دەنـگ، لەبەرئـەوەی چـاوەڕوانی شـتێكە نـازانێ چـیە، ئاكامەكەش كەس نازانێ چیە. ﴿وَقَدْ خَابَ مَنْ حَمَلَ ظُلْمًا﴾[1]

سەیركە لە كوێدا باسی ستەمی كردووە!! لـەو هەڵوێسـتە ترسـناكە هـەموو دنیـا تێیـدا ئامادەیـە، لەبەرئـەوە خـوای گـەورە وەك ناسـاندنێكی ڕۆژی دوایـی دەفەرموێت:

﴿لَا ظُلْمَ الْيَوْمَ﴾[2] واتە: ئەمڕۆ هیچ جەورو ستەمێ نییە.

وە لەم هەڵوێستەو لەم ترسەدا شەیطان نەفرەتی خوای لێ بێـت وتارێك دەدات بۆ خەڵكی، ﴿وَمَا كَانَ لِيَ عَلَيْكُم مِّن سُلْطَانٍ إِلَّا أَن دَعَوْتُكُمْ فَاسْتَجَبْتُمْ لِي فَلَا تَلُومُونِي وَلُومُوا أَنفُسَكُم مَّا أَنَا بِمُصْرِخِكُمْ وَمَا أَنتُم بِمُصْرِخِيَّ إِنِّي كَفَرْتُ بِمَا أَشْرَكْتُمُونِ مِن قَبْلُ﴾[3]

واتە: من هیچ زۆرێكم نەبوو بەسەرتانەوە، تەنها ئەوەندە بوو بانگم كردن بۆ ڕێگای چەوت و بەگوێتان كردم. ئێستە سەرزەنشتی من مەكەن. سەرزەنشتی خۆتان بكەن كە بەگوێتان كردم. نە من ئەتوانم ئێوە لـە سزا ڕزگـار بكـەم و نـە ئێوەیش ئەتوانن من ڕزگار بكەن. مـن ئیمـانم بـەوە نیـیە كـە لەمـەوپێش ئێـوە

---

١- طه: ١١١

٢- غافر: ١٧

٣- إبراهيم: ٢٢

منتان کرده هاوبەشی خودا. بەڕاستی ستەمکاران سزای سەختیان هەیە. خۆی لە هەموو شتێك بێ بەری دەکات.

هــەروەها، ﴿كَمَثَلِ ٱلشَّيْطَٰنِ إِذْ قَالَ لِلْإِنسَٰنِ ٱكْفُرْ فَلَمَّا كَفَرَ قَالَ إِنِّى بَرِىٓءٌ مِّنكَ إِنِّىٓ أَخَافُ ٱللَّهَ رَبَّ ٱلْعَٰلَمِينَ فَكَانَ عَٰقِبَتَهُمَآ أَنَّهُمَا فِى ٱلنَّارِ خَٰلِدَيْنِ فِيهَا﴾[1]

واتە: میسالی ئەم دووڕووانە لە هاندانی جوولەکەدا کە بە گژ موسوڵمانانا بچن وەك میسالی شەیتان وایە کە کەوتە بن کلێشەی ئادەمزادو پێی وت: کافر بەو باوەڕت بە خواو پێغەمبەری خوا نەبێ. جا کە کافر بوو حاشای لێ کردو وتی: من بێ بەریم لە تۆ، من لە خوای پەروەردگاری هەموو جیهانەکان ئەترسم. جا سەرەنجامی هەردولایان ئەوەبوو کە هەردوولا لەناو ئاگری دۆزەخدان و هەمیشە تیایا ئەمێننەوەو، ئەمەیش پاداشی ستەمکارانە. ئەگەر لە ئایەتەکان ورد بینەوە بۆمان دەردەکەوێت کە شەیتانی مرۆڤ و شەیتانی پەری یەك شتە ﴿إِذْ تَبَرَّأَ ٱلَّذِينَ ٱتُّبِعُوا۟ مِنَ ٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوا۟ وَرَأَوُا۟ ٱلْعَذَابَ وَتَقَطَّعَتْ بِهِمُ ٱلْأَسْبَابُ ﴿١٦٦﴾ وَقَالَ ٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوا۟ لَوْ أَنَّ لَنَا كَرَّةً فَنَتَبَرَّأَ مِنْهُمْ كَمَا تَبَرَّءُوا۟ مِنَّا كَذَٰلِكَ يُرِيهِمُ ٱللَّهُ أَعْمَٰلَهُمْ حَسَرَٰتٍ عَلَيْهِمْ وَمَا هُم بِخَٰرِجِينَ مِنَ ٱلنَّارِ﴾[2] واتە: ئا لەو کاتەدا کە پەیڕەویکراوەکان لە پەیڕەویکەرەکان تەبەڕا ئەبن و بە هیچ جۆرێ بە کەڵکیان نایەن و، بە چاوی خۆیان سزای توند دەبینن و هیچ جۆرە پێوەندییەك نامێنێ لە نێوان ئەمان و ئەواندا. جا پەیڕەویکەرەکان لە قووڵایی دڵیانەوە ئاوات ئەخوازن و ئەڵێن: خۆزگا جارێکی تر ئەگەڕاینەوە بۆ دنیا تا لێیان تەبەڕا ببین وەك ئەوان ئا لەم تەنگانییەدا لە ئێمە تەبەڕا بوون. بەم جۆرە خودا

---

١- الحشر: ١٦ - ١٧

٢- البقرة: ١٦٦ - ١٦٧

کردەوەکانیان دێنێتەوە بەرچاویان و ئەیانکا بە مایەی خەم و خەفەت بۆیان و لە ئاگری دۆزەخیش دەرناچن.

مانای (وَتَقَطَّعَتۡ بِهِمُ ٱلۡأَسۡبَابُ ) واتە: نە هەڵوەشانەوەی حوکم وە نە شەفاعەت و نە پاڵپشت و نە خزم و دڵسۆز.

ئێوە ئەی ئەو کەسانەی کە شوێن شەیتان کەوتون، وا ئەو خۆیتان لێ بەری دەکات، ئەو پیاوە بەرپرسەی کە بە کرێکارەکەی یاخود کارمەندەکەی دەڵێت فلانە کەس بکوژە یاخود سیخوڕی بکە بەسەر فلانە کەسەوە یاخود بەرتیلێك بدە بەفلان، یاخود فلان زیندانی بکە یاخود فلان سزا بدە، ئەی ئەو کەسەی ئەم کارانە بۆ بەپرسەکەت دەکەیت هیچ سودێکت پێ ناگەیەنێ بەڵکو لەڕۆژی قیامەتدا خۆی بەریی دەکات لێت.

پاشان خەڵکی سەر گۆرەپانی مەحشەر گوێیان لەچەند دەنگێك دەبێت، دەڵێن دەنگی زانایانی ئومەتی محمەدە ﷺ خەڵکی دەچن بۆلایان هەتا شەفەعەتیان بۆ بکەن، دەچن بۆ لای ئادەم و ستایش دەکەن ئەی باوکی ئێمە خوای گەورە تۆی بەدەستی خۆی دروستکردووە لەرۆحی خۆی فووی پێداکردویت و فریشتەکان سوجدەیان بۆ بردوویت، نابینی ئێمە لە چیداین؟ ئەویش دەفەرموێت خوای گەورە ئەمڕۆ بەجۆرێك توڕە بووە کە لە رابردودا هەرگیز بەو جۆرە توڕە نەبووەو لە داهاتوشدا بەو جۆرە توڕە نابێت، فەرمانی پێ کردم لەو درەختە نەخۆم خواردم، بڕۆن بۆلای کەسێکی تر، لێی دەپرسن بۆ لای کێ بڕۆین؟ دەفەرموێت: بۆ لای نوح.

ئەوانیش دەڕۆن بۆلای و دەڵێن: نوح تۆ لە نێو پێغەمبەراندا درێژترین تەمەنت بووە کە تۆ لە (اولي العزم)ی تۆ یەکەم پێغەمبەری لە دوای باوکت بڕۆ شەفاعەتیان بۆ بکە، ئەویش دەفەرموێت دوعام لە گەلەکەم کرد:

﴿ رَّبِّ لَا تَذَرۡ عَلَى ٱلۡأَرۡضِ مِنَ ٱلۡكَٰفِرِينَ دَيَّارًا ﴾[1] واتـه: ئـەی پـەروەردگاری مـن! كـەس لەم كافرانە بەسەر ڕووی زەوییەوە مەهێڵە. بۆیە نوح دەڵێت: خـوای گـەورە هەرگیز وەكو ئەمڕۆ توڕە نەبووە لە داهاتوشدا بەو جۆرە توڕە نابێت، بڕۆن بـۆ لای كەسێكی تـر بـڕۆن بـۆلای حـەزرەتی ئیـبراهیم. ئـەوانیش دەڕۆن بـۆلای حەزرەتی ئیبراهیم و پێی دەڵێن ئەی ئیـبراهیم تـۆ بـاوكی پێغەمبـەرانی بویتـە هاوڕێی الرحمن، ئەویش دەفەرموێت مـن درۆم كـرد: ﴿ فَقَالَ إِنِّي سَقِيمٞ ﴾[2] واتـە: وتی: من نەخۆشم.

(سقیم القلب) واتە دڵی بێبەر، لـەناو گەلەكەیدا ئەوانـەی بـت دەپەرسـتن بـە درۆی زانیوە ! ! بۆیە پێیان دەڵی خوای گەورە بە جۆرێ توڕەیە لەوەو پـێش وا توڕە نەبووە، توڕەش نابێت، بڕۆن بۆ لای موسا ﷺ.

دەڕۆن بۆلای موساو دەڵێن: ئەی ئەو پێغەمبەرەی قسەت لەگەڵ خوادا كـردو تۆ بووی خوای گەورە نیعمەتی خۆیدا بەسەرتدا بەقسەكردن و ناردنی پـەیامی خۆی بۆت، بڕۆ شەفاعەتمان بۆ بكە، ئـەویش دەفـەرموێت: دوعـام لـە گەلەكـەم كرد:

﴿ رَبَّنَا ٱطۡمِسۡ عَلَىٰٓ أَمۡوَٰلِهِمۡ وَٱشۡدُدۡ عَلَىٰ قُلُوبِهِمۡ فَلَا يُؤۡمِنُواْ حَتَّىٰ يَرَوُاْ ٱلۡعَذَابَ ٱلۡأَلِيمَ ﴾[3] واتە: مووسا لە خودا پاڕایـەوە وتـی: خودایـا تـۆ جـوانی و نومـایش و ئەسبابی سەربەرزیی دنیات داوە بە فیرعەون و دەستەو بەستەكەی، ئـەوانیش خەڵك گومراه ئەكەن و لـە ڕێگـای تۆیـان لائـەدەن، خودایـا سـامان و داراییـیـان لەناوبەرە و دڵیان مۆربكە، بۆ ئەوەی ئیمان نەهێنن تا سزای سەخت ئەبینن.

---

١- نوح: ٢٦

٢- الصافات: ٨٩

٣- یونس: ٨٨

پاشان دەفەرموێت خوای گەورە بەجۆرێك تورە بووە هەرگیز لەوەو پێش وا تورە نەبووەو تورەش نابێت، برۆن بۆ لای کەسێکی تر برۆن بۆ لای عیسا.

دەرۆن بۆ لای و دەڵێن ئەی عیسا تۆ رۆحێکی تایبەتی لەلایەن خواوە بەخشراوی، وە بە فەرمانی خوا لە مەریەمدا (بەرجەستە بووی) شەفاعەتمان بۆ بکە، ئەویش دیسانەوە دەڵێت خوای گەورە بە جۆرێك تورە بووە هەرگیز بەو جۆرە تورە نەبووە تورەش نابێت، هیچ گوناهێکی باس نەکرد بەڵام شەفاعەتی بۆ نەکردن یاخود رێگەی پێ نەدرا.

ئەوانە بەرێزترین دروستکراون، هەر یەکێ: دەڵێت بۆم نیە بۆم نیە، دەرۆن بۆ لای پێغەمبەری خوا ئەویش بە میسك دەست نوێژ دەگرێت پاشان لە ژێر عەرشی پەروەردگار سوجدە دەبات هەتا خوای گەورە ستایشی بۆ دەکاتەوەو هەرگیز لەوەوبەر بۆ کەسی نەکردۆتەوە خوای گەورە دەفەرموێت: ئەی محمد سەرت بەرز بکەرەوە داوا بکە هەتا پێت ببەخشرێ، شەفاعەت بکە با لێت وەرگرین.

## ئەوانەی بەبێ لێپرسینەوە دەڕۆنە بەهەشتەوە:

ئەوەی مایەی سەرسوڕمانە راوەستاوی پێغەمبەری خوایە ﷺ لەویش سەیرتر نزای بۆ ئومەتەکەی کردووە خوای گەورە دەفەرموێت: ئەیمحمد ئەوکەسانە ببە کە هیچ لێپرسینەوەیەکی لەسەر نیەو لەم دەرگایە بیکەرە ژوورەوە. ئەوەی کتوپرە ئەوەیە کە بەهەشت لەلای راستیەوەیە.

پێغەمبەر ﷺ ئومەتەکەی چۆن دەناسێتەوە؟ طەلحە یەکێکە لە دە مژدە پێدراوەکەی بەهەشت پرسیار دەکات: ئەی پێغەمبەری خوا هەزاران طەلحە هەیە گوێم لێ بوو فەرموت ئادەمیزاد لەو رۆژەدا بە ناوی خۆی و بەناوی

باوکیەوە بانگ دەکرێت من چۆن بزانم ئەوەی بانگ کراوە منم؟ فەرمووی: ئەی طەلحە کاتێك دەوترێت ئەی طەلحە کوڕی عوبەیدوڵا کەس هەڵناسێ تۆ نەبێ.

ئینجا پێغەمبەر ﷺ ئەو کەسانە لەگەڵ خۆیدا دەبات کە هیچ لێپرسینەوەیەکیان لەسەر نیە، ئەوانیش یەکەمیان ئەبوبەکرە کە هیچ لێپرسینەوەیەکی لەگەڵدا ناکرێت هەروەها شەهیدان و ئەوانەی ئارامگرن، رەضوان (گەنجینەداری بەهەشت) دەڵێت ئێوە لە کوێن ئێوە بۆ لێپرسینەوە نەوەستێنران وە چاوەروانی نامەو کێشانەی کردەوەکانتان نەکرد! ! ئەوانیش دەڵێن: ئەی رەضوان ئەوە فەرمایشتی پەروەردگارت نەخوێندۆتەوە کە دەفەرمویت: ﴿إِنَّمَا يُوَفَّى الصَّابِرُونَ أَجْرَهُم بِغَيْرِ حِسَابٍ﴾[1] واتە: کەسێکیش بەسەبر بێ‌و تەحەمولی مەینەتی فەرمانبەرداریی خوا بکاو لەپێناوی فەرمان بەرداریی خوای خۆیا نیشتمانی خۆی بەجێ بهێڵێ، پاداشێکی وای ئەدرێتەوە ژمارەی ژمێریار پیایا ناگاتەوە.

ئەویش دەفەرموێت: ئارامگرتنتان چۆن بوو؟ وتیان: ئەگەر خراپەمان بەرامبەر بکرایە هێمن دەبووین و ئاراممان دەگرت، ئەگەر بەرامبەرمان نەفامییان بکردایە ئاراممان دەگرت، ئەگەر پێمان ببەخشرایە سوپاس گوزار دەبووین، ئەگەر ئازار بدرایانیە داوای لێخۆش بوونمان دەکرد، فەرمووی دەی برۆنە بەهەشتەوە، ئیتر لەوەودوا ترستان لەسەر نابێت و بۆ هیچ شوێنێك خەمبار نابن لەوانە بێوەژنێك کە مێردەکەی چەند منداڵێکی بەسەردا جێ دەهێڵێت، ئەویش دەژی بۆ ئەوەی پەروەردەیان بکات، ئەو کەسە پێشبڕکێ لەگەڵ پێغەمبەردا دەکات بۆ چوونە ناو بەهەشت.

---

١- الزمر: ١٠

## ئاشکرا کردنی نامەی کردەوەکان:

دوای ئەوەی لێپرسینەوە دەست پێ دەکات هەروەها نامەی کردەوەکان ئاشکرا دەکرێن و دەکرێنەوە ئەوە دیمەنی یەکەمی حەشرە، هەموو یەکێك کردەوەکانی لەشێوەی کتێبێکدا بۆ دێت هیچ هەڵەیەکی تێدا نیە، هەموو کەسێك کردەوەکانی خۆی تێدا دەبینێت و کردەوەکانی کەسی تری تێدا نیە، خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿ وَأَن لَّيْسَ لِلْإِنسَٰنِ إِلَّا مَا سَعَىٰ ﴿٣٩﴾ وَأَنَّ سَعْيَهُۥ سَوْفَ يُرَىٰ ﴿٤٠﴾ ثُمَّ يُجْزَىٰهُ ٱلْجَزَآءَ ٱلْأَوْفَىٰ ﴾[1] واتە: کەسیش هیچی دەسگیر نابێ بەرهەمی کردەوەی خۆی نەبێ و، سەعی و تێکۆشانیشی لە ڕۆژی خۆیا کە ڕۆژی قیامەتە ئەبینرێ وپاشانیش جەزای پڕبەپێستی خۆیی بەرانبەر بە کردەوەکانی ئەدرێتەوە.

ئەوە وەکو ئەو قوتابییە وایە کە شەهادە بەدەست دێنێت کۆی گشتی نمرەکانی و دەفتەری وەڵامی پرسیارەکانی تێدایە کە لەژێر عەرشی پەروەردگاردایە.

هەر یەکێك لە ئێمە دۆسیەیەکی نوسراوی هەیە هەتا ئەوکاتەی فریشتەی مەرگ گیانی دەباتەوە لە ڕۆژی حەشردا زیندوو دەکرێتەوەو جارێکی تر نیشان دەدرێتەوە.

﴿ وَإِذَا ٱلصُّحُفُ نُشِرَتْ ﴾[2] واتە: کە نامەی ڕەفتاری هەرکەسێ بڵاوکرایەوە بۆ لێپرسینەوە. کاتێ دەڵێت (الصحف) مەبەستی لەپەڕەی کردەوەکانە.

بۆیە خوای گەورە دەفەرموێت:

---

١- النجم: ٣٩ - ٤١

٢- التکویر: ١٠

﴿ وَٱضۡرِبۡ لَهُم مَّثَلَ ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا كَمَآءٍ أَنزَلۡنَٰهُ مِنَ ٱلسَّمَآءِ فَٱخۡتَلَطَ بِهِۦ نَبَاتُ ٱلۡأَرۡضِ فَأَصۡبَحَ هَشِيمٗا تَذۡرُوهُ ٱلرِّيَٰحُۗ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ مُّقۡتَدِرًا ﴿٤٥﴾ ٱلۡمَالُ وَٱلۡبَنُونَ زِينَةُ ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَاۖ وَٱلۡبَٰقِيَٰتُ ٱلصَّٰلِحَٰتُ خَيۡرٌ عِندَ رَبِّكَ ثَوَابٗا وَخَيۡرٌ أَمَلٗا ﴿٤٦﴾ وَيَوۡمَ نُسَيِّرُ ٱلۡجِبَالَ وَتَرَى ٱلۡأَرۡضَ بَارِزَةٗ وَحَشَرۡنَٰهُمۡ فَلَمۡ نُغَادِرۡ مِنۡهُمۡ أَحَدٗا ﴿٤٧﴾ وَعُرِضُواْ عَلَىٰ رَبِّكَ صَفّٗا لَّقَدۡ جِئۡتُمُونَا كَمَا خَلَقۡنَٰكُمۡ أَوَّلَ مَرَّةِۭۚ بَلۡ زَعَمۡتُمۡ أَلَّن نَّجۡعَلَ لَكُم مَّوۡعِدٗا ﴿٤٨﴾ وَوُضِعَ ٱلۡكِتَٰبُ فَتَرَى ٱلۡمُجۡرِمِينَ مُشۡفِقِينَ مِمَّا فِيهِ وَيَقُولُونَ يَٰوَيۡلَتَنَا مَالِ هَٰذَا ٱلۡكِتَٰبِ لَا يُغَادِرُ صَغِيرَةٗ وَلَا كَبِيرَةً إِلَّآ أَحۡصَىٰهَاۚ وَوَجَدُواْ مَا عَمِلُواْ حَاضِرٗاۗ وَلَا يَظۡلِمُ رَبُّكَ أَحَدٗا ﴾[1] واته: ئەی پێغەمبەر! بۆ جوانی و ڕەونەقی ژیانی دنیاو زوولاچوونی، نموونە بهێنەرەوە بۆ خەڵك بەو ئاوەی لە ئاسمانەوە ئەینێرین و، بەهۆی ئەو ئاوەوە دنیا پڕ ئەبێ لە گیاو سەوزیی جۆراوجۆرو ئەچن بەیەکدا، کەچی زۆری پێناچێ وشك ئەبێتەوەو ئەبێتە پووش و پەڵاشی وردو خاش و با ئەیباو شوێنەواری نامێنێ. خودای گەورە توانایەو دەستەڵاتی بەسەر هەموو شتێکدا ئەڕوات. * ماڵ و سامان و ئەولاد جوانیی ژیانی دنیان و زوو لەناوئەچن. بەڵام کردەوە چاکەکان، کە بەرهەمیان هەتا هەتایە ئەمێنێ، لای خودا چاکترن بۆ بنیادەم لە لایەنی پاداشەوەو، چاکترین شتێکن هیوایان پێ ببەسترێ. * باسی ئەو ڕۆژە بکە کە کێوەکان ئەخەینە جموجووڵ و لە بن هەڵیانئەکەنین و ئەیانڕەوێنین و، لەو کاتەدا تەختی زەوی بەئاشکرا ئەبینی، چونکە هیچی لەسەر نابێ‌و، خەڵك هەموو کۆئەکەینەوەو کەسیان بەجێ ناهێڵین. * هەموو ئەمانە لە بەردەم خودادا ئەنوێنرێن تا فەرمانی خۆی بدات دەربارەیان. جا خودا ئەفەرموێ: ئەوا ئێوە بەڕاستی هاتن بۆ لامان وەك چۆن یەکەم جار بە ڕووتوقووتی و بێ ماڵ و منداڵ

---

١- الكهف: ٤٥ - ٤٩

دروستمان كردن. ئێوه وەختی خۆی لە دنیادا ئەتانوت: گوایه ئێمه كاتی زیندووكردنەوەمان بۆ دیاری نەكردوون و، لاتان وابوو پێغەمبەران درۆیان لەگەڵ ئەكردن. * لەو ڕۆژەدا نامەی كردەوە دائەنرێ، جا ئەبینی تاوانبارەكان، زۆر لەوە ئەترسن كە لە ناو ئەو نامانەدا نووسراوەو ئەڵێن: ئەی هاوار ماڵوێران خۆمان! ئەم نامەیە نە كاری گەورەو نە كاری بچووك هیچی بەجێ نەهێشتووەو هەمووی نووسیوەو دیاریی كردووە؟ چییان كردووە لە دنیادا لەو كاتەدا هەمووی ئەبینن و بە تەواوی بۆیان دەرئەكەوێ كە پەروەردگاری تۆ ستەم لە كەس ناكات و بە خۆڕایی سزای كەس نادات.

هەروەها دەفەرموێت: ﴿ ٱقۡرَأۡ كِتَٰبَكَ كَفَىٰ بِنَفۡسِكَ ٱلۡيَوۡمَ عَلَيۡكَ حَسِيبٗا ﴾[1] واتە: لەلایەن فریشتەی مەئموورەوە پێی ئەوترێ: كتێبی كردەوەكانی خۆت بخوێنەرەوەو بزانە چیت كردووە؟ ئەمڕۆ خۆت بەسیت بۆ لێپرسینەوەی خۆت، واتە پێویست ناكات كەس شایەتیت لێ بدات.

سورەتی الاسراء بەمە دەست پێ دەكات كە ئەم مانایە دەدات بەدەستەوە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ إِنَّ هَٰذَا ٱلۡقُرۡءَانَ يَهۡدِي لِلَّتِي هِيَ أَقۡوَمُ وَيُبَشِّرُ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ٱلَّذِينَ يَعۡمَلُونَ ٱلصَّٰلِحَٰتِ أَنَّ لَهُمۡ أَجۡرٗا كَبِيرٗا ٩ وَأَنَّ ٱلَّذِينَ لَا يُؤۡمِنُونَ بِٱلۡأٓخِرَةِ أَعۡتَدۡنَا لَهُمۡ عَذَابًا أَلِيمٗا ﴾[2] واتە: بەڕاستی ئەم قورئانە شارەزایی خەڵك ئەكات بۆ ڕاسترین ڕێگا كە ئایینی ئیسلامە. هەروەها مژدە ئەدات بەو خاوەن ئیمانانەی كردەوەی چاك ئەكەن بەوەی كە پاداشتێكی گەورەیان هەیە. ئەوانەیش كە ئیمان و باوەڕیان بە ڕۆژی قیامەت نییە، سزایێكی پڕ ئازارمان بۆ ئامادە كردوون.

---

١- الإسراء: ١٤

٢- الإسراء: ٩ - ١٠

﴿ وَكُلَّ إِنسَٰنٍ أَلْزَمْنَٰهُ طَٰٓئِرَهُۥ فِى عُنُقِهِۦ... ﴾[1] واتـــه: هــــه‌موو بنیـــاده‌مێ کرده‌وه‌ی خۆیمان کردووه‌ته گه‌ردنی....

مه‌به‌ست له‌وه‌یه ئه‌وه‌ی رزگاربوونی ده‌وێ با بڕوات بۆ لای قورئان.

په‌ڕه‌و نامه‌ی کرده‌وه‌کان وه‌کو کۆتر داده‌بارێ به‌سه‌ر ملیاره‌ها مرۆڤدا، پاشان داده‌به‌زێته خواره‌وه هه‌تا ده‌لکێت به گه‌روته‌وه بێ ئه‌وه‌ی بزانی ئایا ده‌ستی راستت ده‌یبات یان ده‌ستی چه‌پ، له‌به‌ر ئه‌وه ئاده‌میزاد هیچ ده‌سه‌ڵاتێکی نابێ به‌سه‌ر ده‌سته‌کانیدا.

## ده‌رکه‌وتنی دۆزه‌خ و سه‌ره‌تای لێپرسینه‌وه:

هه‌موو یه‌کێك چاوه‌ڕێیه بانگ بکرێت ئاگر دێت سێ هه‌ناسه ده‌دات، یه‌که‌م هه‌ناسه‌ی: ئه‌وه‌ی له گۆره‌پانی مه‌حشه‌ردایه ده‌تۆقێت و له‌به‌رده‌میه‌وه راده‌که‌ن:

﴿ وَجِاْيٓءَ يَوْمَئِذٍۭ بِجَهَنَّمَ ﴾[2] واته: ئه‌و ڕۆژه دۆزه‌خیش ئه‌هێنرێته به‌رچاوی خه‌ڵك.

پرسیار له پێغه‌مبه‌ر ﷺ کرا ئه‌ی پێغه‌مبه‌ری خوا چۆن دێت؟ فه‌رمووی : (٧٠) هه‌زار جڵه‌وی هه‌یه هه‌ر جڵه‌وه‌و (٧٠) هه‌زار فریشته هه‌یه رایده‌کێشن، ده‌فیشکێنێ وه‌کو فیشکه‌ی مار گه‌روی درێژی لێوه دێته‌ده‌ر کافر هه‌ڵده‌لوشێت وه‌ك چۆن باڵنده قوت ده‌دات، پاشان هه‌ناسه‌ی دووه‌م: هه‌رچی ئومه‌ت له‌وێدان ده‌سته‌و ئه‌ژنۆ دانیشتون؛ خه‌ڵکی له ترساندا له‌سه‌ر ده‌م و چاویان ده‌که‌ون به‌سه‌ر یه‌کدا، پاشان هه‌موو یه‌کێك له‌سه‌ر ئه‌ژنۆی داده‌نیشێت، پاشان هه‌ناسه‌ی سێیه‌م ده‌دات هه‌موو یه‌کێك به‌سه‌ر ده‌م و چاویدا ده‌دا به‌زه‌ویداو به

---

١- الإسراء: ١٣

٢- الفجر: ٢٣

تیلەی چاوی تەماشای دەکات (بزانێت ڕۆیشتووە یان نا)، ﴿إِنَّهَا تَرْمِي بِشَرَرٍ كَالْقَصْرِ﴾[1] واتە: ئاگری دۆزەخ پزیسکی وا فڕێئەدا ئەوەندەی کۆشکێ ئەبێ.

وتیان یا رسول الله چۆن فەرموویەتی وەکو شاران و قەڵاکان.

ئەگەر یەك پریشکی ئاگری دۆزەخ بکەوتایە بەسەر دنیادا ئەوەی تیایەتی دەیسوتاند، لەو سێ هەناسەیەدا منداڵەکانی کە کاریان بۆ کردووە هەڵیدەگرنەوە: ئەوانەی کە لەدنیادا بەکینەو ئیرەیی بردن ئاگریان بەردایە دنیا، ئەوانە دەبەین خەڵکییان لە دنیادا سەرشۆڕ کردووەو بەزۆر شەرەفیان ئەتك کردون و دەیانکوشتن و ستەمیان لێ دەکردن.

پرسیاریان لە پێغەمبەر ﷺ کرد چۆن خوای گەورە لێپرسینەوە لەو ژمارە بێ شومارە دەکات؟ فەرمووی وەك چۆن بەو زۆریەیان ڕۆزیان پێ دەدات.

پاشان لێ پرسینەوە دەست پێ دەکات، یەکەم کەس لێی دەپرسرێتەوە لە پێغەمبەرانە لەدوای بەرزبوونەوەی نامەی کردەوەکانی حەزرەتی نوح، بانگ دەکرێت ئەی نوح، دەڵێت بەڵێ خوایە: بانگەوازی گەلەکەت کرد؟ (خوای گەورە زاناترە بەو پرسیارە بەڵام دەیەوێت بیکاتە بەڵگەیەك بەسەریەوە)، حەزرەتی نوح دەفەرموێت: بەڵێ خوایە، ئەی گەلی نوح ئایا نوح بانگی کردن؟ دەڵێن: نەخێر خوایە!! سەیری ئەو ستەمە زۆرە بکە لە دنیاو دواڕۆژیشدا بە درۆیان خستەوە، سوێند دەخۆن کە هیچی پێ ڕانەگەیاندوون، خوای گەورە بە نوح دەفەرموێت: ئایا کەس هەیە شایەتیت بۆ بدات، دەفەرموێت: محەمەدو ئومەتەکەی: ﴿وَكَذَٰلِكَ جَعَلْنَاكُمْ أُمَّةً وَسَطًا لِّتَكُونُوا شُهَدَاءَ عَلَى النَّاسِ وَيَكُونَ الرَّسُولُ عَلَيْكُمْ شَهِيدًا﴾[2] واتە: ئەی موسوڵمانینە! هەروەك هیدایەتمان دان بۆ ڕێگای ڕاست وەهایش کردمانن بە ئوممەتێکی میانەڕەوی چاك کرداری

---

١- المرسلات: ٣٢

٢- البقرة: ١٤٣

دادپەروەر، کە بە وردبوونەوە لە قورئان و تێفکرین لە بەڵگە ئاشکراکانی خودا بزانن خودای گەورە زوڵمی لە ئوممەتە پێشووەکان نەکردووەو بەخیل نەبووە لەگەڵیانا، بەڵکو پێغەمبەرانی ناردووەتە سەریان و ڕێی پیشان داون، بەڵام ئەو ئوممەتانە خۆیان دوای ئارەزووی نەفس کەوتبوون و گوێیان نەدابووە قسەی پێغەمبەرەکانیان. بەڵێ ئێوەی کردووەتە ئوممەتێکی ئاوەهایی تا لە ڕۆژی قیامەتدا ببنە شایەت لەسەر ئەو ئوممەتانەو پێغەمبەریش واتە موحەممەد(د.خ) لەوێدا ببێتە شایەت لەسەر ڕاستیی شایەتییەکەتان. ئەوەش گەورەیی ئیسلامەو ئەوەش پلەو پایەو گەورەیی پێغەمبەرمان محەمەدو ئومەتەکەیەتی.

خوای گەورە پرسیار لە محەمەدﷺ دەکات: ئەی محەمەد ئایا نوح بانگەوازی گەلەکەی کرد؟ پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت: بەڵێ خوایە. خوای گەورە پرسیار لەئومەتی محەمەد دەکات: ئەی ئومەتی محەمەد نوح بانگەوازی گەلەکەی کرد؟ دەڵێن: بەڵێ خوایە، ئومەتی نوح دەڵێت چۆن شایەتیمان لەسەر دەدەن کە ئێمەتان نەبینیوە؟!!! ئومەتی محەمەد دەڵێت: خوایە قورئانەکەی تۆمان خوێندەوە، وە زانیومانە ئەوەی تیای نوسراوە ڕاستیەو نوح پەیامی تۆی بەگەلەکەی گەیاندووە، ئەوان درۆ دەکەن، خوای گەورە دەفەرموێت: محەمەد ڕاست دەکات، نوح ڕاست دەکات، ئومەتی محەمەدیش ڕاستیان وت.

بەو شێوەیەك هەموو پێغەمبەرێك لەگەڵ ئومەتەکەیدا دەبێت هەتا دەگاتە حەزرەتی عیساعليه السلام، خوای گەورە دەفەرموێت: تۆ وتوتە من و دایکم بکەنە خوای خۆتان لەجیاتی خوا؟ ئەمە پرسیاری نکۆڵی کردنە، لەبەرئەوە وەڵامەکەی بەم شێوەیە هات: پاکی و بێگەردی بۆ تۆ (واتە بەپاکی ڕات دەگرم لە هەر کەم و کورییەك بە هەموو سیفەتێکی کەماڵ و تەواوی وەصفت دەکەم) خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿ وَإِذْ قَالَ ٱللَّهُ يَٰعِيسَى ٱبْنَ مَرْيَمَ ءَأَنتَ قُلْتَ لِلنَّاسِ ٱتَّخِذُونِى وَأُمِّىَ إِلَٰهَيْنِ مِن دُونِ ٱللَّهِ ۖ قَالَ سُبْحَٰنَكَ مَا يَكُونُ لِىٓ أَنْ أَقُولَ مَا لَيْسَ لِى بِحَقٍّ ۚ إِن كُنتُ قُلْتُهُۥ فَقَدْ عَلِمْتَهُۥ ۚ تَعْلَمُ مَا

﴿فِي نَفْسِي وَلَآ أَعْلَمُ مَا فِي نَفْسِكَ ۚ إِنَّكَ أَنتَ عَلَّٰمُ ٱلْغُيُوبِ ﴿١١٦﴾ مَا قُلْتُ لَهُمْ إِلَّا مَآ أَمَرْتَنِي بِهِۦٓ أَنِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ رَبِّي وَرَبَّكُمْ ۚ وَكُنتُ عَلَيْهِمْ شَهِيدًا مَّا دُمْتُ فِيهِمْ ۖ فَلَمَّا تَوَفَّيْتَنِي كُنتَ أَنتَ ٱلرَّقِيبَ عَلَيْهِمْ ۚ وَأَنتَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ شَهِيدٌ ﴿١١٧﴾ إِن تُعَذِّبْهُمْ فَإِنَّهُمْ عِبَادُكَ ۖ وَإِن تَغْفِرْ لَهُمْ فَإِنَّكَ أَنتَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ﴾[1] واتە: ئەی موحەممەد! باسی ئەوەیان بۆ بکە کە چۆن خودا لە ڕۆژی قیامەتدا بە ئاگاداریی خەڵك و لە بەردەمیاندا لە عیسای کوڕی مەریەم ئەپرسێو ئەڵێ: ئەوە تۆ بەو خەڵکەت وتووە: لە خوا بەولاوە من و دایکیشم بپەرستن و بە خودامان حیساب بکەن؟ عیسایش لە وەڵامدا ئەڵێت: پاکی و بێعەیبی هەر بۆ تۆیە، بۆ من ڕەوا نییەو حەقی ئەوەم نییە شتی پووچ و ناڕەوا بڵێم. ئەگەر وتبێتم ئەوا تۆ پێت زانیوە. ئەوەی لە دەروونی مندایە تۆ پێی ئەزانی بەڵام من نازانم چی لای تۆیە. هەر تۆی زاناو ئاگادار لە هەموو کارێکی پەنهان و شتێکی نادیار.* هیچم پێ نەوتوون ئەوە نەبێ کە خۆت ئەمرت پێکردووم پێیان بڵێم، پێم وتوون: تەنها خودا بپەرستن، ئەو خودایەی کە پەروەرگاری منیش و ئێوەیشە. تا لە ناویاندا بووم ئاگام لێیان بوو. کاتێ کە بردمتەوە بۆ خۆت و لە ناویاندا نەمام تۆ خۆت ئاگات لێیان بووەو بەسەریانەوە بووی. تۆ لە هەموو شت و هەموو کارێ ئاگاداریو هیچت لێ ون نابێ. * ئەگەر عەزابیان ئەدەی ئەوا بەندەی خۆتن و ئەتوانی بە ئارەزووی خۆت لەگەڵیان بجوولێیتەوەو سزایان بدەیت. موڵکی خۆتن و کەس حەقی ڕەخنەی نییە. ئەگەر لە گوناهیشیان خۆش بیو چاوپۆشییان لێ بکەیت کەس ناتوانێ بڵێ: نەیتوانی سزایان بدات، بۆیە بەخشینی! تۆ زۆر بەهێزی و دەستت بەسەر هەموو شتێکدا ئەڕوات. ئەتوانی ببەخشیو ئەتوانی سزا بدەیت. کارەکانیشت پڕ لە حیکمەتن.

---

١- المائدة: ١١٦ — ١١٨

فەرمویەتی العزیز الحکیم نەك الغفور الرحیم، لەبەرئەوەی شایستەی بەزەیی نین: ﴿قَالَ ٱللَّهُ هَٰذَا يَوۡمُ يَنفَعُ ٱلصَّٰدِقِينَ صِدۡقُهُمۡ﴾[1] واتە: جا خودا ئەفەرموێ: ئەمە ئەو ڕۆژەیە کە ڕاستگۆیان ڕاستییەکەیان فریایان ئەکەوێت.

کاتێ حەسەنی بەصری ئەم ئایەتەی خوێندەوە لەهۆش خۆی چوو ڕاستەوخۆ لەسەر ڕاستگۆیەکەی پرسیاری لێ دەکرێت ئەی داخۆ ئێمە چۆن بین لەڕۆژی قیامەتدا، دادوەر دێنن، ئەوەندە لێپرسینەوەی لەگەڵدا دەکرێت هەتا وای لێ دێت ئاوات دەخوازێت دادوەریی لە نێوان دوو دەنکە خورمادا نەکردایە، خەڵکی لە دنیادا هەڵپەو کێبڕکێ لەسەر کورسی و پلەو پایە دەکەن بێ ئەوەی بزانن بەرپرسیار دەبن لەسەری.

پاشان دێنە سەر ئومەتی ئیسلام پاشان خوای گەورە فەرمان دەکات بە دانانی تەرازوو لەگەڵ ئومەتی محەمەددا ﷺ هیچ ئومەتێك بە ئەندازەی ئومەتی محەمەد ﷺ لێپرسینەوەی لەگەڵدا ناکرێت: ﴿وَنَضَعُ ٱلۡمَوَٰزِينَ ٱلۡقِسۡطَ لِيَوۡمِ ٱلۡقِيَٰمَةِ﴾[2] واتە: ئێمە ترازووی سەرنەکردوو دائەنێین لە ڕۆژی قیامەتا بۆ کێشانەی چاکەو خراپەی خەڵك، واتە دادپەروەری ﴿فَلَا تُظۡلَمُ نَفۡسٞ شَيۡـٔٗاۖ وَإِن كَانَ مِثۡقَالَ حَبَّةٖ مِّنۡ خَرۡدَلٍ أَتَيۡنَا بِهَاۗ وَكَفَىٰ بِنَا حَٰسِبِينَ﴾[3] واتە: ئیتر هیچ کەسێ ستەمی لێ ناکرێو هەقی خۆی ئەدرێتێ، ئەگەر کەسێکیش دانە خەردارەیێ چاکە یا خراپەی هەبێ ئەیهێنینە مەیدانی حیسابەوەو بۆیی حیساب ئەکەین و ئێمە بەسین بۆ حیساب کردنی چاکەو خراپەی بەندە.

ئادەمیزاد تەرازووەکەی خۆی بە چاوی خۆی دەبینێ، وتراوە کە حەزرەتی جبرەئیل کێشانەی کردەوەی خەڵکی دەکات چەند دادوەرێکی لەگەڵدایە

---

١- المائدة: ١١٩
٢- الأنبیاء: ٤٧
٣- الأنبیاء: ٤٧

تەرازووی کردەوەکان لەگۆرەپانی مەحشەردا دادەنرێت ئەو خەڵکە گۆرەپانی مەحشەر بەجێ ناهێڵێت، هەتا یان بەرەو بەهەشت دەبرێت یان خوا پەنامان بدات بەرەو دۆزەخ دەبرێت.

هەر لەئادەمەوە هەتا دواهەمین کەس کە لەسەر زەوی ژیاوە دانە دانە مرۆڤەکان بانگ دەکرێت ئەمڕۆ بە ئەندازەی (٥٠) هەزار ساڵە، بانگ دەکرێت فلانی کوڕی فلان، فریشتە بانگ دەکرێت ئەمە فلانی کوڕی فلانە، هەر کەسێ لەلایەن ئەمەوە ستەمێکی لێ کراوە بابێت، لێرەدا ستەمکار حەقەکەی لێ دەسەندرێتەوە ئەگەر لەسەر ئۆقیانوسیش بێت، ئەگەر بزنێکی شاخدار ستەمی لە بێ شاخێ کردبێ ستەمەکەی بۆ وەردەگیرێتەوە.

بەڵام لێ خۆشبوونی خوایی بۆ ئەو کەسەی خێری پێش خۆی خستووە.

## لەمەودوا ئەم دۆسیانە پڕ بکەرەوە:

پاشان هەر بەندەیەک (٩٩) دۆسییەی بۆ دەردەهێنرێت، هەر دۆسیەیەک بەئەندازەی بینای چاو درێژە، لەو ڕۆژەشدا چاو زۆر تیژ دەبێت تەمەن هەموو جوڵە بە جوڵە تۆمارکراوە، بە ڕۆیشتن و هاتن و بەپێوەو بە نوستویی، خوای گەورە بەو بەندەیە دەفەرموێت سەیری دۆسیەکانی خۆت بکەو ماوەی دەداتێ سەیری بکات پاشان دەڵێت خوایە تۆ ستەم ناکەیت لە بەندەکانت، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ اقْرَأْ كِتَابَكَ كَفَىٰ بِنَفْسِكَ الْيَوْمَ عَلَيْكَ حَسِيبًا ﴾[1] پەڕەپەڕە دۆسیەکەی دەخوێنێتەوە وە نکوڵی لە هیچ ناکات. خوای گەورە بانگ دەکات ئەی بەندەکەم سەیرت کرد؟ پاشان سێ پرسیاری لێ دەکات: ئایا نوسەری کردەوەکان هیچ ستەمێکیان لێ کردویت؟ ئەویش دەڵێت: نەخێر خوایە، پاشان لێی دەپرسێت ئایا چاکەت هەبووە نەیان نوسیبێت؟ دەڵێت: نەخێر خوایە،

---

١- الإسراء: ١٤

پاشـان لێـی دەپرسـێت ئایـا بیانویـەکت هەیـە هـەتا بـۆ ئێمـەی بهێنیتـەوە؟ پرسـیاریان لەپێغەمبـەری خـوا کـرد ﷺ ئایـا خـوای گـەورە بیانووەکانمـان لێ وەردەگرێـت؟ ئـەویش فـەرمووی: کـەس بەئەنـدازەی خـوای گـەورە بیـانوی بەندەکانی وەرناگرێ!

بەڵێ ئێمـە فریـو درابـووین، بـەڵام تـۆ خۆتـت فریـودا: ﴿يُخَٰدِعُونَ ٱللَّهَ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَمَا يَخْدَعُونَ إِلَّآ أَنفُسَهُمْ وَمَا يَشْعُرُونَ﴾[1] واتـە: ئەوانـە فێـڵ ئەکـەن لەگـەڵ خوداو لەگەڵ خـاوەن ئیمانەکانـدا، بـەڵام لـە ڕاسـتیدا فێڵەکـەیان هـەر بـۆ سـەر خۆیان ئەگەڕێتەوەو نافامن.

بە چی بیانوو دێنیتەوە، ئایا کاتمان نەبوو بۆ ئەنجامدانی نوێژەکانمان کە پێـنج نوێـژەو بەسـەر (٢٤) سـەعاتدا دابەشـکراوە، ئەگـەر سـەرت قاڵـەو سەفەرداریت نوێژەکانت کۆبکەرەوە. تـۆ بەشـە میراتـی براکـەت و خوشـکەکەت دەخۆیت (ئەوەی بەشە میراتی براکەی بخوات خوای گەورە بەشـە میراتـی ئـەو دەخوات لەبەهەشتدا) ئەی تۆ بۆ فلانت کوشت، دەڵێ تورەی کردم و ورووژاندمی بەڵام خوا هۆشیاری پێ دایت لەسەر سزای کوشتن و دەرەنجامەکەی.

﴿وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ أَن يَقْتُلَ مُؤْمِنًا إِلَّا خَطَـًٔا﴾[2] واتـە: بـۆ هـیچ خـاوەن ئیمانێ ڕەوا نییە موسوڵمانێ بکوژێ، بە هەڵەو لەدەس دەرچوون نەبێ.

کەواتـە تـۆ بۆخـۆت هەڵیدەبـژێری: ﴿قَدْ أَفْلَحَ مَن زَكَّىٰهَا ﴿٩﴾ وَقَدْ خَابَ مَن دَسَّىٰهَا﴾[3] واتە: سوێند بە هەموو ئەوانە، ئەو کەسەی نەفسی خۆی پاك کاتەوە

---

١- البقرة: ٩

٢- النساء: ٩٢

٣- الشمس: ٩ - ١٠

له سیفاتی خراپ و ناشیرین ڕزگاری ئەبێو! ئەوەی پەردەی نەفامیو نەزانیو بێشەرمیی بدا بەسەرا نائومێدو بێبەش ئەبێ.

دوای ئەوە ماف خۆرەکان کۆدەبنەوە، ئەگەر ئەو کەسە چاکەکانی بەئەندازەی کێوێك بێت کەسی ماف خوراو دێت و لەچاکەکانی دەبات ئەو دێت بەشی خۆی دەبات هەتا چاکەکانی نامێنێ، پاشان ماف خۆر لە خراپەکانی ئەوان دەدرێت بەسەریدا پاشان نامەی کردەوەکانی دەدرێت بەدەستی چەپیەوە، جبرەئیل بانگ دەکات فلانە کەس بەجۆرێ بەدبەخت بوو ئیتر هەرگیز بەختەوەری بەخۆیەوە نابینێ ئەو بەندەیەش دەڵێت:

﴿يَٰلَيۡتَنِي لَمۡ أُوتَ كِتَٰبِيَهۡ ﴿٢٥﴾ وَلَمۡ أَدۡرِ مَا حِسَابِيَهۡ ﴿٢٦﴾ يَٰلَيۡتَهَا كَانَتِ ٱلۡقَاضِيَةَ﴾[1] واتە: خۆزگە کتێبی کارنامەکەم نەدرایەتە دەستم. نەیشمزانییایە حیساب و کیتابم چییەو چۆنە. خۆزگە ئەو مردنە کە مردم مردنێ بووایە وای بمراندمایە هەرگیزاو هەرگیز زیندوو نەبوومایەتەوە. خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿خُذُوهُ فَغُلُّوهُ ﴿٣٠﴾ ثُمَّ ٱلۡجَحِيمَ صَلُّوهُ ﴿٣١﴾ ثُمَّ فِي سِلۡسِلَةٖ ذَرۡعُهَا سَبۡعُونَ ذِرَاعٗا فَٱسۡلُكُوهُ﴾[2]

واتە: خوا بە دۆزەخەوانەکان ئەفەرموێ: بیگرن و کۆت و زنجیری کەن. پاشان بیخەنە ئاگرە سەختەکەی دۆزەخەوەو مەیخەنە شوێنێکی تر. ئەنجا بیپێچن بە زنجیرێکی حەفتا گەزییەوە.

پاشان بەندەی تر دەبینیت تەرازووەکەی قورسەو ماف خوراوی کەمە چونکە زۆر تەوبەی کردووە، گەڕاوەتەوە بۆلای خواو لەپێناوی خوادا تێکۆشاوە، یاخود هەڵگری غەمی ئیسلامەو دەستی خەڵکی بەرەو خێر بردووە بەمەش نامەی کردەوەکانی دەدرێتە دەستی ڕاستی و دەڵێت:

---

١- الحاقة: ٢٥ - ٢٧

٢- الحاقة: ٣٠ - ٣٢

﴿ هَآؤُمُ ٱقۡرَءُواْ كِتَٰبِيَهۡ ۝١٩ إِنِّي ظَنَنتُ أَنِّي مُلَٰقٍ حِسَابِيَهۡ ۝٢٠ فَهُوَ فِي عِيشَةٖ رَّاضِيَةٖ ۝٢١ فِي جَنَّةٍ عَالِيَةٖ ۝٢٢ قُطُوفُهَا دَانِيَةٞ ﴾[1] واته: فەرموون کارنامەکەم بخوێننەوە. من ئەمزانی بە حیساب و کیتابی خۆم ئەگەم و، سوپاس بۆ خوا وا پێیگەیشتم. ئەوکەسە لە ژیانێکی وادایە مرۆ ڕەزامەندە لێی. لە بەهەشتێکی بەرزو بڵنددایە. بەری درەختەکانی لە دەستی مرۆوە نزیکەو بە ئاسانی بۆی لێ ئەکرێتەوە. ئینجا فریشتەیەك دێت و دەیباتە بەهەشت، خۆی زۆر لەماڵەکەی دنیای شارەزاترە بەماڵە نوێیەکەی بەهەشت.



١- الحاقة: ١٩ - ٢٣

# پردی سیراط

## چوارکەس دەبنە شایەت بەسەر چوار کەسی ترەوە:

﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ ۝١ الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ ۝٢ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ ۝٣ مَالِكِ يَوْمِ الدِّينِ ۝٤ إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ ۝٥ اهْدِنَا الصِّرَاطَ الْمُسْتَقِيمَ ۝٦ صِرَاطَ الَّذِينَ أَنْعَمْتَ عَلَيْهِمْ غَيْرِ الْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ وَلَا الضَّالِّينَ﴾[1] واتە: بەناوی خودای میهرەبان و بەخشندەی نیعمەتی گەورە و بچووک. * هەرچی ستایش و سوپاسە بۆ ئەو خودایە کە ناوی (الله)یەو پەروەردگاری هەموو عالەم خۆیەتی.* خوای میهرەبان و بەخشندەی نیعمەتی گەورە و بچووک. * کە خاوەنی جەزاو پاداشی بیروباوەڕو کردەوەیە لە ڕۆژی قیامەتدا.* خودایا، هەرتۆ ئەپەرستین و بەندەیی بۆ تۆ ئەکەین و هەر لە تۆ داوای یارمەتی ئەکەین. * بمانخەرە سەر ڕێگای ڕاست و داد، ڕێگای بەختیاریی هەردوو جیهان.* ڕێگای ئەوانەی نیعمەتت پێ داون، نەک غەزەب لێ گیراوان و ڕێ ونکردوان.

هەموو ڕۆژێک موسوڵمانان بەلای کەمەوە (١٧) جار سورەتی فاتیحە دەخوێنن، دەڵێن: ﴿اهْدِنَا الصِّرَاطَ الْمُسْتَقِيمَ﴾ئەوانەی کە لەدنیادا لەسەر ڕێگە ڕاستەکە ڕۆشتن (ئەوانەی کە پێغەمبەری خوا لەمیانەی ئایەتەکانی خواو شەرع

---

١- الفاتحة: ١ - ٧

و سونەتەکانەوە بۆی وەسف کردوین) ئەوەی لەسەریان ڕۆیشت ئەوا بەسەر پردی سیراطدا دەپەڕێتەوە، کە بەسەر دۆزەخەوەیە ئەوەش لە دنیادا لەسەر ئەم ڕێگە ڕاستە نەڕوات و ڕێچکەکان ڕێگەکانی پێ خواربکەنەوە ئەوا دەرباز نابێت دەبێت چەند پێشەکیەك هەبێت پێش چوونە سەر پردی سیراط.

پیاوێك ڕۆشت بۆ لای حسێنی کوڕی عەلی و پێی وت: ئەی پێشەوا من پیاوێکی نەخۆشم، حەزرەتی حسێن پێکەنی و فەرمووی: من دکتۆر نیم، وتی: نەخێر نەخۆشەکان چارەسەریان لای تۆیە، وتی: باشە نەخۆشیەکەت چییە؟ وتی: هەر کاتێ ویستومە تەوبە بکەم گەڕاومەتەوە سەر گوناه کردن، پێشەوا حسێن وتی تۆ پێنج دەرمانت پێویستە:

یەکەم: ئەگەر ویستت سەرپێچی خوا بکەیت ئەوا لە شوێنێکدا سەرپێچی بکە کەموڵکی ئەو نەبێت.

دووەم: ئەگەر ویستت سەرپێچی بکەیت لە ڕۆزی ئەو مەخۆ.

سێیەم: ئەگەر ویستت سەرپێچی بکەیت لە شوێنێکدا ئەنجامی بدە کەئەو نەتبینێ.

چوارەم: ئەگەر فریشتەی مەرگ هات بۆ گیان کێشانت پێی بڵێ دوای بخە هەتا تەوبە دەکەم.

پێنجەم: ئەگەر دەتەوێ سەرپێچی بکەیت کاتێ لەبەردەمیدا لەڕۆژی قیامەتدا حەشر کرایت و لێی پرسیت ئەی بەندەکەم بۆچی سەرپێچیت کردم بڵێ خوایە من سەرپێچیم نەکردویت.

پیاوەکە وتی: سەیرە لە دنیادا درۆزن بوم و لە ڕۆژی دوایشدا هەر درۆ بکەم؟!! خوا بە شایەت بێت ئەوا من گەڕامەوە بۆلای خوا.

ئەوە پایەی یەکەم، پایەی دووەم چوار جۆر خەڵك هەن شایەتیان لەسەردەدرێت بە چوار شت لەدنیادا.

* خەڵکی خاوەن سامان و پلەی بەرزی کۆمەڵایەتی پێیان دەوترێت چی سەرقاڵی کردن یادی منتان نەدەکرد؟ ئایا ئێوە دەوڵەمەند بوون یان سلێمان؟ کە دەوڵەمەندیەکەی یادی منی بیرنەبردەوە.

* خەڵکێك دێنن بەڵایان زۆر بەسەردا هاتووە ئارامیان نەگرتووە، پێیان دەوترێ بۆ ئارامتان نەگرت؟ ئێوە بەڵاتان زۆر بەسەردا هات یان ئەیوب پێغەمبەر، حەفتا ساڵ دوچاری ئیفلیج بوون بووبوو بەڵام ئەو بەڵایەی یادی منی بیر نەبردەوە.

﴿ إِن كُلٌّ إِلَّا كَذَّبَ ٱلرُّسُلَ فَحَقَّ عِقَابِ ﴾[1] واتە: ئەم گشت کۆمەڵانە پێغەمبەرانی خۆیانیان بە درۆزن دانا، بۆیە سزای ئێمەیان بۆ پێویست بوو و موستەحەقی ئەو سزایە بوون.

* گەنجانێك دەهێنن بۆنخۆش پێیان دەڵێن چی یادی خوای لەبیری ئێوە بردۆتەوە؟ ئێوە جوانترو بۆن خۆشتر بوون یان یوسف؟ ئەو جوانییەی یادی خوای لەبیر نەبردەوە.

* خەڵکانێکی هەژار دەهێنن خاوەنی هیچ نین و هەمان پرسیاریان لێ دەکەن، ئایا ئێوە هەژارتر بوون یان عیسی؟ کەدەستی دەخستە ژێر سەری وەکو سەرین و دەیوت من دەوڵەمەندترین کەسم لە دنیادا.

کەواتە چوارکەس شایەتی لەسەر چوار کەس دەدەن لەدنیادا. کەواتە هیچ مرۆڤێك بەڵگەیەکی نابێت.

دوای ئاشکرابوونی نامەی کردەوەکان هەندێکیان بەدەستی ڕاستیان وەری دەگرن هەندێکی تریشیان بە دەستی چەپ، ئینجا دوای ئەوەی دادوەری ماف خۆرەکان دەکرێت، ئەوەی مافی خەڵکی خواردووە یان ڕێگەی لەمافی خەڵکی

---

١- ص: ١٤

گرتووە، ماوەی پەنجا هەزار ساڵ بە درێژایی ماوەی حسابەکە دەدرێت بە کۆڵیدا.

## تێپەڕبوون بەسەر سیراطدا:

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: (هیچ کەسێك نابێ لەوانەی کەخاوەنی زێڕو زیون و مافی خۆیان پێ نەداوە، ڕۆژی قیامەت دێت سینی ئاگرینیان بۆ ئامادە دەکرێت ئاگر دەدرێن و لەسەری دەسوتێنرێت)[1] .

﴿ يَوْمَ يُحْمَىٰ عَلَيْهَا فِي نَارِ جَهَنَّمَ فَتُكْوَىٰ بِهَا جِبَاهُهُمْ ﴾[2] واتە: ئەو سزا سەختە لە ڕۆژێکدا ئەبێ کە ئەو ئاڵتوون و زیوە لە ئاگری دۆزەخدا سوور ئەکرێنەوەو، تەوێڵ و پشت و تەنشتی خاوەنەکانیان پێ داخ ئەکرێ.

ئەوپارەو سامانەی کۆی کردۆتەوە، لەدۆزەخدا سووردەکرێتەوە، ناوچاوو لاتەنیشت و پشتی پێ داخ دکرێت، چونکە لەدونیادا هەر کە هەژارێك دەبینێت ناوچەوانی گرژدەکات و ڕووی لێ وەردەگێڕێ و پاشان لادەکاتەوەو پشتی تێ دەکات، ئەم سزایە ٥٠ هەزار ساڵ بەردەوام دەبێت تا لێپرسینەوەی کۆتایی دێت. جا ئیدی بۆ بەهەشت یان دۆزەخ ڕەوانە دەکرێ.

کاتێ پێغەمبەرﷺ باسی زێڕو زیوی کرد هاوەڵان وتیان: پێغەمبەری خوا ئایا وشتریش؟ (ئەوان دەیانویست شارەزای ئاینەکەیان ببن و بزانن ئەرك و مافەکانیان چی‌یە)، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەو کەسەی خاوەنی وشترەو مافی نادات لەڕۆژی قیامەتدا یەکە یەکە وشترەکان سواری کۆڵی دەبن و بە دەمیان دەیانگەزن لەڕۆژانێکدا کەپەنجا هەزار ساڵە.

---

١- رواه مسلم.

٢- التوبة: ٣٥

هەروەها خاوەن كۆشك و تەلارو زەوی زۆر ئەو خەڵكە چاوەڕوانی ئاكامێكە، پاشان دەخرێتە بەردەم پەروەردگار ئینجا ئەو كەسەی نامەی كردەوەكانی بەدەستی ڕاست وەرگرتووە بەختەوەر دەبێت و ئەوەشی بەدەستی چەپ وەریدەگرێت بەدبەخت و نیگەران دەبێت پاشان لەلایەن خوای باڵادەستەوە كەسێك بانگەواز دەكات و فەرمانیان پێ دەكات بەسەر پردی سیراطدا بپەڕنەوە ئینجا ئەو خەڵكە دەست دەكەن بەپەڕینەوە، پێغەمبەریش ﷺ دانیشتووە لەلای ڕاستی پردەكەوە بەتەنیشتی عەرشەوە بەئاراستەی ئاگری دۆزەخدا كاتێ پرسیاری لێ كرا ئەی پێغەمبەری خوا بۆچی بەئاراستەی ئاگری دۆزەخ وە بەهەشت نیە؟ فەرمووی بۆ ئەوەی ئەو كەسانەی ئومەتەكەم ببینم كە بۆ ناو ئاگر دەبرێن لای خوای خۆم شەفاعەتیان بۆ بكەم، حەزرەتی ئیبراهیم خەلیل لەلای چەپەوە وەستاوە لەلای بەهەشتەوە.

پێغەمبەر ﷺ وەصفی سیراطمان بۆ دەكات دەفەرموێت: (لە شمشێری هەر یەكێكتان تیژ ترە، وەكو موە ژێریشی ئاگرە بەبنكەكەشیەوە، هەموو سیراط لەسەر دۆزەخ بەستراوە دۆزەخ سور نیە بەڵكو ڕەشە، كاتێ بەندە دەست دەكات بەپەڕینەوە هیچ شتێك نابینێ تەواو تاریكە، هیچ شتێك بۆی ڕووناك ناكاتەوە ئیمان و كردەوەی چاكە نەبێت كە لەدنیادا كردویەتی ﴿يَسْعَىٰ نُورُهُم بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَبِأَيْمَانِهِم﴾[1] واتە: لەو ڕۆژەدا كە پیاوانی خاوەن باوەڕو ژنانی خاوەن باوەڕ ئەبینی ڕووناكیی باوەڕیان وەك چرا لەبەردەمیانەوەو لای ڕاستیانەوە ڕێگەی بەهەشتیان بۆ ڕوون ئەكاتەوە.

---

١- الحديد: ١٢

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: (ئەوانەی بەسەر سیراطدا دەپەڕنەوە سێ جۆر کەسن: جۆری یەکەم ڕزگاربوو جۆری دووەم بریندارکراو یاخود روشێنراو، سێیەم کەڵەکەبووە لەئاگردا) [1].

– **جۆری یەکەم:** ڕزگار بووەو هیچ شتێ نایگرێت.

– **جۆری دووەم:** بریندارە چونکە هەندێ گوناهی هەیە لەسەر سیراط قولاپی پێوەیە وەکو درك هەر قولاپەو تایبەتە بە گوناهێکەوە بۆ نموونە قولاپ هەیە تایبەتە بەغەیبەتەوە هەیە تایبەتە بەدوو زمانییەوە هەیە تایبەتە بەڕق و کینەو ئێرەیی بردن، ئەگەر چاکەکانی زیاتر بوون لەگوناهەکانی ئەو قولاپانە دەیروشێنن و برینداری دەکەن بەڵام نایخەنە ناو ئاگرەکەوە بەڵام ئەگەر گوناهەکانی زۆرتر بوون و چاکەکانی کەمتر بوون هەر کە دەیەوێ بڕوات قولاپێ دەیگرێت و دەوەستێت و هیچیش نابینێ چاوەڕێ دەکات باوەڕەکەی و کردەوەکانی ڕێگای بۆ ڕووناك بکەنەوە هەتا جارێکی تر بکەوێتەوە ڕێی، خەڵکانێکی تریش دەبینی بەهۆی لاوازی کردەوەکانیەوە بەسنگە خشکێ دەڕوات، بەڵام کەڵەکەبەستوو ئەوا بەهۆی کردەوە خراپەکانیەوە دەکەوێتە ناو ئاگرەوە.

ئەوانەی بەسەر سیراطدا تێدەپەڕن هەریەکەیان بە پێی کردەوەکانی دەپەڕێتەوە، هەیانە وەك مریشك دەڕوات بەڕێوە، هەیانە وەکو مەڕی نەعجە دەڕوات بەڕێوە هەیانە وەکو ئەسپ دەڕوات بەڕێوە هەروەها ڕووناکیش هەر بە پێی باوەڕەکەیانە کز دەبێت و ڕووناك دەبێتەوە، ئەگەر تاریك بوو ناچار دەوەستێت و قولاپەکان پەڕی پیادەکەن ئەگەر ڕووناکیش بوو ئەوا دەست دەکاتەوە بەڕۆیشتن هەیانە وەکو بای خێرا دەڕوات هەشیانە ئاگر بانگی دەکات

---

[1] – رواه مسلم.

و دەڵێت ئەی باوەڕدار خێرا بپەڕەوە بەسەرمەوە ڕووناکیەکەت خەریکە ئاگرەکەم دادەپۆشێت.

## پردو بەربەستەکانی سەر سیراط:

کێشەیەکی تریش هەیە لەسەر سیراط، حەوت جۆر بەربەستی لەسەرە:

* **پردو بەربەستی یەکەم:** بەربەستی یەکتاپەرستی، لەوێدا بەندە دەوەستێنرێت هەتا بزانن یەکتاپەرستی بۆ خوا چۆن بووە ئەگەر یەکتاپەرستیەکی راستگۆیانەت هەبوو ئەوا دەپەڕییتەوە، خۆ ئەگەر یەکتاپەرستییەکەت دووکەڵێك یاخود بۆ ریاکاری بوو ئەوا دەکەویتە ناوی.

* **پردی دووەم:** پردی نوێژ، لەبەرئەوەی بونیادی ئاین و کۆڵەکەکەیەتی لەوێدا بەندە دەوەستێنرێت تا پرسیاری لێ بکرێت ئاخۆ نوێژی کردووە یان نا؟ ئایا نوێژەکەی بۆ ریاکاری بووە یان بۆ خوا؟ بەرهەمەکەی چی بووە؟

* **پردی سێیەم:** پردی زەکات، هەروەها دەربارەی زەکاتیش پرسیاری لێ دەکرێت ئاخۆ جێبەجێی کردووە لەو سامانەی خوا کە لای ئەوە ئاخۆ مافی هەژارانی داوە...

* **پردی چوارەم:** پردی رۆژو، پرسیاری دەربارەی رۆژوو لێدەکرێ ئاخۆ گرتویەتی یان نا.

* **پردی پێنجەم:** پردی حەجە، بۆ ئەوەی توانیویەتی بەجێی بگەیەنێ.

* **پردی شەشەم:** پردی فەرمان بە چاکە و نەفرین لە خراپەیە. بەدەست و زمان و دڵ.

* **پردی حەوتەم:** پردی ستەمکردنەکان، بەڵایەکی گەورەیە نابێ ستەم لەهیچ کەسێ بکرێ.

هەروەها لەسەر شەرەفی خەڵکی لێپرسینەوەمان لەگەڵدا دەکرێت، هەر کەسێ خێزانەکەی فریو دابێ یان ئەو ئافرەتەی کە لەگەڵ مێردەکەیدا خراپ

مامەڵەی کردووە، ئەو دراوسێیەی لەگەڵ دراوسێکەیدا خراپ بووە، فەرمانڕەوا لەبەرامبەر فەرمانبەردارەکانیدا فریشتەکان ستەمەکان وەردەگرنەوە، چەند ئافرەت خۆی بەباوکی یان براکەیدا هەڵدەواسێت و دەڵێت خوایە منی دا بەپیاوێکی ستەمکاری تاوانباری نوێژنەکەر.

ئەو ئافرەتە ڕووتانەی کەبەسەر شەقامەکاندا دەڕۆن بۆ سەرنج ڕاکێشانی کوڕان ئەوا مافی ئەو کوڕە گەنجانەیان لێ دەسەننەوە، ئەو ڕۆژە ڕۆژی یەکلایی کردنەوەیە پرد. یاخود بەربەستی ستەمەکان لەهەر حەوت پردو بەربەستەکانی تر ئەستەمترە.

ڕۆژێك کەسێك پرسیاری کرد لە پێشەوا حەسەنی بەصری و وتی: پۆشاکم بۆ حەجاج دەدوری ئایا من لەو کەسانەم کە کۆمەکی ستەمکارانم کردووە؟ پێشەواش فەرمووی: بەڵێ تۆ لەستەمکارانی، لە ڕۆژی قیامەتدا پێیان دەوترێ هەرچی ستەمکارو هاوکارانیان کۆبکەنەوە لەنێو ئومەتدا، ئەو کەسانەش ئەوانەن کە لە هەموو شتێکدا هاوکاری ستەمکارییان کردووەو زانیویشیەتی کە ستەمکارو فریودەرە.

کەواتە دەبێت ئەو کەسەی کە دەزانێت هاوکاری ستەمکارێك دەکات هاوکاری نەکات و کاری بۆ جێبەجێ نەکات، لەبەرئەوەی دەبێت لەخوا بترسێت، وەکو وتمان ستەمکاریش خۆی لە هاوکارەکانی بێ بەری دەکات، ئەوەش لە ڕەفتارەکانی شەیتانە، شوێنکەوتەکانی لەمرۆڤ و پەرییەکان. بۆیە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿يَوْمَ نَحْشُرُ الْمُتَّقِينَ إِلَى الرَّحْمَٰنِ وَفْدًا ﴿٨٥﴾ وَنَسُوقُ الْمُجْرِمِينَ إِلَىٰ جَهَنَّمَ وِرْدًا﴾[1] واتە: ئەو ڕۆژەی ئێمە لەخواترسەکان کۆئەکەینەوەو بە کۆمەڵ کۆمەڵی پرقەدرو حورمەت ئەیانبەین بۆ لای خوا. تاوانبارەکانیش ئەدەینەبەر بۆ دۆزەخ و لێیان ئەخوڕین وەك گەلەیێ ئاژەڵی تینوو کە بەرێ بۆسەر ئاو. سەرەتا

---

١- مریم: ٨٥ - ٨٦

ڕۆیشتن بەپێ بەسەر سیراطدا دەست پێ دەکات، پێش ئەوەی بکەوێتە نێو دۆزەخەوە ، تینوەو وەکو ئاژەڵ بەڕێ دەکرێت: ﴿ وَقِفُوهُمْ إِنَّهُم مَّسْـُٔولُونَ ﴾[1] واتە: ڕایشیان بگرن، ئەوان بەرپرسیارن و پرسیاریان لێئەکرێ. لەسەر پردی سیراط دەوەستێنرێت، بەفریشتەکان دەفەرموێت: ﴿فَٱهْدُوهُمْ إِلَىٰ صِرَٰطِ ٱلْجَحِيمِ ﴾[2] واتە: کە ئەوانیان ئەپەرست و خوایان نەئەپەرست و، ڕێگای دۆزەخیان پیشان بدەن.

لەبەرئەوەی لە دنیادا لادەربوون و لەسەر ڕێگای ستەم و شکاندنی حورمەتی خەڵکی و ناشیرین کردنی وێنەیان وەستاون، دوای ئەوە دەچێتە مۆڵگەکەی خۆی و دەڕوات بەرەو ئاگری بڵێسەدار. کەواتە دەبێت ئەم ئومەتە جارێکی تر بەئاگا بێتەوە ئەوەش فەرمایشتی خواو پێغەمبەرەکەیەتی.



١- الصافات: ٢٤

٢- الصافات: ٢٣

# حەوزو شەفاعەت

## حەوزی پێغەمبەرﷺ بۆ ئەم جۆرە کەسانە نیە....!!

باسکردنی حەوزو شەفاعەت باسێکە دڵەکان گوشادو ناسک دەکاتەوەو ترس هێور دەکاتەوەو بەرەو پلەی بانگخوازان بەرزمان دەکاتەوە.

ئێستا باسەکەمان تەواو دەکەین، دوای ئەوەی بەندە لەسەر بەربەستی ستەمەکاندا تێدەپەڕێت، قۆناغێکی زۆرگەورە بەسەر ئومەتی محەمەددا تێدەپەڕێت ئەویش حەوزە، پێغەمبەرەﷺ دەفەرموێت: (هەموو پێغەمبەرێك حەوزێکی هەیە، حەوزەکەی من لە هەموویان زۆرترە، لەخوا بترسن چونکە من لەڕۆژی دوایدا شانازی بە ئێوەوە دەکەم بەزۆریتان لەنێو ئومەتەکانی تردا).

بەڵام هەموو ئەوانەی کە دەڕۆن بەرەو حەوز مەرج نیە لێی بخۆنەوە، لەدوای سیراط فریشتەکان هەندێك لەخەڵکی دەگێڕنەوەو پاڵیان پێوە دەنێن، پێغەمبەر ﷺ دەڕوات هەتا بیانهێنێتەوە، فریشتەکان دەڵێن ئەی محەمەد کاری وەها مەکە، تۆ نازانی دوای تۆ چی کردووە، ئەوانە پاشگەزبوونەوە، پێغەمبەریشﷺ دەفەرموێت: تیاچن تیاچن ئەوانەی پاشگەزبوونەوەو ئاینیان گۆڕی.

ئەوەی ئەم کارەی کردبێت لەحەوزەکەی پێغەمبەر ﷺ ناخواتەوە، وەکو ئەو کەسەی لەوڵاتەکەی خۆیدا خوا دەپەرستێت بەڵام کە سەفەری کرد بۆ وڵاتێکی تر نایپەرستێت، ئەو ئافرەتانەی کە لەوڵاتی خۆماندا باڵاپۆشن بەڵام کە سەفەریان کرد بۆ رۆژئاوا، عەباکەی سەریان فڕێ دەدەن و باڵاپۆشەکەیان

لادەبەن، حەزیان بەچیە ئەوە لەبەردەکەن و دەڵێن: ئەمە باو و نەریتەو لە بنەماکانی ئاین نیە ! ! ئەوەی شەرعی خوا بگۆڕێت و جێبەجێی نەکات و یاسا دەستکردەکان بەچاکتر بزانیّ، وەك چۆن جولەکە فەزڵی کافریاندا بەسەر باوەڕداراندا، دەیانوت: ﴿هَٰٓؤُلَآءِ أَهۡدَىٰ مِنَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ سَبِيلًا﴾[1] واتە: ئەوانە، واتە: کافرەکان لە موسوڵمانەکان باشترن و ڕێگای ڕاستتریان گرتووە !

ئەوانە نایانەویّ شەرعیخوا جێبەجیّ بکەن، نموونەی ئەم جۆرە کەسانە فریشتەکان دەیانگێڕنەوە بەرەو دۆزەخ.

## خواردنەوەیەك بە دوایدا دێت:

ئەوەی لەحەوزی کەوثەر بخواتەوە دوو شت لێی بە دوور دەبێت:

**یەکەم:** هەرچی ڕق و کینەو ئیرەیی و سۆزداریەکەی دنیای نامێنیّ.

﴿وَنَزَعۡنَا مَا فِي صُدُورِهِم مِّنۡ غِلّٖ﴾[2] واتە: هەرچی لەدڵیاندا بیّ لە ئەسبابی ڕق و کینە و یەکترنەویستن دەریئەهێنین و ئەبنە برای یەکتر. واتە لە هەموو دەردێکی دنیا دەربازی دەبێت.

**دووەم:** وەکو باوکە ئادەمی گەشە دەکات و گەورە دەبێت هەتا دەگاتە (٦٠) باڵ لەئاسماندا ﴿وَأَنَّ عَلَيۡهِ ٱلنَّشۡأَةَ ٱلۡأُخۡرَىٰ﴾[3] واتە: دروستکردنەوەی دووبارەیشی هەر لەسەر ئەو خوایە خۆیەتی.

---

١- النساء: ٥١

٢- الأعراف: ٤٣

٣- النجم: ٤٧

بەڵام فەرمایشتی پەروەردگار: ﴿إِنَّآ أَعۡطَيۡنَٰكَ ٱلۡكَوۡثَرَ﴾[1] واتە: بەڕاستی ئێمە خێرو بێرێکی زۆرمان داویتێ. یا ئاوی کەوسەرمان داویتێ کە ناوی جۆگەیەکە لە بەهەشتدا.

ئەمە سیفەتە نەك ناو، کەوثەر لای عەرەب شتێکی زۆرە، کاتێ پرسیاریان لە ئەعرابیەك کرد بەچی کوڕەکەت گەڕایەوە؟ وتی: بە کەوثەر واتە شتێکی زۆر.

لەبەرئەوەی ئاوی نابڕێت، پێغەمبەر ﷺ وەسفی کردوەو دەفەرموێت: ڕووپێوەکەی بەئەندازەی ماوەی نێوان مەککەو قودسە، ئاوەکەی لە تامی هەنگوین خۆشترە، لە شیر سپی ترە، وەکو زیوی پاك وایە، ژمارەی کوپەکانی بەئەندازەی ژمارەی ئەستێرەکانی ئاسمانە، هەرکاتێ باوەڕدار دەستی درێژ بکات بۆ کوپێك بێ ماندووبوون دێتە بەردەستی، ئەمەش یەکەمین مژدەکانی بەهەشتە.

لەگەڵ خواردنەوەی یەکەم کوپی ئاوی کەوثەردا، لەهەرچی نەخۆشییەکانی نەفسە ڕزگارت دەبێ، وەکو تووڕەیی و ڕق و کینەو خۆبەگەورە زانین، ئەوەی لێی بخواتەوە هەرگیز تینوی نابێتەوە، فریشتەکان بە هەندێ لە باوەڕداران دەڵێن ئێوە بحەوێنەوە ئێمە ئاوتان بۆ دەهێنین هەندێ کەس پێغەمبەر ﷺ خۆی ئاویان دەداتێ، ئەمەش بەرزترین پلەیە، هەیانە یەك کوپ لەو ئاوە دەخواتەوە، کەخوای گەورە دروستی کردووە پێی دەفەرموێ ببە دەبێت.

## کێ لەحەوز دەخواتەوە...؟

ئەو کەسانەی کە لەحەوز دەخۆنەوە هەموو ئەو باوەڕدارانەن کەخۆیان خاوێن ڕاگرتووە، خۆیان پاراستووەو بیانووەکان قبوڵ دەکەن. بەڵای ئێمە لەوەدایە بیانوەکانی یەکتری قبوڵ ناکەین، حەفتا بیانو بۆ براکەت بهێنەرەوە

---

[1] - الكوثر: ١

ئەگەر نەبوو ئەوا دە بیانوی کەی بۆ دەدۆزینەوە دەڵێم لەوانەیە بیانویەکی هەبێت و من نەیزانم.

هەموو کەسێك لێی دەخواتەوە تەنها ئەوانە نەبن کە لەیەك زویرن و ئاژاوە لە نێوانیاندایە، لەکاتی بەگژداچووندا زاری لەوشەی خراپدا بەکار ناهێنێ، لەبەرئەوەی ئەوە خەسڵەتی دووڕووەکانە، ئەوەتا ئەمرۆ دەبینین ئاژاوەو لێکحاڵی نەبوونی خەڵکی دادگاکانی پڕکردووەتەوە، ئیتر چۆن لە حەوز بخۆینەوە. بۆیە هەتا لەدنیادایت چاکە بۆخۆت پێش بخە لە رۆژی دوایدا دەیبینیتەوە، پاداشتیش لە جۆری کارە.

هەروەها ئەو کەسانەش لێی دەخۆنەوە کە کلیلی خێرو چاکەو داخەری شەڕە، ئەگەر بارەکەی گۆڕی ئەوا لە حەوز ناخواتەوە.

هەروەها ئەوکەسانەش لێی دەخۆنەوە کە پشتیوانی لە کەسی بێ پشتیوان دەکەن سود لە لاوازی مرۆڤەکان وەرناگرن بۆبەرژەوەندی خۆیان و کەس ناچار ناکەن بەوەی لەسەر ناڕەوایی بن و ماڵ و سامانیان بدزرێت. ئەوەی لەحەوز بخواتەوە شوێنی خۆی لەبەهەشتدا دەبینێت و دەڕوات بۆی، هەروەها خەڵکی لەدوای نوێژی هەینی بانگ هێشت دەکات بۆ ماڵەکانیان، بەکۆو بە دانە دانە.

کەواتە دانایی و مەبەست لە پەڕینەوەی ئەم جۆرە کەسانە لەسەر پردی سیراط چیە؟ مادام لەحەوزی کەوثەری پێغەمبەر دەخۆنەوە؟ مەبەست لەوەیە کاتێ موسوڵمان لەسەر پردی سیراط دەپەڕێتەوە لەگەڵ دوو فریشتەدا دەبێت پێی دەڵێن سەیری ئەوە بکە، ئەوە جێگەی تۆ دەبوو لە ئاگردا ئەگەر سەرپێچی خوات بکردایە، بەلام مادام گوێڕایەڵی پەروەردگارت کرد، برۆ لەحەوزی کەوثەر بخۆرەوە، ئەم بەختەوەرییەش دەبێتە دوو بەختەوەری:

﴿ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْوَٰرِثُونَ ﴿١٠﴾ ٱلَّذِينَ يَرِثُونَ ٱلْفِرْدَوْسَ هُمْ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴾[1] واتـــــه: ئەوانەن ئەو کەسانەی بەهەشت بە میرات ئەبەن بۆ خۆیان. ئەوانەی بەهەشت بە میرات وەرئەگرن هەمیشە تیایا ئەمێننەوەو نامرن.

هەروەها مرۆڤ دۆزەخی بێت شوێنی خۆی لەبەهەشتدا نیشـان دەدەن و پێـی دەڵێن ئەوە جێگەی تۆ دەبوو ئەگەر لەخوا بترسایتایە بەمەش پەشـیمانییەکەی چەند هێندە دەبێت.

هـیچ هـەواڵێك نـەهاتووە لەسـەر مـاوەی مانـەوەی خـەڵکی لەسـەر حـەوزی کەوثەر، بەڵام ڕۆژی دوایی بەلای باوەڕداری ڕاستگۆوە وەکو ماوەی کاتی نێـوان نوێژێك بۆ نوێژێکی ترە ئەمەش لە مژدەکانی باوەڕدارە کە پێی دەدرێت.

کاتیَ خەڵکی سەر حەوز تەواو دەکەن دەڕۆن بەرەو دەرگای بەهەشت ئـەوان دەیناسنەوە وەکو چۆنماڵـەکانی خۆیـان لـە دنیـادا دەناسـیەوە، بـەو جـۆرە خۆشیی دەچێتە دڵی ئادەمیزادەوە.

بەڵام تێبینیەك هەیە تۆ وەکو سروشـتی مـرۆڤ بوونـت کـە لـەدنیادا لەسـەری بوویت دەمێنیتەوە گۆڕان لە ڕووکەشدایە لەبەرئەوە کاتێـك دەچـنە بەهەشـتەوە دەڵێن:

﴿ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ٱلَّذِىٓ أَذْهَبَ عَنَّا ٱلْحَزَنَ ۖ إِنَّ رَبَّنَا لَغَفُورٌ شَكُورٌ ﴿٣٤﴾ ٱلَّذِىٓ أَحَلَّنَا دَارَ ٱلْمُقَامَةِ مِن فَضْلِهِۦ ﴾[2] واتە: لەو بەهەشـتەیانا سـەناو ستایشـی خـوا ئەکـەن و ئەڵێن: سوپـاس بۆ ئەو خوایەی غەمو پەژارەی ژیـانی دنیـاو ترسـی ئاخرشـەڕیی قیامەتی لیَ لادایین. بەڕاستی خوای ئێمە خوایەکی تاوانبەخش و سوپاسگوزارەو جەزای بەخێری خەڵك ئەداتەوە بەرانبەر هـەر چاکەیەك بیکـەن. ئـەو خودایـەی

---

١- المؤمنون: ١٠ - ١١

٢- فاطر: ٣٤

ئێمـەی بـە فـەزڵ و ڕەحمـەتی خـۆی لـەم نشـینگە بـەردەوام و پایـەدارەدا جێگیرکرد.

﴿ إِنَّا كُنَّا مِن قَبۡلُ نَدۡعُوهُۖ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلۡبَرُّ ٱلرَّحِيمُ ﴾[1] واتە: ئێمـە لەمەوبـەر کـە لە دنیادا بووین هاوارمان هەر لەو ئەکرد. بەڕاستی هـەر ئـەو خـاوەن ئیحسـان و میهرەبانە.

بەهەشـت شـوێنی جـێگیر بوونـە، حـەوز بـۆ پـاك بوونەوەیـە، لـە بێـزاری و ئالۆزیـەکانی دنیـا لـەدڵی بەنـدەدا، لێـرەدا دەروونـی بـاوەڕدار هێـور دەبێتـەوە پێغەمبەر ﷺ سێ شوێنی باس کردووە کەکەس تیایدا باسی کەس ناکات: کاتی پەرش و بڵاوبوونەوەی نامەی کردەوەکان، شوێنی تەرازوو، لای پـردی سـیراط. خـزم پرسـیار لـەخزمی خـۆی ناکـات، بـەڵام لـەلای حـەوزی کـەوثـەردا: ﴿ ٱلۡأَخِلَّآءُ يَوۡمَئِذِۭ بَعۡضُهُمۡ لِبَعۡضٍ عَدُوٌّ إِلَّا ٱلۡمُتَّقِينَ ﴾[2] واتە: دۆست و برادەران لەو ڕۆژەدا هەندێکیان دوژمنـی هەندێکیانن چونکە تێئەگـەن کـە ئـەوان بـوون بەهۆی گومڕاه بوونیان، تەنها دۆست و برادەرانی وا نەبێ لـە دنیـادا لـەخواترس بووبن ئەوانە هەر لەسەر دۆستایەتیی خۆیان ئەمێننەوە.

لەبەرئەوەی لەبەر خوا لەگەڵیەکدا کۆبوونەوەو لەبەر خـوا سـەردانی یـەکیان دەکرد بۆیە بانگ خوزاێك بانگ دەکات: (با دراوسێکانی خـوا هەڵسـن) کۆمـەڵێك هەڵدەسنەوە بەرەو بەهەشت دەڕۆن، دەڵێن: ئێوە کێن؟ دەڵێن: ئێمە دراوسـێی خواین، پێیان دەوترێت: چۆن ئێوە دراوسـێی خـوان؟ دەڵـێن: ئێمـە لەبـەر خـوا سـەردانی یـەکترمان دەکـرد لەبـەر خـوا لەگـەڵ یەکـدا دادەنیشـتین لەبـەر خـوا یەکمان خۆش دەویسـت. دەرگـای بەهەشـتیان بـۆ دەکرێتـەوەو دەڕۆنـە نـاوی. لەبەرئەوە ئەگەر موسوڵمان برایەکی خـۆی خـۆش ویسـت بـا پێـی بڵێـت، وەکـو

---

١- الطور: ٢٨

٢- الزخرف: ٦٧

پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێ داوە پێی بڵێ: من لەبەر خوا خۆشم دەوێیت. ئەویش پێت دەڵێت: (أحبكَ الله الذي أحببتني من أجله) واتە: ئەو خوایە خۆشی بوێیت کە لەپێناویدا منت خۆش دەوێت.

## پایەکانی شەفاعەت و جۆرەکانی:

شەفاعەت پێویستی بەچوار شت هەیە ئەویش شەفاعەتکەرو شەفاعەت لاکراو و شەفاعەت بۆ کراو و گوناهەکەیە (کە شەفاعەتی تیاکراوە).

شەفاعەتکەر مەبەستی لەدووانە، بۆ نموونە تۆ لەماڵەکەی خۆتدایت لەگەڵ خێزانەکەتدا کوڕەکەت لەئەنجامدانی کارەکەیدا کەموکوڕی هەیە یاخود نوێژ ناکات، باوکەکە لەگەڵ دایکەکەدا ڕێك دەکەون بەوەی دەنگی بەسەردا بەرزبکاتەوەو ئەویش هێوری بکاتەوەو سۆزی لە بەرامبەردا دەرببڕێت، ئابەو جۆرە شەفاعەت بۆکردن و توندی نواندن. خوای گەورە ڕازی نابێت شەفاعەت لەکەس وەربگرێت هەتا پێغەمبەر ﷺ شەفاعەتی بۆ نەکات، دوای ئەوەی خوا خۆی مۆڵەتی دەدات.

﴿ ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلْحَيُّ ٱلْقَيُّومُ ۚ لَا تَأْخُذُهُۥ سِنَةٌ وَلَا نَوْمٌ ۚ لَّهُۥ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ ۗ مَن ذَا ٱلَّذِى يَشْفَعُ عِندَهُۥٓ إِلَّا بِإِذْنِهِۦ ﴾[1] واتە: (الله) زاتی(واجب الوجود)ی خاوەن کەماڵە. لە هەموو عەیب وکەم و کوورپیەك پاکە. لە صیفات و کردەوەیدا هیچ جۆرە کەم و کوورپیەك نییە، کەس نییە شایستەی پەرستن بێ و بەندەیی بۆ دروست بێ ئەو نەبێ؛ چونکە هەر ئەوە زیندوو بە زاتی خۆی و لەو زیندوویەتییەدا موحتاجی کەس نییەو نابێ. ئەوە کە خۆی بە خۆیەوە ڕاوەستاوەو بەڕاستی خاوەنی بوونی خۆیەتی و ئەوە هۆی بوونی غەیری خۆیەتی؛ واتە هەموو مەوجوودێ ئەو دروستی کردووە. کەوابوو هەرئەو شایانی پەرستن و بەندەیی بۆ کردنەو کڕنووش هەر بۆ ئەو ئەبرێ. ئەو (الله)یە بە ئان

---

١- البقرة: ٢٥٥

بیٚئاگایی بەسەردا نایێ، وەنەوز نایگرێ و خەوی لێناکەوێ، هەرچی لە ئاسمان و زەویدا هەیە موڵکی ئەوە، ئەو دروستی کردوون و بوون و نەبوون و مان و نەمانیان بە دەستی توانای ئەوە. ئەوەندە خاوەن پایەیە کێ بێ وکێیە بتوانێ بە بێئیزنی ئەو تکا بۆ تاوانبارێ بکات؟

ئەوەتا پێغەمبەر ﷺ دەڕوات هەتا شەفاعەت بۆ ئەو کەسانە بکات کە لەحەوز گێڕاویانەتەوە، بەڵام ڕێگەی پێ نادرێت، بۆ نموونە تۆ لەلای بەڕێوەبەرەکەت شەفاعەت بۆ کەسێك دەکەیت لەبەرئەوەی بڕێك لەموچەکەی داشکاندووە، بەڕێوەبەر پێت دەڵێت: باشە سەیرێکی دەکەم. ئەگەر پلەو ڕێزت لای بەڕێوەبەرەکەت نەبووایە نەتدەتوانی شەفاعەتی بۆ بکەیت نموونەی بەرز بۆ خوایە کەواتە شەفاعەتکەر خۆی دەڕوات بۆ ئەوەی شەفاعەتت بۆ بکات.

ئەوەی لەلای شەفاعەت بۆ کراوە خوای بەندەکانە، ئەوەش شەفاعەتی بۆ کراوە خاوەن گوناهەکەیە، ئەوەش شەفاعەتی بۆ دەکرێت گوناهە.

شەفاعەت جۆری زۆرە لەوانە شەفاعەتی هەرە گەورە ئەوە یەکەمیانە، یاخود شەفاعەتی گەورە ئەوەش ئەو شەفاعەتەیە کە پێغەمبەر ﷺ دەیکات لەگەڵ دەست پێکردنی لێپرسینەوە، ئەوەش بۆ هەموو ئومەتەکانە، هەروەها شەفاعەتێك هەیە بۆ ئەوانەی کە لە(الاعراف)ن ئەوانەی کەچاکەو خراپەیان وەکو یەکە، چاکەکانیان نەیخستونەتە بەهەشتەوەو خراپەکانیشیان نایانخاتە دۆزەخەوە، پێغەمبەر ﷺ دێت و شەفەعاتیان بۆ دەکات، هەروەها شەفاعەتێکی تر هەیە لەسەر تەرازوو لەوێدا پێغەمبەر ﷺ دێت و کارتێك لەدەستیدایە دەیخاتە سەر تای تەرازوی کردەوە چاکەکانی کردەوەکانی بەرزدەکاتەوە ئەو کارتە "لا إله إلا الله، محمد رسول الله" ی تێدا نوسراوە.[1]

---

١- ئەمە لە (صحیح البخاري و موسلم)دا هاتووە.

هەروەها شەفاعەتێکی تر هەیە ئەویش بۆ سوك کردنی ئەشکەنجەو سزایە، وەکو لەگەڵ ئەبو طالبی مامی ڕویدا. عەباس(ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: ئەی برازای خۆم ئایا شەفاعەت بۆ مامی خۆت ناکەیت کەپشتیوانی لێ کردی و بووە پاڵپشت و هاوکارت، فەرمووی: شەفاعەتم بۆ کرد، عەباس فەرمووی: چی پێ دایت؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: کردی بەو کەسانەی کە سوکترین سزای دۆزەخیان لەسەرە. عەباس فەرمووی: ئەو سزایە چیە؟ فەرمووی: جوتێك نەعلی ئاگرین دەخرێتە پێیەوە خوێنی سەری دەکوڵێنێ.

هەروەها شەفاعەت هەیە بۆ پێغەمبەر ﷺ لەدنیادا وەکو ئەو مژدەیەی کە پێغەمبەر ﷺ دای بە (٧٠) هەزار کەس لەئومەتەکەی کەبەبێ حیساب دەچنە بەهەشتەوە. عەکاشە کە لەلای ڕاستی پێغەمبەرەوە بوو وتی: ئەی پێغەمبەر ﷺ نزام بۆ بکە یەکێك بم لەوانە فەرمووی ئەی عەکاشە تۆش یەکێکی لەوان. ئینجا ئەوەی بەتەنیشت عەکاشەوە بوو وتی ئەی من ئەی پێغەمبەری خوا؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی عەکاشە پێش تۆ کەوت، وەکو وتراوە پێغەمبەر ﷺ ئەو دەرگایەی داخست لەبەرئەوەی چەند دووڕوویەك لەدانیشتنەکەدا بوون لەبەرئەوەی پێغەمبەر ﷺ کە وادەیدا وادەی حەق و ڕاستە، ئەگەر بیدات خوای گەورە جێبەجێی دەکات.

هەروەها شەفاعەتێکی تر هەیە بۆ ئەو کەسانەیە کە گوناهی گەورەیان ئەنجام داوە لە ئوممەتی محەمەددا ﷺ تەنانەت خاوەن گوناهە گەورەکانیش سۆزی بۆ دەردەبڕن، وە شەفاعەتیان بۆ قبوڵ دەبێت مادام ئەوگوناهە گەورەیە لەبەندەکانی خوانەکراوە چونکە خوای گەورە لەحەقی خۆی خۆش دەبێت. هەروەها شەفاعەت کردن چەند کاتێکی دیاری کراوی هەیە ئەویش پێش سیراط و دوای سیراط و لای تەرازووە، بۆ نموونە شەفاعەت کردن بۆخاوەن گوناهە گەورەکان لەسەر پردی سیراط دەبێت پێش چونە دۆزەخ، کاتێك قولاپەکان دێن بۆئەوەی خاوەن گوناهە گەورەکان ببەن پێغەمبەر ﷺ دێت شەفاعەتیان بۆ

دەكات، شەفاعەتەكەی قبولّ دەكرێت بەومەرجەی ستەمی لەكەسێك نەكردبێت. سەیركەو وردبەرەوە ستەمت لەهیچ موسوڵمان و بەندەیەك لەبەندەكانی خوا نەكردبێت، چی دەكەی بیكە بەلاّم ستەم لەهیچ موسوڵمان و هیچ بەندەیەك لەبەندەكانی خوا مەكە هەتا شەفاعەتت لیّ قەدەغە نەكرێت، پێویستە موسوڵمانان لەنێو خۆیاندا یەكتری رازی بكەن لەدنیاداو لەیەكتر رازی بن.

هەركەسێك خاوەنی كردەوە چاكەكان بێت لەدنیادا ئەوا لەرۆژی دواییدا بەهەمان شێوە خاوەنی چاكە دەبێت، لەرۆژی دواییدا ستەمكارو ستەملێكراو دەهێنن ستەمكارەكە خاوەنی كردەوەی چاكەو خێرە خوای گەورە هەردووكیان دەهێنێت، بە ستەملێكراوەكە دەفەرمووێت: سەیری بەهەشت بكە ئەویش دەڵێت ئەی خوایە ئەو كۆشكانە هی كێن؟ هی چ پێغەمبەرێكە هی چ راستگۆیەكە هی چ شەهیدێكە؟ خوای گەورە دەفەرموێت نەخێر بۆ ئەوكەسانەیە نرخەكەی دەدەن، دەڵێت: نرخەكەی چەندە؟ دەفەرموێت: بۆ تۆ دەبێت ئەگەر لەهاورێكەت خۆش ببیت. ئەویش دەڵێت: ئەوا لێی خۆش بووم، خوای گەورە دەفەرموێت: برۆ دەستی براكەت بگرەو پێكەوە بچنە بەهەشت.

هەروەها شەهیدانیش دەتوانن شەفاعەت بۆ (٧٠) كەس لەخزم و نزیكەكانیان بكەن كەدۆزەخ بۆتە نشینگەیان لەبەرئەوەی لەدوای خۆیان چاودێری منداڵەكانیان كردوون، هەروەها راستگۆكان دەتوانن شەفاعەت بكەن وەكو حەزرەتی (ئەبوبەكری صدیق) هەروەها زانایانیش دەتوانن شەفاعەت بۆ (٧٠) كەس بكەن كەدەیانەوێ لەخزم و كەس و خۆشەویستانیان. پاشان خوای گەورە دەفەرموێت: پێغەمبەران و راستگۆیان و شەهیدان و زانایان شەفاعەتیان كرد كەس نەماوەتەوە من نەبێت منم الرحمن الرحيم، ئینجا بەدەستی راستی خەڵكی دۆزەخ لەئاگر دێنێتە دەرەوەو دەیانخاتە نێو بەهەشتەوە.

هەروەها لە گێرانەوەیەكی تردا كە فەرمایشتی عەكاشەیە دەفەرموێت: (٧٠) هەزار كەس لەئوممەتی محەمەد ﷺ بیّ لیّ پرسینەوە دەخرێنە بەهەشتەوە

ئەعرابییەك كە ئەلای پێغەمبەری خوا ﷺ دانیشتبوو وتی: (ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ لای خوا بۆمان زیاد ناکەیت؟ فەرمووی: بەڵێ زیادی کرد ئەعرابیەکە وتی: چی پێدایت؟ بۆ هەریەکێك لە (٧٠) هەزار کەس (٧٠) هەزار کەسی پێدام، ئەعرابیەکە وتی: زیاتری ناکات؟ حەزرەتی عومەر(رەزای خوای لێ بێ) هەڵساو دەستی خستە سەر دەمی و ڕێگەی پێ نەدا داوای زیاتری لێ بکات، ئەعرابیەکە دەستی حەزەتی عومەری لەسەر دەمی لابردو وتی: بێ دەنگبە کوڕەکەی خطاب ئایا لەماڵی خۆت یان لەماڵی باوکت پێمان دەدەیت؟ پێغەمبەر ﷺ پێکەنی و فەرمووی: بەڵێ زیاتری کرد. ئەعرابیەکە وتی: چی تری پێ دایت؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: سێ فەرخە وشتری پێدام). لەگێڕانەوەیەکی تری موسلیمدا هاتووە دەفەرموێت: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: خوای گەورە کۆمەڵێك لەدۆزەخ دەردەهێنێت هەرگیز کاری چاکەیان نەکردووە.

## ئاگات لە بێ بەشبوون بێت لەشەفاعەت:

تاقمێك هەن شەفاعەتی شەفاعەتکاران سودیان پێ ناگەیەنێت، ئەوانیش ئەو خۆبەگەورە زانانەن لەبەرامبەر خوادا خۆیان بەگەورە لەقەڵەم دەدەن جیاوازی ناکەن لەنێوان حەڵاڵ و حەرامدا. بەهەموو موسوڵمانێك دەڵێن ئەوانەی تەمەڵی دەکەن لە جێبەجێ کردنی پەرستشەکانیان بە بیانوی ئەوەی دەکەونە بەر شەفاعەتەکان. ئەو شەفاعەتەی کە خوای گەورە داوییەتی بە پێغەمبەر ﷺ، بەڵام ئەوانە چین کەشەفاعەتمان بۆ مسۆگەر دەکەن، کەواتە بەندە چەندێك دەتوانێت پەرستش و بەندایەتی کردنی زیاتر ئەنجام بدات و لەخوای گەورە بپاڕێتەوە کە لەوکەسانە بێت کە پێغەمبەری خوا ﷺ شەفاعەتیان بۆ دەکات. هەندێك وادەزانن ئاگر بۆ موسوڵمان دروست نەکراوە! ئەی کەواتە دۆزەخ بۆچی دروست کراوە؟ بۆ نموونە ئەوەی لەدنیادا نوێژ ناکات لەدۆزەخدا نوێژ دەکات، ئەوکەسە دەیتوانی لەمزگەوت یان لەماڵەکەیدا نوێژەکانی بکات بەڵام نەیکرد، ئەوکەسانەی ئەمانەتی خەڵکیان لەناو بردووەو مافی خەڵکیان خواردووە،

هەرچی ئەمانەت و مافە خوراوەکان هەیە دەخرێنە ئاگری دۆزەخەوە ئینجا بەوکەسانەی کە خواردویانە دەوترێت بڕۆن بیهێننەوە ئەوانیش دادەبەزنە ناوی بۆئەوەی بیهێننەوە دەرەوە دەکەونە ناوی.

ئاگر(٧٠) شوێنگەی هەیە شەش دانەیان خەڵکەکەی بۆ هەتاهەتایی تیایدا دەمێننەوە، یەکێکیشیان بەهەمیشەیی تیایدا نامێننەوە ئەوانیش یەکتاپەرستە سەرپێچی کارەکانە، شەفاعەتیش هەر بۆئەوان دەبێت. هیچ کەسێك بێ کارکردن پاڵ نەدات بەشەفاعەتەوە، پێغەمبەر ﷺ کاتێك پێیان وت نزام بۆ بکە هەتا ببمە هاوڕێت لەبەهەشتدا. فەرمووی: خۆتان لەسەر زۆر سوجدە بردن ڕابهێنن.

هەروەها فەرمووی ﷺ: ئەی فاطمەی کچی محەمەد کاربکە من هیچت بۆ ناکەم لای خوا، ئەی عەباس ئەی مامی پێغەمبەری خوا کاربکە لای خوا هیچم پێناکرێت، (ئەوەی لە کارکردنیدا لاوازو خاو بێت پشت و ڕەگەزی خێرای ناکەن)[١].

# مژدە پێدراوانی دۆزەخ

## هاوڕێی چاك پشتی باوەڕە:

کاتێك باسی ئاگر دەکەین وامان لێ دەکات باسی هۆکاری کەوتنە ناوی بکەین، ئەویش سەرپێچی کردنە، هۆکارەکەشی شەیطانی نەفرین لێکراوە، دوژمنایەتی شەیطان لەگەڵ مرۆڤدا هەتا هەتاییە لەساتی بەدیهێنانی ئادەمەوە ئەم نەفرین لێکراوە لە پێشبڕکێدایە بۆئەوەی ئادەمیزاد بێتە نێو دۆزەخەوە، ئەمەش ئامانجیەتی، هەتا نەبێتە تەنها کەسێك لەدۆزەخدا.

---

١- رواه مسلم

شەیطـان ئـادەمی فریـودا ﴿فَدَلَّىٰهُمَا بِغُرُورٍ﴾[1] واتـە: جـا شـەیتان بـە سـوێند خواردن ئـادەم و حـەووای هەڵخەڵەتانـدو لـە بەرزییـەوە هێنانیـە پەسـتی. دڵـە ڕاوکێی بۆ ئـادەم و حـەوا کـرد هـەتا لـەو درەختـە بخۆن کـەخوا لێـی قەدەغـە کردبـوون، پێـی وتـن: ئەگـەر لێـی بخـۆن ئـەوا دەبنـە ئـەو کەسـانەی کـە بـۆ هەتاهەتایی دەمێننـەوەو نـامرن: ﴿هَلْ أَدُلُّكَ عَلَىٰ شَجَرَةِ ٱلْخُلْدِ وَمُلْكٍ لَّا يَبْلَىٰ﴾[2] واتە: پاشان شەیتان وەسوەسەو خەیاڵاتی پڕوپووچی خستە ناو دڵیـەوە، پێـی وت ئەی ئادەم ئایا شارەزاییت بکەم بۆ دارێ کە لێخواردنی ئەبێ بە هۆی ئـەوە هـەتا هەتایـە بـژیت و، موڵـك و ماڵێکـت پیشـان بـدەم کـە هـەرگیز نافـەوتێ و نابرێتـــەوە. ﴿وَقَاسَمَهُمَآ إِنِّي لَكُمَا لَمِنَ ٱلنَّٰصِحِينَ﴾[3] واتـــە: سوێندیشـــی بـــۆ خواردن کە من بەڕاستی ئامۆژگاریتان ئەکەم!.

کاتێـك شیسـی کـوڕی ئـادەم پرسـیاری لـەباوکی کـرد: (باوکـە گوێڕایـەڵی شەیطان دەکـەیت و سەرپێچـی "رحمن" دەکـەیت؟! ئـادەم پێـی وت: سـوێند بەخوا کوڕی خۆم گومانم نەبردووە بەوەی کەسێك هـەبێت سـوێندی درۆ بخـوات بـەخوا) لەگـەڵ ئـەوەی خـوای گـەورە هۆشـیاریدا بـەئادەمیزاد بـەڵام ئـەم بەدیهێنراوەی خوا هەروەك سروشتی خۆی بیری دەچێتەوە هـەر بۆیـە نـاونراوە (الانسـان) واتـە: (النسـیان) واتـە بیرچـوونەوە، هـەروەها خـاوەنی ئیرادەیـەکی بـــەهێز نییـــە. ﴿وَلَقَدْ عَهِدْنَآ إِلَىٰٓ ءَادَمَ مِن قَبْلُ فَنَسِيَ وَلَمْ نَجِدْ لَهُۥ عَزْمًا﴾[4] واتـــە: بەڕاستی لەمەوپێش ئامۆژگاری ئادەممان کرد تـوخنی درەخـتی گـەنم نەکـەوێ،

---

١- الأعراف: ٢٢

٢- طه: ١٢٠

٣- الأعراف: ٢١

٤- طه: ١١٥

کەچی ئامۆژگارییەکەمانی لەبیرچوو و بە خاوەن عەزم و توانمان نەدی ئەو ئامۆژگارییەمانی پێ ڕابگیرێ.

ئادەمیزاد هەمیشە پێویستی بە یەکێکە بیری بهێنێتەوەو دەستی بگرێت.

بۆیە حەزرەتی عومەر(رەزای خوای لێ بێ) دەستی ئەبو موسای دەگرت و پێی دەوت: وەرە با ساتێك باوەڕدار بین، ئەوە پێغەمبەری خوایە ﷺ داوا لە ئیبن مەسعود دەكات قورئانی بۆ بخوێنێت ئیبن مەسعود(رەزای خوای لێ بێ) پێی دەفەرموێ بۆ بەڕێزتان دابەزیوە من بیخوێنمەوە؟! پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: دەمەوێت لەدەنگی یەكێكی ترەوە گوێم لێبێت. كاتێك ئادەم دروست كرا خۆی بەتەنهایی بینی ترسی لێ نیشت بۆیە داوای لەخوا كرد كەسێك بكاتە هاوسەرو هاودەمی تەنیاییەكەی پاشان نوست كاتێك بەئاگا هات سەیری كرد حەواء لە تەنیشتیەوەیەتی!! فەرمووی: ئەمە كێیە؟ خوای گەورە فەرمووی: ئەوە (حەواء)ە وشەی ئادەم لە (أدمة)ەوە هاتووە (أدمة الأرض) واتە توێكڵی زەوی : ﴿ مِنْهَا خَلَقْنَاكُمْ وَفِيهَا نُعِيدُكُمْ وَمِنْهَا نُخْرِجُكُمْ تَارَةً أُخْرَىٰ ﴾[1] واتە: لەو ئەرزە ئێوەمان دروست كردووەو پاش مردنیش ئەتانگێڕینەوە بۆ ناو ئەو ئەرزەو جارێكی تریش كە لە ڕۆژی قیامەتدا مردوو زیندوو ئەكرێتەوە لەو ئەرزەتان ئەهێنینە دەرەوە.

حەواء سەربە ئادەمە چونكە لەو دروست بووە.

ئادەم و حەواء هەردووكیان هۆكاربوون بۆ چوونە دەرەوە لەبەهەشت نەك حەواء وەكو هەندێك دەڵێن ئەوەتا خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ فَدَلَّىٰهُمَا ﴾[2] واتە هەردووكیان، كاتێك هەردووكیان ویستیان بیخۆن عەیب و عاریان

---

١- طه: ٥٥

٢- الأعراف: ٢٢

دەرکەوت: ﴿فَلَمَّا ذَاقَا﴾[1] وە هەردووکیشیان پێکەوە بناغەی سەرپێچییەکەیان بۆ دەرکەوت، بۆیە ئادەمو حەواء پێکەوە وتیان:

﴿رَبَّنَا ظَلَمْنَآ أَنفُسَنَا وَإِن لَّمْ تَغْفِرْ لَنَا وَتَرْحَمْنَا لَنَكُونَنَّ مِنَ ٱلْخَٰسِرِينَ﴾[2] واتە: وتیان: ئەی خودای پەروەردگار! ئێمە ستەممان لە خۆمان کرد، تۆ ئەگەر لە گوناهمان خۆش نەبی و رەحممان پێ نەکەی لە زومرەی زیانباران ئەبین.

پاشان ئەمەش لەسەرەتاوە دان پیانانە بەگوناهەکەدا کە ئەنجامیان داوە.

﴿وَعَصَىٰٓ ءَادَمُ رَبَّهُۥ فَغَوَىٰ ﴿١٢١﴾ ثُمَّ ٱجْتَبَٰهُ رَبُّهُۥ فَتَابَ عَلَيْهِ وَهَدَىٰ﴾[3] واتە: ئادەم لە فەرمانی خوای خۆی دەرچوو گومڕا بوو. پاش ئەوە خوا بە رەحمەتی خۆی هەڵیبژارد بۆ پێغەمبەرایەتی و لێی بووردو ڕێگای پیشان دا بۆ لانەدان لەو تەوبەیەی کردی.

پاشان فەرمانی دابەزاندنیان درا بۆ سەر زەوی دیارە دوای ئەوەی خوای گەورە لێیان خۆشبوو.

کەسانێك هەن دەڵێن ئادەم بووە هۆی ئەو بەدبەختییە کە ئێستا ئێمەی تیاین لەبەرئەوەی بە هۆی سەرپێچییەکەیەوە ئێمە دابەزێنراینە سەر زەوی، بەڵام ئەم قسەیە هیچ ڕاستییەکی نییە، لەبەرئەوەی خوای گەورە لە ئادەم خۆشبوو تەوبەکەی لێ وەرگرت و وەك مرۆڤێکی پاك دابەزییە سەرزەوی، خوای گەورە دەفەرموێت:

---

١- الأعراف: ٢٢

٢- الأعراف: ٢٣

٣- طه: ١٢١ - ١٢٢

﴿ أَلَّا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَىٰ ﴾[1] واته: كەوا هیچ تاوانبارێ تاوانی كەسێكی تری ناگرێتە ئەستۆ.

چۆن خوای گەورە هەڵەی ئادەم بەسەر ئێمەدا دەسەپێنێت، هەروەها دەفەرموێت:

﴿ وَأَن لَّيْسَ لِلْإِنسَانِ إِلَّا مَا سَعَىٰ ﴾[2] واتە: كەسیش هیچی دەسگیر نابێ بەرهەمی كردەوەی خۆی نەبێ.

## دوژمنایەتییەك سەدەكان نەیكوژاندۆتەوە:

دوژمنایەتی كردنی شەیطان بۆ مرۆڤ كۆنە لەو ساتەوەی خوای گەورە فەرمانی پێكرد سوجدە بەرێت ئەویش گوێڕایەڵی نەكردو سەرپێچی فەرمانی خوای كردو سوربوو لەسەر ئەو سەرپێچییەی بەپێچەوانەی حەزرەتی ئادەم كە یەكسەر تەوبەی كرد، بەڵام ئەو لەسەر گومڕایی خۆی بەردەوام بوو.

ئەویش وەكو مرۆڤ ویستیی بەدەست خۆیەتی، ڕازی نەبوو سوجدە ببات و وتی: ﴿ قَالَ أَنَا خَيْرٌ مِّنْهُ خَلَقْتَنِي مِن نَّارٍ وَخَلَقْتَهُ مِن طِينٍ ﴾[3] واتە: بۆیە سوجدەم بۆ نەبرد چونكە من لەو چاكترم. تۆ منت لە ئاگر دروست كردووەو ئەوت لە قوڕ دروست كردووە.

ئەمەش هەڵەیە چونكە گڵ و قوڕ لەئاگر باشترن، لەگەڵ سوربوونی لەسەر سەرپێچی لە ڕەحمی خوا كرایە دەرەوە : ﴿ قَالَ يَا إِبْلِيسُ مَا مَنَعَكَ أَن تَسْجُدَ لِمَا خَلَقْتُ بِيَدَيَّ أَسْتَكْبَرْتَ أَمْ كُنتَ مِنَ الْعَالِينَ ﴾[4] واتە: خوا بە ئیبلیسی فەرموو: ئەی

---

١- النجم: ٣٨
٢- النجم: ٣٩
٣- ص: ٧٦
٤- ص: ٧٥

ئیبلیس! چی ڕێی ئەوەی لێ گرتی سوجدە بۆ ئینسانێ بەری من بە دەستی قودرەتی خۆم دروستم کردووە؟ خۆت بەزل زانی، یان هەر لە زاتی خۆتدا بەرزو پایە بڵندی؟

وەکو وتراوە فریشتەکان هەژدە جۆرن لەناویاندا کۆمەڵێك هەن پێیان دەوترێت (العالین) ئەمانە هیچ زانیارییەکیان نییە دەربارەی ئادەم و دوو کوڕەکەی بەڵکو تەنها یەکتاپەرستی خواو بە پیرۆز ڕاگرتنی سەرقاڵی کردون.

ئایا ئەی شەیطان تۆ لەو کۆمەڵەیت هەتا ئادەم نەناسیت و سەرپێچی بکەیت، ئەمە ڕایەکە، ڕایەکی تریش ئەوەیە دەڵێن (العالین) لە (العلو)ەوە هاتووە واتە (التعالي) واتە خۆ بەگەورەزان.

من ڕام لەسەر لێکدانەوەی یەکەمە، لەبەرئەوەی پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: لەوێ شوێنێك هەیە پێی دەوترێت (البیت المعمور) هەموو ڕۆژێك (٧٠) هەزار فریشتە ئەڕۆنە ناوی و نایەنە دەرەوە هەتا ڕۆژی دوایی، ئەگەر بەردێکی لێ بکەوتایەتە خوارەوە ئەوا دەکەوت بەسەر کەعبەی پیرۆزدا.

## کاری شەیطان و سەربازەکانی:

شەیطان دوژمنایەتی خۆی لەبەرامبەر مرۆڤدا ڕاگەیاند، یەکەم گوناهێك کەسەرپێچی خوای پێکرد خۆبەگەورە گرتن و ڕق و ئیرەیی بردن بوو، بۆیە ئەم خەسڵەتانە لەقەدەغە کراوەکانی ئیسلامە، بۆیە دەبێت وریاو بەئاگابین کەس ئەو خەسڵەتانەی شەیطانی تیانەبێت، چونکە ئەو هەوڵ دەدات ئەو خەسڵەتانەی خۆی لەنێو مرۆڤەکاندا بڵاوبکاتەوە، بۆنموونە بەکەسێك دەڵێت بۆ فلانە کەس دەوڵەمەندەو ئەویتر هەژار.

بۆیە هەڵەکەی ئادەم بەمەبەست نەبوو بەڵکو ئاگای لێی نەبوو لەبەرئەوە ئاگای لێی نەبوو هیچ پلانێکی بۆ سەرپێچی کردن دانەڕشتبوو، کاتێك

ئارەزووەكان بەرز دەبنەوە ژێری دیارنامێنێت، هەڵەو گوناهەكەی ئادەم لە قۆناغی ڕاهێناندابوو پێش هاتنەسەر زەوی.

بۆیە مرۆڤ چەندێك لەتەقواو چاكەخوازی تێدا بێت ئەوا كاتێك دێتە پێش سەرپێچی خوای بەندەكان دەكات، بەڵام تەوبە دەكات و خواش تەوبەكەی لێ وەردەگرێت.

لەبەرئەوەی كاری شەیطان لەزەویدا بریتیە لەلابردنی نەوەی ئادەم لەسەر فەراهەم هێنانی خێرو چاكە، لەكاتێكدا خۆی لەخێردابوو، بەڵام خۆی بەگەورەزانی، حەزرەتی عەلی(رەزای خوای لێ بێ) دەربارەی دەفەرموێت: ئەی ئادەمیزاد خۆت بەگەورە دەزانیت! لەكاتێكدا تۆ لەدوو كونە میزەوە هاتیتە دەرەوە. واتە شوێنی زاوزێی دایك و باوك.

بەڵام شەیطان لەدوژمنایەتیەكەیدا لەگەڵ ئادەمیزادا جۆرێكی دیاری كراوی جیا كردوەتەوەودانیشی بەوەدا ناوە كە بەو جۆرە كەسانە ناوێرێت: ﴿ إِلَّا عِبَادَكَ مِنْهُمُ الْمُخْلَصِينَ ﴾[1] واتە: تەنها بەندە خاوێن و دڵسۆزەكانت نەبێ لە ناویانا.

لەبەرئەوەی خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ إِنَّ عِبَادِي لَيْسَ لَكَ عَلَيْهِمْ سُلْطَانٌ إِلَّا مَنِ اتَّبَعَكَ مِنَ الْغَاوِينَ ﴾[2] واتە: بەڕاستی تۆ هەرگیز دەستت بەسەر بەندەكانی مندا ناڕوا مەگەر ئەوانەی بكەونە شوێنت لە گومڕاهەكان.

ئەو جۆرە كەسانە خوای گەورە دەربارەیان لە كۆتایی سورەتی (الفرقان) فەرمویەتی: ﴿يَمْشُونَ عَلَى الْأَرْضِ هَوْنًا ﴾[1] واتە: بەندەی بەڕاستی بەندەیی‌كەری خوا ئەوانەن بەئارامی بەسەر زەویدا ئەڕۆن و بە ئەدەبەوە هەڵسوكەوت ئەكەن.

---

١- ص: ٨٣

٢- الحجر: ٤٢

وه لەسورەتی (الإسراء)دا: ﴿بَعَثْنَا عَلَيْكُمْ عِبَادًا لَّنَا أُولِي بَأْسٍ شَدِيدٍ﴾[2] واتـه: چەند بەندەییّکی بەهیّز و ئازا لە بەندەکانی خۆمان ڕەوانە ئەکەین بۆ سـەرتان بە دواتاندا ئەگەڕیّن و لەناومالّاندا ئەتانگرن و سزاتان ئەدەن.

هـەروەها لەسـورەتی (المؤمنـون)یشـدا فەرمویـەتی: ﴿قَدْ أَفْلَحَ الْمُؤْمِنُونَ﴾[3] واتە: بەڕاستی خاوەن باوەڕەکان ڕزگاریان بووە.

لەخەسلّەتەکانی ئەم جۆرە بەندانە ئەوەیە دلّسۆزن نەك هەر دلّسۆزن بـەلّکو خوای گەورە بەتایبەتی بۆخۆی جیاکردونەتەوەو وابەستەن بـەخوای خۆیانـەوە، نموونـەی ئەمـە (حـەزرەتی یوسـف)ە، بـەم شێوەیە دوژمنایـەتی شـەیطـان بـۆ ئادەمیزاد دەستی پێکرد.

ئـیتر لیّـرەوە کارەکـانی شـەیطـان خـۆی و شـویّنکەوتوەکانی لـەئادەمیزادو پەریەکان جیّبەجێی دەکەن شەیطان هەرخۆی نیە بەلّکو نەوەشی هەیە:

﴿وَأَجْلِبْ عَلَيْهِم بِخَيْلِكَ وَرَجِلِكَ وَشَارِكْهُمْ فِي الْأَمْوَالِ وَالْأَوْلَادِ وَعِدْهُمْ وَمَا يَعِدُهُمُ الشَّيْطَانُ إِلَّا غُرُورًا﴾[4] واتە: بە سوارەو پیادەتەوە پەلاماریان بدە. هەموو هێزێك بۆ هەلّخەلّەتاندنیان بخەرەکار. لە مـالّی حـەرام و ئـەولادی حەرامـدا هاوبەشـیان بە. بە درۆو دەلەسە بەلّێنیان بدەرێ. بەلّێنی شـەیتان تـەنها بەوەیـە کـە کـاری خراپ و ڕەوشتی ناشرینیان لە بەرچاو جوان بکات. کەواتە یـەکێك نـیـە بـەلّکو زۆرن.

---

١- الفرقان: ٦٣

٢- الإسراء: ٥

٣- المؤمنون: ١

٤- الإسراء: ٦٤

هـەروەها شـوێنکەوتەی هەیـە لـە ئـادەمیزادو پەریـەکان، لـە ئامارێکدا کـە لەئەمریکا کراوە بۆیان دەرکەوتوە (٥٠٠٠) شەیطان پەرست لەو وڵاتەدا دەژین، هەروەها (٧٠٠) هەزار لە ئەوروپا (٧٠) هەزار لەوڵاتانی ئـەفریقیادا وەکو دەڵـێن نهێنیەکانی شەیطانی گەورەیان لایەو نهێنی هێنانیشیان بـۆ لای خۆیـان ئەوەیـە کە شەیطان تاکە هەڵگەڕاوەیە لەخوا.

هەروەها پێغەمبەر ﷺ چەندین کەسی تری لە شوێنکەوتوانی شەیطانـی پـێ ناساندوین وەك ئافرەتانێ نەپۆشتەو نەڕوتن و ئەوانەی بە نـازەوە دەڕۆن بـەناو خەڵکیدا بۆ سەرنج ڕاکێشانی خەڵکی وەکو ئافرەتانی پێشـبڕکێی جوانی و ڕێـك پۆشی.

شەیطان هەموو شەوێك هەڵدەسێت بەدواداچونی شوێنکەوتوانی، عەرشەکەی لەسـەرئاو دادەمـەزرێنێت وەکـو لـە فەرمایشـتێکدا دەفـەرموێت کوڕەکـانی کۆدەکاتـەوەو دەڵێـت: کـێ ئـەمڕۆ موسـوڵمانێکی بـۆ بەدڕەوشـت کـردوم هـەتا تاجەکەم بخەمـە سـەری؟ واتـە بەتـەواوی مانـا بەدڕەوشـتی کردبێـت بـەجۆرێك لەهەموویان زیاتر بەدڕەوشت بێت، سەرۆکی بەشی بەدڕەوشتی کردن.

هەریەك لەکوڕەکانی هەڵدەستن بە چەند کارێك هەیانە دەڵێت فلانم گومڕاکرد لەوازهێنان لەنوێژ. شەیطانیش دەڵێـت: بـەیانی بەئاگادێتـەوەو تەوبـە دەکـات و دەست دەکاتەوە بەنوێـژ! هیچـت نـەکرد، یـەکێکی تـر دەڵێـت: فـلان کەسـم وا لێکـرد ڕۆژوو نـەگرێت شـەیطـانـیش دەڵێـت: بـەیانی تەوبـە دەکـات و ڕۆژو دەگرێتەوە هیچت نەکردووە، زیرەکی ئاوا دەبێت! هەتا یـەکێکی تریـان دێـت و پێی دەڵێت: وام لە فلان کـەس کـرد هاوسـەرەکەی تـەڵاق بـدات، ئـەم کارەیـان بەچاك دەدات لەقەڵەم و لەدانیشتنەکەدا لەخۆی نزیك دەکاتەوە چـونکە بچڕانی پەیوەندی و سۆزی خزمایەتی و جیابوونەوەی دوو خێزان لەیەکتری تیایە.

لەبەرئەمە هەموو موسوڵمانێك بانگ دەكەم سەرئەنجامی كێشەی نێوان خۆیان و هاوسەرەكانیان نەگەیەننە ئەم ئاستەو تەڵاق نەبێتە ئاسانترین كار لامان.

گومانی تێدا نییە هەریەكێك لە ئێمە شەیطانێكی هەیە كاتێك پێغەمبەر ﷺ ڕۆیشت بۆ سەردانی خەڵكی بەقیع و پاشان گەڕایەوە بۆلای خاتو عائیشە و پێی فەرموو: شەیطانەكەت سەردانی كردیت؟ ئەویش فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوا منیش شەیطانم هەیە؟ فەرمووی: هەموو موسوڵمانێك هەیەتی. پاشان وتی: ئەی پێغەمبەری خوا تۆش هەتە؟ فەرمووی: بەڵێ منیش هەمە، بەڵام خوای گەورە كۆمەكی كردم و موسوڵمان بوو، وشەی (أسلم) واتە پێغەمبەر ﷺ لەشەڕو خراپەی بەدوور دەبێت و هیچ شتێكی خراپ لەبەرچاوی پێغەمبەر ﷺ جوان ناكات.

دوو ڕوداو لەگەڵ شەیطاندا هەیە، **ڕووداوی یەكەمیان:** لەكاتی نوێژدا بوو هات بۆلای پێغەمبەر ﷺ ئەویش بردی و ویستی بیبەستێتەوە بەكۆڵەكەی مزگەوتەكەیەوە بەڵام دوعاكەی حەزرەتی سولەیمانی بیركەوتەوە كە فەرمووی: ﴿رَبِّ ٱغۡفِرۡ لِي وَهَبۡ لِي مُلۡكٗا لَّا يَنۢبَغِي لِأَحَدٖ مِّنۢ بَعۡدِيٓ﴾[1] واتە: خوایە! لێم ببوورەو فەرمانڕەوایيەكی وام پێ ببەخشە پاش خۆم شایانی كەسی تر نەبێ، ئیتر وازی لێ هێنا.

**ڕووداوی دووەمیان:** بەشەو هاتە لای هەتا نوێژەكەی لەدەست بدات پێغەمبەر ﷺ قوڕگی توند گرت بەجۆرێك لیكی ڕژا.

كەواتە شەیطان قەبارەو شێوەو دیمەنی هەیە لەپەریەكان ژن دەهێنێت، نێرو مێیان هەیە، لەنێو پەریەكاندا بڕوادارو بێ باوەڕ هەیە: ﴿وَأَنَّا مِنَّا ٱلۡمُسۡلِمُونَ

---

١- ص: ٣٥

﴿ وَمِنَّا ٱلۡقَٰسِطُونَ ﴾[1] واتـه: هـەروەها ئەيشـيانوت: ئێمـە ئێسـتا موسوڵمانيشـمان تيايەو لە ئيسلامەتى لاداويشمان تيايە.

﴿وَمِنَّا دُونَ ذَٰلِكَ ﴾[2] واتە: هيـى واشمـان تيايـە لەمانـە ئايـەخترن و چاكەيان بـۆ كەس ناوێ.

پێغەمبـــەر ﷺ ﴿ سَنَفۡرُغُ لَكُمۡ أَيُّهَ ٱلثَّقَلَانِ ﴾[3] ى بۆنـــاردن واتـــە: بێگومـــان لەمەولا دەسمان بەتاڵ ئەبێ بۆ لێپرسينەوەو حيساب و كيتـاب لەگـەڵ كردنتـان لەو دنيادا ئـەى جووتـە كۆمەڵەكـەى ئـادەمزادو پـەرييان. بـەڵام ئـەوان جيهـانى تايبەت بەخۆيان هەيە هەموويان لەلايەن ئيبليسى باوكيانەوە ئاڕاستەدەكرێن.

موسـوڵمانان ئـەركى نوێـژو ڕۆژو و زەكاتيـان دراوە بەسـەردا پێغەمبـەر ﷺ دەڕۆشت بۆلاى پەريەكان و دەربارەى سورەتى (الجن) قسەى لەگەڵدا دەكردن.

كەواتە ئادەم باوكى مرۆڤەكانە شەيطانيش باوكى پەريەكانە.

شـــەيطـــان نـــاوێكى زۆرى هەيـــە لەوانـــە: (الغـــرور) واتـــە: لـــەخۆبايى بـــوو ﴿وَلَا يَغُرَّنَّكُم بِٱللَّهِ ٱلۡغَرُورُ ﴾[4] واتە: شەيتانى ئينسان خەڵەتێن واتان لێ نـەكا لە خوا بەلەسە بن و دەست بدەنە بێ فەرمانى و گوناهكردن.

هەروەها يـەكێكى تـر لـەناوەكانى (الطـاغوت) واتـە: هەرشـتێك بێـت بێجگـە لەخوا بپەرسترێت، ديارە (الطاغوت) لە شەيطانەوەيە.

---

١- الجن: ١٤

٢- الجن: ١١

٣- الرحمن: ٣١

٤- لقمان: ٣٣

## هەنگاوەکانی شەیطان:

شەیطان چەندین هۆکارو شێوازی فریودانی هەیە، یەکەم کار کەدەیکات فەرمان دەکات بە خراپەکاری، بۆنموونە سەیری حەرام کراوت لا حەلاڵ دەکات.

حەرام جوان دەکات و دەیڕازێنێتەوەو حەلاڵیشت لا دزێو و ناشیرین دەکات.

پاشان لەدڵە ڕاوکێ کردندا بەردەوام دەبێت بێ ماندوو بوون لەبەرئەوەی ئەوە کارو پیشەیەتی، بەشەو و ڕۆژ واز لە ئادەمیزاد ناهێنێت بۆنموونە کاتێك بەندە دەچێتە نوێژەوە دێتە لای و گومانی لە دەست نوێژەکەی بۆ دروست دەکات، یاخود ڕکاعەتەکانی لێ تێك دەدات، بەوجۆرە.

بۆئەوەی لە کێشەی دڵەڕاوکێ یان بێ ئاگابوون دەرباز ببیت پێویستە ئادەمیزاد بزانێت کە تەنها ئەو نوێژەی بۆ دەبێت کە تیایدا بەئاگایە، کەواتە چارەسەر لە نوێژکردنی بەکۆمەڵدایە ئەگەر هەڵە بکەیت یان نا بەویستی خوا نوێژەکەت وەرگیراو دەبێت.

ئایا شەیطان بۆ هەموو کەس دێت؟ ئەوانە کێن کە لەبەرزترین پلەی باوەڕدان؟ بەڵێ شەیطان بۆ هەموو کەس دێت تەنانەت ئەو باوەڕدارانەی کە لەبەرزترین ئاستدان، سەیری فەرمایشتی پەروەردگار بکە کە دەفەرموێت:

﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ ٱتَّقَوْاْ إِذَا مَسَّهُمْ طَٰٓئِفٌ مِّنَ ٱلشَّيْطَٰنِ تَذَكَّرُواْ فَإِذَا هُم مُّبْصِرُونَ ﴾[1]

واتە: بێگومان ئەوانەی لە خودا ئەترسن‌و خۆیان لە گوناه دوور ئەخەنەوە ئەگەر سووسەیێ لە شەیتانەوە لێیان بداو غافڵیان بکا گورج بیر ئەکەنەوە لە گەورەیی‌و زانایی خوداو ئەبینی گورج چاویان بینایەو دڵیان زانایەو ڕۆحیان ئاشنایە.

---

١- الأعراف: ٢٠١

ئەمە بەرزترین پلەی لەخواترسانە، لەكاتی گومڕابوندا (الإغواء) ئەوەتان لەیادبێت ئەمە دوژمنتانە ئەوەشتان لەیادبێت كە پێغەمبەر ﷺ هۆشیاری پێ داوین.

(فَإِذَا هُم مُّبْصِرُونَ ) وەكو ئەوەی شەیطان ئادەمیزاد دوچاری كوێربوون بكات، كوێربوونی ژیریی، واتە ڕاستی شەیطان ببینن. لەبەرئەوە نزا دەكەین: (اللهم أرنا الحق حقا وارزقنا اتباعه وأرنا الباطل باطلا وارزقنا اجتنابه) واتە: خوایە گیان ڕاستیمان فێربكەو نیشانمان بدەو بمانگێڕە لە شوێنكەوتوانی ڕێبازی ڕاستی و ڕێگەی چەوتیشمان بۆ ئاشكرا بكە، تا بەرچاو ڕونبین و دوورمان خەرەوە لێی.

شەیطان بەنێو دەمارەكانی جەستەی ئادەمیزاددا دەڕوات، ئەگەر ئەوكەسە یادی خوای كرد دەچێتەوەیەك، ئەگەر بێ ئاگاش بوو دەست دەكات بەجوڵەو دڵەڕاوكێ دروست دەكات كارە ناشیرینەكانی لاجوان دەكات: ﴿ وَإِمَّا يَنزَغَنَّكَ مِنَ ٱلشَّيْطَٰنِ نَزْغٌ فَٱسْتَعِذْ بِٱللَّهِ ﴾[1] واتە: ئەگەر لەلایەن شەیتانەوە خەیاڵێكی خراپ و نابار هات بە دڵتا پەنا بە خودا بگرە لە بەدی ئەو خەیاڵەو بڵێ (أعوذ بالله من الشیطان الرجیم) خودا دوعات ئەبیسێو زانایە بە ئەحواڵت.

تەنانەت لەنێو نوێژەكاندا پەنا دەگرین بەخوا لێی لەبەرئەوەی وتویەتی :

﴿ لَأَقْعُدَنَّ لَهُمْ صِرَٰطَكَ ٱلْمُسْتَقِيمَ ﴾[2] واتە: چەقی ڕێگا ڕاستەكەتیان لێ ئەگرم و بۆیان دائەنیشم و، لەو ڕێگایە لایان ئەدەم و گومڕایان ئەكەم.

دەڕوات بۆ شوێنی پەرستگاكان نەك شوێنی سەرپێچی و خراپەكاری، خوێندنی قورئان دەبڕێت لەكاتی نوێژدا بۆیە دروستە پەنابگرین بەخوا لە

---

١- الأعراف: ٢٠٠

٢- الأعراف: ١٦

شـەيطـان، شـەيطـان تەنانـەت لـەكاتى نوستنيشـدا واز لـەئادەميزاد ناهێنێـت، شەيطـان لـەرا سـەرى ئـادەميزادەوە دادەنيشـێت سـێ گرێـى لێدەدات، ئەگـەر ئەوكەسـە هەڵسـا بـۆ نوێـژى بـەيانى و يـادى خـواى كـرد واتـە ذيكـرى لەخـەو هەستانى خوێند ئەوا گرێيەك دەكرێتەوە، ئەگەر دەست نوێژى گرت ئـەوا گرێـى دووەميش دەكرێتەوە، كاتێك نوێژەكەشى كرد ئەوا گرێى سێيەميش دەكرێتەوە ئەوكاتە كەسێكى چالاك و سنگ فراوان دەبێت.

بەڵام ئەوەى وازى لەنوێژ هێنا ئەوا شـەيطـان پێـى دەڵێـت بخـەوە شـەوێكى درێژت لەبەردەمدايە هەتا كاتێـك بـەئاگادێت خـۆر هـەڵهاتووەو شـەيطـان ميـزى كردووە بە گوێكانيدا.

بيهێنەرە بەرچاوت سەراپاى گەلێك شەيطان ميز بكات بەگوێچكەو دەميانـدا داخۆ هەڵس و كەوت و كردەوەيان چۆن بێت داخۆ چى لەو كارمەندە چـاوەڕوان بكەيت هەر بەوجۆرە قسەيەكى خێرى لێ نابيستيت. هەموو موسوڵمانێك دەست دەگرێت بەهـەموو هۆكارەكانـەوە بۆئـەوەى نوێـژى بـەيانى بەكۆمـەڵ لەدەست نـەدات يەكـەم چـوار ئايـەتى سـەرەتاى سـورەتى (الكهـف) لـەپێش خەوتنـدا دەخوێنێت ئەوەش دەبێتە هۆكارى بەئاگاهاتنەوەى بۆ نوێژى بەيانى. شەيطـان باسێكى تريشى هەيە ئەويش دەيكاتە كەسێكى ئارەزووبـاز: ﴿كَٱلَّذِى ٱسْتَهْوَتْهُ ٱلشَّيَـٰطِينُ فِى ٱلْأَرْضِ حَيْرَانَ﴾[1] واتە: ئايا ڕەوايە وەكو ئەوانەمان لێ بێ كە شـەيتان لە خشتەى بردوون و بە سەر زەويدا سەرگەردان و بێ ئامانج ئەسووڕێنەوە.

واتـە ئارەزووبـازى دەخاتـە نێـوان حـەڵاڵو حەرامـەوە، وەكـو گـەلى(لـوط) ئەنجاميان‌دا. ﴿أَخْرِجُوهُم مِّن قَرْيَتِكُمْ ۖ إِنَّهُمْ أُنَاسٌ يَتَطَهَّرُونَ﴾[2] واتە: لـووط و

---

١- الأنعام: ٧١

٢- الأعراف: ٨٢

جەماعەتەکەی لەم دێیەتان دەرکەن، ئەمانە خەڵکێکن خۆیان لە کردەوەی ئێمە پاك ڕائەگرن و حەز لە کاری ئێمە ناکەن!.

لێرەوە هاوسەنگی تێکدەچێت لەبەرئەوەی شەیطان دەوری داوە پاشان هەڵدەسێت بەجوان کردنی ناڕەواییو دەیکاتە ڕەوا وەکو باسی سو، دەڵێت: ئەمە وەبەرهێنانە، بەڵێ بەم شێوەیە ناڕەوایی دەڕازێنێتەوە لەپێناو بەدەستهێنانی سامانی زۆردا.

شەیطان لەگۆڕەپانی مەحشەردا وتارێکی هەیە: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ وَعَدَكُمْ وَعْدَ ٱلْحَقِّ وَوَعَدتُّكُمْ فَأَخْلَفْتُكُمْ ۖ وَمَا كَانَ لِىَ عَلَيْكُم مِّن سُلْطَٰنٍ إِلَّآ أَن دَعَوْتُكُمْ فَٱسْتَجَبْتُمْ لِى ۖ فَلَا تَلُومُونِى وَلُومُوٓا۟ أَنفُسَكُم ۖ مَّآ أَنَا۠ بِمُصْرِخِكُمْ وَمَآ أَنتُم بِمُصْرِخِىَّ ۖ إِنِّى كَفَرْتُ بِمَآ أَشْرَكْتُمُونِ مِن قَبْلُ ۗ إِنَّ ٱلظَّٰلِمِينَ لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾[1]

واتە: شەیتان بە دۆزەخییەکانی وت: خودا بەڵێنی پێ دان و ڕاستی لەگەڵ کردن و هێنایەدی، منیش بەڵێنم پێدان کە حیساب نییەو درۆم لەگەڵ کردن. من هیچ زۆرێکم نەبوو بەسەرتانەوە، تەنها ئەوەندە بوو بانگم کردن بۆ ڕێگای چەوت و بەگوێتان کردم. ئێستە سەرزەنشتی من مەکەن. سەرزەنشتی خۆتان بکەن کە بەگوێتان کردم. نە من ئەتوانم ئێوە لە سزا ڕزگار بکەم و نە ئێوەیش ئەتوانن من ڕزگار بکەن. من ئیمانم بەوە نییە کە لەمەوپێش ئێوە منتان کردە هاوبەشی خودا. بەڕاستی ستەمکاران سزای سەختیان هەیە.

بۆیە کاتێك دەچینە شوێنی دەست بەئاوگەیاندن پەنابەخوا دەگرین لە شەیطان، وەکاتێك دەخەوین کاتێك دەکەوینە جوڵە زمانت پاراو دەبێت بەیادی خوا، هەروەها شەیطان ناچێتەماڵێکەوە سورەتی (البقرة)ی تیا بخوێنرێت،

---

١- إبراهيم: ٢٢

هەروەها لەساتی چونە نێو کەعبەوە پەنابەخوا دەگرین لە شەیطان، شەیطان دەڵێت ئەمڕۆ نەدەمێننەوە نەنانی شەو دەخۆن، هەروەها لەکاتی نان خواردندا نابێت شەیطان دەستی بەدەستتەوە بێت لەنان خواردندا بۆیە پێغەمبەر ﷺ وەسیەتی کردوە بەناوی خواوە دەست بکەین بەنان خواردن ئەوەیش بیری چوو دەکریٚ لەناوەڕاست و کۆتاییدا بیڵێت.

شەیطان ئادەمیزاد دەخاتە چەند هەنگاوێکەوە: ﴿وَلَا تَتَّبِعُواْ خُطُوَٰتِ ٱلشَّيۡطَٰنِ﴾[1] واتە: دوای قسەو وەسوەسەی شەیتان مەکەون.

شەیطان هەنگاو بەهەنگاو بەرەو سەرپێچیت دەبات، وات لیٚ دەکات لەپێناو بەدەستهێنانی پلەو پایەیەکدا دووڕوویی بکەیت، وات لیٚ دەکات چروکی بکەیت لەترسی ئەوەی نەبادا لەداهاتوودا هەژار ببیت یاخود لەبەر داهاتوی منداڵەکانت وە بەوجۆرە...

وەکو وتمان هەنگاو بە هەنگاو لەگەڵتدا دیٚ بیٚ ئەوەی کۆڵ بدات و ماندوو ببێت سەرەتا بەوە لەگەڵتدا دەست پیٚ دەکات لەئایینەکەت دەردەچیت، گومانت لەباسە نادیارەکان بۆ دروست دەکات وەك سزای گۆڕو ڕۆژی دوایی و فەرزەکانی وەکو باڵاپۆشی.

ئەگەر لەوەدا شکستی هێنا هەوڵ دەدات لەدەرگای داهێنراوەکانەوە (البدع) بێتە ژوورەوە واتە زیادە یاخود کەم و کوڕی ئایین، بۆنموونە وا لەخەڵکی دەکات بەدەوری گۆڕەکاندا بسوڕێنەوە، ئەگەر لەمەشدا شکستی هێنا ئەوا لەدەرگای گوناهە گەورەکانەوە دێتە ژوورەوە، وەکو ئەوەی قەناعەت بەکارمەندێك دێنێت کەهەژارەو موچەکەی بەشی ناکات سروشتیە ئەگەر بەرتیل وەربگریت کارە

---

١- الأنعام: ١٤٢

نارەواکانی لەلا جوان دەکات و قەناعەتی پێدەکات کەئەوەی وەریگرتووە بەرتیل نییە بەڵکو دیاریەو هەموو کەسێکیش دیاری وەردەگرێت.

بەڵام ئەگەر بۆی دەرکەوت باوەڕەکەت بەهێزە ئەوا گوناهە بچوکەکانت لا خۆشەویست دەکات وەکو سەیر کردنی حەرام و گوێ گرتن لە گۆرانی خراپ قەناعەتیشت پێدەکات کە ئەوانە بۆ هێور کردنەوەی دڵ و گیانە.

ئەگەر لەمەشدا سەرکەوتنی بەدەست نەهێناو بۆی دەرکەوت کە باوەڕت چەندە بەهێزە لەدەرگای زۆر بەکارهێنانی شتە ڕێگە پێدراوەکانەوە دێتە ژورەوە بۆت وەکو فراوان کردنی خانوەکەت کڕینی سەیارەی زۆر گرانبەهاو زێڕو سامانی زۆر هەتا ببیتە بەندەو لەگەڵیدا بڕۆی.

ئەگەر لەم کارەشدا سەرکەوتنی بەدەست نەهێنا ئەوا چەند کەسێك لەسەربازەکانی ئادەمیزادو پەریەکانت بۆ دیاری دەکات هەمیشەو لەهەموو هەڵوێستێکدا بەدواتەوە بن.

کەواتە باسەکە بەندە بەوەی تاچەندێك تۆ پشتت بەخوا بەستووە ئەگەر لەگەڵتدا بێت ئەوا تۆ لەقەڵای ئەودایت بۆیە دەبێت هەمیشە یادی خوا بکەیت و شوێنکەوتەی قورئان و سوننەت بیت، دەبێت نیەتت بۆ خوا پاك بکەیتەوەو لەنێو کۆمەڵی موسوڵماناندا بیت و پشتی شەیطان و شوێنکەوتوانی نەگریت هەتا دەبیتە بەندەیەکی پاك و تەقواداری پەروەردگار: ﴿ إِنَّ عِبَادِي لَيْسَ لَكَ عَلَيْهِمْ سُلْطَانٌ ﴾[1] واتە: بەڕاستی تۆ هەرگیز دەستت بەسەر بەندەکانی مندا ناڕوا.

---

[1]- الحجر: ٤٢

## یەکەمین مژدە پێدراو بەئاگری دۆزەخ...

یەکەم کۆمەڵ لەمێژوودا کەمژدەی بەئاگر پێ درا گەلی نوحە لەبەرئەوەی ئەوگەلە لادەرو هەڵگەڕاوەیەکی زۆر سەیربوون، سەیری بانگی حەزرەتی نوح بکەن بۆ کوڕەکەی: ﴿يَٰبُنَيَّ ٱرۡكَب مَّعَنَا﴾[1] واتە: ڕۆڵە کوڕم وەرە سوار بە لەگەڵمان. وەکو ئەوەیە بانگی هەموو مرۆڤایەتی کردبێت بۆئەوەی نغرۆی ژێر ئاو نەبن.

بەڵام مرۆڤایەتی سورە لەسەر نغرۆبوون. هیچ کاتێك مرۆڤایەتی ناحەوێتەوە هەتا نەگاتە نێو کرۆکی ئیسلام، حەزرەتی نوح (٩٥٠) ساڵ لەنێو گەلەکەیدا مایەوە، کەمێك نەبێت باوەڕیان پێنەهێنا (وما آمن معه إلا قليل) وشەی (قليل) واتە لەخوار (١٠٠) کەسەوە.

بیهێنەرە بەرچاوت پێغەمبەرێك (٩٥٠) ساڵ بانگی گەلەکەی بکات کەمتر لەسەد کەس بڕوای پێ بهێنێت واتە هەرچەند ساڵ جارێك یەك کەسیان بڕوایان هێناوە؟!

لەگێڕانەوەیەك لەپەڕاوە تەفسیرەکاندا هاتووە خوای گەورە نیگا (وەحی) بۆ حەزەتی نوح نارد کەدرەخت بڕوێنێت، ئەویش ڕواندی و گەورە بوو پاشان پێی فەرموو: بیبڕەرەوەو وازی لێ بێنە با وشك بێتەوە، ئەویش چەند ساڵێکی دەوێت، پاشان فەرمانی پێکرد لەناوەڕاستی شارەکەدا کەلەمی بیابان دەوری داون دەست بکات بەدروستکردنی کەشتییەك: ﴿وَكُلَّمَا مَرَّ عَلَيۡهِ مَلَأٞ مِّن قَوۡمِهِۦ سَخِرُواْ مِنۡهُ﴾[2] واتە: هەرجارێ کە کۆمەڵێ لە قەومەکەی بەلایدا تێپەڕیان ئەکرد گاڵتەیان پێ ئەکرد.

---

١- هود: ٤٢

٢- هود: ٣٨

ئـەویش یاسـاکانی ژیانـە، خـاوەن حـەق تـوڕە نابێـت ئەگـەر خـەڵکی سوکایەتیان پێکرد یـاخود ئازاریانـدا. پێیـان دەوت نـوح شـێتەو لـەنێو خۆیانـدا دەیان چەوساندەوە.

نـوح وەچـەو نـەوەی هەشـتەمی باوکـە ئادەمـە. سـەیرکە چـۆن ئـادەمیزاد بەسروشتی دابـەزی ئەوکاتـەی ئـادەم لەبەهەشـت دابـەزی، پاشـان یەکـەم بـەڵا ڕوویـدا ئـەویش کوشـتنی هابیلـە لەلایـەن قابیلـەوە ئـەویش یەکێکـە لەمـژدە پێدراوانی دۆزەخ. ئیتر لەو ساتەوە مرۆڤایەتی دەستی کرد بەدوورکەوتنـەوە لـە یاسای خوایی یاخود ئێرەیی بردن هاتە کایەوە وەك چۆن هاتە ناو شەیطانـەوە بەرامبەر ئادەم، قابیل هابیلی کوشت کەهەر بەهۆی ئێرەیی بردنەوەبوو ئەمەش توندترین نەخۆشییەکانی دڵە.

**دڵ سێ جۆرە:** دڵێکی تەواو، دڵێکی نەخۆش، دڵێکی مردوو.

دڵـی تـەواو تاکـە دڵـە کەدەشـێت بۆگەیشـتن بـەخوا لـەڕۆژی قیامەتـدا :

﴿يَوْمَ لَا يَنفَعُ مَالٌ وَلَا بَنُونَ ۝٨٨ إِلَّا مَنْ أَتَى اللَّهَ بِقَلْبٍ سَلِيمٍ﴾[1] واتە: ئەو ڕۆژەی کە نـە دارایی و نە کوڕ سوودی نییەو دادی کەس نادا چونکە کەس بە پارەو بە کـوڕ و کەسوکار خۆی لە سزای ڕۆژی قیامەت پێ ڕزگار ناکرێ. بەڵام ئەگەر کەسـێ بـە دڵێکی ساف و ساغ وپاك لە گوناهەوە هاتبێتە حوزووری خوا، ئـەوە سـوود لـەو حاڵەی خۆی ئەبینێ.

ئەم دڵـە لـە دنیـادا تەندروسـتە لـە ئێرەیـی و خۆبەگـەورەزانین و ڕیاکـاری و نائومێد بـوون لـەڕەحمی خـوا، ئەگـەر دڵ تەندروسـت و چـاك نـەبوو بەندایـەتی کردن هیچ سودێکی نابێت. خوا لەفەرمایشتە قودسیەکاندا دەفـەرموێت: ((نوێـژ

١- الشعراء: ٨٨ - ٨٩

لەو کەسە قبوڵ دەکەم لەبەرامبەر گەورەیی مندا خۆبەکەمزان بێت، ستەم لەبەندەکانم نەکات و سورنەبێت لەسەر سەرپێچی کردنم)).

بەڵێ، لەدوای کوشتنی هابیل لەلایەن قابیلەوە مرۆڤایەتی نەخۆش کەوت و ڤایرۆسی شەیطانی ڕۆشتە نێو دڵەکانەوە، خوای گەورە پێغەمبەرانی ناردووە وەکو دکتۆرێك هەرکاتێك مرۆڤایەتی دوچاری نەخۆشی بووبێت دکتۆرێکی بۆناردووە، بۆیە دەبینین بەنی ئیسرائیل زۆرترین پێغەمبەریان بۆ نێردراوە لەبەرئەوەی نەخۆشیەکانیان زۆر بووە.

## بۆسەیەك کە ستەمکاران لێی دەرباز نابن...

بۆیە کاتێك حەزرەتی نوح گەلەکەی بانگکردو ئەوانیش بەدرۆیان خستەوە، خوای گەورە نیشانەیەکی پێدا ئەویش هاتنە دەرەوەی ئاوبوو لەتەنورو لوتکەی شاخەوە، ئەوەبوو نزای کردو فەرمووی: ﴿أَنِّي مَغْلُوبٌ فَانتَصِرْ﴾[1] واتە: خوایە! من بەدەست ئەم کافرانەوە بەزیوو ژێرکەوتووم، دەرەقەتیان نایەم، یارمەتیم بدەو سەرم بخە.

هەر موسوڵمانێکی ستەم لێکراو لەخوابپاڕێتەوە بەدڵسۆزی ئەوا بەفەزڵی خوا ڕزگاری دەبێت، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَفَتَحْنَا أَبْوَابَ السَّمَاءِ بِمَاءٍ مُّنْهَمِرٍ﴾[2] واتە: ئێمەیش دەرگای ئاسمانمان کردەوە بە باراندنی بارانێکی شەستەباران کە بە خوڕ ئەهاتە خوار. ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی ئاو زۆر بەلێشاو دادەبارێت:

﴿وَفَجَّرْنَا الْأَرْضَ عُيُونًا فَالْتَقَى الْمَاءُ عَلَىٰ أَمْرٍ قَدْ قُدِرَ﴾[3] واتە: زەویشمان هەڵقوڵاند بە چەندین کانیاوو سەرچاوە وەك بڵێی زەوی هەمووی کەوتووەتە سەرئاو، جا

---

١- القمر: ١٠

٢- القمر: ١١

٣- القمر: ١٢

ئاوی ئاسمان و ئاوی زەوی لەسەر فەرمانێ کە لە خواوە دەرچووبوو، بەیەك گەیشتن.

حەزرەتی نوح سواری کەشتیەکە بوو بەڵام کوڕەکەی و هاوسەرەکەی لەمژدە پێدراوانی ئاگربوون، ئەمەش تاقیکردنەوەیەك بوو بۆ حەزرەتی نوح، چۆن خەڵکی بڕوای پێ بهێنن و چۆن سود لەبانگەوازەکەی وەربگرن لەکاتێکدا هاوسەرەکەی و کوڕەکەی بڕوای پێ ناهێنن، بۆیە خوای گەورە لەبارەی هاوسەرەکەی و ژنەکەی لوط دەفەرموێت: ﴿كَانَتَا تَحْتَ عَبْدَيْنِ مِنْ عِبَادِنَا صَالِحَيْنِ فَخَانَتَاهُمَا فَلَمْ يُغْنِيَا عَنْهُمَا مِنَ اللَّهِ شَيْئًا وَقِيلَ ادْخُلَا النَّارَ مَعَ الدَّاخِلِينَ﴾[1] واتە: ئەم دوو ئافرەتە لەژێر نیکاحی دوو بەندەی پیاوچاکی ئێمەدا بوون کەچی خیانەتیان لەگەڵ کردن، بەناو لەسەر ئاینی مێردەکانیان بوون و لەڕاستیدا لەگەڵ کافرەکانی دوژمنی مێردەکانیان بوون، بۆیە مێردەکانیان نەیانتوانی هیچ سوودێکیان لە ڕاستی خوادا بگەیەننێ و، پێیان وترا: بچنە ناو ئاگری دۆزەخ لەگەڵ ئەو کافرانەی تێی ئەچن.

هەروەها تاقیکردنەوەی کوڕەکەی کەڕازی نەبوو سواری کەشتیەکە ببێت لەگەڵ باوکیدا ئەوەبوو لەبەر چاویدا نغرۆبوو.

لەبەرئەوە وتراوە ئەوەی پشت بەژیری خۆی ببەستێت یان بە بەرزترین فێڵی مێشکی بە گومانی ئەوەی لە لافاوی بەدڕەوشتی یاخود تیاچون دووری دەخاتەوە ئەوا نغرۆ دەبێت وەك چۆن کوڕەکەی حەزرەتی نوح نغرۆبوو.

ئەوەی بڕوای بەحەزرەتی نوح نەهێنا نغرۆی ئاوبوون، دیارە لەسەر زەوی مرۆڤی زۆر نەژیاوە. لەو سەردەمەدا مرۆڤەکان زۆر نەبوون. هۆکاری نغرۆبوون و ئەم سزا توندەش ئەوەیە کە مرۆڤایەتی لەسەرەتاکانیدا تەنها جوڵەو هەڵوێستی

---

١ - التحريم: ١٠

بەرچاو و هاوشێوەی بەلاوە گرنگە، ئەو دوژمنایەتی و هەڵگەڕانەوە توندەی کە لەبەرامبەر حەزرەتی نوحدا دەریان بڕی هیچ شتێك نەیدەگێڕایەوە سزایەکی توند نەبێت بۆیە بەو شێوەیە نغرۆی کردن ئەوەش سزایەك دەبێت بۆ هەرکەسێك کەوەکو گەلی نوح دەکات.

## هاوەڵانی ئوخدود:

هەروەها لەوانەی مژدە پێدراوی ئاگرن ئەوانەن کەهاوەڵانی ئوخدودیان شەهید کرد، (الأخدود) چاڵێك بوو لەزەویدا هەرچیەك بڕوای بەخوا هێنا خستیانە ناوی و بەزیندوویی سوتاندیانن بەسەرهاتەکە بەم شێوەیە بوو:

پادشایەك هەبوو جادوگەرێکی هەبوو، پادشا خەڵکی بانگ دەکرد هەتا بەندایەتی خۆی بکەن، جادووگەرەکە تەمەنی زۆربوو گەڕا بەدوای منداڵێکدا هەتا جادووەکەی فێربکات، هەتا خراپەکاری بەردەوام بێت! کەسانێك هەن چاکەیەکی بەردەوام دەکەن کەسانێکیش هەن خراپەیەکی بەردەوام دەکەن!!

منداڵێکیان بۆ هێنا هەموو ڕۆژێك دەڕۆشت بۆلای و کارو پیشەی جادوگەری فێردەکرد، ڕۆژێك لەسەر ڕێگاکەی قەشەیەکی بینی خواپەرستی دەکردو وتەکانی زۆر بەلاوە سەیربوو.

ئەوەبوو جادوگەرەکە مرد و لەدوای ئەو پادشاش نەخۆش کەوت ئەوەبوو منداڵەکەیان هێنا پێیان وت شتێك بۆ پادشا بکە بەڵکو چاك ببێتەوە، ئەویش ڕۆشت بۆلای پادشاو پێی وت دەستەکانت درێژبکەو بڵێ بەناوی خوا پادشا سەری سوڕماو وتی خوا کێیە؟ منداڵەکە وتی خوای من و خوای تۆ (ألله). پادشاکە وتی: بێجگە لەمن خوای ترت هەیە؟ وتی: بەڵێ خوای هەموو بونەوەرە.

ئـەوەبوو پادشـا فـەرمانی کـرد ئـەو منداڵـە بخەنـە بەلـەمێکی بچـوکەوەو لەناوەڕاستی دەریادا فڕێی بدەنە نـاوی، کاتێك بەسـتیانەوەو بردیـان منداڵەکـە وتـی: خوایـە لێمیـان دوربخـەرەوە بـەوەی خـۆت دەتـەوێت و چـۆن دەتـەوێت؟ ئەوەبوو بەلەمەکە هەڵگەڕایەوە بەسەریانداو خۆی بەسەلامەتی گەڕایەوە.

پاشا بەم ڕوداوە قەناعـەتی نـەکرد، وتـی ببیـەن بۆسـەر ئـەو کێـوەو لەسـەر لوتکەکەی فڕێی بدەنە خوارەوە ئەوەبوو بردیان و بەستیانەوە، منداڵەکە هەمان نزای کردەوە (اللهم أكفينيهم بِما شئت وكيف شئت) بـەم نزایـە کێوەکـە کەوتـە لەرزین ئەسـپەکان و سـەربازەکان کەوتنـە خـوارەوەو منداڵەکـەش بەسـەلامەتی گەڕایەوە.

منداڵەکە بەپادشای وت: ناتوانی بمکوژیت هەتا ئەم ڕمە هەڵنەگریت و نـەڵێی بەناوی خوای ئەم منداڵە ئینجـا تـیّم بگریـت، بـەڵام دەبێـت خـەڵکی ئـەم شـارە کۆبکەیتەوە، کاتێك پادشا ئەو کارەی کرد منداڵەکـە مـرد و سـەرجەم خەڵکەکـە باوەڕیان هێنا.

پادشا چاڵێکی گەورەی هەڵکەند ئینجا پاشگەزبوونەوەی لەخـەڵکی شـارەکە داواکـرد ئـەوانیش گوێڕایـەڵیان نیشـان نـەدا، پادشـا ئـاگرێکی گـەورەی لـەنێو چاڵەکەدا کردەوەو هەموویانی خستە ناوی، پیاو و ژن و منداڵ:

﴿ قُتِلَ أَصْحَٰبُ ٱلْأُخْدُودِ ﴿٤﴾ ٱلنَّارِ ذَاتِ ٱلْوَقُودِ ﴿٥﴾ إِذْ هُمْ عَلَيْهَا قُعُودٌ ﴿٦﴾ وَهُمْ عَلَىٰ مَا يَفْعَلُونَ بِٱلْمُؤْمِنِينَ شُهُودٌ ﴿٧﴾ وَمَا نَقَمُواْ مِنْهُمْ إِلَّآ أَن يُؤْمِنُواْ بِٱللَّهِ ٱلْعَزِيزِ ٱلْحَمِيدِ ﴾[1] واتـە: قەسـەم بە هەموو ئەوانەی وتران، لە ڕەحمەتی خوا دوورخراونەتەوە ئەوانەی خەنـەکیان هەڵکەنـد.* خەنەکـە هەڵکەنراوەکـە کـە ئـاگری پڕسـووتەمەنییە. * کاتـێ کـە خۆیان لە کەناری ئاگرەکەدا دانیشتبوون و،* ئاگایان لێ بوو چـییان بـە خـاوەن

---

١- البروج: ٤ - ٨

باوەڕەکان ئەکردو بە ئاگر سزایان ئەدان و، لە ڕۆژی قیامەتیشا شایەتی لەسەر یەك ئەدەن لەبارەی ئەو کارەوە کە بە موسوڵمانەکانیان ئەکرد لە دنیادا.* لەبەر هیچیش ڕقیان لێیان نەبوو لەبەر ئەوە نەبێ کە ئیمانیان هێنابوو بە خوای خاوەن عیززەت و ستایش کراو.

ئادەمیزاد هەر دەمرێت، کەواتە با لەسەر حەق بمرێت ڕاوەستاوی بۆئەو باشترە.

## گەلی سبأ:

لەو کۆمەڵانەی تر کە بەئاگر مژدەیان پێ دراوە گەلی سەبەئن (خاوەن شارستانیەتی یەمەن) گەیشتنە ئاستێك لەشارستانیەتدا هیچ کەسێکی تر نەگەیشتبووە ئەو ئاستە، بەڵام سوپاسی خوایان نەکرد. ئێمە سوپاسی هەرکەسێك لەخۆمان دەکەین کاتێك کارێکمان بۆ دەکات، بەڵام سوپاس نەکردنی خوای گەورە و سوپاس نەکردنی دایك و باوك لەچاوی خەڵکدا دەبینیت ئەمەش کارەساتەو فەرو پیت لەنێو کۆمەڵگاکاندا ناهێڵێت.

## گەلی صالح:

گەلی صالحیش لەمژدە پێدراوانی دۆزەخن، زانای نێو کێوەکان بوون (واتە زانایانی جیۆلۆجی) بوون، حەزرەتی صالح پێی فەرموون لەم شیوانەو لەنێو ئەو بەردەوە وشترێك دێتە دەرەوە. وتیان: چۆن؟!!، ئەوەبوو هاتە دەرەوە بۆلایان ئەوانیش زۆر سەریان سوڕما، حەزرەتی صالح پێی فەرموون: بەڵگەیەکی تریش هەیە، ئەم ئاوەتان لەگەڵدا دابەش دەکات ڕۆژێك ئەو ئاوەکە دەخواتەوەو ڕۆژێکی تر شیر دەدات بەهەمووتان، پاشان پێی فەرمون نەکەن ئازاری بدەن.

لەنێو ئەو شارەدا نۆ تاقم هەبوون خەریکی بەدڕەوشتی بوون لەزەویداو چاکسازییان نەدەکرد، ئەوەبوو گەورەکەیان دەیویست لەناوی ببات بەڵام دەترسا، قورئان دەفەرموێت: ﴿فَتَعَاطَىٰ فَعَقَرَ﴾[1] واتە: ئەویش زاتی کرد وشترەکە سەربڕێ و چوارپەلی بڕییەوە.

ئەوەبوو خۆی سەرخۆشکردو کێشای بەسەریداو کەوت و مرد، بەم کارەیان سزای خوایان بەسەردا باری ﴿فَدَمْدَمَ عَلَيْهِمْ رَبُّهُم بِذَنبِهِمْ فَسَوَّاهَا﴾[2] واتە: خوایش بەهۆی گوناهی خۆیانەوە غەزەبی لێ گرتن و سزای دان و هەڕەشەکەی صالحی لێ هێنانەدی. واتە ماڵەکانیان وای لێهات وەکو لەوەو پێش بوونی نەبووبێت.

لەبەرئەوەی ئەگەر بەدڕەوشت وازی لێ هێنرا بەئارەزووی خۆی هەر کارێك بکات ئەوا سەراپای کۆمەڵگە بەرەو خراپتر دەبات، ئەگەر واز لەوانە بهێنین کەفلیمی خراپ و بەرەڵایی و گۆڤاری شەرم ئاوەر بەرهەم بهێنن ئەوا فەرو پیت لەنێو کۆمەڵگادا هەڵدەگیرێت.

## خوا ستەم لەکەس ناکات:

ئەگەر سەیری ئەوگەل و کۆمەڵانە بکەین هەموویان پێغەمبەرانیان بەدرۆ خستۆتەوەو باوەڕیان پێ نەهێناون بەڵام سزاکان جیاوازیان هەبووە، لەبەرئەوەی مرۆڤایەتی لەسەرەتادا ژیرییان کەم و کورپوو هزرو بیریان پێنەگەیشتبوو ئەوکاتە سزاکەیان بەلافاو بوو هەموویانی لەناو دەبرد بەڵام گەلی عاد لەکێوەکان ماڵیان بۆ خۆیان دروست دەکرد ئەوان پیشەسازییان دەکرد بەو

---

١- القمر: ٢٩

٢- الشمس: ١٤

هیوایەی بەزیندوویی بمێننەوە لەبەرئەوە سزاکەیان بەئەندازەی گوناهەکانیان بوو ئەویش ڕەشەبایەکی نەزۆك بێ کەڵك وەکو مێشکیان.

گەلی لوط لەلای خواوەندەوە بەردباران کران بەجۆرێك هەر بەردێك ناوی ئەوکەسەی لەسەر نوسرابوو کە لەناوی دەبات، ئەوەش لەبەرئەوە بوو پێچەوانەی سروشتی مرۆڤایەتی جوڵانەوە تاوانەکەیان لادانی ڕەوشتی بوو کە هەندێك بەدروستی دەزانن بەبیانوی ئازادی.

بەڵام دەبێت هەموو شتێك بەپێی بەرنامەی خوا بەڕێوەبچێت، بۆنموونە هاوسەرداری ڕێگایەکی سروشتیە: ﴿هَٰؤُلَاءِ بَنَاتِي هُنَّ أَطْهَرُ لَكُمْ﴾[1] واتە: ئەوە کچەکانم لەخۆتانیان مارەبکەن، ئەوان چاکتر و پاکترن بۆتان.

ئەمە باری گەل و کۆمەڵەکان بوو، هەروەها لەسەر ئاستی تاکیش مژدە پێدراوانی ئاگر هەن، لەوانە موسەیلەمەی درۆزن، خەڵکی یەمەن بوو بانگەشەی پێغەمبەرایەتی دەکرد، ئەوەبوو پەیامبەرێکی ناردە لای پێغەمبەری خوا ﷺ و وتی لەموسەیلەمەی پێغەمبەری خواوە بۆ محەمەد پێغەمبەری خوا، دەیویست خۆی بکاتە هاوشانی پێغەمبەری خوا ﷺ.

هەروەها خەڵکانێکی تریش هەبوون کە بانگەشەی پێغەمبەرایەتییان دەکرد لەوانە سەجاح و ئەسوەدی عەنسی.

لەهەموویان مەترسیدارتر موسەیلەمە بوو نامەیەکی نارد بۆ پێغەمبەر ﷺ تیایدا نوسیبووی لەموسەیلەمەی پێغەمبەری خواوە بۆ محەمەد پێغەمبەری خوا، نیوەی زەوی بۆ ئێمەو نیوەکەی تریشی بۆ قورەیش، بەڵام قورەیش گەلێکن پەلامار دەدەن، والسلام علیکم ورحمة الله وبرکاته.

---

[1] - هود: ٧٨

پێغەمبەری خوا نامەیەکی بۆ نارد: لەمحەمەد پێغەمبەری خواوە ﷺ بۆ موسەیلەمەی درۆزن، زەوی بۆ ئەوکەسەیە کەخوای گەورە ویستی لەگەڵیدایە ئاکامی هەموو شتێك بۆ لەخواترسانە.

ئەوەبوو لەدوای کۆچی دوایی پێغەمبەر ﷺ زمان درێژی موسەیلەمە زیادی کرد ئەوەبوو کێشەی هەڵگەڕانەوەو ڕێگری لەزەکاتدان ڕوویاندا، حەزرەتی ئەبوبەکر بەهەڵگەڕاوەی لەقەڵەمدان، چونکە ئیسلام گشتگیرەو بەش بەش ناکرێت، نوێژو زەکات و ڕۆژو و حەج هەموو ئەمانە داواکراون پێکەوە ئەنجام بدرێن.

کێ دەتوانێت بڕوا بەئایەتێك بکات و بڕوا بەیەکێکی تر نەکات، یان هەر کەسێك نکوڵی لە ئایەتێکی قورئان بکات ئەوا لەئاییني خوا دەردەچێت، لەبەرئەوەی وەکو ئەوە وایە نکوڵی هەموو قورئانی کردبێت، خەڵکانێك هەن نکوڵی لەئایەتی باڵا پۆشی دەکەن و ئەمەش لەدیندا بە پێویستی ناسراوە.

بەڵام تەممەڵی نواندن لەگەڵ زانستدا بەفەرزبوونی نوێژ یان هەر فەرزێکی تر بێ نکوڵی کردنی ئەمەیان باسێکی ترە.

موسەیلەمە گەورەی گەلەکەی بوو سەجاحی خواست کەیەکێك بوو لە بەهێزەکانی گەلەکەی.. ئەوەی نامۆیە بەبێ مارەییدان کردیە خێزانی خۆی، کاتێك پرسیاریان لێکرد وتی: مارەییم پێ داون!! وتیان: کامەیە؟ وتی: نوێژی بەیانیان و عیشام بۆکەم کردنەوە. ڕۆژێك ئامۆزاکەی هات بۆلای و پێی وت: موعجیزەکانی تۆ چین؟ وتی: بۆم بشارەوە، ئامۆزاکەی پێی وت: تۆ درۆزنیت، بەڵام درۆزنێکی ڕەبیعە لەڕاستگۆیەکی زیانبەخش باشترە. ئەمەیە ئارەزووبازی و شوێنکەوتنی ئارەزوو.

حەزرەتی ئەبوبەکر خالیدی کوڕی وەلیدی نارده سەری، ئەوەبوو موسەیلەمە خۆی لە باخێکدا پەنادا دوایی ناونرا بە باخچەی مەرگ، گەلەکەی

موسەیلەمە جەنگاوەر بوون جەنگەکە بەردەوام بوو ئەوەبوو (وەحشی) کە بکوژی حەمزە بوو موسەیلەمەی کوشت، حەزرەتی ئەبوبەکر دورگەکەی جارێکی تر گێڕایەوە سەر باری خۆی.

هەروەها یەکێکی تر لە مژدە پێدراوانی دۆزەخ ئەبو لەهەب و هاوسەرەکەیەتی (ئەروای کچی حەرب) پێیان دەوت ئەبو لەهەب لەبەرئەوەی وەکو ئاگر لەڕوخساریدا بێت زۆر سپی و سور پێست بوو ناوی ڕاستەقینەی (عبدالعُزي)یە پێغەمبەر ﷺ لەلایەن ئەم بێ باوەڕەوە ئازارێکی زۆری چەشت لەوانە ئازاری دەروونی وەکو تەڵاقدانی کچەکانی لەلایەن کوڕەکانیەوە، تاکە کەسێك بوو کە پێغەمبەری ﷺ لەشیوی ئەبو طالبدا گەمارۆدا.

بۆیە فەرمایشتی خوا دەربارەی دابەزی: ﴿تَبَّتْ يَدَآ أَبِي لَهَبٍ وَتَبَّ ﴿١﴾ مَآ أَغْنَىٰ عَنْهُ مَالُهُۥ وَمَا كَسَبَ ﴿٢﴾ سَيَصْلَىٰ نَارًا ذَاتَ لَهَبٍ﴾[1] واتە: یاخودا وشك بن هەردوو دەستی ئەبوولەهەب و، وشکیش بوون. پارەو داراییەکەی‌و هەرچیی پەیدا کردووە هیچی سوودی نەبوو بۆی و دادی نەدا. لەمەوپاش ئەچێتە ناو ئاگرێکی بە کڵپەو بڵێسەوە.

ئیتر تەواو دوای دابەزینی قورئان گەڕانەوەی بۆ نیە هەروەها هاوسەرەکەشی زۆر ڕقی لەپێغەمبەری خوا بوو ﷺ زۆر بەخراپی مامەڵەی لەگەڵ کچەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ دەکرد، دڕك و داڵی لەبەردەمیدا دادەنا.

ئەم بەسەرهاتانە جۆرێکن لە هەڵگەڕانەوە لەخواو دژایەتی و بێ باوەڕی ئاشکراو نکوڵی کردن لەحەق.

فیرعەونیش نموونەیەکە لەستەمکاری و کینە لەبەرامبەر گەل، فەرمانڕەوایەکە گەلەکەی ڕقیان لێیەتی! بەنی ئیسرائیلی زۆر ئازاردا:

---

١- المسد: ١ - ٣

﴿يُذَبِّحُ أَبۡنَآءَهُمۡ وَيَسۡتَحۡيِۦ نِسَآءَهُمۡ﴾[1] واته: هەر منالێكی نێرینەیان لێ بهاتایەتە دنیاوە سەری ئەبڕی‌و منالی مێینەیانی بە زیندووی ئەهێشتەوە.

لەلای ئەو كاریان دەكرد بەبێ وەرگرتنی بەرامبەر لەبەرئەوە ساحیرەكان وتیان: ﴿إِنَّ لَنَا لَأَجۡرًا إِن كُنَّا نَحۡنُ ٱلۡغَٰلِبِينَ﴾[2] واتە: ئایا ئێمە پاداشتێكی چاكمان ئەبێ ئەگەر هات و سەركەوتین؟.

كاتێك نوقم بوون و خنكانی نزیك بووەوە وتی: باوەڕم بەخوا هێنا، بەلام ئەمە تەوبەی درۆزنەكانە، ئەمە تەوبەیەكە لەپێناو ڕزگاربوونە لەخنكان.

هامان و قارون یەكێكیان خۆی بەگەورە گرت، ئەوی تریشیان زەكاتی نەدەدا، ئەمانە هەموویان و ئەوانەی ئەو ڕێگایەی ئەوان دەگرێت ڕیسوای دنیاو تیاچوی ڕۆژی دوایین.

# دەرگاو پلەكانی دۆزەخ

## چەندێك ئاتاجی ئەوەین لێی بترسین:

دەبێت دڵی بەندە بەئاگر بلەرزێت لەبەرئەوەی هیچمان زیرەكترو بەرێزتر نین لە پێغەمبەری خوا ﷺ كاتێك باسی دۆزەخ دەكرا دڵی دەلەرزی و سنگی وەكو فیشەی مەنجەڵی كوڵاو دەینالاند، حەزرەتی عومەر(رەزای خوای لێ بێ) دوو هێڵ بەژێر چاویدا شۆڕبووبوونەوە بەهۆی گریان لەترسی خوای گەورە.

حەسەنی بەصری(رەزای خوای لێ بێ) كاتێك بە پێشنوێژی ئەم ئایەتەی خوێند: ﴿إِنَّآ أَعۡتَدۡنَا لِلظَّٰلِمِينَ نَارًا أَحَاطَ بِهِمۡ سُرَادِقُهَاۚ وَإِن يَسۡتَغِيثُواْ يُغَاثُواْ بِمَآءٍ

---

١- القصص: ٤

٢- الأعراف: ١١٣

﴿ كَٱلۡمُهۡلِ يَشۡوِي ٱلۡوُجُوهَۚ بِئۡسَ ٱلشَّرَابُ وَسَآءَتۡ مُرۡتَفَقًا ﴾[1] واتـە: ئێمـە ئاگرێکمـان ئامـادە کـردووە بـۆ سـتەمکاران دەوریـان ئـەگرێ و گـەمارۆیان ئـەدات. ئەگەر هاوار و فیغانیش بکەن و لە تینواندا داوای ئاو بکەن، ئاوێکیان پێ ئەدرێ وەك لەشی تواوە گەرمەو دەموچاو ئەبرژێنێ. ئای کە ئـاوێکی خراپـە! ئـای کـە ئاگر جێگای حەسانەوەیێکی بەدو ناخۆشە!.

بورایەوە هەروەها حەزرەتی عومەری کوڕی عەبدولعەزیزیش وابوو، کاتێك بـە ئایەتێك لەئایەتەکانی باسی ئـاگردا تێدەپـەڕی هەسـتی دەکـرد کەچـاو و گـوێی بەگڕەی ئاگری دۆزەخ دەسوتێت، بەدرێژایی شەو نەدەخەوت و بـەخوا پەرسـتی زیندوی دەکردەوە مامەڵەیان لەگەڵ قورئاندا بەو شێوەیە بوو، کاتێکیش باسـی بەهەشت دەکرا دڵیان دەهاتە جۆش و خرۆش لەبەرئەوەی دڵەکان پاك بوون.

پێویستە لەئاگر بترسین لەبەرئەوەی دەزانین کە بەسەریدا تێدەپـەڕین وەکـو خوای گەورە دەفەموێت: ﴿ وَإِن مِّنكُمۡ إِلَّا وَارِدُهَاۚ ﴾[2] واتە: کەس لە ئێـوە نیـیە نەچێتە ناو دۆزەخ.

بەڵاکە لێرەدایە مانای ئایەتەکە واتە پردی سیراط بەسـەر دۆزەخـدا دروسـت کراوە سەرجەم مرۆڤەکان دەبێت بەسەریدا تێپەڕن بۆیە دەبێت لەئاگر بترسین:

إذا كانت طباعُك طبـعَ سـوءٍ فـــــلا أدب ولا أديــــــبُ

مانای ئەوەیە کە دڵ وەکو لەپێشەوە وتمان، دڵی نەخۆش وەکو ئاوێنەیـەکی ژەنگ گرتوو وایەو وێنەکان وەکو خۆی نیشان نـادات، بـەڵام دڵـی هـاوەڵان دڵـی تەندروست و تەواو بـوو، ئایەتـەکانیان وەکـو خـۆی وەردەگـرت فەرمایشـتەکان وەك چۆن لەپەڕەکانی دڵی هاوەڵاندا نوسرابوو بەنورو ڕۆشنایی فەرمایشتی خوا

---

١- الكهف: ٢٩

٢- مريم: ٧١

ڕوناك بووبوویـەوە، هـاوەڵان وەكو قورئانێـك بـوون كـە دەجـوڵان، بـەڵام ئێمـە دڵەكانمان بەشتانێك پڕبووە نـەدەبوو پـڕ ببێـت، چـونكە كـاری دڵ یـادی خـواو ترس و ئومێدبوونە بـەخواو خۆشەویسـتییە لـەپێناوی ئـەوداو، بـۆ ئـەو زاتەیـەو ڕاستگۆیی نیەت و خۆشەویستی خەڵكانی تر.

دەبێت ئێرەیی و ڕق و كینـە تیایـدا بەهـەڵم بـن هـەروەها بـیٚ بـاك بـوون لـە (مَكـر)ی خـواو نائومێـدبوون لـەڕەحمی خـواو خۆبەگـەورە گـرتن لەبەرامبـەر خەڵكیداو هاوەڵ دانان بۆ خواو باوەڕنەبوون بەخواو پشـت كردنـە نیعمەتـەكانی خواو جێگەی بە دڵنیایی و ئارامگری و پشت بەستن بەخوا پڕ بكەینەوە.

ئێمـە دڵـەكانمان بەچییەوە سـەرقاڵ كـردووە؟ بـەدنیاوە سـەرقاڵمان كـردوە ئەگەر وادابنێین دڵ مەكینەیەكی بەنزینە تـۆ ئـاوت تێكـردووە، یـاخود ئامێرێكـە بەكارەبا كاردەكات تۆ ماددەیەكی ترت تێكردووە، دیارە پەكی دەكەوێت دڵیش وەهایە تۆ بەشتێكەوە سـەرقاڵی دەكـەیت كـەنابێت بـەوە سـەرقاڵبكرێت دیـارە بەوە لێوان دەبێت لە غەم و پەژارە.

وای لیٚ دێت كابرا لەنوێژی نیوەڕۆی نوێـژی هـەینی قسـەی لەگـەڵ دەكـات و لەگەڵیشت نیـە، بـیر لەكێشـەكەی خـۆی دەكاتـەوە لەگـەڵ خێزانەكەیـدا یـاخود لەگەڵ كوڕەكەیدا لەبەرئـەوەی پەیوەنـدی بەپەروەردگاریـەوە نـەكردووە ئەگـەر بیكردایە ئەوا پەنادانی ئەوی بەس بوو.

## ڕووناكییەكانی باوەڕو تاریكییەكانی بیٚ باوەڕی:

كورتترین ڕێگا پەیوەندی نێوان خـواو بەندەیـە، ئەگـەر بەنـدە وابەسـتە بـوو بەخوای خۆیەوە دڵی ڕووناك دەبێتەوە، لەوانەیە ئەگەر باسی ئاگریان بۆ بكەیت بگـرین. بـەڵیٚ، ئێمـە نكـوڵی لـەوە ناكـەین دەگـرین بـەڵام گریـانێكی كاتییـەو بەپێچەوانەی هاوەڵانەوە كە سەراپای تەمەنیان تەنها بۆ خوا ژیان.

بەهەشت دروستکراو فەرمان درا بەجبریل بڕوات سەیری بکات کاتێک گەڕایەوە وتی: هیچ کەسێ نییە لەنەوەی ئادەم گوێی لێبێت لەپێناویدا کارنەکات هەتا بچێتە ناوی پاشان خوای گەورە بەئازارو نارەحەتی دەوری داوە کارەکە هەروا ئاسان نییە.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ أَحَسِبَ ٱلنَّاسُ أَن يُتْرَكُوٓاْ أَن يَقُولُوٓاْ ءَامَنَّا وَهُمْ لَا يُفْتَنُونَ ﴿٢﴾ وَلَقَدْ فَتَنَّا ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ فَلَيَعْلَمَنَّ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ صَدَقُواْ وَلَيَعْلَمَنَّ ٱلْكَٰذِبِينَ ﴾[1]

واتە: ئایا ئەوانەی موسوڵمان بوون و باوەڕیان بە خواو بە پێغەمبەری خوا هێناوە، وا گومان ئەبەن هەر بەوەی کە وتوویانە باوەڕمان هێناوە وازیان لێبهێنرێو هیچ جۆرە تاقیکردنەوەیەکی ناخۆش و تاڵ و سوێریان نەیەتەڕێ؟ موسوڵمانانی پێش ئەم موسوڵمانانەیش کە لەسەر دەستی تۆدا باوەڕیان بە خواو بە ئایینی خوا کردووە، وەك ئەمان تاقیمان کردوونەتەوەو تاڵیو سوێریی ژیانمان بەهۆی موسوڵمان بوونیانەوە هێناونەتەڕێ تا خوا بزانێ کام لەمانە بەڕاستی موسوڵمان بوون و لەگەڵ خوای خۆیان ڕاست ئەکەن و بەرانبەر بە دەردو ئازار خۆیان ئەگرن و، کامیان درۆ ئەکەن و بەڕاستیان نییەو موسوڵمانی ڕاستەقینە نین.

دوو جۆر خەڵك هەیە، ڕاستگۆو درۆزن، وشەی (أَحَسِبَ) بۆ سەرسوڕمانە وەکو ئەوەی سەرسوڕمانی نارەزایی دەربڕینە: ﴿ أَحَسِبَ ٱلنَّاسُ أَن يُتْرَكُوٓاْ أَن يَقُولُوٓاْ ءَامَنَّا ﴾

ئەی کامەیە ئەو بەڵگەیەی کەمن باوەڕدارم، بۆنموونە کاتێك دەفەرموێت: بەئازارو نارەحەتی دەورە دراوە، ئەوەتا فەرمانت پێ دەکات هەستە نوێژی

---

١- العنكبوت: ٢ - ٣

بەیانی بکە ئەوەش گرانە، زمانت بگرە، چاوت داخە، گوێ لەگۆرانی مەگرە، مەڕۆ بۆ شوێنێك کە کاری خراپی تێدا دەکرێت، دڵت بۆ یادی خوا ببزوێنە، ئارام بگرە لەسەر ئەوەی دوچارت هاتووە، ببەخشە بەوکەسەی تۆی بێ بەشکردووە، سەردانی ئەو کەسە بکە کەسەردانت ناکات، لەوکەسە خۆشبە ستەمی لێ کردویت، هەموو ئەم نارەحەتیانە دژی ئارەزووەکانن هەرچییەك پێچەوانەو دژی ئارەزووە بەدەکان بێت لەخوات نزیك دەکاتەوە، هەرچیەکیش هاوشانە لەگەڵ ئارەزوودا لەخوا دورت دەخاتەوە.

بۆیە کاتێك بەهەشت بەنارەحەتی دەورە درا جبریل وایزانی باسەکە زۆر گرانە کەس ناتوانێت بچێتە ناوی مەگەر کەسێك خوا ڕەحمی پێ بکات.

پاشان خوای گەورە ئاگری دروست کردو فەرمانی بەجبریل کرد سەیری بکات زۆر بەترسەوە هات و فەرمووی: لێی ڕادەکەن، کەس ناچێتە ناوی مادام کاتێك بەئارەزووبازی دەورەدرا، بۆنموونە ئەوە تیۆرێکی چاکە، ئەم گۆرانیە خۆشە، ئەم سەمایە، ئەم دانیشتنە غەیبەتکردنی تیایە، ئەمە گاڵتە پێکردنی کەسێکی تیایە، ئەمە تەشەردانە لەکەسێك، ئەمە باسکردنی ئابڕوی کەسێکە، ئەمە سو و ماڵ و سامانی حەرامە، بەرتیل دان، بێ سەرو بەرەیی، لادان، تۆمەت، پاشان جبریل وتی: باوەڕناکەم کەس ڕزگاری ببێت لێی.

خەڵکی یان موسوڵمانن یان بێ باوەڕن، باوەڕدار لەنێو پێنج ڕوناکیدا تل دەخوات بێ باوەڕیش لەنێو پێنج تاریکیدا تل دەخوات، باوەڕدار کردارو ڕەفتاری ڕوناکییە، چونە ژورەوەی ڕوناکییە، هاتنە دەرەوەی ڕوناکییە، گۆڕەکەی ڕوناکییە، لەسەر سیراط ڕوناکییە، بێباوەڕیش وتەکانی تاریکن، هاتنەژورەوەی تاریکییە، هاتنە دەرەوەی ڕوناکییە، سەر پردی سیراطی

تاریکییە، پەنا بەخوا گۆڕەکەی تاریکە، ﴿ظُلُمَٰتُۢ بَعۡضُهَا فَوۡقَ بَعۡضٍ﴾[1] واتە: تاریکستانێك بێ هەندێ بەسەر هەندێکی تریەوە.

ئەگەر موسوڵمان لەئاگر ترسا لەگۆڕ ترسا ئەوا لەهەموویان ڕزگاری دەبێت، ئەگەر ئومێدی بەبەهەشت بوو وەك چۆن ئومێدی هەیە دەوڵەمەند بێت ئەوا هەردووکیانی دەست دەکەوێت، ترسانی موسوڵمان لەئاگرو ئارەزووی بۆ بەهەشت دەبێت ببێت بەکردەوەو کار پێکردن.

## بەشێك لەپرشنگی پێغەمبەریتی:

وەك دەزانین چەندێك ئادەمیزاد لەخوا نزیك بێتەوەو هەرکارێك کەئەنجامی دەدات لەبەر ڕەزامەندی پەروەردگاری بێت ئەوا بەو ڕۆحە بەرزەوە دەگات بەپلەی خەو بینینی ڕاست، بۆنموونە نورەدینی زەنگی، پێغەمبەر ﷺ هاتە خەوی پێی فەرمو: لەدەست ئەو دوانە ڕزگارم بکە، شێوەی ڕوخسارییانی پێ دەڵێت کەڕەنگی خەنەییە نورەدین زانایانی کۆکردەوەو لەسەر ئەو خەوەی ڕاوێژی پێکردن و خەوەکەی بۆ گێڕانەوە، ئەوانیش ئاماژەیان پێدا بڕوات بۆ مەدینە، ئەویش ڕۆشت بۆ ئەو شارەو خێرو سامانێکی زۆری وەك دیاری لەگەڵ خۆیدا پێ بوو هەموو خەڵکی مەدینەی بانگکرد، هەموویان هاتن بەڵام ئەو دووکەسەی کە لەخەوەکەدا بینی نەهاتبوون بەخەڵکی شارەکەی وت: کەسی تر هەیە لەخەڵکی ئەم شارە نەهاتبێت؟ وتیان دوو مەغریبی هەن هاتون بۆ فێربوونی زانست و خەڵکێکی چاکەکارن و زەکات و سامان بەسەر خەڵکیدا دابەش دەکەن. هەردووکیانی بانگکرد سەیری کرد هەمان ئەو دوو کەسەن کە لەخەوەکەدا بینینی. پرسیاری لێکردن: ماڵەکەتان لەکوێیە وتیان: دراوسێی مزگەوتەکەین ڕۆشت بۆ سەردانیان کتێب و پارەی بینی، سەری لەو ماڵە سوڕما

---

[1] - النور: ٤٠

ئەوەبوو بەناو ژوورەکەدا دەهات و دەڕۆشت هەتا قاچی بەر شتێك کەوت فەرمانی دەرکرد ڕاخەری سەرزەویەکە لابەرن، کاتێك لایانبرد چاڵێکیان بەرچاو کەوت بۆیان دەرکەوت وەکو تونێلێکە ئاڕاستەکەی بەرەو جەستەی پیرۆزی پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆشتووە ئەو دوو کەسە لە مەسیحییە مەغریبیەکان بوون فەرەنسییەکان ناردبوویانن و پارەیەکی زۆریان پێدابوون بۆ دروست کردنی ئەو تونێلەو دزینی جەستەی پیرۆزی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوەبوو هەر لەویادا لەگەردنی هەردووکیانی داو گەیاندنی بەسزای خۆیان.

هەروەها قەرامطەکانیش لەسەردەمی فاطمیەکاندا ویستیان بەردە ڕەشەکە بدزن ئەو ڕۆژە ڕۆژی هەشتەمی ئاودانی حاجیەکان بوو (٢٢٠٠٠) کەس کوژران کەبەرگریان لەبەردە ڕەشەکە دەکرد هەتا گێڕایانەوەو خستیانەوە شوێنی خۆی و خوای گەورە کەعبەی پاراست.

لێرەوە دەبێت بزانین خەڵکانێك هەن بڕوایان بەخوا هێناوەو پەیمانیان پێداوە بەگێڕانەوەی مافەکان بۆ هەر خاوەن مافێك هەروەها خەڵکانێك هەن لەسەر ناڕەوایین، بێ باوەڕەکانیش ڕووبەڕووی خەڵکانی ڕەوا دەبنەوە. سەیر دەکەیت ئەوانە شەڕو خراپەکاری لەناویاندا ڕواوە، خەڵکی بێ باوەڕی بەرنامەدار دەبێت ئیسلامێکی بەرنامەدار ڕووبەڕویان بێتەوە، ئارەزوو کوێرت دەکات و خەڵکیش کوێر دەکەیت بەهۆیەوە، ئەو ئادەمیزادەی کە خوای گەورە دڵێکی پاکی پێداوە ئەو کەسە بە گوناه و سەرپێچی ڕەشی دەکاتەوەو گوێ بەو گوناهو سەرپێچیانە نادات و هەروا بەسانایی بەسەریدا گوزەر دەکات، بێ ئەوەی ئەو ڕاستییە بزانێت کە گوناهێکی بچوك خاڵێکی ڕەش بەسەر دڵەوە دروست دەکات، ئەگەر ئەو بەندەیە بگەڕێتەوەو داوای لێخۆشبوون بکات دەسڕێتەوە، ئەگەر داوای لێخۆشبوونی نەکردو گوناهی بەدوای گوناهدا ئەنجامدا ئەوا دڵی بەتەواوی ڕەش دەبێت، خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿ كَلَّا ۖ بَلْ ۜ رَانَ عَلَىٰ قُلُوبِهِم مَّا كَانُوا يَكْسِبُونَ ﴾[1] واته: با دەس لە قسەی هیچوپووچی لەم جۆرە هەلگرن. ئەو تاوانانەی ئەیانکردن وەك خاڵێکی ڕەش بووە بە ژەنگ بەسەر دڵیانەوەو دڵی داگرتوون، بۆیە ناتوانن ڕاست و چەوت لێك جویّکەنەوەو ئەم جۆرە قسانە ئەکەن.

ئەمە دەبێتە هۆی دروستبوونی بەربەست لەنێوان خۆی و خوای گەورەدا ئیتر حەق نابینیّ و شوێنی ناکەوێت و ناڕەواش بەناڕەوا نازانێت، خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿ وَإِذَا ذُكِرَ اللَّهُ وَحْدَهُ اشْمَأَزَّتْ قُلُوبُ الَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِالْآخِرَةِ ۖ وَإِذَا ذُكِرَ الَّذِينَ مِن دُونِهِ إِذَا هُمْ يَسْتَبْشِرُونَ ﴾[2] واتە: کاتێ ناوی خوا بەتەنیاو بە بیّهاوبەش ئەهێنریّ دڵی ئەوانەی ئیمانیان بە ڕۆژی قیامەت نییە ناڕەحەت و پەرێشان ئەبیّ. کاتێکیش کە ناوی بتەکانیان ئەهێنریّ کە لەخوار خوایانەوە داناون دەسبەجیّ شادمان ئەبن و ئەگەشێنەوە.

کاتێك باسی ئاگردەکەین و خواردن و خواردنەوەی خەڵکەکەی و باسکردنی ئاگرو شیو و دۆڵەکانی مەبەستمان لەوەیە خەڵکی سودی لێوەربگرن و لەئاگر بترسن و لەهەر شتێك دوربکەونەوە کە ڕەزامەندی خوای تێدا نیە.

## بەڵاکانی جوامێری و مرۆڤایەتی:

المروءة: واتە جوامێری و ڕەوشت بەرزی و پیاوەتی و کۆمەك کردنی هەژار، دەستگیرۆیی بیّ نەوایان و ڕێزگرتنی میوان، ئەگەر هەژارێك هاتە لات دڵخۆش ببیت، هاوەڵان ئەگەر بیویستایە کەسایەتی براکەی بەکەم تەماشا بکات پێداویستی خۆی لەکەسێکی تر داوا دەکرد.

---

١- المطففين: ١٤

٢- الزمر: ٤٥

جوامێری لەنێو پێشینەی پیاوچاکاندا گەیشتبووە بەرزترین ئاستی خۆی، ئیمامی شافیعی کاتێك گەڕایەوە ماڵەوە کەنیزەکەکەی پێی وت فڵانە کەس هات بۆ لات کەسی لەماڵەوە نەبینی دەرگاکەی کردەوە فڵانە شتی خستە گیرفانیەوەو پاشان ڕۆشت. ئەویش فەرمووی ئەگەر ئەوەی دەیڵێیت ڕاست بێت ئەوا تۆ لەڕێی خوادا ئازادیت، ئەوەش لەبەر خۆشحاڵی شافعی بوو بەوەی کە براکەی کارەکەی بۆ جێبەجێ کرد.

زانایان چەند مەرجێکیان داناوە بۆ برایەتی ڕاستگۆ، کەمترینیان سینە سافییەو بەرزترینیان لەخۆبوردنە.

**کەل کردنی جوامێری لەم خاڵانەدا خۆی دەبینێتەوە:**

١- دێت لەجیاتی فێربوونی قورئان شتێکی تر دەکات بێ بوونی هیچ پێویستییەك، بەڵام ئەگەر هیچی نەبوو جگە لەم پیشەیە ئەوا قەیناکات، بەڵام هاوەڵان و شوێنکەوتوان و ئەوانەی بەدوای ئەوانیشدا هاتن بەکەلکردنی جوامێرییان زانیوە.

٢- شوێنکەوتنی ئارەزووبازی کاتێك لەگەڵ کۆمەڵێکدا دانیشت دەڵێت ژیری وا دەڵێت یاخود حەق وا دەڵێت، یەکێکی تریش دەڵێت لەڕاستیدا خێزانم وا دەڵێت و منداڵەکانم پێم پێدەدەکەن و پێم دەڵێن چۆن دەست هەڵدەگریت.

٣- بەردەوام بوون لەدواخستنی نوێژ بۆنموونە کەسانێك هەن نایەن بۆ نوێژ لەکاتی ڕکاتی چوارەمدا نەبێت، لەکاتێکدا هیچ بەربەستێك نییە ڕێگەی لێ بگرێت، ئەگەر من لەمزگەوتدا نوێژ نەکەم و تۆو ئەم و ئەو ئیتر کێ نوێژ بکات لەمزگەوتەکاندا.. کێ ماڵی خوا بکاتەوەو ئاوەدانی بکاتەوە؟!! کاتێك بانگ وێژ دەڵێت: (حيَّ على الفلاح...) بەکێ دەڵێت؟ ئەوەی خیانەت لە (حيَّ عَلى

الصلاة)بكات خيانەت لە (حيَّ على الفلاح)يش دەكات.. ئايا لە نێو ملیارێك موسوڵماندا ملیونێكی ڕێك و پێك هەیە لە مزگەوتدا نوێژ بكەن.

٤- وازهێنان لە زیكرو نزاكانی دوای نوێژ، ئەو چەپكە گوڵەی كە بەدەوری درەختدایە تەسبیحاتن هەموو (سبحان الله)یەك خێرێكە، هەموو (الحمد لله)یەك خێرێكە هەموو (الله أكبر)ێك خێرێكە هەموو زیكرێك لەمانە درەختێكت لە بەهەشتدا بۆ دەڕوێنن.

٥- ڕۆیشتنە نێو دوكانی بۆنەكان و تاقیكردنەوەی جۆرەكانی ئەگەر پرسیارت كرد: كێ ئەم كارە دەكات ئایا دەیكڕیت؟ پێت دەڵێت: نەخێر، تەنها تاقی دەكەمەوە ئەمە حەرامە بەڵام ئەگەر مەبەستت كڕینی بێت ئەوا ئاساییە، خوای گەورە بەنیەتی دڵ لەبەندەكانی دەپرسێتەوە، خوای گەورە زاناترە بەتیلەی چاو و ئەوەی لە دڵەكاندا شاردراوەتەوە.

٦- بەكارهێنانی میوان، واتە تۆ میوانداری كەسێك دەكەیت تایبەتمەندیەكی هەیە بۆ نموونە لەبواری پزیشكیدا تایبەتمەندیەكی ناوازەی هەیە، تۆش دێیت سود لەمە وەردەگریت بەكوڕەكەت دەڵێیت: وەرە كوڕی خۆم با مامی خۆت سەیرت بكات و دەیخەیتە بەردەستی، نیشانەكانی بۆ باس دەكەیت. ئەمە شیاو نیە.

٧- میزكردن بەپێوە بەبێ بوونی پێویستی وەكو نەخۆشی یان هەرشتێكی تر، پێشەوا مالك ئەمە بە بەڵایەك دەزانێت لەبەرئەوەی ئەم كارە جلەكانت پیس دەكات و پرژی بەردەكەوێت پێغەمبەر ﷺ بە دانیشتنانەوە میزی دەكرد.

٨- بە ئاشكرا ئەنجامدانی بەدڕەوشتی وەك ئێستا لەكەناڵە ئاسمانیەكاندا دەیبینین ئایا لەوە خراپتر دەبینیت؟! هەروەها چەندین ڕووت دەبینیت بۆ نموونە تۆ دەتەوێت كتێبێك یان ڕۆژنامە یان گۆڤارێك بكڕیت، سەیردەكەیت

بەتەنیشتیەوە ژەهرێك زۆر سەرنج ڕاكێشانە دانراوە نازانیت ڕوخسارت بۆ كوێی گۆڤارەكە ببەیت و چاوت لەسەر چی دابنێیت..!!!

٩- خواردن لەسەر شەقامەكان و لە نێو بازاڕدا مەگەر بارودۆخێك نەبێت كە ناچاری كردبیت بۆ نموونە لەگەڵ منداڵەكانتدایت لە بازاڕداو برسییان دەبێت ئەمە لە تێڕوانینی شەریعەتی ئیسلامەوە نەنگیە، لەبەرئەوەی شەرم دەشكێنێ، لەبەرئەوەی تۆ دەیخۆیت و خەڵكی سەیرت دەكەن. بۆیە هەندێك لە زانایان دەڵێن (عورە)یە واتە (شەرمگای مرۆڤ)ە شایەتیدانی لێ وەرناگیرێت.

١٠- پێكەنین بە دەنگی بەرز، واتە بە هەموو گەورەو بچوكێك قاقای پێكەنینت بێت، ئەمەش دەبێتە مایەی داڕمانی شەرم ئەوەتا حەنەفییەكان دەڵێن ئەم جۆرە كەسانە شایەتیان لێ وەرناگیرێت.

١١- لەبەردەمی ئەو دەفرەوە نەخۆیت كە بۆت دانراوە، ئەوەتا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمان دەكات بە ئەنەس و پێی دەفەرموێت: (بەناوی خواوە دەست پێبكەو بەدەستی ڕاستت بخۆو لەبەردەمی خۆتەوە خواردنەكە بخۆ)[١]. ئەمە جوامێرییە ئەگەر سوپاسگوزاری نیعمەتەكان بیت و لە بەرامبەریاندا بەئەدەبەوە هەڵس و كەوت بكەیت.

١٢- قرقێنە دانەوە بە دەنگی بەرز، بەجۆرێك ئازاری خەڵكی بدەیت، ئەمەش جوامێری كەل دەكات.

١٣- هەروەها وازهێنان لە (ویتر)، لەلای حەنەفییەكان ویتر دەبێت بگێڕیتەوە نەك وەكو ئەوەی خەڵكی لێی تێگەشتووە كەسوننەتێكی سوكەو پێویستیش ناكات پێی تەنگەتاو بین ئەگەر ئەنجامان نەدا یان وازمان لێهێنا.

---

١- رواه البخاري.

١٤- پیاو خێزانەکەی لەبەرچاوی خەڵکیدا ماچ بکات، ئەمە پیاوەتی و جوامێری نییە.

١٥- ڕۆشتن بۆ دەعوەت بێ ئەوەی بانگ کرابێت، بەم کارەی پێی دەوترێت ئێسک قورس، هەر دەعوەتێک کرا ئەوی تیا ئامادەیە، هەروەها لە هەموو ئاهەنگێکدا دەیبینیت، ئەمەش جوامێری کەل دەکات.

١٦- دانیشتن لەسەر ڕێگا مەگەر بەوەی مافەکانی بدەیت کەسانێك دەبینیت لە چایخانەکاندا دانیشتوون ئایا ئەو کەسە بۆ یادی خوا دانیشتووە؟

١٧- بەسوك باسکردنی خێزانەکەت لەبەرامبەر خەڵکیدا بۆ نموونە دەڵێت لەهیچ تێناگات گێژە، یان وەکو خەڵکی ڕەشۆکی دەڵێن دەڵێی گای خوایە لەنێو وێنجەو سێپەڕەدایە، پێدەکەنیت...!! براکەم کەسایەتی خێزانەکەت لەنێو خەڵکیدا بەرزبکەرەوە هەروەها منداڵەکانت، دەبێت خێزانەکەشت هەروا بێت ڕێزت بگرێت.

١٨- قازانج وەرگرتن لە هاوڕێکانت، بۆ نموونە تۆ داوات لێکردوم شتێکت بۆ بکڕم دەبێت بۆت بکڕم و بیخەمە بەردەستت و لە پشتی سەرتەوە قازانجی لێ نەخۆم چونکە من بازرگان نیم.

١٩- قسە نەکردن بە زمانی عەرەبی و تێکەڵ کردنی بەزمانی عەجەمی جیاواز، ئەوەتا پزیشکەکان ئەم حاڵەتە زاڵە بەسەریاندا بەڵام منداڵەکانیشمان هەروان بۆنموونە لەتەلەفۆندا قسە دەکەن دەڵێن (ئەلوو) لە جیاتی ئەوە بڵێن (السلام علیکم)کە (٣٠) چاکەیان بۆ دەنوسرێت.

٢٠- زۆر ئاوڕدانەوە لەسەرە ڕێگاکان، پێویستە کە بەڕێگادا دەڕۆیت بە ڕێك و پێکی بڕۆیت وەکو بورجی چاودێری کردن مەبە (حەزرەتی عومەر(ڕەزای خوای لێ بێ) کاتێك گەنجی دەبینی بەم شێوەیە دەڕۆشتن بەڕێگادا لێی دەدان و دەیفەرمو بێ هودەو بە حەپەساوی مەڕۆن بە ڕێگادا) بە خێرایی بڕۆ بۆ

جێبەجێ کردنی کارەکانت. ئەمەش دڵەکان دەمرێنێ وای لێدەکات هەست بەوە نەکات ئەو کارەی دەیکات خراپە.

٢١- لەبەرکردنی پۆشاکی مۆدە بەشێوەیەکی خراپ. پیاو دەبینیت لە ماڵەکەیدا دانیشتووەو کچەکەی دەڕوات بۆ زانکۆ پۆشاکێك لەبەر دەکات زۆر ناشایستەیەو نابێ لەبەر بکرێت کەچی ئەو باوکە پێدەکەنێت و دەڵێت: ئەمە مۆدەیەتی و دەبێت لە تەمەنی خۆیدا بژی!! لەکاتێکدا بەرپرسە لێی (فکلکم راع وکلکم مسؤول عن رعیتە) دەبێت پێی بڵێیت ئەگەر باڵاپۆش نابیت باشتر وایە لە ماڵەوە دابنیشیت لەبەر ئەوەی باڵاپۆشی فەرزە، ئەو زانستەی وەرت گرتووەو فێری بووت بەستە، کچەکەی لەسەر کەمی زانستەکەی لۆمە ناکرێت و لێی ناپرسرێتەوە، بەڵام لەسەر باڵاپۆشییەکەی لێپرسینەوەی لەگەڵدا دەکرێت.

خوای گەورە دۆزەخی دروست کردووە هەروەها بەهەشتیش، ئەگەر ویستی لەسەر بوایە سەرجەم مرۆڤەکان ڕێنمویی خوایان وەردەگرت و هەموویان دەچوونە بەهەشتەوە، بەڵام بەندەکان خۆیان گومڕا کردو بە دوای ئارەزووەکانیاندا ڕۆیشتن، بۆیە دەبوایە دۆزەخ دروست بکرایە وەکو خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ زُيِّنَ لِلنَّاسِ حُبُّ ٱلشَّهَوَٰتِ ﴾[1]

واتە: جوان کراوە لای بنیادەم حەز لە ئارەزووی نەفس کردن.

بۆیە دەبینیت هاوەڵان بەدوای ئەوانیشدا شوێنکەوتوان و دوای ئەوانیش، جوانییان هەبوو لە جیاتی ئەم کرانەوەیە. خەڵکانێك هەبوون خاوەن ئاڵای سور بوون و شتی تریش باسەکەش پێوانەییە.

کەواتە فەرمانبەرداری کردن بەفەرمانەکانی خوا، وازهێنان لەوەی نەهی لێ کردووەو هەروەها جێبەجێ کردنی فەرزەکانی خواو بەندایەتی کردنی و مامەڵە

---

١- آل عمران: ١٤

کردن و پێدانی مافەکان وەکو ئەوەی فەرمانی پێکردوین، خوای گەورە چەند فەرمانێکی هەیە سەرپێچی مەکەن، چەند سنورێکی هەیە مەیشکێنن لە چەند شتێك بێ دەنگ بووە لەبەرئەوەی ڕەحمتان پێبکات نەك لەبیری چوبێت پرسیاری لێ مەکەن.

ئەوەی بەندایەتی کردنی بەجوانی نەکات ئەوا ڕەوشتیشی جوان نابێت، ئەگەر من لەبەروبومی نوێژەکەم نەخۆم کەفێرم دەکات لەخراپەکاری و بەدڕەوشتی دورکەومەوە، وە ئەگەر نوێژەکەم وام لێنەکات لە نێو خەڵکیدا سادە بم ... ئەوا سودی نیە..!!



# باسکردنی دۆزەخ

## زۆری ژمارە، مانای هەیە....

لە قورئانی پیرۆزدا (١٣٨) جار باسی دۆزەخ کراوە. ئەمەش ژمارەیەکی گەورەیە، ئەو کەسەی بەو ئایەتانەی کە باس لەدۆزەخ دەکەن کاریگەر نەبێ پێیان ئەوا بە دوای دڵیدا بگەڕێت، لەبەرئەوەی دڵی مردووە، خوای گەورە هەندێ ئایەتی قورئانی بەشێوەی دووانی دابەزاندووە (واتە لە هەندێك باسدا دوو بابەتی جیاوازی خستۆتە ڕوو و باسی لێ کردوون)، باس لە ڕەحمەت و ئەشکەنجەدان دەکات، بەهەشت و دۆزەخ، پاداشت و سزا، داد و ستەم و بەو جۆرە.

باسکردنی دۆزەخ دڵی باوەڕدار دێنێتە لەرزە و سینەی ڕاستگۆیان دەتۆقێنێت، دڵیان ناسکە وەکو دڵی ئەوانەی کە لەنادیاردا لەخوای خۆیان دەترسن، بەڵام ئەوەی دڵی ناسك نیەو ناترسێت و ناوەستێت ئەوا نیشانەی نوێی بۆ ژیانی بنیات نەناوە، لەبەرئەوە ئامۆژگاری دەکەم بەدوای ئەقڵێکدا بگەڕێت.

ئەمە یەکەم زانیارییە سەبارەت بەدۆزەخ، بۆنموونە با بڕۆینە ناو پەڕاوی پەروەردگارو سورەتی (البقرة) وەربگرین خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿وَقَالُواْ لَن تَمَسَّنَا ٱلنَّارُ إِلَّآ أَيَّامًا مَّعۡدُودَةً﴾[1] واتـه: وتيـان: ئـاگرى دۆزەخ چەند ڕۆژێكى كەم نەبێ لە كەسمان نادا.

بەم شێوەیە جولەكە بانگەشەی ئەمەیان كرد كەچەند ڕۆژێكی دیاری كراو گوێرەكەیان پەرست ئەو كاتەی موسا ﷺ بە براكەی فـەرموو: ﴿ٱخۡلُفۡنِي فِي قَوۡمِي وَأَصۡلِحۡ وَلَا تَتَّبِعۡ سَبِيلَ ٱلۡمُفۡسِدِينَ﴾[2] واتـە: جێنشـینم بـە لـەناو قەومەكەمـداو، ئاگاداریـان بـە لـە شـەریعەت لانـەدەن و نـەگۆڕێن. چـاكەكەر بەو دوای ڕێگـای بەدكاران مەكەوە، كە ئەوانەن لە خۆیان غافڵن و دوورن لە خوداپەرستی.

گرنگ ئەوەیە گوێرەكـەیان پەرست و بانگەشـەی درۆو بوختانیـان كرد كـە ئـەوان بـە دۆزەخ سـزا نـادرێن مەگـەر بەئەنـدازەی ئـەو چـەند ڕۆژە نـەبێت كـە گوێرەكـەیان تێـدا پەرستووە واتـە ڕۆژێكـی دنیـا یەكسـانە بـەڕۆژێكی سـزای قیامەت، ئەوان وتیان: ﴿وَقَالُواْ لَن تَمَسَّنَا ٱلنَّارُ إِلَّآ أَيَّامًا مَّعۡدُودَةً قُلۡ أَتَّخَذۡتُمۡ عِندَ ٱللَّهِ عَهۡدًا﴾[3] واتـە: وتیـان: ئـاگری دۆزەخ چـەند ڕۆژێكـی كـەم نـەبێ لـە كەسمان نادا: ئەی (محمد) پێیان بڵێ: ئاخۆ پەیمانتان لە خودا وەرگرتووە.

ئایا ئەمە لەتەورات یـان لەئینجیلدا هەیـە یـان نوسـراوە كـە بـۆ حـەزرەتی عیسا ﷺ دابەزی؟ ئینجیل هـات هـەتا تـەواوكاری تـەورات بێـت ئایـا ئەمـە ئـەو پەیمانە بوو كە خوای بەندەكان پەیمانی پێدان و بەڵگەنامەیەكی لەگەڵدا پێدان كە ئێوە تەنها ئەو چەند ڕۆژە سزا دەدرێن.

---

١- البقرة: ٨٠

٢- الأعراف: ١٤٢

٣- البقرة: ٨٠

خـــوای گـــەورە دەفـــەرموێت: ﴿قُلْ أَتَّخَذْتُمْ عِندَ ٱللَّهِ عَهْدًا فَلَن يُخْلِفَ ٱللَّهُ عَهْدَهُۥٓ أَمْ تَقُولُونَ عَلَى ٱللَّهِ مَا لَا تَعْلَمُونَ﴾[1] واتـە: ئـاخۆ پـەیمانتان لـە خـودا وەرگرتووە ، کە دیارە خودا هـەرگیز لـە پـەیمانی خـۆی پاشگەز نابێتـەوە، یـا شتێکتان بە دەم خوداوە هەڵبەستووە خۆیشتان نایزانن و درۆو ساختەیە؟

چۆن ئادەمیزاد بـەناوی خـواوە درۆو بوختـان دەکـات و دەڵێـت تـەنها ئـەو چـەند ڕۆژە سـزا دەدرێـت کـە گوێرەکەکـەی تێـدا پەرسـتووە، ئـەوەتا قورئـان بەڵگەکەیان پوچەڵ دەکاتەوەو درۆکەیان دەردەخات کاتێکی دیاری کراویان نیە بۆ مانـەوەیان لـە ئـاگردا، بـەڵکو دەفـەرموێت لـەئاگری دۆزەخـدا بەهەمیشـەیی دەمێننەوە، جولەکە دان بەوەدا دەنێنن کە لەئاگردا سـزا دەدرێـن، ئەمـەش زۆر سەیرە وەکو چۆن هاوەڵ پەیداکەران لە ڕابردوودا دەیانوت:

﴿إِن نَّتَّبِعِ ٱلْهُدَىٰ مَعَكَ نُتَخَطَّفْ مِنْ أَرْضِنَآ﴾[2] واتـــە: ئەگـــەر شـــوێنی ئـــەو ڕێپیشـاندانە بکـەوین کـە تـۆ ڕێمـان پیشـان ئـەدەی لـەم خـاکی خۆمانـەمان هەڵئەکەنن و دوورئەخرێینەوە .

تەنانەت سەرپێچیکارانی ئوممەتی محەمەد، ئەوانەی کـە لـەخوای گـەورەوە دوورن ئومێدو هیوایان بەخوا هەیە ئەو کەسەی لە خوای گـەورە ناترسـێت: مـن سەرپێچیکارم و لەئاگر دێمە دەرەوە، هەموو ئەوانـەی کـە دەڵـێن لا إلـه إلا الله، ئەو کەسە گوێی لەو فەرمایشتە ڕاستە نـەگرتووە کـە دەفـەرموێت ئـەو کەسـەی لەئاگردا دەمێنێتەوە بە ئەندازەی بوونی دونیا دەمێنێتەوە واتە لەساتە وەختـی دروست بوونی ئادەمەوە هەتا دوا ساتەکانی تەمـەنی زەوی و ئـەوەی تیایـەتی، ئەو کەسە هەڵەڕاوەیە کەهەر لەخۆیەوە شـەرع بۆ خۆی دادەڕێژێت و دەڵێت:

---

١- البقرة: ٨٠

٢- القصص: ٥٧

﴿هَٰٓؤُلَآءِ أَهۡدَىٰ مِنَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ سَبِيلًا ﴾[1] واته: كافرەكان لە مسولمانەكان باشترن و ڕێگای ڕاستریان گرتووە!

هەروەها پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: (نموونەی من و نموونەی ئێوە وەكو پیاوێك وایە ئاگرێكی كردۆتەوەو پەپولە دەرویان داوە منیش دورتان دەخەمەوە لێی ئێوەش لە دەستم ڕادەكەن دەكەونە ناوی)[2]. دەبینیت فەرمایشتەكە بە ئاگات دێنێتەوەو دورت دەخاتەوەو پێت دەڵێت: لە هەنگاوەكانی شەیطان نزیك مەبەرەوە.

خەڵكانێك دەبینیت سەرپێچی كردنی خوا بەكەم سەیر دەكەن لەكاتێكدا دەبێت ئادەمیزاد ئەنجامی نەدات و لێی بترسێت ئەوەتا خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿وَإِذۡ قَالَ إِبۡرَٰهِـۧمُ رَبِّ ٱجۡعَلۡ هَٰذَا بَلَدًا ءَامِنًا وَٱرۡزُقۡ أَهۡلَهُۥ مِنَ ٱلثَّمَرَٰتِ مَنۡ ءَامَنَ مِنۡهُم بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِۖ قَالَ وَمَن كَفَرَ فَأُمَتِّعُهُۥ قَلِيلًا ثُمَّ أَضۡطَرُّهُۥٓ إِلَىٰ عَذَابِ ٱلنَّارِۖ وَبِئۡسَ ٱلۡمَصِيرُ ﴾[3] واتە: یادی ئەو كاتە بكەنەوە كە ئیبراهیم دوعای كردو وتی: خودایا ئەم شوێنە بكە بە شارێكی هێمن و لە بەش و بارەی ژیواریش ڕۆزیی خەڵكەكەی بدە ئەوانەیان باوەڕیان هەیە بە خوداو ڕۆژی قیامەت. خودا فەرمووی: تەنانەت كافرەكانیش هەر دڵخۆش ئەكەم بۆ ماوەیەكی كەم كە بریتی‌یە لە دنیا. جا ناچاریان ئەكەم بۆ سزای دۆزەخ. بێگومان دۆزەخ مەئوایەكی ناهەموارە.

شاری چاك مەككەیە، سەیر دەكەیت ڕۆزی بەسەر هەردوو لادا دابەش كراوە موسوڵمان و بێ باوەڕ، بەڵام فەرو پیت لەڕۆزی بێ باوەڕەكە هەڵدەگیرێت،

---

١- النساء: ٥١

٢- رواه مسلم.

٣- البقرة: ١٢٦

ئەمەش لەمیهرەبانی خوایە کەڕۆزی هەموو لایەك دەدات ڕەحمانی دنیایەو ڕەحیمی دنیاو ڕۆژی دوایی، باسی زیادبوونی ڕۆزی وابەستە نیە بەباوەڕەوە بەڵام فەڕو پیتی ڕۆزیی کەسی بێ باوەڕ بێ بەشە بەهۆی بێ باوەڕی و نکۆڵی کردنیەوە لەحەق و ڕاستی.

## پلەکانی بێ باوەڕی...

سەیر دەکەیت کەسی بێ باوەڕ وەکو مەیخۆر وایە بەخواردنەوەی مەی تینویەتیەکەی زیاتر دەبێت، ملیۆن یان دە یاخود ملیار یاخود دە ملیاری هەیە بەڵام تێر نابێت ئەگەر دوو شیو زێڕیشی هەبێت. خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿قَالَ وَمَن كَفَرَ فَأُمَتِّعُهُۥ قَلِيلًا ثُمَّ أَضۡطَرُّهُۥٓ إِلَىٰ عَذَابِ ٱلنَّارِۖ وَبِئۡسَ ٱلۡمَصِيرُ﴾[1] واتە: خودا فەرمووی: تەنانەت کافرەکانیش هەر دڵخۆش ئەکەم بۆ ماوەیەکی کەم کە بریتی‌یە لە دنیا. جا ناچاریان ئەکەم بۆ سزای دۆزەخ. بێگومان دۆزەخ مەئوایەکی ناهەموارە.

بە بێ باوەڕبوون دەستی پێکرد بەمەش لە ئایین دەردەچێت، بێ باوەڕیش بێ باوەڕی نکوڵی کردنە بێباوەڕی مل نەدانە هەتا ئەوکاتەی ئادەمیزاد لەبازنەی ئایینی خوا دێتە دەرەوە، ئەم جۆرو پلانە دەکەونە ژێر ڕۆشنایی فەرمایشی (وَمَن كَفَرَ) واتە کەمترین پلە لە پلەکانی بێ باوەڕی.

بۆ نموونە ئەگەر ساڵانێکی دوورو درێژ خەرجی کوڕەکەت بدەیت پاشان ڕۆژێك دێت پێت دەڵێت ئەو زەویە دەکڕم یاخود ئەو ئوتومبێلە یان فڵانە کچ دەخوازم، تۆش پێی دەڵێیت من نامەوێت ئەو پارچە زەویە بکڕیت یان ئەو ئوتومبێلە یان نامەوێت ئەو کچە بخوازیت، تۆ بەمە بەرژەوەندی ئەوت مەبەستە، ئەو دەیەوێت گوێڕایەڵی تۆ نەبێت گوێ نەدات بەقسەکانت ئەوەی

---

١- البقرة: ١٢٦

فەرمانی پێدەکەیت نایکات پێت دەڵێت: ئەرکی سەر شانتە خەرجی من بدەیت و خۆت هەڵمەقورتێنە کارەکانی منەوە.

ئەم جۆرە کوڕە لەگەڵ باوکیدا ڕەقەو بێباوەڕە بەنیعمەتەکانی ئاخۆ ئەوەی کەللەڕەقیی لەبەرامبەر خوادا دەکات داخۆ چۆن بێت؟ پاشان خوای گەورە دەفەرموێت:﴿وَمَن كَفَرَ فَأُمَتِّعُهُۥ قَلِيلًا ثُمَّ أَضْطَرُّهُۥٓ إِلَىٰ عَذَابِ ٱلنَّارِ﴾[1] واتە: بە زۆرو بێ دڵی خۆی دەبرێت وەکو خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَجَآءَتْ كُلُّ نَفْسٍ مَّعَهَا سَآئِقٌ وَشَهِيدٌ﴾[2] واتە: هەمووکەسێکیش هات بۆ سارای مەحشەر بۆ لێپرسینەوەو حیساب و کیتاب لەگەڵ کردن و هەر یەکێ دوو کەسی لەگەڵە، یەکیان لێخوڕێکە ئەیهێنێ بۆ مەیدانی حەشرو ئەویشیان شایەتێکە ڕاستیی ئەو شتانە باس ئەکا کە لەو ئادەمزادە ڕوویان داوە.

واتە کەسێك دەبیات شاهیدێك لەفریشتەکان شایەتی لەسەر دەدەن پاشان بەرەو دۆزەخ و خراپترین چارەنوس. ئەمەش کۆتاییەکی خراپە ئەم باسەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کەدەبێت سوپاسی نیعمەتەکانی پەروەردگار بکات وەکو خوای گەورە دەفەرموێت:﴿لَئِن شَكَرْتُمْ لَأَزِيدَنَّكُمْ﴾[3] واتە: بەڕاستی ئەگەر سوپاسم بکەن نیعمەتتان بۆ زیاد ئەکەم .

سوپاسکردنی نیعمەت و کار پێکردنی و خەرج کردن و دەرخستنی هەروەها دەبێت موسوڵمان ئاسەوارەکانی ئیسلام لەهاتنە ناوەوەو چونە دەرەوەو قسەکردنی پێوە دیاربێت، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿قُلْ إِنَّ صَلَاتِى وَنُسُكِى

---

١- البقرة: ١٢٦

٢- ق: ٢١

٣- إبراهيم: ٧

﴿وَمَحۡيَايَ وَمَمَاتِي لِلَّهِ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ لَا شَرِيكَ لَهُۥۖ وَبِذَٰلِكَ أُمِرۡتُ وَأَنَا۠ أَوَّلُ ٱلۡمُسۡلِمِينَ﴾[1] واتە: ئەی موحەممەد! تۆ بڵێ: بەڕاستی نوێژو هەموو جۆرە عیبادەتێکم یا حەج و قوربانیم و هەر عیبادەتێ لە کاتی زیندوویەتیدا ئەیکەم و لەسەری ئەمرم هەمووی بۆ خودایە کە خوای هەموو جۆرە مەخلووقێکە. هاوبەشی نییە و من بەم جۆرە ڕاستی و دڵسۆزی و خاوێنییە لە لایەن خوداوە فەرمانم پێ دراوەو من لەپێش هەموو ئوممەتی خۆمەوە موسوڵمان بووم و ڕێگای ڕاستی ئیسلامەتیم گرتووەتەبەر.

کەواتە هەموو شتێك لەم ژیانەدا دەبێت سوپاسی لەسەر بکەین لەبەرئەوەی سوپاس نەکردنی نیعمەتەکان دەتکاتە شایستەی سزای خوایی، ئەوەشی نکوڵی و کەللەڕەقی بکات ئەوە بەهۆیەوە شایستەی سزای خوایی دەبێت بەئاگر سزا دەدرێت، خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿وَجَحَدُواْ بِهَا وَٱسۡتَيۡقَنَتۡهَآ أَنفُسُهُمۡ﴾[2] واتە: فیرعەون و کۆمەڵەکەی ئینکاری پێغەمبەرایەتیەکەی مووسایان کرد هەرچەند بەدڵ ئەیانزانی ڕاستە پێغەمبەرە.

واتە نکوڵیان لەنیعمەتی ئیسلام کرد، سوپاسی خوای نەکرد لەسەر ئەو نیعمەتە، ئەوانەی کەسوپاس گوزارو ستایشی خوا دەکەن ئەوانەن ئەگەر پێیان بەخشرا پێی ڕازی دەبن ئەگەر پێشیان نەبەخشرا ئەوا ئارام دەگرن.

خوای گەورە پاداشتی سوپاسگوزاری بەگەورە گرتووە، ئەم پلەیە زۆر گەورەیە بۆیە ئەو کەسەی بە براکەی بڵێت: خوا پاداشتی چاکەت بداتەوە ئەوا زۆری پێ بەخشیوە، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: (هیچ چاکەیەك بەکەم مەزانە

---

١- الأنعام: ١٦٢ – ١٦٣

٢- النمل: ١٤

ئەگەر پیشاندانی ڕوویەکی گەش بێت لە بەرامبەر براکەتدا)[1] . ئەوەتا ئێستا ئافرەتان دەبینین ڕوویان لەبەرامبەر هاوسەرەکانیاندا گرژ دەکەن وە بەپێچەوانەشەوە، هەروەها دراوسێ لەگەڵ دراوسێدا، خزم لەگەڵ خزمدا، مام لەگەڵ برازاکانیدا. کوا مامەڵە جوانەکان؟؟!

## بەتەنها دێیت بۆ لای خوای خۆت:

خوای گەورە دەفەرموێت:﴿ وَقَالَ ٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُواْ لَوْ أَنَّ لَنَا كَرَّةً فَنَتَبَرَّأَ مِنْهُمْ كَمَا تَبَرَّءُواْ مِنَّا كَذَٰلِكَ يُرِيهِمُ ٱللَّهُ أَعْمَٰلَهُمْ حَسَرَٰتٍ عَلَيْهِمْ وَمَا هُم بِخَٰرِجِينَ مِنَ ٱلنَّارِ ﴾[2]، واتە: جا پەیڕەویکەرەکان لە قووڵایی دڵیانەوە ئاوات ئەخوازن و ئەڵێن: خۆزگا جارێکی تر ئەگەڕاینەوە بۆ دنیا تا لێیان تەبەڕا ببین وەك ئەوان ئا لەم تەنگانییەدا لە ئێمە تەبەڕا بوون. بەم جۆرە خودا کردەوەکانیان دێنێتەوە بەرچاویان و ئەیانکا بە مایەی خەم و خەفەت بۆیان و لە ئاگری دۆزەخیش دەرناچن.

ئەمە ئاکامی شوێنکەوتەو شوێنکەوتووە، ئەمەش بەڵایەکە لەبەڵاکانی دنیا سەیردەکەین ئەوکەسەی کەشوێنی دەکەون خۆی دەڕازێنێتەوە بۆ ئەوکەسانەی کە دوای دەکەون بەوێنەی شەیتان، شەیتانی ئادەمی دەڵێت وەرە من کورسییەکت لەوەزارەتێك دەدەمێ یان بەڕێوەبردنێك یاخود سەرۆکایەتییەك، دەتکەمە پارێزگارێك یاخود بەڕێوەبەری دەزگایەك، بەڵام ئەمانە لەبەرامبەر ئەوەی سەرت نەوی بکەیت و واز لەهەر بیرو باوەڕێك بهێنیت.

---

١- رواه مسلم.

٢- البقرة: ١٦٧

بەمەش بوونی لێ داگیردەکات، پاشان ڕۆژی قیامەت دێت خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِذْ تَبَرَّأَ الَّذِينَ اتُّبِعُوا مِنَ الَّذِينَ اتَّبَعُوا وَرَأَوُا الْعَذَابَ وَتَقَطَّعَتْ بِهِمُ الْأَسْبَابُ﴾[1] واتە: ئا لەو کاتەدا کە پەیڕەویکراوەکان لە پەیڕەویکەرەکان تەبەڕا ئەبن و بە هیچ جۆرێ بە کەڵکیان نایەن و، بە چاوی خۆیان سزای توند دەبینن و هیچ جۆرە پێوەندییەك نامێنێ لە نێوان ئەمان و ئەواندا.

﴿وَقَالَ الَّذِينَ اتَّبَعُوا لَوْ أَنَّ لَنَا كَرَّةً فَنَتَبَرَّأَ مِنْهُمْ كَمَا تَبَرَّءُوا مِنَّا ...﴾[2]

ئەوەی لەسەرەتاوە خۆی بێبەری دەکات ئەو کەسەیە کە خەڵکی شوێنی کەوتون (سەرۆك) کاتێ ڕۆژی قیامەت دێت و هەست بە بەرپرسیاریەتی دەکات خۆی بەری دەکات، لەبەرئەوەی لەسەر ئەو گوناهو فریودانەی خەڵکی لێپرسینەوەی لەگەڵدا دەکرێت، و شوێنکەوتەش سزا دەدرێت لەبەرئەوەی خاوەن کەسایەتی لاواز بووە ئیتر هەرچەندێ قسە بکات بەڵگەی لاوازەو هیچ بیانویەکی دەست ناکەوێت هەتا بیانوی پێبێنێتەوە.

لەو بیانویانەی کە پەنای بۆ دەبات بەرتەنگی ڕۆزی یان نەخۆشی یان هەر پێویستیەك، بەڵام فەرمایشتی پەروەردگار دێت و دەفەرموێت: ﴿فَمَنِ اضْطُرَّ غَيْرَ بَاغٍ وَلَا عَادٍ﴾[3] واتە: جا ئەگەر کەسێ ناچار بوو بۆ خواردنی ئەوانە، بە مەرجێ دەستدرێژی نەکاتە سەر ناچارێکی ترو لەو سنوورە لانەدات کە خودا دایناوە.

---

١- البقرة: ١٦٦

٢- البقرة: ١٦٧

٣- البقرة: ١٧٣

لێرەدا ئیبن حەزم پرسیار لە پێشەوای باوەڕداران دەکات و دەڵێت: تەقوا چییە؟ ئەویش وەلامی دایەوەو فەرمووی: بەخاکێکی دڕکاویدا نەڕۆشتویت؟ فەرمووی: بەڵێ. فەرمووی: چیت کرد؟ فەرمووی خۆم کۆکردەوەو هەوڵمدا.

ئەمە ئایینە داوات لێدەکات خۆت هەڵبکەیت و لەهەموو شتێکدا هەوڵ بدەیت، پارە لەحەلاڵەوە دێت هەروەها سەیرکردن، وشە، جوڵە، موسوڵمان بەدوای حەلاڵدا دەگەڕێت و ئەوە ئیسلامێکە بەسەر زەویدا دەگەڕێت.

ئیسلام ئایینی خوایە ئەمەشمان لە ڕێگای قورئان و فەرمایشتەکانی پێغەمبەری خواو هەڵسوکەوتی شوێنکەوتوانیەوە زانیوە، خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَكۡتُمُونَ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ مِنَ ٱلۡكِتَٰبِ وَيَشۡتَرُونَ بِهِۦ ثَمَنٗا قَلِيلًا ﴾[1]

واتە: بەڕاستی ئەو زانایانەی ئەوەی لە تەوراتدایە ئەیشارنەوە، مەبەستی نیشانەکانی پێغەمبەری ئاخرزەمانەو، لە باتی ئەوە نرخێکی کەم و بێمایە وەرئەگرن.

ئەو دێت ئایەتێکی دیاری کراو دەگرێت و حوکمەکەی پەک دەخات، کارپێکردنی دەشارێتەوە، بۆنموونە ئایەتی بڕینی دەستی دز دێنێت و دەڵێت: ئەمە دڕندەییە، دەربارەی مەیخۆری دەڵێت: ئەوە ئازادی کەسییە.

ئەمە بەمانای شاردنەوەو کپ کردن دێت، لەبیری ناکات بەلام حوکمەکەی پەک دەخات، بۆ نموونە یاسایەکی دیاری کراوی ئایینی دێنێت بەلام کاری پێناکات. دونیا بەئایین پینە دەکات، نە ئاینەکە دەمێنێتەوەو نە ئەوەش کە پینەی دەکەین، خوای گەورە دەفەرموێت:

---

١- البقرة: ١٧٤

﴿أَفَتُؤۡمِنُونَ بِبَعۡضِ ٱلۡكِتَٰبِ وَتَكۡفُرُونَ﴾[1] واته: ئیمانتان به هەندێ لە پەیمانەکە هەیە کە لە کیتاب و پەیماننامەکەدا نووسراوەو ئیمانتان بە هەندێکی تری نییە!

ئەوانە ئەمە دەکەن بۆ گەیشتن بەمەرامەکانیان و خەڵکانیشی پێ ڕازی دەکەن، ئەمەش تێکەڵاو کردنێکی ئاینییە، خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿أُوْلَٰٓئِكَ مَا يَأۡكُلُونَ فِي بُطُونِهِمۡ إِلَّا ٱلنَّارَ وَلَا يُكَلِّمُهُمُ ٱللَّهُ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ وَلَا يُزَكِّيهِمۡ﴾[2] واته: ئەوانە لە پاشەڕۆژدا پڕبەپڕی سکی خۆیان ئاگری دۆزەخ ئەخۆن و خودا لە ڕۆژی قیامەتا قسەیان لەگەڵ ناکات و ناویان بە پاک نابات، هەروەها سزایێکی ئێجگار سەختیان هەیە.

ئەو کاتەی موسوڵمان دینەکەی بۆ دنیا دەفرۆشێت ئەوا جگە لە ئاگر هیچ ئەگەرێکی تری نیە.

عەطائی کوڕی ڕەباح ڕۆشت بۆ بازاڕ هەنجیر بکڕێت منداڵێك لەوێدا بوو بۆی کێشا خاوەنی فرۆشگاکە لەدوکانەکەی هاتە دەرەوەو وتی: کوڕە ئەوە عەطائی کوڕی ڕەباحە پێشەوای موسوڵمانانە ئەمە گەورەی ئێمەیە، ویستی کێشانەکەی بۆ زیاد بکات، عەطاء وتی: ئێمە ئاین بەهەنجیر نافرۆشین ئێمە لەبەر خوا فێرت دەکەین، واتە من پێویستم بەزیادە کێشانی هەنجیری تۆ نیە تەنها پێویستم بەحەقی خۆمە، هەرکەسێك جگە لەمە هەر شتێکی تر بکات ئەوا بۆچوونی خراپە لەبەرئەوەی بۆ خوا کارناکات و دژی سنورەکانی خوایە.

---

١- البقرة: ٨٥

٢- البقرة: ١٧٤

## کێ هەیە جگە لەخوا..؟!

خـــوای گـــەورە دەفـــەرموێت:﴿ وَمِنْهُم مَّن يَقُولُ رَبَّنَآ ءَاتِنَا فِى ٱلدُّنْيَا حَسَنَةً وَفِى ٱلْءَاخِرَةِ حَسَنَةً وَقِنَا عَذَابَ ٱلنَّارِ ﴾[1] واتـــە: هـــی وایـــش هـــەن ئەپاڕێنەوە لە خودا ئەڵێن: خودایا لە دنیادا چاکەمان پێ ببەخشە لە لەشساغی و ئاسایش و ماڵ و خێزانی باش و خزمی باش و بەشی حاڵی خۆمان داراییمان پێ ببەخشە و لە ڕۆژی قیامەتیشدا پاداشی چاکمان پێببەخشە و لە سزای ئاگر بمانپارێزە.

هەروەهادەفەرموێت: ﴿ فَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَقُولُ رَبَّنَآ ءَاتِنَا فِى ٱلدُّنْيَا وَمَا لَهُۥ فِى ٱلْءَاخِرَةِ مِنْ خَلَٰقٍ ﴾[2]، واتـە: بنیـادەمی وەهـا هـەن ئەپاڕێنـەوە ئـەڵێن خودایا سامان و ماڵی دنیامان بدەرێ و، ئـیتر داوای شـتێ ناکـەن بـۆ دوارۆژیـان باش بێ. ئەمانە لە قیامەتدا بەش و بەهرەیان نییە.

ئـەو دنیـای دەوێت، خـوای گـەورەش دنیـاو دوارۆژیشـی لایـە کەواتـە ئـەی باوەڕدار کاتێك بۆدنیـا بـانگی خـوا دەکـەیت بـۆ قیامـەتیش بـانگی بکـە، هـەتا هەردوکیانت دەست بکەوێت هیچ شتێك نەبێتـە بەربەسـت بـۆ نێـوان تـۆو خـوا، لەبەرئەوەی کەس هاوبەشی فەرمانڕەوایی ئەو نیـە، بـەڵام کاتێـك بەربەسـت بـۆ خۆت دروست دەکەیت کە هاوبەشیت بـۆ غـەیری خـوا بڕیـار دابێـت، بـۆ نموونـە کاتێك پێویستت بە شتێك دەبێت پاشان دەڵێیت ئەگـەر پشـتم بـە فڵانـە کـەس ببەستایە یاخود جەنابی وەزیر بـۆی بکردمایـە ئێسـتا کرابـوو، پێویسـتییەکانت لەفڵان و فڵان داوا دەکەیت کەواتە هەر خۆتیت بەربەست لەنێوان خۆت و خـوادا دادەنێیت، بۆیە هیچ هیوایەکمان نیە جگە بەخوای گەورە.

---

١- البقرة: ٢٠١

٢- البقرة: ٢٠٠

لەبەرئەوە دەڵێین: (لا إله إلاّ الله) واتە هیچ پەرستراوێك نییە بەڕاستی خوا نەبێت، کەس لەم گەردوونەدا حوکم ناکات تەنها خوا نەبێت (سبحانە وتعالی)، ئێمە پەرستراومان بیردەچێتەوەو کارەکان دەدەینە دەست بەندەکان، خەڵکی خوای هۆکارەکانیان بیردەچێتەوە ئەو زاتەی کەهۆکارەکانی لەسەر دەستی ئەوان بەدیهێناوە.

ئەمە کێشەکەیە کەدەکەوێتە ناوی، بەندە پێویستی بەئامۆژگاری و بیرهێنانەوە هەیە، پێویستی بە وەگەڕخستنەوەی وزەی ئیمانیی هەیە بۆیە دوورکەوتنەوە لە دانیشتن لەگەڵ زانایان و فێربوونی زانست و خەڵکی چاکەخوازو بڕوادار شادەمیزاد دەفەوتێنێت، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿شَغَلَتۡنَآ أَمۡوَٰلُنَا وَأَهۡلُونَا فَٱسۡتَغۡفِرۡ لَنَا﴾[1] واتە: ماڵ و دارایی و ژن و منداڵمان خەریکیان کردین و نەمانتوانی بێین لە غەزادا بەشداری بکەین.

کاتی نییە هەتا داوای لێخۆشبون بکات، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ٱللَّهُ وَلِيُّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ يُخۡرِجُهُم مِّنَ ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى ٱلنُّورِۖ وَٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ أَوۡلِيَآؤُهُمُ ٱلطَّٰغُوتُ يُخۡرِجُونَهُم مِّنَ ٱلنُّورِ إِلَى ٱلظُّلُمَٰتِۗ أُوْلَٰٓئِكَ أَصۡحَٰبُ ٱلنَّارِۖ هُمۡ فِيهَا خَٰلِدُونَ﴾[2] واتە: ئەوانەی ئیمانیان هێناوە بە خوداو پێغەمبەری خوداو دوایان کەوتوون، خودا سەردارو کارهەڵسووڕێنیانە، لە تاریکیی خامی و نەفامی، تاریکیی چاوکوێری و نەزانی و، لە تاریکیی کوفرو ئارەزووپەرستی ڕزگاریان ئەکات و ئەیانخاتە ڕووناکیی فام و شعوورو زانیاریو خوداپەرستی. ئەوانەیش کە بێ ئیمانن و خوداو پێغەمبەرەکەی ناناسن سەردارو سەرکردەیان شەیتان و دەستەوبەستەکەینی، کە بەپێچەوانەی موسوڵمانەکان، لە ڕووناکیی فام و زانین

---

١- الفتح: ١١

٢- البقرة: ٢٥٧

و ئیمان و بیروهۆش دەریان ئەکەن و، تووشی تاریکیی نەزانی و نەفامیو بێئیمانیو بێئەقڵییان ئەکەن" ئەم کافرانە لایقی ئاگری دۆزەخ و سزای پڕئازاری دواڕۆژن و لە ئاگردا هەتا هەتایە ئەمێننەوە.

الطاغوت: هەر شتێکە کە جگە لەخوا بپەرسترێت.

دەکرێت ئادەمیزاد بەفەزڵی خوا پاشان چەند کارێك وای لێدەکات دووربکەوێتەوە، وەکو ئەو کەسەی بەڕێگایەکی سەرەکیدا دەڕوات پاشان دێتە سەر شەقامە تەسکەکان پاشان بەرەو کۆڵانی تەسك و تەسکتر لێرەدا خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿وَأَنَّ هَٰذَا صِرَٰطِي مُسۡتَقِيمٗا فَٱتَّبِعُوهُۖ وَلَا تَتَّبِعُواْ ٱلسُّبُلَ فَتَفَرَّقَ بِكُمۡ عَن سَبِيلِهِۦۚ ذَٰلِكُمۡ وَصَّىٰكُم بِهِۦ لَعَلَّكُمۡ تَتَّقُونَ﴾[1] واتە: ڕێگای ڕاستی بێپێچ و پەنای منە، من بەم ڕێگەدا ئەڕۆم، ئێوەیش بیگرنە بەرو لێی لامەدەن، مەکەونە دوای ئارەزووی نەفس و ڕێگای هەمەجۆرە کە تەفرو تووناتان بکات و سەرتان لێ تێکبدات و لە ڕێی ڕاست لاتاندات. خودا بەوە ئامۆژگاریتان ئەکات کە ڕێگای ئیسلام بگرن، بەڵکو خۆتان لە گوناه و لە سزای ڕۆژی دوایی بپارێزن.

لەبەرئەوە ئامانت بم نەکەی ڕێچکەکان بگریتەبەر ئەوە قورئان و سوننەتەکانە ئیتر بۆ دەڕۆیت بەرەو ڕێچکەو ڕێگاکانی تر؟ بۆ نموونە خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿ٱلَّذِينَ يَأۡكُلُونَ ٱلرِّبَوٰاْ لَا يَقُومُونَ إِلَّا كَمَا يَقُومُ ٱلَّذِي يَتَخَبَّطُهُ ٱلشَّيۡطَٰنُ مِنَ ٱلۡمَسِّۚ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمۡ قَالُوٓاْ إِنَّمَا ٱلۡبَيۡعُ مِثۡلُ ٱلرِّبَوٰاْۗ وَأَحَلَّ ٱللَّهُ ٱلۡبَيۡعَ وَحَرَّمَ ٱلرِّبَوٰاْۚ فَمَن جَآءَهُۥ مَوۡعِظَةٞ مِّن رَّبِّهِۦ

---

١- الأنعام: ١٥٣

﴿فَانتَهَىٰ فَلَهُۥ مَا سَلَفَ وَأَمْرُهُۥٓ إِلَى ٱللَّهِ ۖ وَمَنْ عَادَ فَأُو۟لَٰٓئِكَ أَصْحَٰبُ ٱلنَّارِ ۖ هُمْ فِيهَا خَٰلِدُونَ﴾[1]

واتە: ئەوانەی سوود ئەخۆن هەر وەك ئەوانە ڕاست ئەبنەوە لە قەبر كە شەیتان دەستی لێ وەشاندبن و شێتی كردبن، ڕائەوەستن و ئەكەون و خۆیان پێ ڕاناگیرێ، ئەمەیش پاداشی ئەوەیە كە لە دنیادا ئەیانوت: موعامەلەی بێسوود وەك موعامەلەی سوودداره‌و فەرقیان نییەو، هەردووكیان حەڵاڵن، كەچی خودای گەورە فرۆشتنی شەرعی و بێسوودی حەڵاڵ كردوەو سوودو ڕیبای حەرام كردوە. جا هەركەس لای خوداوە ئامۆژگاریی بۆ هاتو حەرامیی پێ ڕاگەیێنراو لە سوودخواردن وازی هێناو دەس بەرداربوو، ئەوا ئەو سوودەی كە لە زەمانی جاهیلی و نەزانیدا، پێش ئەوەی حەرام بكرێ، وەریگرتوەو خواردوویەتی، خودا عەفوی ئەكات و ئەنجامی كاری و پاداشی وازهێنانی لای خودایە. بەڵام هەركەس بگەڕێتەوە بۆ سوودخواردن ئەوانە هاوڕێی ئاگرن و هەتا هەتایە تیایا ئەمێننەوە.

ئەو كەسەی سووخواردن حەڵاڵ دەكات بۆ هەمیشەیی لەئاگردا دەمێنێتەوە واتە نایەتە دەرەوە لێی تەنانەت بەشەفاعەت كردنیش، كە تیایدا مایەوە واتە ئیتر تەواو، ئیجتیهادو لێكدانەوە بۆ دەق نیە.

بۆ نموونە (٢٠) زانا دەبینیت هەموویان متمانەیان پێدەكرێت دەڵێن بانكەكانی ئێستا سووخۆر نین هەروەها زانایانێكی تر كەمتمانەیان پێدەكرێت دەڵێن سووە، بەمەش دڵ دوچاری دوودڵی و گومان دەبێت. كەواتە پتەوترەكە بگرەو لەگومانەكە دوربكەوەرەوە، لەبەرئەوەی گومان وەك شوانێك وایە ڕانەكەی بەدەوری پەرژینێكدا بلەوەڕێنێ خەریكە بكەوێتە ناوی، ئەوەتا حەڵاڵ دیارەو حەرامیش دیارە، زۆرێك لە خەڵكی بە گومانەكان نازانن، خوای گەورە

---

١- البقرة: ٢٧٥

دەفەرموێت: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَن تُغۡنِيَ عَنۡهُمۡ أَمۡوَٰلُهُمۡ وَلَآ أَوۡلَٰدُهُم مِّنَ ٱللَّهِ شَيۡـٔٗاۖ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمۡ وَقُودُ ٱلنَّارِ﴾[1] واتە: بێگومان ئەوانەی کافرن سامان و دارایی‌و ئەولادیان ڕێگا لە هیچ زیانێ ناگرن کە لای خوداوە بۆیان بێ‌و ئەم شتانە کە لە دنیادا شانازییان پێوە ئەکەن لە ڕۆژی قیامەتدا فریایان ناکەون. ئەو کافرانە سووتەمەنیی ئاگری دۆزەخن.

ئەوەی سەیرە فریشتەکان هەموویان بەبەزەیی نین وەکو جبریل عليه السلام هەیانە زۆر بە زەبرو توندە سەرپێچی فەرمانی خوا ناکەن، بەزەیی لەدڵیاندا نیە، لەبەرئەوەی بەبێ دڵ دروست کراون هەتا بۆ دینی خوا بەزەییان بەکەسدا نەیەتەوە لێکدەرەوانی قورئان دەڵێن: دۆزەخ (١٩) ملیۆن فریشتەی بەسەرەوەیە.

## ئیسلام کەمەربەندی ڕزگاربوونە لەدۆزەخ:

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَٱعۡتَصِمُواْ بِحَبۡلِ ٱللَّهِ جَمِيعٗا وَلَا تَفَرَّقُواْۚ وَٱذۡكُرُواْ نِعۡمَتَ ٱللَّهِ عَلَيۡكُمۡ إِذۡ كُنتُمۡ أَعۡدَآءٗ فَأَلَّفَ بَيۡنَ قُلُوبِكُمۡ فَأَصۡبَحۡتُم بِنِعۡمَتِهِۦٓ إِخۡوَٰنٗا وَكُنتُمۡ عَلَىٰ شَفَا حُفۡرَةٖ مِّنَ ٱلنَّارِ فَأَنقَذَكُم مِّنۡهَا﴾[2]

واتە: هەمووتان دەست بە دینی ئیسلامەوە بگرن تا لە کەوتن و هەڵدێران ڕزگاربن. مەبن لە ناو خۆتانا وەك ئەهلی کیتاب لەناو خۆیانا بوون بە تاقم تاقم. یا مەبەست ئەوەیە وەك سەردەمی جاهیلییەت مەمێننەوە کە بەگژی یەکترا ئەچوون. بیری ئەو نیعمەتە بکەنەوە کە خودا ڕژاندی بەسەرتاناو ئەوەبوو ئێوە لەناو خۆتانا دوژمن بوون و ماوەیێکی دوورو درێژ لە یەکترتان ئەکوشت. ئەنجا

---

١- آل عمران: ١٠

٢- آل عمران: ١٠٣

خودا بەهۆی نیعمەتی ئیسلامی پیرۆزەوە ئاشتی کردنەوەو لەناو خۆتانا بوون بە برای یەکتر. ئێوە لەسەر لێواری چاڵی ئاگری دۆزەخ بوون و ئەگەر دینی ئیسلام فریاتان نەکەوتایەو ئیسلام نەبوونایە لەوانە بوو تێبکەون. خودا هیدایەتی دان و ڕزگاری کردن لەو ئاگرە.

واتە لەئاگری دنیا ڕزگاری کردون، ئاگری دوژمنایەتی خەڵکی لەنێوان خۆیاندا، وە خەڵکی وا لێکردووە پێویستیان بە یەکتر بێت.

موسوڵمان خەڵکی دەناسێت و ئاگای لەبارو غەم و ئەندێشەیانە نزای خێریان بۆ دەکات و گرفتەکانیان بۆ چارەسەر دەکات، نزا بۆ نەخۆش دەکەین، بەزەییمان بە مردودا دێتەوە، هەرکەسێك کەوتە تەنگانەوە پشتی دەگرین.

بەڵام خەڵکانێك هەن ڕێگە نادەن خەڵکی بەئاشتی بژین، خۆیان لەهەموو کاروبارێکی ژیانیان هەڵدەقورتێنن، ئەوەی کەدەبێت نەیزانن هەوڵ دەدەن بیزانن، لێرەدا خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَلَمْ يَلْبِسُوٓاْ إِيمَٰنَهُم بِظُلْمٍ أُوْلَٰٓئِكَ لَهُمُ ٱلْأَمْنُ وَهُم مُّهْتَدُونَ﴾[1] واتە: ئەوانەی باوەڕیان بە خودایەتی خودا هەیەو، باوەڕیان نەکردووە بە هاوبەش دانان بۆ خودا، ئەوانە بێ ترس ئەبن لە سزای ڕۆژی قیامەت و، ئەوانەن خودا هیدایەتی داون و ڕێگای ڕاستیان گرتووەتەبەر.

ئاسایش بەبێ باوەڕبوون نیە، کاتێك ئادەمیزاد لەگەڵ خۆیدا دادەنیشێت هاوەڵانی دێتەوە یاد لەژیانیان و هەست بەشێوازی هەڵسوکەوت و ژیانیان دەکات و، مێژوویان دەخوێنێتەوە.

ئەو کاتە هەست بەئاستی گەورەییان دەکات، حەزرەتی ئەبوبەکر(ڕەزای خوای لێ بێ) کاتێك قورئانی دەخوێند دەگریا، بێهۆش دەبوو و بەگوێگرتنی

---

١- الأنعام: ٨٢

نەخۆش دەكەوت، حەزرەتی عوسمان(رەزای خوای لیّ بیّ) دەبینیت شەرم و حەیای سەرجەم هەڵسوكەوت و كردارو ڕەفتارەكانی گرتبویەوە، ئەمە حەزرەتی عەلییە(رەزای خوای لیّ بیّ) زانست سەرریژی كردبوو لیّی.

ئیّمە پیّیان خۆشحاڵ دەبین دەڵیّین ئەوانە باوباپیری ئیّمەن باشترین كەسمان بوون كەواتە دەبیّت ئیّمەش باشترین نەوە بین، ئەگەر ئەمە كارمان تیّنەكات ئەوا كارەساتە، چونكە ئەو هاوەڵە بەڕیّزانە بەڵگەن بەسەرمانەوە.

بەم شیّوەیە خوای گەورە منەتمان بەسەردا دەنیّت هەتا دەست بگرین بە پەیامەكەیەوەو دژایەتی نەكەین، ئەوەتا دەفەرمویّت:﴿وَكُنتُمْ عَلَىٰ شَفَا حُفْرَةٍ مِّنَ ٱلنَّارِ﴾[1]

خۆ ئەگەر دوژمنایەتی لەنیّو خەڵكیدا بمایەتەوە وەكو لەناو هەردوو هۆزی ئەوس و خەزرەج و نیّوان خیّزانەكان و دەوڵەتاندا، لەئاگر ڕزگار نەدەبووین بەڵام ئیسلام لە ئاگر ڕزگاری كردین، هەروەها لەو دژایەتی كردنانەش، هەروەها داویّن پاریّزیی بەندەكان لەلایەن پەروەردگاری بەندەكانەوە.

خوای پەروەردگار لەسەر زمانی باوەڕداران دەفەرمویّت:

﴿رَبَّنَآ إِنَّكَ مَن تُدْخِلِ ٱلنَّارَ فَقَدْ أَخْزَيْتَهُۥ ۖ وَمَا لِلظَّٰلِمِينَ مِنْ أَنصَارٍ﴾[2] واتە: ئەڵیّن: خودایا ئەو كەسەی بیخەیتە دۆزەخ ئەوە بەتەواوی ئابرووت بردوەو ماڵویّرانت كردوە. بیّگومان ئەو ستەمكارانەی ئەیانخەیتە ئاگری دۆزەخ، هیچ یارمەتیدەریّكیان نییە.

كەواتە دەبیّت باوەڕدار پشتیوانیّكی هەبیّت، ڕزگاربوون و سەرفرازی بەدڵنیاییەوە بەشی دەبیّت ئەگەر ئەو پشتیوانە خوای بەندەكان بیّت.

---

١- آل عمران: ١٠٣

٢- آل عمران: ١٩٢

مەبەست لەستەمکاران ئەوانەن کە بەهاوەڵ پەیداکردن ستەمیان لەخۆیان کردووەو بەهۆیەوە چونە نێو دۆزەخ لەبەرئەوەی هاوەڵ دانان بۆ خوا لەستەمە گەورەکانە، هەروەها ڕیاکاری و هێرش کردنە سەرمافەکانی خەڵکانی تر.

هاوەڵ دانان ئەگەر بچوك بێت یان گەورە ستەمە، وەکو خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿إِنَّآ أَعۡتَدۡنَا لِلظَّٰلِمِينَ نَارًا أَحَاطَ بِهِمۡ سُرَادِقُهَا﴾[1] واتە: ئێمە ئاگرێکمان ئامادە کردووە بۆ ستەمکاران دەوران دەوریان ئەگرێ و گەمارۆیان ئەدات.

هەروەها لە ستەمەکانی تر تێنەگەیشتنێکی ڕاستەقینە لە (لا إله إلاّ الله) بەو شێوەیەی خوای گەورە دەیەوێت.

پیاوێك ڕۆشت بۆ لای معاویە(ڕەزای خوای لێ بێ) ناوی ئەبو حەزم بوو بەمعاویەی وت: سلاوی خوات لێبێ ئەی بەکرێگیراو، ئامادەبوان وتیان: بڵێ ئەی پێشەوا. پیاوەکە دوبارەی کردەوە: ئەی بەکرێگیراو. معاویە وتی: واز لە ئەبو حەزم بێنن تێدەگات چی دەڵێت و دەزانێت چی دەڵێت ئەبو حەزم سەیرێکی دانیشتوانی دەوروبەری معاویەی کردو پاشان وتی: خوای گەورە بەکرێی گرتووە بۆمان هەتا ببێتە پێشەواو کاروبارمان بۆ بەڕێوەبەرێت و بەچاکی بنیات بنێت، بەسۆز بێت لەبەرامبەر بچوکەکانمانداو ڕێز لەگەورەکانمان بگرێت و مافی زاناکانمان بزانێت، ئەو بەو ئاستەی خوای بەندەکان بەکرێی گرتووە بەکرێگیراوە لای ئێمە، بەم قسەیەی ئەبوحەزم معاویە سەری نەوی کرد.

---

[1] - الكهف: ٢٩

## پەرژینی خوا حەرام کراوەکانیەتی:

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَمَن يَعۡصِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَيَتَعَدَّ حُدُودَهُۥ يُدۡخِلۡهُ نَارًا خَٰلِدٗا فِيهَا وَلَهُۥ عَذَابٞ مُّهِينٞ ﴾[1] واتە: هەروەها هەرکەسێ بەگوێی خوداو پێغەمبەری خودا نەکات و لەو سنوورە لابدا کە خودا دیاری کردوە، ئەوە خودا ئەیخاتە ئاگرێکەوە هەتا هەتایە تیا ئەمێنێتەوەو، سزایەکی وەها ئەدرێ هۆی سووکیو سەرشۆڕییەتی.

بەهاوەڵ دانان بۆ خوا سەرپێچی خوا دەکات و سەرپێچی پێغەمبەرەکەی دەکات بەوەی شوێن فەرمانەکانی ناکەوێت و نەرێ ناکات لەحەرام کراوەکان، مەبەست لە سەرپێچی کردن هەڵگەڕانەوەیەو هاتنە دەرەوەیە لەکارە داواکراوەکان (پێویستەکان) خوای گەورە چەند سنورێکی داناوە مەیشکێنن ئەگەر ئەوەی فەرمانی پێ کردویت ئەنجامی نەدەیت ئەوا ئەو سنورەی خوات شکاندووەو سەرپێچیت کردووە، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: (ألا وإن لكل مَلِكٍ حمىً ألا إن حِمَى الله في أرضه محارمه)[2]. واتە هەموو دەسەڵاتدارێك پەرژینێکی هەیە پەرژینەکانی خوا لەسەر زەویەکەی حەرام کراوەکانیەتی.

هاوەڵان دەیانوت دەبێت بەبێ حەرام بمرین، خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿وَمَن يَعۡصِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَيَتَعَدَّ حُدُودَهُۥ يُدۡخِلۡهُ نَارًا خَٰلِدٗا فِيهَا وَلَهُۥ عَذَابٞ مُّهِينٞ ﴾[3].

ئەوەی سنورەکانی خوا بشکێنێت ئەوا لەئاگردا بە هەمیشەیی دەمێنێتەوەو هەرگیز لێی نایەتە دەرەوە، موفەسیرین وەك پێغەمبەری خوا ﷺ باسی کردووە، دەڵێن: لەڕۆژی قیامەتدا ستەمکار دێنن هەرچی دۆزەخیەکان هەن

---

١- النساء: ١٤

٢- رواه البخاري

٣- النساء: ١٤

دەیخەنە ژێر پێیان وەك چۆن وشتر پـێ دەنێت بەزەویدا لەشیوەکانیدا مـاری تێدایە بە ئەندازەی ئێسترێك کاتێك بەستەمکارو بێ باوەڕەوە دەدات بەدرێـژایی (٤٠) ساڵ ژەهرەکەی دەچێتە جەستەیەوە (٤٠) ساڵ بەهۆیەوە هاوار دەکات.

هاوەڵان لای پێغەمبەرەوە ﷺ دادەنیشتن پێغەمبەر ﷺ گوێی لـە دەنگێـك بوو فەرمووی: دەزانـن ئـەوە چـی بـوو؟ وتیـان: نـەخێر ئـەی پێغەمبـەری خـوا. فەرمووی ئەوە بەردێك بوو (٧٠) سـاڵە دەخرێتـە دۆزەخـەوە ئێسـتا دای بـەبنی دۆزەخدا ئەمەش سزای ئەو کەسانەیە کەناپاکی لەخواو پێغەمبەرەکـەی دەکـەن و فەرمانبەرداری فەرمانەکانی خوا ناکەن و نەرێ ناکەن بۆ حەرامکراوەکانیان.

ئـەوەی ناپـاکی لـە نیشـتمان دەکـات پێـی دەوترێـت ناپـاك و لەسـێدارە دەدرێت، دیارە ئەوەی ناپاکی لەخوای بەندەکان دەکات ئەوە پاداشـتەکەی لای خوا ئاگرە.

خـەڵکانێك هـەن داوای جیاکردنـەوەی دیـن لەدەوڵـەت دەکـەن و دابڕینـی ئابوری و باری کۆمەڵایـەتی دەکـەن لـەئاین کەسـیش ناتوانێت لەبەرامبەریانـدا بوەستێت بـەهۆی تـرس لەتۆقانـدن و ئەشـکەنجەو ئازاریانـەوە، لەبەسـەرهاتی پێشیناندا هاتووە کـە ئـیبن تـەیمیـە شـەوێك پاسـەوانەکانی دەوڵـەت لـەدەرگای ماڵەکەیان داو شمشێرەکانیان بەرز کردبوویەوە کوڕەکەی هاتە ژورەوە بۆ لای و ئەم هەواڵەی پێدا، ئیبن تـەیمیەش وتی: کوڕی خۆم باوکت زۆر لەوە کەمترە کـە لەپێناوی خوادا بکوژرێت.

خـــوای گـــەورە دەفـــەرموێت: ﴿ لَقَدْ كَفَرَ الَّذِينَ قَالُوا إِنَّ اللَّهَ هُوَ الْمَسِيحُ ابْنُ مَرْيَمَ ۖ وَقَالَ الْمَسِيحُ يَا بَنِي إِسْرَائِيلَ اعْبُدُوا اللَّهَ رَبِّي وَرَبَّكُمْ ۖ إِنَّهُ مَن يُشْرِكْ بِاللَّهِ فَقَدْ حَرَّمَ اللَّهُ عَلَيْهِ الْجَنَّةَ وَمَأْوَاهُ النَّارُ ۖ وَمَا لِلظَّالِمِينَ مِنْ أَنصَارٍ ﴾[1] واتــە: ئەوانــەی

---

١- المائدة: ٧٢

وتیان مەسیحی کوڕی مەریەم خودایە کافر بوون، مەسیح پێی وتن: بەنی ئیسرائیلییەکان! ئەو خودایە بپەرستن کە خودای من و ئێوەیشەو پەروەردگاری عالەمە، ئەوەی هاوبەش بۆ خودا دابنێ خودا بەهەشتی لێ حەرام ئەکات و جێگای ئاگر ئەبێت. بێگومان ستەمکاران و کافران هیچ یارمەتیدەرێکیان نی یە.

هەروەها دەفەرموێت: ﴿وَلَوۡ تَرَىٰٓ إِذۡ وُقِفُواْ عَلَى ٱلنَّارِ فَقَالُواْ يَٰلَيۡتَنَا نُرَدُّ وَلَا نُكَذِّبَ بِـَٔايَٰتِ رَبِّنَا وَنَكُونَ مِنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ﴾[1] واتە: ئەگەر چاوت لێیان بوایە کاتێ لەسەر ئاگری دۆزەخ ڕائەگیرێن، چۆن پەنجەی پەشیمانی ئەگەزن و ئەدەن بە ئەژنۆی خۆیانداو ئەڵێن: ئاخ خۆزگا ئەگەڕاینەوە بۆ ژیانی دنیاو ئیتر ئینکاری ئایەتەکانی خودامان نەئەکردو ڕێگای ئیسلامەتیمان ئەگرتەبەر، بەڵام پاش چی؟!

لەم ئایەتەدا: (إِذۡ وُقِفُواْ عَلَى ٱلنَّارِ): ئەوانە کێن دەخرێنە سەر ئاگر.

هاوەڵ دانەران و بێ بڕوایان و ئەوانەی دوورن لە پەروەدگاریانەوە هەروەها دەڵێن: (يَٰلَيۡتَنَا نُرَدُّ) واتە ئاوات دەخوازن جارێکی تر بگەڕێنەوە بۆ دنیا.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلَوۡ رُدُّواْ لَعَادُواْ لِمَا نُهُواْ عَنۡهُ وَإِنَّهُمۡ لَكَٰذِبُونَ﴾[2] واتە: ئەگەر بیشگێڕرێنەوە بۆ دنیا جارێکی تر دەست ئەدەنەوە ئەو کارو کردەوە ناشیرینانە کە نەهییان لێ کرابوو، بەڕاستی ئەوانە درۆزنن.

هەروەها دەفەرموێت: ﴿أَلَا يَعۡلَمُ مَنۡ خَلَقَ وَهُوَ ٱللَّطِيفُ ٱلۡخَبِيرُ﴾[1] واتە: ئایا کەسێ ئەم خەڵکەی دروست کردبێ، بە خەیاڵاتی دڵیان نازانێ، کە زانستیشی ئەگاتە هەموو دەرو ناوو نهێنیو ئاشکرای ئەم خەڵکە؟

---

١- الأنعام: ٢٧

٢- الأنعام: ٢٨

لێرەدا خوای گەورە دەفەرموێت ئەگەر بیانگێڕیتەوە بۆ دنیا ئەوا دەچنەوە سەر ئەوکارانەی کە نەرێیان لێکراوە، بۆ نموونە بەندەیەك دەبینیت شتێك لەخوا داوا دەكات نەزر دەكات ئەگەر ئاواتەكەی بێتە دی ئەوا فلان دەردەهێنێت، بە فلان دەدات، یان فلان سەردەبڕێت، بەڵام سەیر دەكەیت لە كاتی جێبەجێ كردنیدا وادەكەی ناباتە سەر، هەروەها خوای گەورە دەربارەی هاوەڵ دانەران بۆ خوا دەفەرموێت: ﴿وَيَوْمَ يَحْشُرُهُمْ جَمِيعًا يَـٰمَعْشَرَ ٱلْجِنِّ قَدِ ٱسْتَكْثَرْتُم مِّنَ ٱلْإِنسِ ۖ وَقَالَ أَوْلِيَآؤُهُم مِّنَ ٱلْإِنسِ رَبَّنَا ٱسْتَمْتَعَ بَعْضُنَا بِبَعْضٍ وَبَلَغْنَآ أَجَلَنَا ٱلَّذِىٓ أَجَّلْتَ لَنَا ۚ قَالَ ٱلنَّارُ مَثْوَىٰكُمْ خَـٰلِدِينَ فِيهَآ﴾[2] واتە: یادی ئەو ڕۆژە بكەرەوە كە خودای گەورە (انس وجن) هەموویان كۆئەكاتەوەو بە كۆمەڵی شەیتان ئەفەرمووی: ئێوە لە دنیادا بنیادەمی زۆرتان گومڕاه كرد، ئەو بنیادەمانەیش كە دۆستی شەیتانەكان بوون دەڵێن: خودایا ئێمەو ئەوان سوودمان لە یەكتر وەرئەگرت، بنیادەمەكان لە شەیتانەكانەوە فێری دواكەوتنی نەفس و ئارەزوویازی بوون و، شەیتانەكانیش بە گومڕاهیی بنیادەمەكان ئاواتیان هاتەدی و دڵخۆش بوون، وا ئیستەیش هەموومان گەیشتووینەتە ئەو سات و كاتەی بۆت دیاری كردبووین و لە بەردەستتداین. خودایش پێیان ئەفەرمووی: دە بڕۆن ئەوە دەردتان بێ مادام لە دنیادا دوای ئارەزووی نەفستان كەوتبوون، ئیستە ئاگری دۆزەخ جێگاو ئەنجامی ئەبەدیتانەو هەتا هەتایە تیایدا دەمێننەوە.

موفەسرین دەڵێن پەریەكان هاتن فێڵیان لەخەڵكی كرد بەوەی دڵەڕاوكێیان بۆ دروست كردن، هەندێك كەس دەڵێن من جنۆكە دەردەكەم من جنۆكە دێنم،

---

١- الملك: ١٤

٢- الأنعام: ١٢٨

هەردوکیان بەناوی خواو خەڵکانی ترەوە درۆ دەکەن لەبەرئەوە هەردوولایان لەئاگردا بەهەمیشەیی دەمێننەوە.

ئەو کەسەی وادەزانێت شەیتان دەستی لێوەشاندووە یان گۆڕیویەتی با سورەتی (البقرة) بخوێنێتەوە هەرچیەکی هەبێت نامێنێت، بەڵام ئەو کەسەی دەچێت بۆ لای جنۆکە یاخود داوای یارمەتی لێ دەکات لەوانەی کە لەگەڵ جنۆکەکاندان و هاوکاریی لەوان وەردەگرن ئەوا وەکو ئەوانیان لێ دێت مادام بڕوایان پێی هەیە، تەنانەت پەرییە باوەڕدارەکانیش سەرقاڵی خواپەرستین، لەبەرئەوە خوای گەورە (بسم الله) کردن و پەناگرتن بەخوای داناوە بۆ ئەم حاڵەتانە، پێغەمبەریش ﷺ زیکری بەیانیان و ئێواران و هەرکاتێکی ترو بۆ هەر چونە دەرەوەیەك و هاتنە ژورەوەیەك داناوە هەتا ئادەمیزاد پارێزراو بێت لە دەست وەشاندنی شەیتان.

کوڕەکەی حەزرەتی عومەر(رەزای خوایان لێ بێ) هەموو شەوێکی هەینی خەتمی قورئانی دەکرد پاشان بێ باوك و منداڵانی تری کۆدەکردەوەو دەیفەرموو: ئامین بۆ دوعاکانی مامتان بکەن چونکە بۆتان گیرا دەبێت. ئەبو ئەیوبی ساختیانی لەمیصر لەسەردەمی تابعیندا بوو دراوسێیەکی خراپ و بەدڕەوشتی هەبوو پیاوەکە مرد پێیان وت: وەرە نوێژی لەسەر بکە ئەویش ڕازی بوو نوێژەکەی لەسەر کرد، ئەو پیاوە هاتە خەوی ئەبو ئەیوب لەبەهەشتدا ڕایدەبوارد، لێی پرسی: چی تۆی هێناوەتە ئێرە؟!! وتی ئەبو ئەیوب، ئەگەر تۆ ڕەحمەتی خوات بەدەستەوە بوایە ئەوا لەترسی هەژاربوون نەتدەدا بەکەس.

ئەبوئەیوب لەخەوەکەی بەئاگاهاتەوەو ڕۆشت بۆلای ژنی ئەو پیاوەو لەپشت دەرگاکەیانەوە لێی پرسی: مێردەکەت چی دەکرد؟ وتی: هەروەکو دەبینی بەڵام هەموو شەوێکی هەینی منداڵانی بێ باوکی گەڕەکی کۆدەکردەوەو

بەدەستی خۆی خواردنی پێدەدان و دەستی دەهێنا بەسەریانداو دەیوت: نزا بۆ مامی خۆتان بکەن بەڵکو خوا لێی خۆش بێت.

هەرگیز کاری چاکە بەکەم مەزانە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: (هیچ چاکەیەك بەکەم تەماشا مەکە ئەگەر زەردەخەنەیەکیش بێت لەبەرامبەر براکەتدا)[1]. ئەگەر سمی بەرانیش بێت بەدیاری بیدەیتێ هەتا دڵەکانی پێ کەمەندکێش بکەیت، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِكُم مِّنَ ٱلْجِنِّ وَٱلْإِنسِ﴾[2] واتە: دە بچنە ناو کۆمەڵانی نەتەوە کافرەکانی پێش خۆتان لە بنیادەم و لە جیننی. واتە: کۆمەڵ کۆمەڵ، هەر کە ئوممەتێك خرانە ئاگرەوە نەفرین لەوەی نزیك خۆی دەکات بێ ئەوەی بیری لێ بکاتەوە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿حَتَّىٰٓ إِذَا ٱدَّارَكُواْ فِيهَا جَمِيعًا قَالَتْ أُخْرَىٰهُمْ لِأُولَىٰهُمْ رَبَّنَا هَٰٓؤُلَآءِ أَضَلُّونَا فَـَٔاتِهِمْ عَذَابًا ضِعْفًا مِّنَ ٱلنَّارِ﴾[3] واتە: کە هەموو لەوێ کۆبوونەوەو ڕووبەڕووی یەك وەستان پەیڕەوەکان دەربارەی ئەوانەی دوایان کەوتبوون ئەیانوت: خودایا! ئا ئەمانە بوون ئێمەیان گومڕا کرد. دە دوو قات بە ئاگر سزایان بدە، حەقی ئەوەی خۆیان گومڕابوون و هی ئەوەیش ئێمەیان گومڕاکرد. دوای ئەوەی دەگەن بەخوارترین ڕەویەی سزایان بەهۆی خراپەکاری یاخود تاوانەکانیان.

بۆ نموونە هەرچی کوژراو هەیە لۆمەی قابیل دەکەن لەبەرئەوەی یەکەم کەس بوو کوشتنی داهێنا، فەرمانڕەوای ستەمکار لۆمەی فیرعەون دەکات لەبەرئەوەی یەکەم ستەمکاری خۆبەزل زان بوو، دەوڵەمەندی سامان کۆکەرەوە

---

١- رواه مسلم

٢- الأعراف: ٣٨

٣- الأعراف: ٣٨

لۆمەی قارون دەکات، خەڵکی نکوڵیکەرو لەخۆبایی بوو لۆمەی ئەبو جەهل دەکات.

ئەوەی کارێکی خراپ دابهێنێ ئەوا گوناهی خۆی و ئەوەی بەدوای خۆیدا ئەنجامی دەدات هەڵدەگرێت تا ڕۆژی دوایی خوای گەورە پێیان دەفەرموێت: ﴿لِكُلٍّ ضِعْفٌ﴾[1] واتە: خودا ئەفەرموێ: ئێوەش و ئەوانیش هەموو تۆڵەتان لێئەسەنرێ.

بەهۆی ئەوەی تۆ شوێنی کەوتبویت، لاوازە بەهۆی ئەوەی چاندویەتی و ئەنجامی داوە، ئەوەش ئەوپەڕی دادپەروەری خوای میهرەبانە بۆ هەردولایان بەوەی ژێری بەخشیوە هەتا بیربکەینەوە.

## ئەوە بچێنە کە حەز دەکەیت بیدوریتەوە...

سەیر دەکەیت ئەوەی کارێك ئەنجام دەدات دروێنەی کارەکەی خۆی دەکات، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَنَادَىٰٓ أَصۡحَٰبُ ٱلۡجَنَّةِ أَصۡحَٰبَ ٱلنَّارِ أَن قَدۡ وَجَدۡنَا مَا وَعَدَنَا رَبُّنَا حَقّٗا فَهَلۡ وَجَدتُّم مَّا وَعَدَ رَبُّكُمۡ حَقّٗاۖ قَالُواْ نَعَمۡۚ فَأَذَّنَ مُؤَذِّنُۢ بَيۡنَهُمۡ أَن لَّعۡنَةُ ٱللَّهِ عَلَى ٱلظَّٰلِمِينَ﴾[2]

واتە: بەهەشتیەکان بانگئەکەنە دۆزەخییەکان و پێیان ئەڵێن: ئێمە بەڕاستی ئەوەی خودا وەعدی پێ دابووین دەستمان کەوت، ئاخۆ ئێوەیش ئەوەی خودا وەعدی پێ دابوون دەستتان کەوت؟ وتیان: بەڵێ، جا لەوێدا لەبەینی ئەو دوو کۆمەڵەدا جارچی جاڕی کێشاو وتی: لەعنەت و نەفرینی خودا لە ستەمکاران بێ.

---

١- الأعراف: ٣٨

٢- الأعراف: ٤٤

ئەم بانگەوازە کاتێك دەکرێت هەریەکەیان لەشوێن خۆیاندا جێگیردەبن، خەڵکی بەهەشت لەبەهەشتدا دۆزەخییەکانیش لەدۆزەخدا.

خوای گەورە وادەی بەبەهەشتیەکان داوە ئەگەر ئارام بگرن ئەوا دەچنە فیردەوسی باڵاوە، ئەگەر بەڕۆژوو بن لەدەرگای ڕەییانەوە دەچنە ژوورەوە، ئەگەر بەخشیبیان گوڵە گەنمەکانیان دەبێتە (٧) گوڵەگەنم، لەهەر گوڵێکدا سەد دەنکی تێدایە، ئەگەر ڕقی خۆیان بخۆنەوەو لەسەر ئازارەکان ئارام بگرن ئەوا ئەوەی خوا وادەی پێداون دەستیان دەکەوێت.

کەسی بێ باوەڕیش دەڵێت خوا ناپەرستم، نوێژ ناکەم، بەڕۆژوو نابم، خۆم پاك ڕاناگرم، میرات بەشی خوشکەکەم نادەم، سەر نەوی ناکەم بۆیان، درۆ بەدەم خواو خەڵکیەوە دەکەم... ئەوا ئەوەی خوا وادەی پێداون دەستیان دەکەوێت، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: (ستەم تاریکی ڕۆژی قیامەتە)[1]. سزای ستەمکار زۆر توندە ستەم بەرەو کافر بوون دەڕوات.

لەبەرئەوە خوای گەورە لەفەرمایشی قودسیدا دەفەرموێت: (بەندەکانم ستەمم لە خۆم حەرام کردووەو لەنێو ئێوەشدا حەرامم کردووە، ستەم لەیەك مەکەن)[2]. دروست نیە ئادەمیزاد ستەم لەبرای خۆی بکات لەهەر سنورێك لە سنورەکانی خوا لەبەرئەوەی خوای گەورە کارامەیی پێ بەخشیوە، بەو زیرەکییەی نەنگیەکانی خۆی پێ دەبینێت و لەسەری دەوەستێت ئەمەش ئەو کاتە دەبێت خۆی دەخاتەبەر قورئانی پەروەردگار.

---

١- رواه البخاري

٢- رواه مسلم

بەڵام ئەو کەسەی لەکارەکانی هەڵناگەڕێتەوە کە ئەنجامی داوە خوای گەورە دەربارەیان دەفەرموێت: ﴿وَنَادَىٰٓ أَصۡحَٰبُ ٱلنَّارِ أَصۡحَٰبَ ٱلۡجَنَّةِ أَنۡ أَفِيضُواْ عَلَيۡنَا مِنَ ٱلۡمَآءِ أَوۡ مِمَّا رَزَقَكُمُ ٱللَّهُۚ قَالُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ حَرَّمَهُمَا عَلَى ٱلۡكَٰفِرِينَ﴾[1]

واتە: دۆزەخییەکان هاوار ئەکەنە بەهەشتییەکان: لەو ئاوو ڕزقەی خودا پێی داون، بڕژێنن بەسەرماندا و بەشمان بدەن. بەهەشتییەکان لە وەڵامدا ئەڵێن: بەڕاستی خودا ئەمانەی لە کافران مەنع کردووەو نایاندرێتێ.

هەروەها دەفەرموێت: ﴿وَإِذَا صُرِفَتۡ أَبۡصَٰرُهُمۡ تِلۡقَآءَ أَصۡحَٰبِ ٱلنَّارِ قَالُواْ رَبَّنَا لَا تَجۡعَلۡنَا مَعَ ٱلۡقَوۡمِ ٱلظَّٰلِمِينَ﴾[2] واتە: ئەمانە کە ڕوویان بەرەو لای ئەهلی دۆزەخ وەرئەچەرخێ ئەڵێن: پەنا بە خودا، ئەی پەروەردگار! مەمانکە بە هاوڕێی ستەمکاران.

ئەوانە (أصحاب الأعراف)ن، واتە ئەو کەسانەی کە لەسەر شوێنە بەرزەکانن، ئەمە بانگەوازی ئەوانە، دوای چوونە بەهەشتی بەهەشتیەکان و خرانە دۆزەخی دۆزەخیەکان، ئەعرافیەکان کەسانێکن شوێنی خۆیان نازانن، دوای ئەوەی بەهەشتیەکان دەچنە بەهەشت و دۆزەخیەکانیش ڕاپێچی دۆزەخ دەکرێن، ئەوان بەوەستاوی دەمێننەوە، دەربارەیان هیچ فەرمانێك نەدراوە، بەڵام ئومێدیان بەبەزەیی خوا هەیە، چاکەی کەمیان هەیە، خراپەیان زۆرە ئەوەتان لەنێوان خۆیان و خوای خۆیاندا.

زانایان دەڵێن ئەعرافیەکان ئەعرافی ئومەتەکانن چاکەیان کەمەو نایانخاتە بەهەشتەوەو خراپەشیان کەمەو نایانخاتە دۆزەخەوە، چاوەڕێی بەزەیی خوان. هەتا شایانی شەفاعەتی پێغەمبەر ﷺو بەزەیی خوا دەبن، خوای گەورە

---

١- الأعراف: ٥٠

٢- الأعراف: ٤٧

دەفـەرموێت: ﴿وَعَلَى ٱلْأَعْرَافِ رِجَالٌ يَعْرِفُونَ كُلًّا بِسِيمَـٰهُمْ﴾[1] واتـە: لـە سـەرووی ئـەو شوورایەوە کۆمەڵێك هەن لەوانەی لە دنیادا هاوبەشیان بۆ خودا دانەناوەو تـەنها خودایان پەرستووە، بەڵام لەکردەوەی چاکدا کەموکوڕییان هەبووە. ئەم کۆمەڵە ئەهلی بەهەشت و جەهەننەم ئەناسن و بـە نیشـانەی تایبەتیـدا لـە یـەکیان جیـا ئەکەنەوە.. ٱلْأَعْرَافِ: واتە شوێنێکی بەرزو باڵا، پیاویش و ژنیشیان تێدایە.

## چاکسازی ئیسلام بۆ ئافرەتان:

سـەیری خـوای بەنـدەکان بکـە چـۆن هانمـان دەدات بەرامبـەر بـەئافرەت بەرەحم بین، کاتێك ﴿وَعَصَىٰٓ ءَادَمُ رَبَّهُۥ فَغَوَىٰ﴾[2] واتـە: ئـادەم لـە فـەرمانی خـوای خۆی دەرچوو گومڕا بوو. لێرەدا ئادەمی باسکردوە نەك ئـادەم و حـەوا، کاتێك تەوبەی قبولّ کردن، پێکـەوە لێـی قبـولّ کـردن وە فـەرمووی: ﴿ٱهْبِطَا مِنْهَا جَمِيعًۢا بَعْضُكُمْ لِبَعْضٍ عَدُوٌّ فَإِمَّا يَأْتِيَنَّكُم مِّنِّى هُدًى﴾[3] واتە: خوا بـە ئـادەم و ژنەکەیو بە شەیتانی وت: لە بەهەشت دابەزن بۆ سـەر زەوی، هەنـدێ لـە ئێـوە (لە ئـادەمزادو لـە جنۆکـە) دوژمـنی هەنـدێکتانن (ئـەوەتا ئـادەمزاد و جنۆکـەی خواپەرست و ئادەمزادو جنۆکەی کافر دوژمنی یەکترن). جا کاتێ کە لـە منـەوە ڕێپیشاندانێکتان بۆ دێ هەرکەسـێ شـوێنی ئـەو ڕێپیشـاندانەی مـن بکـەوێ ڕێ گوم ناکا و ناڕەحەت و کلۆلّ نابێ.

---

١- الأعراف: ٤٦

٢- طه: ١٢١

٣- طه: ١٢٣

بەڵام ئادەم سەرپێچی خوای کرد، هەر خۆی بەرپرسیاریەتی گرتۆتە ئەستۆ، لەبەرئەوەی خوای گەورە ڕەحم بەئافرەت دەکات و تەنانەت لە سەرپێچی کردنیش بۆی دەپۆشێت.

بۆیە دەبێت بەوجۆرە بین لەگەڵ کچەکانماندا، ئەگەر کەسێك هاتە داوای لە ڕەوشت و ئایینی ڕازی بوون بیاندەنێ، کاری لە سەر قورس نەکەین چونکە کاتێك بردی زۆر بەخراپی ئازاری دەداو زۆر بەناشرینی مامەڵەی لەگەڵ دەکات.

دەگەڕێینەوە بۆ لای ئەعرافیەکان و دەڵێین. کاتێك دۆزەخیەکان دەبینن دەڵێن: ﴿رَبَّنَا لَا تَجْعَلْنَا مَعَ الْقَوْمِ الظَّالِمِينَ﴾[1] پەروەردگار! مەمانکە بە هاوڕێی ستەمکاران.

ئەمانە ستەمکاران بوون ئەوانە بوون ستەمیان کرد لەخۆیان و لایاندا لەو هەڵسوکەوتە جوانانەی کە فەرمانیان پێکراوە، خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿أَلَمْ يَعْلَمُوا أَنَّهُ مَن يُحَادِدِ اللَّهَ وَرَسُولَهُ فَأَنَّ لَهُ نَارَ جَهَنَّمَ خَالِدًا فِيهَا ذَٰلِكَ الْخِزْيُ الْعَظِيمُ﴾[2] واتە: ئایا نەیانزانیوە ئەوی موعارەضەی فەرمانی خوداو پێغەمبەری خودا ئەکات ئاگری دۆزەخ بەشیەتی‌و هەتا هەتایە تیایا ئەمێنێتەوە؟ ئا ئەمەیە سەرشۆڕی‌و ڕیسوایی گەورە.

خوای پاك و بێگەرد چەند یاسایەکی داناوە، ئەوەی جێبەجێی نەکات دژایەتی خوا دەکات بۆنموونە ئەوکەسەی بالاپۆشی ناکات لەبەرامبەر خوادا خۆی بەگەورە دەزانێت چونکە خوا فەرمانی پێکردووە بالاپۆش بێت بەڵام ئەو گوێی پێنادات، خوای گەورە چەند یاسایەکی داناوە وەکو بالاپۆشی و چاو داخستن و ئازارنەدانی خەڵکی، فەرمانی بەمانە کردووە لەبەرامبەردا ئەگەر

---

١- الأعراف: ٤٧

٢- التوبة: ٦٣

ئەنجامتدا دەچیتە بەهەشتەوە، ئەو یاسایانە زانراون لەکاتی نوێژدا ڕودەکەینە قیبلە، ئافرەت خۆی دادەپۆشێت و یاساکانی ئەو بالآپۆشیە دەزانێت ئەوەی دەیبینێ و ئەوەشی نایبینێ، وە کێ مەحرەمە بۆی، وە کێن نامەحرەمەکانی.

هەروەها چەند شتێکی بۆ ڕازاندوینەتەوە بەلآم یاسای خۆیان هەیە، ئەگەر لە چوارچێوەی دەرچویت ئەوە حەرام کراوە، خۆ ئەگەر ئادەمیزاد پابەند بوو پێوەی ئەوا خۆی و جەستەی لەئاگر دەپارێزێت بۆ نموونە:

﴿ زُيِّنَ لِلنَّاسِ حُبُّ ٱلشَّهَوَٰتِ ﴾[1] وە ﴿ ٱلْمَالُ وَٱلْبَنُونَ زِينَةُ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ﴾[2]

واتە: ماڵ و سامان و ئەولاد جوانیی ژیانی دنیان و زوو لەناوئەچن.

ئەوە لێت حەرام نەکراوە لەبەرئەوەی لەدڵەکانماندا جوانی کردووە خۆشمان ویستووە لەگەڵیدا مامەڵە دەکەین هەروەها ئارەزووەکانی لەچوارچێوەیەکی دروستدا داناوە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ أَفَمَنْ أَسَّسَ بُنْيَٰنَهُۥ عَلَىٰ تَقْوَىٰ مِنَ ٱللَّهِ وَرِضْوَٰنٍ خَيْرٌ أَم مَّنْ أَسَّسَ بُنْيَٰنَهُۥ عَلَىٰ شَفَا جُرُفٍ هَارٍ فَٱنْهَارَ بِهِۦ فِى نَارِ جَهَنَّمَ ۗ وَٱللَّهُ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴾[3] واتە: ئایا کەسێ بینای مزگەوتی لەسەر بناخەی بتەوی لەخوداترسان و ڕەزامەندی خودا دامەزراندبێ چاکترە، یا کەسێ بینای مزگەوتی لەسەر قەراخی کەندێکی بێهێزی ڕووخاو دامەزراندبێ کە لەگەڵ خۆیدا برووخێتە ناو ئاگری دۆزەخەوە؟ چونکە لەسەر بناخەی دوژمانیەتیکردنی ئایینی ئیسلام دامەزراوە. خودا هەرگیز هیدایەتی قەومی ستەمکار نادات.

---

١- آل عمران: ١٤

٢- الكهف: ٤٦

٣- التوبة: ١٠٩

## ئاینەکەت خوێن و گۆشتتە:

خـوای گـەورە دەفـەرموێت: ﴿ أَفَمَن كَانَ عَلَىٰ بَيِّنَةٍ مِّن رَّبِّهِۦ ﴾[1] واتـە: ئایـا کەسێ دەلیلی لای خوداوە هەبێ، وەك عـەقڵ و تێفکرین، بیخاتـە سـەر ڕێگـای ڕاست ، واتە قورئان و سوننەتی پێیە، ئەم فەرمایشتە بۆ موسوڵمانانە.

پوری عومەری کوڕی عەبدولعەزیز هاتە خزمـەتی وتـی: کوا بەخشیشـەکەی خۆم؟ حەزرەتی عومەر(ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پوریێ گیان پـێم داویـت. ئەویش وتی: نەخێر بەخشیشە تایبەتیەکەی خۆم. ئەویش فەرمووی: بەخشـینی تایبەتی نیە. پوری وتی: چۆن؟ وەلیدی مامت وە پێش ئـەویش عەبدولمـەلیك و بەنو ئومەییە، ئایا چەکی پارەی وەلیدت پـێ نەگەیشـتووە ؟ حـەزرەتی عومـەر لەوکاتەدا سەری دانەواندبوو بـەرزی کردەوەو فـەرمووی: چـی دەڵێیـت پـوریێ؟ وتی: پارەکەی وەلیدی کوڕی عەبـدولملکت پێنەگەیشـتووە بمـدەیتێ ئـەو بـۆی دەنوسـیم کـە بەخشیشـێکی تایبـەتیم هەیـە لەدەوڵەتـەوە. حـەزرەتی عومـەر فەرمووی: پوریێ بەقورئان دێیت؟!! چووە دەرەوە وتـی: ئـەی بـەنی ئومەییـە لۆمـەی کـەس مەکـەن خۆتـان نـەبێت. قسـەکەی عومـەری بـەدڵ نـەبوو، لێـی توڕەبوو.

هەروەکو ئەوەی لەسەردەمی حەزرەتی عومـەری کـوڕی خـەطـابـدا کەسێك کرایە سەرۆکاری (بیت المال)ی موسوڵمانان، فلسێکی بینی لـەو نـاوە کـەوتبوو دای بە یەکێك لەنەوەکانی حەزرەتی عومەر کەئەوەی بینی قۆڵی کابرای گـرت و فەرمووی: ماڵێکی ترت نەبینی حەرام وەربگرێت ماڵی عومەر نەبێت.

---

١- هود: ١٧

نموونـەی تـر زۆرە حەسـەنی بەصـری هـەموو ڕۆژێ وەك زوهـدو دەسـت گرتنەوە نانی دەخوارد هەتا خۆی بۆ خواردنـە خۆشـەكانی ڕۆژی دوایـی ئامـادە بكات، خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿ أَفَمَن كَانَ عَلَىٰ بَيِّنَةٍ مِّن رَّبِّهِۦ وَيَتْلُوهُ شَاهِدٌ مِّنْهُ وَمِن قَبْلِهِۦ كِتَٰبُ مُوسَىٰٓ إِمَامًا وَرَحْمَةً ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ يُؤْمِنُونَ بِهِۦ ۚ وَمَن يَكْفُرْ بِهِۦ مِنَ ٱلْأَحْزَابِ فَٱلنَّارُ مَوْعِدُهُۥ ۚ فَلَا تَكُ فِى مِرْيَةٍ مِّنْهُ ۚ إِنَّهُ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّكَ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يُؤْمِنُونَ ﴾[1] واتە: ئایـا كەسـێ دەلیلی لای خوداوە هەبێ، وەك عەقڵ و تێفكرین، بیخاتە سەر ڕێگـای ڕاسـت و، شاهیدێكی وەك قورئانی هەبێ یارمەتیی بدات و، لـە پـێش ئـەو شاهیدەیشـەوە تەوراتی مووسا كـە پێشـەوای خـەڵكی سـەردەمی خـۆی بـووە، یارمـەتی قسـەو كـردەوەی دابـێ، ئایـا ئـەم جـۆرە كەسـە وەك ئـەو كەسـەیە كـە تـەنها ژیـان و خۆشـیی دنیـای مەبەسـت بـێ‌و ڕۆژی دوایـی بەخەیاڵـدا نـەیێ؟ ئەوانـە، واتـە پێغەمبـەرو پـەیڕەوەكانی، باوەڕیـان بـە قورئـان هەیـە. ئـەوەیش بـاوەڕی پـێ نـەكات، وەك موشـریكەكانی مەككـەو دەسـتەو بەسـتەكانیان، ئـاخری دۆزەخ جێگایانەو لەوێ سزا ئـەدرێن. هـەرگیز گومـان و دوو دڵـیت نـەبێ لـە قورئانـدا؛ قورئان حەقەو لای خودای خۆتەوە هاتووە، بەڵام زۆرتری خەڵك باوەڕیان نیـیە؛ چونكە بیرناكەنەوەو عەقڵیان ناخەنەكار.

واتە لەدژی ئایین خۆی ڕێك دەخات ئەوا ئەو جۆرە كەسانە ئاگر نشینگەیانە، سەرەتا ئەم دینە لەحەزرەتی موساوەعليه السلام هەتا حەزرەتی عیساعليه السلامو پاشانیش محمد ﷺ دابەزیوە ئەوەتا پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: بەو زاتـەی منـی بەحـەق ناردووە ئەگەر مووسای برام ئێستا زیندوو بووایە ئەوا هیچ بوارێكی نەبوو تـەنها

---

[1] - هود: ١٧

شوێنکەوتنی من نەبێت. خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ إِلَىٰ فِرْعَوْنَ وَمَلَإِيْهِۦ فَٱتَّبَعُوٓاْ أَمْرَ فِرْعَوْنَ ۖ وَمَآ أَمْرُ فِرْعَوْنَ بِرَشِيدٍ يَقْدُمُ قَوْمَهُۥ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ فَأَوْرَدَهُمُ ٱلنَّارَ ۖ وَبِئْسَ ٱلْوِرْدُ ٱلْمَوْرُودُ ﴾[1] واتە: بۆ سەر فیرعەون و دەستە و بەستەکەی، ئەوانە دوای قسەی مووسا نەکەوتن و ئیمانیان پێ نەهێنا، بەڵکو دوای فەرمانی فیرعەونی گومڕا کەوتن. بێگومان ڕێگای فیرعەون ڕاست و ڕەوان نەبوو بەڵکو ڕێگایەکی چەوت و چەوێڵ بوو. لە ڕۆژی قیامەتدا ئەکەوێتە پێش قەومەکەی و ئەیانبات بۆ ئاگری دۆزەخ کە پیسترین شوێنە خەڵکی ببرێتە سەر.

ئەوە پێشەوای بێ باوەڕیە پێشەوای شەڕە وە هەمان باسی شوێنکەوتوو و شوێنکەوتنەکەیە، وە هەمان باسی شوێنکەوتنی هودە: ﴿ وَمَا نُؤَخِّرُهُۥٓ إِلَّا لِأَجَلٍ مَّعْدُودٍ ﴾[2] واتە: ئێمە ئەو ڕۆژە دواناخەین بۆ ماوەیێکی دیاری نەبێ، جا کە وادەکە تەواو بوو ئەو ڕۆژە دێتە دی. ڕۆژی دوایی ﴿ يَوْمَ يَأْتِ لَا تَكَلَّمُ نَفْسٌ إِلَّا بِإِذْنِهِۦ ﴾[3] واتە: کە ئاکامەکە تەواو بوو و ڕۆژی قیامەت هات کەس ناتوانێ قسە بکات بە ئیزنی خودا نەبێ.

﴿ يَوْمَ يَقُومُ ٱلرُّوحُ وَٱلْمَلَـٰٓئِكَةُ صَفًّا ۖ لَّا يَتَكَلَّمُونَ إِلَّا مَنْ أَذِنَ لَهُ ٱلرَّحْمَـٰنُ وَقَالَ صَوَابًا ﴾[4]

واتە: لە ڕۆژێکا کە جیبرەئیل و فریشتەکانی تر پۆل پۆل ئەوەستن کەس قسە ناکا کەسێ نەبێ خوای میهرەبان ئیزنی دابێ و قسەی ڕاست و باش بکا.

---

١- هود: ٩٧ - ٩٨

٢- هود: ١٠٤

٣- هود: ١٠٥

٤- النبأ: ٣٨

لەناویاندا نائومێدو بەختەوەر هەیە، نائومێدو بەدبەختەکانیان لەناویدا هەناسەو هەناسە دانەوەیان وەکو زەڕەی گوێدرێژە هەتا کۆتایی مانەوەیان لەئاگردا.

خوای گەورە دەفەرموێت:﴿ وَلَا تَرْكَنُوٓاْ إِلَى ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ فَتَمَسَّكُمُ ٱلنَّارُ ﴾[1] واتە: هیچ جۆرە مەیلێ مەکەن لەگەڵ ئەو کافرانە کە ستەم لە خۆیشیان و لە خەڵکیش ئەکەن و لە فەرمانی خودا لائەدەن، ئەگینا ئاگری دۆزەخ لێتان ئەکەوێو ئێوەیش ئەگرێتەوە.

بۆ نموونە دەڵێ: دین مەخەنە هەموو شتێکەوە دین پەیوەندی بەهونەرو باری ئابوورییەوە نیە، بەڵکو تەنها پەیوەندی بەمزگەوتەوەیە. ئەوەی ئەو قسانە دەکات بەدڵنیاییەوە ئاگر شوێنیەتی. خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿وَإِن تَعْجَبْ فَعَجَبٌ قَوْلُهُمْ أَءِذَا كُنَّا تُرَٰبًا أَءِنَّا لَفِى خَلْقٍ جَدِيدٍ ﴾[2] واتە: ئەگەر تۆ سەرت سووڕئەمێنێ لە قسەی ئەوان، حەقتە سەرت سووڕبمێنێ، چونکە قسەی ئەوان زۆر جێگەی سەرسووڕمانە کە ئەڵێن: ئایا ئەگەر ئێمە بمرین و بڕزێین و ببین بە خۆڵ سەرلەنوێ دروست ئەکرێینەوە؟! وە دوا وتەیان: ﴿أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بِرَبِّهِمْ وَأُوْلَٰٓئِكَ ٱلْأَغْلَٰلُ فِىٓ أَعْنَاقِهِمْ وَأُوْلَٰٓئِكَ أَصْحَٰبُ ٱلنَّارِ هُمْ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴾[3] واتە: ئەوانە ئیمانیان بە خودای خۆیان نییە، بۆیە باوەڕ بە زیندووبوونەوە ناکەن. ئەوانە بەهۆی ئەوەوە کە هەمیشە گومڕاهن، ڕۆژی قیامەت زنجیر ئەخرێتە ملیان. ئەوانە هاوڕێی ئاگرن و، هەتا هەتایە لەو ئاگرەدا ئەمێننەوە. ئەوەی نکوڵی لە زیندوبونەوە دەکات بێ باوەڕە.

---

١- هود: ١١٣

٢- الرعد: ٥

٣- الرعد: ٥

## زانست شەرەفە لەگەڵ پێ سپاردن (التكليف):

ئەو کەسانەی کە زانان و ئەوانەی نەزانن وەك یەك نابن نە لەپاداشت و نە لەسزادا خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿أَفَرَءَيْتَ مَنِ اتَّخَذَ إِلَٰهَهُ هَوَىٰهُ وَأَضَلَّهُ اللَّهُ عَلَىٰ عِلْمٍ﴾[1] واتە: ئایا کەسێ ئارەزووی نەفسی خۆی بۆ خۆی کردبێ بە خوای خۆیو بەگوێرەی ئەوە بجوولێتەوە هەر وەك بلێی بیپەرستێو، خوا ئەو کەسەی بەو کردەوەیەی گومڕا کردبێ، لەگەڵ ئەوەیشا کە زانیاریی داوەتێ چاك چییەو خراپ چییە.

ئەمەش جیاوازە لەوانەی کەخراپەیەك بەنەزانی دەکەن پاشان بەزوویی تەوبە دەکەن و پەشیمان دەبنەوە.

بۆیە دەبێت ئادەمیزاد زانستە ئاینیی و نائاینییەکان فێر ببێت وە دەبێت ئەو کەسەی زانایە هەڵسێت بە فێرکردنی نەزانەکان، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَلَوْلَا نَفَرَ مِن كُلِّ فِرْقَةٍ مِّنْهُمْ طَائِفَةٌ لِّيَتَفَقَّهُوا فِي الدِّينِ وَلِيُنذِرُوا قَوْمَهُمْ إِذَا رَجَعُوا إِلَيْهِمْ﴾[2] واتە: کەواتە بۆچی لە هەموو کۆمەڵێکی گەورە، وەك هۆزێ یا تیرەیێ، جەماعەتێکیان ناچن بۆ فێربوونی زانیاری تا لە ڕێگای زانینی حوکمی ئاییندا ماندوو بێن و کە گەڕانەوە بۆ لای قەومەکانیان بییانترسێنن لە کردەوەی خراپ و بێدینی، بەڵکو خۆیان بپارێزن و تووشی سزای دواڕۆژ نەبن؟

سەیر دەکەیت یەکەم شت کە بۆ پێغەمبەری خواﷺ دابەزی سورەتی علق بوو: ﴿اقْرَأْ بِاسْمِ رَبِّكَ الَّذِي خَلَقَ﴾[3] واتە: قورئان بخوێنە لەگەڵ هێنانی ناوی ئەو خوایەی خۆتا کە دروستکردنی هەر دروستکراوێ کاری ئەوە. ئەمە فەرمانێکە بۆ

---

١- الجاثية:٢٣

٢- التوبة: ١٢٢

٣- العلق: ١

پێغەمبەرو ئومەتەکەی لەدوای خۆی دەبێت فێربن و گەلەکەشیان فێربکەن، چونکە ئەمە پێ سپاردەیەکی پێویستە، پێویستی بەفێربوونی هەموو شتێکە، لەجوڵەو وەستان و خەوتن و بەئاگابوون و هاتنە دەرەوەو چونە ناوەوە. کەسانێك هەن دەڵێن: دەترسم فێرببم لەبەرئەوەی فێربوون ئادەمیزاد رادەسپێرێت بەجێبەجێ کردنی فەرمانبەرداری و نەرێ کردن ئەو کاتە دەبێت هەر ئەنجامی بدەم، ئەوەی زانی و کاری بەمەنەکرد کەدەیزانێت سزاکەی جیایە، لەبەرئەوە خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿يَعۡرِفُونَهُۥ كَمَا يَعۡرِفُونَ أَبۡنَآءَهُمۡ﴾[1] واتە: زاناکانی ئەهلی کیتاب، ئەوانەی تەوراتمان پێدان، پێغەمبەری ئاخر زەمان، موحەممەد، زۆرباش دەناسن وەك چۆن کوڕەکانی خۆیان دەناسن.

ئەوا دەبێتە بەڵگە بەسەریانەوە، بەڵگە بەزانین، بەڵگەشە بەکارنەکردن بەوەی کە زانیویەتی و گێلی و دوژمنایەتی و دژایەتی کردنی.

بەڵام ئەوانە جیادەکرێنەوە کە تەوبە دەکەن، ئەگەر پێی بزانێت یان نا، بەڵام ئەو کەسەی خۆی شارەزا نەکات لە کاروبارە ئاینیەکەی ئەوە گوناهبارەو لەسەر نەزانینەکەی لەبەرامبەر خوادا لێپرسینەوەی لەگەڵدا دەکرێت، قورئان بۆ سەر پێغەمبەر ﷺ دابەزی هەتا هاوەڵان لەسەری شارەزا بکات پاشان شوێنکەوتووان و دوای ئەوانیش، ئەم قورئانە لەسەری دەخوێنرێت لەسەری فێردەبێت هەتا ئەو ڕۆژەی تاکە کەسێك لە زەویدا دەمێنێتەوە.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿تِلۡكَ حُدُودُ ٱللَّهِ فَلَا تَعۡتَدُوهَاۚ﴾[2] ، لەئایەتێکی تردا دەفەرموێت: ﴿فَلَا تَقۡرَبُوهَا﴾[1]

---

١- البقرة: ١٤٦

٢- البقرة: ٢٢٩

لەجاری یەکەمدا بۆ فەرمانە، لەدووەمدا بۆ نەرێیە (النهي) بۆ نموونە فەرمانم پێکراوە بەڕۆژو بم و نوێژ بکەم و شتی تریش ئەمانە فەرمانن و سنوری خۆیان هەیە. ئەوەی هەڵنەسێ بەئەنجامدانی نوێژو ڕۆژو و زەکات و حەج ئەوا سنورەکانی خوای شکاندووە.

بەڵام ئەوەی کارە حەرامکراوەکان ئەنجام دەدات وەکو مەی خۆری و قوماربازی و گۆڕپەرستی و کەس پەرستی هەموویان حەرامن و نابێت لێیان نزیك بکەویتەوە چونکە ئەوانە نەهی لێکراوەکانن، خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿إِنَّمَا ٱلْخَمْرُ وَٱلْمَيْسِرُ وَٱلْأَنصَابُ وَٱلْأَزْلَٰمُ رِجْسٌ مِّنْ عَمَلِ ٱلشَّيْطَٰنِ فَٱجْتَنِبُوهُ﴾[2] واتە: ئەی خاوەن ئیمانەکان! شەراب و قوماركردن و سەربڕینی حەیوان لەسەر بەردەکانی دەوری کەعبە، یا لای بتەکان، هەروەها پەیڕەوی کردنی ئەزلام و بەکارهێنانی، کارێکی پیس و قیزەونن و کرداری شەیتانی نەفرین لێکراون، کاری ئینسانی ژیرو لەخوداترس نین، خۆتان لەمانە بپارێزن و لێیان دووركەونەوە بەڵکو سەرکەون و بەختەوەر بن.

نزیك نەکەوتنەوە ئادەمیزاد لەکەوتنە ناو کارە گوماناویەکان دەپارێزێت تەنانەت لەکارە دینیەکانیشدا.

خوای گەورە چەند سنورێکی داناوە بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ خەڵکیدا بۆ نموونە کەسێك خانوویەك دروست دەکات پرس بەدراوسێکەی دەکات مافی ئەوەی دەداتێ کەڕێگەی هەوای لێنەگرێت ماوەیەك جێبهێڵێت لەنێوان ماڵەکەی و شەقامەکەدا، بەو شێوەیە دەبینین هەموو شتێك سنوری هەیە، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: (هەموو پادشایەك سنورو پەرژینی هەیە، سنورو پەرژینی خوا

---

١- البقرة: ١٨٧

٢- المائدة: ٩٠

لەســەر زەوی خۆیــدا حەرامکراوەکانیــەتی) لەفەرمانەکانیــدا ســنور نەشــکێنم لەنەرێکانیشدا نزیك نەکەومەوە.

## ڕاکردن نیە لەسزای خوا:

ئاگر هەمیشە نوێ دەبێتەوەو کۆتـایی نایـەت و داناخرێ، خـوای گـەورە دەفەرموێت:

﴿كُلَّمَا خَبَتۡ زِدۡنَٰهُمۡ سَعِيرٗا﴾[1] واتە: هەرچەند بلێسەی دامرکێتەوە ئێمە گڕەکەی زیاد دەکەین.

ئەوەی کەوتە ناوی هـەرگیز نافـەوتێت هـەر لەناویـدا دەمێنێتـەوە هەمیشـە بلێسـەدارەو ناکوژێتـەوە بـەڵام حـەزرەتی نـوح خـوای گـەورە دڵـی باوکایـەتی لەبەهەشـتدا لـێ دەردەهێنێـت هـەتا بـۆ کوڕەکـەی غـەمبار نـەبێت کەخراوەتـە ئاگرەوە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلَا هُمۡ يَحۡزَنُونَ﴾[2]

بۆیــە بەهەشــت نــاونراوە مــاڵی نیشــتەجێبوون، ئەمــەش فــەزڵی خــواو بەخشندەییەتی، هەروەها بەخشندەیی خوا لەسزاو پاداشتیشـدا دەردەکـەوێت، هەردوو لایان ئەوەی هەڵیان بژاردووە هەتا هەتایی دەمێنێتـەوە تیایـدا، ئـەوەی ڕێگەی هیدایەتی هەڵبژارد ئەوا بـۆ هەمیشـە لەبەهەشـتدا دەمێنێتـەوە ئەوەشـی ڕێگەی گومڕایی گرتەبەر بۆ هەمیشە لەئاگردا دەمێنێتەوە، ئەوەش دادپـەروەری خوایە لەگەڵ بەندەکانیدا خوای گەورە ستەم لەبەندەکانی ناکات.

---

١- الإسراء: ٩٧

٢- الزمر: ٦١

کاتێك بێ باوەڕان سزای ئاگر دەبینن بەخوا دەڵێن: ﴿رَبَّنَآ أَخۡرِجۡنَا نَعۡمَلۡ صَٰلِحًا غَيۡرَ ٱلَّذِي كُنَّا نَعۡمَلُ﴾[1] واتە: خوایە! لەم دۆزەخەمان دەرکە با کردەوەیەکی چاك بکەین غەیری ئەو کردەوە خراپانەی لە دنیادا ئەمانکردن.

خوای گەورە بە بێ باوەڕییان دەزانێت بۆیە پێیان دەفەرموێت: ﴿وَلَوۡ رُدُّواْ لَعَادُواْ لِمَا نُهُواْ عَنۡهُ وَإِنَّهُمۡ لَكَٰذِبُونَ﴾[2] واتە: ئەگەر بیشگێڕرێنەوە بۆ دنیا جارێکی تر دەست ئەدەنەوە ئەو کارو کردەوە ناشیرینانە کە نەهییان لێ کرابوو، بەڕاستی ئەوانە درۆزنن.

لەبەرئەوەی لەپێشیشدا ئەوەیان کردووە:

﴿يَٰمُوسَى ٱدۡعُ لَنَا رَبَّكَ بِمَا عَهِدَ عِندَكَ لَئِن كَشَفۡتَ عَنَّا ٱلرِّجۡزَ لَنُؤۡمِنَنَّ لَكَ وَلَنُرۡسِلَنَّ مَعَكَ بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ﴾[3] واتە: کە ئەو سزاو ئازارانە بارین بەسەریانداو تووش بوون پەنایان بردە بەر مووساو پێیان وت: لە خودای خۆت بپاڕێرەوە ئەم نەگبەتیو نەهاتییەمان لە کۆڵ بکاتەوە، بەو پەیمانەی لە بەینتاندا هەیەو پێی وتووی: ئەگەر لێم بپاڕێیتەوە نزات قبووڵ ئەکەم. جا قەسەم بەو پەیمانە ئەگەر ئەم جارە ئەم ئازارەت لێ ڕەواندینەوەو ڕزگار بووین ئیمانت پێ ئەهێنین و بەنی ئیسرائیلت لەگەڵ ئەنێرین.

کاتێك خوا بانگی کردن ئەوانیش وادەیاندا کەباوەڕداربن بەڵام وادەی خۆیان نەبردە سەر بۆیە خوای گەورە سزای بەسەردا باراندن، لەئەسپێ و بۆق و کوللە، تەنانەت فیرعەون چێشت لێنەرەکانی پاکژدەکردەوەو چێشتخانەکانی

---

١- فاطر: ٣٧

٢- الأنعام: ٢٨

٣- الأعراف: ١٣٤

بەپاسەوان دەورە درابوو، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا کاتێك پارویەکی بۆ دەمی دەبرد یان خوێن یان ئەسپێ یان کولله یان بۆقی لەناو خواردنەکەدا دەبینی، ئەوە پاداشتی بێ باوەڕیی و کەللەڕەقی و سەرپێچی کاری خوای گەورەیە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَٱلْيَوْمَ لَا يُؤْخَذُ مِنكُمْ فِدْيَةٌ وَلَا مِنَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مَأْوَىٰكُمُ ٱلنَّارُ هِىَ مَوْلَىٰكُمْ وَبِئْسَ ٱلْمَصِيرُ﴾[1] واتە: ئیتر ئەمڕۆ تۆڵەو بریتیتان وەرناگیرێ لەجیاتیی سزای دۆزەخ و لە کافرە بەئاشکراکانیش هەروا وەرناگیرێ. مەئواو جێگای هەمووتان ئاگری دۆزەخەو هەر ئاگری دۆزەخ شوێنی شایانتانەو خراپ سەرەنجامێکە.

بیخەرە بەرچاوت ئاگر ببێتە گەورەت کەهانای بۆ دەبەیت و لێی نزیك دەبیتەوە. دەبینیت لەم دنیایەدا دارو درەخت و ڕووەکەکان بەئاو دەژین، بەڵام درەختی زەقوم بە ئاگر ئاودەدەرێت ڕەگەکەی لە خودی دۆزەخدایە، خوای گەورە باسی شەیتان دەکات و دەفەرموێت: ﴿كَمَثَلِ ٱلشَّيْطَٰنِ إِذْ قَالَ لِلْإِنسَٰنِ ٱكْفُرْ فَلَمَّا كَفَرَ قَالَ إِنِّى بَرِىٓءٌ مِّنكَ إِنِّىٓ أَخَافُ ٱللَّهَ رَبَّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿١٦﴾ فَكَانَ عَٰقِبَتَهُمَآ أَنَّهُمَا فِى ٱلنَّارِ خَٰلِدَيْنِ فِيهَا ۚ وَذَٰلِكَ جَزَٰٓؤُا۟ ٱلظَّٰلِمِينَ﴾[2] واتە: میسالی ئەم دووڕووانە لە هاندانی جوولەکەدا کە بە گژ موسوڵمانانا بچن وەك میسالی شەیتان وایە کە کەوتە بن کلێشەی ئادەمزادو پێی وت: کافر ببەو باوەڕت بە خواو پێغەمبەری خوا نەبێ. جا کە کافر بوو حاشای لێ کردو وتی: من بێ بەریم لە تۆ، من لە خوای پەروەردگاری هەموو جیهانەکان ئەترسم. جا سەرەنجامی هەردولایان ئەوەبوو کە هەردوولا لەناو ئاگری دۆزەخدان و هەمیشە تیایا ئەمێننەوەو، ئەمەیش پاداشی ستەمکارانە.

---

١- الحديد: ١٥

٢- الحشر: ١٦ - ١٧

هـــــــەروەها ﴿ لَا يَسْتَوِيٓ أَصْحَٰبُ ٱلنَّارِ وَأَصْحَٰبُ ٱلْجَنَّةِ ۚ أَصْحَٰبُ ٱلْجَنَّةِ هُمُ ٱلْفَآئِزُونَ ﴾[1] واتــە: هاوسـان نـین ئەوانـەی بەهەشـتین و ئەوانـەی دۆزەخـین. بەهەشتییەکانن ئەوانەی بە کەرەمی خوا بەختەوەر بوون.

چۆن کەسێکی گوێڕایەڵ و لادەر یاخود کافر وێك دەچن، چۆن زیندوو مردوو وەك یـەك وان، چـۆن تاریکیـەکان و ڕووناکی وەکـو یـەکن، خـوای گـەورە دەفـەرموێت: ﴿ ضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلًا لِّلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ٱمْرَأَتَ نُوحٍ وَٱمْرَأَتَ لُوطٍ ۖ كَانَتَا تَحْتَ عَبْدَيْنِ مِنْ عِبَادِنَا صَٰلِحَيْنِ فَخَانَتَاهُمَا فَلَمْ يُغْنِيَا عَنْهُمَا مِنَ ٱللَّهِ شَيْـًٔا وَقِيلَ ٱدْخُلَا ٱلنَّارَ مَعَ ٱلدَّٰخِلِينَ ﴾[2] واتــە: خـوا نموونـەی هێناوەتـەوە بـۆ ئەوانـەی کافربوون، ژنەکەی نووح و ژنەکەی لووطی کردووە بە نموونە. ئەم دوو ئافرەتـە لەژێر نیکـاحی دوو بەنـدەی پیاوچـاکی ئێمـەدا بـوون کەچـی خیانـەتیان لەگـەڵ کردن، بەناو لەسەر ئـایینی مێردەکانیـان بـوون و لەڕاسـتیدا لەگـەڵ کافرەکـانی دوژمنی مێردەکانیان بوون، بۆیە مێردەکانیـان نـەیانتوانی هـیچ سـوودێکیان لـە ڕاسـتی خـوادا بگەیـەننێ و، پێیـان وتـرا: بچنـە نـاو ئـاگری دۆزەخ لەگـەڵ ئـەو کافرانەی تێی ئەچن.

هـەروەها خـوای گـەورە دەفـەرموێت: ﴿ لَا يَسْتَوِيٓ أَصْحَٰبُ ٱلنَّارِ وَأَصْحَٰبُ ٱلْجَنَّةِ ۚ أَصْحَٰبُ ٱلْجَنَّةِ هُمُ ٱلْفَآئِزُونَ ﴾[3] لێـرەدا باسـی دۆزەخـی کـردووە پـێش بەهەشـت ئەویش بۆ بەرزکردنـەوەی ورەی بـاوەڕدارە، کاتێـك ترسـی بـۆ دروسـت دەبێـت باوەڕی زیاد دەکات بەوەش گوێڕایەڵی زیاتر دەبێـت بـەڵام کەسـی لادەر کاتێـك

---

١- الحشر: ٢٠
٢- التحريم: ١٠
٣- الحشر: ٢٠

گوێی لە باسی دۆزەخ دەبێت لەوانەیە بیر لە تەوبەکردن بکاتەوەو بگەڕێتەوە لای خوا.

خەڵکانێك هەن حساب بۆ ڕۆژێکی لەم جۆرە ناکەن، بەهەشتییەکان بەوەی کەئەنجامیاندا دەستیان کەوت، بەڵام دۆزەخییەکان لە دۆزەخدا بەهەمیشەیی دەمێننەوە، چونکە کەسی بێ باوەڕ کەللەڕەقەو دەبێت سزا بدرێت بەڵام ئەوەی زانی و بەڵام بێباوەڕ بوو کەوتە گاڵتە کردن و ئەوەی وتی (لا إله إلاّ الله) سزاو ئەشکەنجەی بدات ئەوا لەسنور دەرچووەو لەکەللە ڕەقی و بێباوەڕی خۆیدا وەکو فیرعەون و نموونەکانی ڕۆچووە، خوای گەورە دەربارەیان دەفەرموێت: ﴿أَرَءَيْتَ ٱلَّذِى يَنْهَىٰ ۝٩ عَبْدًا إِذَا صَلَّىٰٓ﴾[1] واتە: ئایا تۆ کەسێکی وات دیوە مەنعی بەندەیەکی خوا بکا لە نوێژکردن کاتێ نوێژ بکا؟

ئەوەشی داهێنەری سونەتێکی خراپە، ئەم جۆرە کەسە سزاکەی چەند جارە دەکرێتەوەو بەهەمیشەیی لەو سزایەیداو بەرسوایی دەمێنێتەوە.

دوای ئەوەی دۆزەخیەکان دەخرێنە دۆزەخەوە، بەهەشتیەکان دەخرێنە بەهەشتەوە، ئیتر ئومێدو هیوا دەبرێت خوای گەورە دەفەرموێت: ئەی خەڵکی بەهەشت بمێننەوە بێ مردن، ئەی خەڵکی دۆزەخ ئێوەش بمێننەوە بێ مردن.

## ئاگات لەم جۆرە گوناهانە بێت...

لێرەدا لەسەر دەرکردنی نهێنییەکانی ماڵ بەئاگات دێنێتەوە نەبرێتە دەرەوە یاخود مشەخۆری کردن بەسەر خەڵکانی ترەوە. ئەم جۆرە کەسانە خوا لێیان خۆش نابێت، مەگەر ئەوکاتە نەبێت ئەو برایەی ئەم غەیبەتی کردووە لێی ببورێت هەروەها ئەو کەسانەی کەحەزیان بەهەواڵی خەڵکانی ترە لەهەموو

---

١- العلق: ٩ - ١٠

وردەکارییەکانی ژیانی خۆیاندا لەچونە ژورەوەو هاتنە دەرەوەو خەرجییەکان دەچنە بازنەی غەیبەت کردنەوە،...

خوای گەورە دەفەرموێت:﴿وَإِذَا مَرُّوا بِاللَّغْوِ مَرُّوا كِرَامًا﴾[1] واتە: ئەگەر بە لای شتێکی هیچوپووچ و ناڕەوادا تێپەڕین مەردانەو بەشەرەفەوە بەلایا تێئەپەڕن و چاوپۆشیی لیٚ ئەکەن.

اللغو: واتە غەیبەت کردن غەیبەتکردنیش بەرەو فیتنەیی دەتبات فیتنەیش بەرەو ناپاکی کردن دەتبات.

بەرهەمی گوێڕایەڵی کردن گوێڕایەڵییە، بەرهەمی سەرپێچیش سەرپێچی کردنە. ئەوەش هەنگاوەکانی شەیتانە، لەوانەش ناپاکی کردن، ئەو کەسەی ناپاکی دەکات دەخرێتە دۆزەخەوە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: (گەورەترین ناپاکی ئەوەیە پیاوێك نهێنییەك لای خێزانەکەی باس بکات ئەویش بچێت لای دراوسێکانی باسی بکات، هەروەها ژنێك بۆ مێردەکەی باسێك بکات و ئەویش بۆ کەسانێکی تری بگێڕێتەوە).

کێ بوو بەگەلی لوطی وت کە حەزرەتی لوط میوانی هەیە جگە لە خێزانەکەی خۆی؟ هەردوو ژنەکە ژنی نوح و ژنی لوط نهێنیەکانی ماڵەوەیان دەبردە دەرەوەی ماڵ، ئەوەش پێی دەڵێن ناپاکی هاوسەری، پاشان خیانەتی ئەو پەیامەی کە لەماڵی پێغەمبەرایەتیدا دابەزی و بڕوای پێنەهێنا، خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَخُونُوا اللَّهَ وَالرَّسُولَ وَتَخُونُوا أَمَانَاتِكُمْ﴾[1] واتە: ئەی خاوەن باوەڕەکان خیانەت لە پێغەمبەر مەکەن، خیانەت لەو شتانەدا مەکەن کە وان بەلاتانەوەو، ئەزانن کە خیانەت و دەستپیسی شتێکی زۆر ناشیرینە.

---

١- الفرقان: ٧٢

نابێت موسوڵمان نهێنی ئاشکرا بکات ئەگەرچی سزاو ئەشکەنجە دراوە.

موسوڵمان دەبێت گۆڕی نهێنییەکان بێت، ئەگەر سزای توند بێت ئەوا ئارامگرتن جوانە، چێژی نزیکبوونەوەی لەخوا تێدایە، ئادەمیزاد لەسەر شاردنەوەی نهێنی پاداشت وەردەگرێت، خوای گەورە لە سورەتی (الأعلى)دا دەفەرموێت: ﴿ٱلَّذِى يَصۡلَى ٱلنَّارَ ٱلۡكُبۡرَىٰ ثُمَّ لَا يَمُوتُ فِيهَا وَلَا يَحۡيَىٰ قَدۡ أَفۡلَحَ مَن تَزَكَّىٰ وَذَكَرَ ٱسۡمَ رَبِّهِۦ فَصَلَّىٰ بَلۡ تُؤۡثِرُونَ ٱلۡحَيَوٰةَ ٱلدُّنۡيَا وَٱلۡأٓخِرَةُ خَيۡرٞ وَأَبۡقَىٰٓ﴾[2] واتە: ئەو مرۆ زۆر خراپکارەی پاش لێپرسینەوەی ڕۆژی قیامەت ئەچێتە ناو ئاگرە گەورەکە. پاش چوونە ناو ئاگرەکەیش نە ئەمرێ لەناویا تا بحەسێتەوە، نە ئەیشژێ ژیانێکی وا چەردەیێ ئیسراحەت و حەسانەوەی تیا بێ. بەڕاستی ڕزگاری ئەبێ ئەو کەسەی خۆی لە تاوان خاوێن ئەکاتەوە، ناوی خوای خۆی بە دڵ و بە زوبان بهێنێ و ئەوجا نوێژەکانیشی بکا. کەچی ئێوە ژیانی دنیا هەڵئەبژێرن بەسەر ژیانی قیامەتدا. بەڵام ئەو دنیا باشترو پایەدارترە.

باشە بۆ دەخرێتە نێو ئاگری هەرە گەورەوە؟ لەبەرئەوەی خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿سَبِّحِ ٱسۡمَ رَبِّكَ ٱلۡأَعۡلَى ٱلَّذِى خَلَقَ فَسَوَّىٰ وَٱلَّذِى قَدَّرَ فَهَدَىٰ وَٱلَّذِىٓ أَخۡرَجَ ٱلۡمَرۡعَىٰ فَجَعَلَهُۥ غُثَآءً أَحۡوَىٰ سَنُقۡرِئُكَ فَلَا تَنسَىٰٓ إِلَّا مَا شَآءَ ٱللَّهُۚ إِنَّهُۥ يَعۡلَمُ ٱلۡجَهۡرَ وَمَا يَخۡفَىٰ وَنُيَسِّرُكَ لِلۡيُسۡرَىٰ فَذَكِّرۡ إِن نَّفَعَتِ ٱلذِّكۡرَىٰ سَيَذَّكَّرُ مَن يَخۡشَىٰ وَيَتَجَنَّبُهَا ٱلۡأَشۡقَى﴾[3]

ناوی بەرزی خوای خۆت خاوێن ڕابگرە لەوە کە هەر ناتەواوییەکی بدرێتە پاڵ. ئەو خوایەی کە شتەکانی لە نەبوون دروست کردووەو ڕێکی خستوون و،

---

١- الأنفال: ٢٧

٢- الأعلى: ١٢ — ١٧

٣- الأعلى: ١ — ١١

ئەو خوایەی ئەندازەی هەموو مەوجوودێکی گرتووەو شارەزای کردووە بۆ ئەو ئامانجەی بۆی دروست کراوەو، ئەو خوایەی لەوەڕو لەوەڕگای شین کردووە تا چوارپێو ئاژەڵ لێی بلەوەڕێن و، پاشان ئەو لەوەڕەی وەرگێڕاوە بە پووشێکی ڕەش. ئێمە وات لێئەکەین ئەو ئایەتانە بخوێنیتەوە کە بە هۆی جیبرەئیلەوە نازڵیان ئەکەینە سەرت، بە جۆرێکی وا کە پاش نازڵ کردنەکەیان لەبیرت نەچنەوە. ئەو ئایەتانە نەبێ کە خوا خۆی ئەیەوێ لەبیرت بچنەوە، چونکە نەسخیان ئەکاتەوە، ئەو خۆی بێگومان زانایە بە هەرچی ئاشکراو نهێنییەك کە هەیە. ئێمە ئامادەت ئەکەین بۆ ئاسانترین ڕێگا بۆ لەبەرکردنی ئایەتەکانی قورئان. دەی تۆ ئامۆژگاریی خەڵك بکە ئەگەر ئامۆژگاری سوودی ببێ. سەرەنجام هەرکەسێ لە خوای خۆی بترسێ بیرئەکاتەوەو سوود لە ئامۆژگاری وەرئەگرێو، ئەوەیش زۆر خراپکار بێ خۆی دوور ئەگرێ لەبیرکردنەوەو سوودوەرگرتن لە ئامۆژگاری.

بەدبەخت و بەڵکو بەدبەختترین کەس ئەوانەن لەخوا هەڵدەگەڕێنەوە. لەبەرئەوە وشەی (شقی) وەکو هەندێك بەکاری دێنن بۆ نموونە دەڵێن: ئەم منداڵە بەدبەختە ئەمە حەرامە، بەڵام دەوترێت کوڕەکە چالاکی زیادی هەیە پێویستە ئادەمیزاد وشەکانی بەوردی بەکاربهێنێت.

پیاوێکی ئەعرابی هاتە لای ئەبو هورەیرەو وتی: ئەی ئەبو هورەیرە لەدوای نوێژی بەیانی نوێژی تر بکەم؟ ئەویش پێی فەرموو: لەدوای هەڵهاتنی خۆر نوێژەکەت بکە. ئەعرابییەکە تێنەگەیشت وتیەوە لەدوای نوێژی بەیانی نوێژ بکەم فەرمووی: بەڵێ لەدوای هەڵهاتنی خۆر.

یەکێك لەهاوەڵان لەوێدا دانیشتبوو بە ئەبو هورەیرەی وت: بڵێ لەدوای نوێژی بەیانی نوێژی تر مەکە. ئەبو هورەیرەش وتی: نامەوێت بچمە بازنەی:
﴿أَرَءَيْتَ ٱلَّذِى يَنْهَىٰ عَبْدًا إِذَا صَلَّىٰٓ﴾[1]

ئەو هاوەڵە بەڕێزە تەریق بوویەوە لەوەی پێی بڵێت نوێژ مەکە... ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئاستی هەستیاربوونی باوەڕ لە گەڕان بەدوای وشەو قسەکردندا ئەوەش بۆ ڕازیکردنی خوای گەورە .... ئەمەش تەقوای ناو دڵەکانە.

ئەوە بزانە تەقوا ئەوەیە خوا لەو شوێنەدا نەتبینێ کەنەرێی لێکردویت وە لەو شوێنەدا بتبینێ کەفەرمانی پێکردویت ئەوەی ئەمە نەکات ئەوا کەسێکی بەدبەختە، بەڵکو بەدبەختترین کەس لەبەدبەختیدا زیادەڕۆیی کردووە گەیشتۆتە لوتکەی زیادەڕۆیی، بۆیە بەم کارەی دەگاتە نێو ئاگری هەرە گەورە.

بەحەسەنی بەصرییان وت: حەزدەکەیت بە موسوڵمانی بمریت لەپاڵ دەرگای حوجرەکەتدا یان بەشەهیدی لەبەر دەرگایماڵەوەتدا؟ کەمێك بێدەنگ بوو پاشان وتی: موسوڵمان لەبەر دەرگای حوجرەدا.. وتیان: ئەی شەهیدی؟ فەرمووی: کێ ئەوەم بۆ مسۆگەر دەکات کە بیسەلمێنم هەتا دەگەمە بەردەرگای ماڵەوە.

---

١- العلق: ٩ — ١٠

## تەرازوویەك گەردیلەو كەمتریش دەكێشێت...!!!

خوای گەورە لەڕۆژی قیامەتدا لەسەر نیەتەكان لەخەڵكی دەپرسێتەوە سەیر دەكەیت كەسێك گوناهی بچوكی ئەنجامداوە بەهۆیەوە كەمێك دەخرێتە ئاگرەوە پاشان خوای گەورە دەری دەهێنێتەوە، بەڵام كەسێك ستەمێك بكات و ماڵی بێ باوك بخوات و خەڵكی بچەوسێنێتەوەو بەسەر خەڵكی دا بخوڕێت و خۆی كرد بەخوا بەسەر خەڵكیدا، ئەم جۆرە كەسە سزایەكی زۆر گەورەیان هەیەو هەرگیز لەدۆزەخ نایەتە دەرەوە.

لە پیاوچاكانی پێشینەوە ڕۆژانی سەردەمی پێغەمبەریان ﷺ گێڕاوەتەوە كە ئوسامە پیاوێكی كوشت شایەتومانی هێنا كاتێك ئوسامە شمشێرەكەی بەرزكردەوەو گرتی بەرەو ئەو پیاوە، پێغەمبەر ﷺزۆر نیگەران بوو فەرمووی: شایەتومانیشی هێنا كەچی هەر كوشتت؟!! وتی: ئەی پێغەمبەری خوا لەترسی من موسوڵمان بوو! فەرمووی: ئەی ئوسامە ئایا سنگت شەقار كرد تا بزانی دڵی چی تێدایە.

لەبەرئەوە خوای گەورە لەسەر نیەتەكان لێپرسینەوە لەگەڵ خەڵكیدا دەكات، نیەتەكان تایبەتن بەخوای گەورە، حەزرەتی عومەر(ڕەزای خوای لێ بێ) دەفەرموێت: ئێمە حوكممان بەسەر خەڵكیدا دەدا، ئەوە موسوڵمانە، ئەوە كافرە، ئەوە هەڵگەڕاوەیە، بەڵام دوای سروشی خوایی هەرگیز حوكممان بەسەر كەسدا نەدا.

خوای گەورە دەفەرموێت:﴿هَلۡ أَتَىٰكَ حَدِيثُ ٱلۡغَٰشِيَةِ وُجُوهٞ يَوۡمَئِذٍ خَٰشِعَةٌ﴾[1]

واتە: ئایا باسی ئەو بەڵا سەختەت هاتووەتەلا كە ئادەمزاد دائەگرێ، كە ڕۆژی قیامەتە؟ لەو ڕۆژەدا چەندەها سەروروو ملكەچ و زەلیلن.

---

١- الغاشية: ١ – ٢

بەزەلیلیەوە سەری ئەوی کردووە: ﴿يَنظُرُونَ مِن طَرْفٍ خَفِيٍّ﴾[1] واتە: بەلاچاوێك سەیری خەڵك ئەكەن .

کاتێك لەڕۆژی حەشردا دۆزەخ دێنن بۆسەر خەڵکی مەحشەر وەکو مار سێ فیشکاندنی هەیە کاتێك دەیەوێت ژەهرەکەی برێژێ، لەگەڵ یەکەم فیشکەیدا خەڵکی بەسەر ئەژنۆیاندا دەکەون هەموو خەڵکی مەحشەر تەنانەت فریشتە نزیکەکانی خواو پێغەمبەرانیش، وە لەفیشکەی دووەمیدا، هەموو خەڵکی لەسەر ڕوخساریان دەکەون بەتایبەت بێ باوەڕو بێ ڕەوشتەکان. بەڵام خوای گەورە دەربارەی باوەڕداران لەو ڕۆژەدا دەفەرموێت: ﴿إِنَّ الَّذِينَ قَالُوا رَبُّنَا اللَّهُ ثُمَّ اسْتَقَامُوا تَتَنَزَّلُ عَلَيْهِمُ الْمَلَائِكَةُ أَلَّا تَخَافُوا وَلَا تَحْزَنُوا وَأَبْشِرُوا بِالْجَنَّةِ الَّتِي كُنتُمْ تُوعَدُونَ نَحْنُ أَوْلِيَاؤُكُمْ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَفِي الْآخِرَةِ﴾[2] واتە: بەڕاستی ئەو کەسانەی وتوویانە: پەروەردگاری ئێمە زاتی خوایەو، پاش ئەو دان پیانانەیان لەسەر باوەڕ بەو قسەیان و فەرمانبەرداری کردنی خوا بەردەوام بوون، ئەوانە فریشتە دێنە خوارەوە بۆ سەریان و پێیان ئەڵێن : لە هیچ مەترسن و خەفەتی هیچ مەخۆن و خۆش مژدە بن بەو بەهەشتەی لەسەر زمانی پێغەمبەران گفتتان پێ ئەدرا کە بۆتان ئەبێ. هەروا پێیان ئەڵێن : ئێمە لە ژیانی دنیاو لە قیامەتا دۆستی ئێوەین .

بڕوادار لەڕۆژی دوایدا هێور دەکرێتەوە یاخود بێ خەم دەکرێت بەهۆی ئەو گوێڕایەڵی و ئارامگریەی هەیبووە دەچێتە ژێر سێبەری عەرشی پەروەردگار لەو ڕۆژەی کە هیچ سێبەرێکی تر نیە ئەو سێبەرەی خۆی نەبێت.

---

١- الشورى: ٤٥

٢- فصلت: ٣٠ - ٣١

لەنێو ئومەتەکانی پێشودا پیاویان دەهێنا بەمشار لەتەوقی سەریەوە تا نوکی پێی دەیانبڕیەوە بەڵام لەفەرمایشتی (لا إله إلاّ الله) پاشگەز نەدەبویەوە، حەزرەتی موسا ﷺ بە گەلەکەی وت: ﴿وَٱصۡبِرُوٓاْۖ إِنَّ ٱلۡأَرۡضَ لِلَّهِ يُورِثُهَا مَن يَشَآءُ مِنۡ عِبَادِهِۦ﴾[1] واتە: داوای یارمەتیو پشتیوانی لە خودا بکەن خۆگر بن. زەوی هەموو موڵکی خودایەو کەس خاوەنی ڕاستەقینەی نییە، خودا زەویو دەستەڵاتی سەرزەوی ئەدا بە هەرکەس کە مەیلی لێ بێ.

باسەکە پێویستی بەکەمێك ئارامگرتن هەیە، خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وُجُوهٞ يَوۡمَئِذٍ خَٰشِعَةٌ ۝٢ عَامِلَةٞ نَّاصِبَةٞ﴾[2] واتە: لەو ڕۆژەدا چەندەها سەروڕوو ملکەچ و زەلیلن. کارئەکەن و ماندوو ئەبن لەناو دۆزەخا زنجیر بەدوای خۆیانا ڕائەکێشن. واتە لەدنیادا بۆ غەیری خوا کاری کردووە (نَّاصِبَةٞ) واتە ماندووە لەنێو دۆزەخدا لەپاداشتی ئەوەی کە بۆ غەیری خوای کردووە.

هەروەها دەفەرموێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡإِنسَٰنُ إِنَّكَ كَادِحٌ إِلَىٰ رَبِّكَ كَدۡحٗا فَمُلَٰقِيهِ﴾[3] واتە: تۆ ئەی ئادەمزاد لەو ڕۆژەدا بە پەلە ئەڕۆی بۆ لای خوای خۆت و پێیئەگەی.

ئادەمیزاد لەسەر نیەتەکەی لێپرسینەوەی لەگەڵدا دەکرێت، پاشان کردەوە، ئینجا ئاکامەکەی: ﴿إِنَّكَ كَادِحٌ إِلَىٰ رَبِّكَ كَدۡحٗا فَمُلَٰقِيهِ﴾

ئاکامی کردەوەکانی خۆت دەبینیتەوە، لەبەرئەوە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: (دوو چاو هەن ئاگر نایانسوتێنێت، چاوێك لەترسی خوا گریابێت،

---

١- الأعراف: ١٢٨

٢- الغاشية: ٢ - ٣

٣- الانشقاق: ٦

چاوێکیش لەپێناوی خوادا پاسەوانی کردبێت)[1]. لێرەدا پێناسەکە گۆڕا هەموویان چاون.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ تَصْلَىٰ نَارًا حَامِيَةً ۝٤ تُسْقَىٰ مِنْ عَيْنٍ آنِيَةٍ ﴾[2] واتە: ئەڕۆنە ناو ئاگری گەرم و پڕتینەوە. ئاویان لە سەرچاوەیەکی گەرم ئەدرێتێ.

لێرەدا جیایە، ئاگرێکی هەڵگیرساو، نەیفەرموو ئاگرێکی گەورەی هەڵگیرساو لەبەرئەوەی لەمامەڵەی لەگەڵ موسوڵماندا گەرم بووە.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ إِنَّهَا تَرْمِي بِشَرَرٍ كَالْقَصْرِ ﴾[3] واتە: ئاگری دۆزەخ پزیسکی وا فڕێئەدا ئەوەندەی کۆشکێ ئەبێ.

وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ئەو کۆشکە چیە؟ فەرمووی: وەکو مەدائن و قەڵاکانە...!! یەك پزیسکە.. بۆ کێ؟ بۆ بێ باوەڕ. بۆ ئەو کەسەی سروشتی خوای لە یەکتاپەرستیدا گۆڕی، یاسای خوای گۆڕی و یاسایەکی دوور لەوەی خوای داڕشتووە! لێرەدا خوای گەورە جەستەکان دەگۆڕێت هەتا زیاترو زیاتر سزاو ئەشکەنجە بچێژن، بەڵام ڕۆحەکانیان گۆڕانکارییان بەسەردا نایەت هەموویان یەکتری دەناسنەوە: ﴿ إِذْ تَبَرَّأَ الَّذِينَ اتُّبِعُوا مِنَ الَّذِينَ اتَّبَعُوا ﴾[4] واتە: ئا لەو کاتەدا کە پەیڕەویکراوەکان لە پەیڕەویکەرەکان تەبەڕا ئەبن و بە هیچ جۆرێ بە کەڵکیان نایەن.

---

١- رواه الترمذي.

٢- الغاشية: ٤ - ٥

٣- المرسلات: ٣٢

٤- البقرة: ١٦٦

تەنانەت شەیتانیش دەناسنەوە ئەویش دەیانناسێتەوە: ﴿ ٱلۡأَخِلَّآءُ يَوۡمَئِذِۭ بَعۡضُهُمۡ لِبَعۡضٍ عَدُوٌّ ﴾[1] واتە: دۆست و برادەران لەو ڕۆژەدا هەندێکیان دوژمنی هەندێکیانن چونکە تێئەگەن کە ئەوان بوون بەهۆی گومڕاه بوونیان.

جەستە لەدۆزەخدا دەگۆڕێت، جەستەی بێ باوەڕ لەدۆزەخدا بە درێژایی (٣) ڕۆژ دەبێت، ددانی بەئەندازەی کێوی ئوحودە کە بەدرێژایی سێ ڕۆژ دەبێت، جەستەی جیاوازە هەتا سزاکەی ببینێ و بیچێژێ، خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿ تُسۡقَىٰ مِنۡ عَيۡنٍ ءَانِيَةٖ ﴾[2]، واتە: ئاویان لە سەرچاوەیەکی گەرم ئەدرێتێ.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿يَوۡمَ نَحۡشُرُ ٱلۡمُتَّقِينَ إِلَى ٱلرَّحۡمَٰنِ وَفۡدٗا ﴿٨٥﴾ وَنَسُوقُ ٱلۡمُجۡرِمِينَ إِلَىٰ جَهَنَّمَ وِرۡدٗا ﴾[3] واتە: ئەو ڕۆژەی ئێمە لەخواترسەکان کۆئەکەینەوە و بە کۆمەڵ کۆمەڵی پڕقەدرو حورمەت ئەیانبەین بۆ لای خوا. تاوانبارەکانیش ئەدەینەبەر بۆ دۆزەخ و لێیان ئەخوڕین وەك گەلەیێ ئاژەڵی تینوو کە ببرێ بۆسەر ئاو.

واتە تینون. یەکەم کەس کە دەخرێتە دۆزەخەوە تینوەکانن، خۆر لەعارەقی خۆیاندا نغرۆی کردبوون.

کاتێك دەکەوێتە ئاگرەکەوە داوای ئاو دەکات کەسی دەست ناکەوێت فریای بکەوێت، لەسورەتی (الغاشية)دا دەفەرموێت:

﴿ تَصۡلَىٰ نَارًا حَامِيَةٗ ﴿٤﴾ تُسۡقَىٰ مِنۡ عَيۡنٍ ءَانِيَةٖ ﴿٥﴾ لَّيۡسَ لَهُمۡ طَعَامٌ إِلَّا مِن ضَرِيعٖ ﴾[4] واتە: ئەڕۆنە ناو ئاگری گەرم و پڕتینەوە. ئاویان لە سەرچاوەیەکی گەرم ئەدرێتێ. لە وشترخوار بەولاوە خۆراکیان نییە. (ضَرِيع) واتە ئەو درکەی کە بەگەڵای

---

١- الزخرف: ٦٧

٢- الغاشية: ٥

٣- مريم: ٨٥ – ٨٦

٤- الغاشية: ٤ – ٦

دارخورماوەیە وشتر دەیخوات، ئەو دڕکەیان بۆ دادەنرێت بۆ خواردن، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿لَّا يُسۡمِنُ وَلَا يُغۡنِي مِن جُوعٖ﴾[1] نەتێر دەبێت، لەبەرئەوەی هەر حەرامی خواردووە ستەمکاری کردووە زۆرە ملێیی کردووە، بۆیە ئەمەش پاداشتی بێ باوەڕبوونیەتی بەسنورەکانی خواو فەرمانەکانی، بۆیە فریشتەکان ئاوی لەکوڵی دەرخوارد دەدەن.

بەپێچەوانەی بڕوادار کە لەبەهەشتدا ئاوی پێ دەدرێت، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: (لەبەهەشتدا پەرداخی زۆری لێیە ژمارەی پەرداخەکانی سەر حەوزی کەوسەر بەئەندازەی ژمارەی ئەستێرەکانە لەئاسماندا)، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَسَقَىٰهُمۡ رَبُّهُمۡ شَرَابٗا طَهُورًا﴾[2] واتە: خوای خۆیان شەرابی خاوێنی پێ نۆش کردوون.

فریشتەکان دەڵێن: ئەی وەلی ڕەحمان دانیشەو پشو بدە لەدنیادا ماندوو بویت گاڵتەیان پێ کردیت زینندانییان کردیت ئەشکەنجەیان دایت، دەی بحەوێرەوە وەلی خوا.

دەرگاکانی بەهەشت کراوە دەبن خوای بەدەسەڵات دەفەرموێت: ﴿مُّفَتَّحَةٗ لَّهُمُ ٱلۡأَبۡوَٰبُ﴾[3] واتە: قاپییەکانی خراونەتە سەر پشت بۆیان.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿عَلَيۡهِمۡ نَارٞ مُّؤۡصَدَةُۢ﴾[4] واتە: ئاگرێکی دەرگاداخراو بەسەر ئەم جۆرە کەسانەوەیە. خوا پەنامان بدا. خوای گەورە دەفەرموێت:

---

١- الغاشية: ٧
٢- الإنسان: ٢١
٣- ص: ٥٠
٤- البلد: ٢٠

﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ ﴾[1] (أهـل الكتـاب) واتـه ئەوانـەن كـە نامـە ئاسمانیەکانیان بۆ دابەزیوە بەڵام بڕوایان پێ نەهێناوە یاخود گۆڕیویانە، کاتێك قورئان هات هـەمویانی پوچـەڵ کردەوە، تەنانـەت ئـەو پەرتوکـە ئاسمانیانـەی کەمژدەی هاتنی پێغەمبەریان تیادا یاداشت کراوە.

ئـەوەتا سـەیردەکەیت پەرتوکـە ئاسمانیـەکان تەواوکـەری یـەکترن، تـەورات شەریعەت و بنەما ڕەوشتیەکان و هـەڵس و کەوتـەکانی تێدابووە، ئینجیـل هـات تەوراتی تەواو کرد، کاتێك جولەکە ئینجیلیان بەدرۆخستەوە تەورات بێ ئینجیـل بەناتەواویی مایەوە. وە کاتێك تەوراتیان بەدرۆخستەوە بێ شەریعەت مانەوە.

ویستی خوا وابوو ئەو پەیامانە بەقورئان کۆتـایی پـێ بێنێـت، پێغەمبـەر ﷺ دەفـەرموێت: ئەگـەر هـەردوو موسـاو عیسـای بـرام(سـەلامی خوایـان لێ بـێ) زیندوبوونایە هیچ ڕێگەیەکیان نەبوو تەنها شوێنکەوتنم نەبێت. کەواتـە پێویسـت بوو خاوەنی کتێبە ئاسمانیـەکان شـوێن پێغەمبـەری خـوا ﷺ بکەوتنایـە بـەڵام نکوڵییـان لێ کـرد، خـوای گـەورە دەفـەرموێت:﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ وَٱلْمُشْرِكِينَ فِي نَارِ جَهَنَّمَ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أُوْلَٰٓئِكَ هُمْ شَرُّ ٱلْبَرِيَّةِ ﴾[2] واتـــە: بێگومـــان ئەوانـەی کـافر بـوون لـە جوولەکـەو گـاورو هاوبـەشبۆخوادانـەرەکان لـە ئـاگری دۆزەخدان و هەمیشە تیا ئەمێننەوەو ئەوانە خراپترین مەخلووقاتی خوان.

خراپترین کەسـن لەبەرئـەوەی پەرتوکەکـەیان زۆر بـەڕوونی فـەرمان و نـەرێ کردنی تێدابوو، بەڵام شوێنی نەکەوتن بۆیە بەزیندوویی لەئاگردا دەمێننەوە.

خـوای گـەورە دەفـەرموێت: ﴿ تَبَّتْ يَدَآ أَبِي لَهَبٍ وَتَبَّ ۝١ مَآ أَغْنَىٰ عَنْهُ مَالُهُۥ وَمَا كَسَبَ ۝٢ سَيَصْلَىٰ نَارًا ذَاتَ لَهَبٍ ۝٣ وَٱمْرَأَتُهُۥ حَمَّالَةَ ٱلْحَطَبِ ۝٤ فِي جِيدِهَا حَبْلٌ

---

١- البينة: ٦

٢- البينة: ٦

﴿مِن مَّسَدِۭ ﴾[1] واته: یاخودا وشك بن هەردوو دەستی ئەبوولەهەب و، وشكیش بوون. پارەو داراییەكەیو هەرچیی پەیدا كردووە هیچی سوودی نەبوو بۆی و دادی نەدا. لەمەوپاش ئەچێتە ناو ئاگرێكی بە كڵپەو بڵێسەوە. ژنەكەیشی هەر ئەچێتە ناو ئەو ئاگرەوە، ژنەكەی كە كۆڵەداری بۆ ئاگری فیتنەو ئاژاوە بە كۆڵەوەیەو پێیەوە بە ماڵانا ئەگەڕێ. لە قیامەتیشا گوریسێكی تاڵلوول دراوی لە ملایە داری بۆ ئاگری دۆزەخ پێ ئەگوێزێتەوە وەك لە دنیادا داری بۆ ئاگری فیتنەو ئاژاوە هەڵئەگرت.

ئەبولەهەب بەهۆی بڕوانەهێنانی بەپێغەمبەری خواو هاندانی بێ باوەڕان لێی بەئاگر دەسوتێ، هەروەها ژنەكەشی كەداری هەڵدەگرت هەتا دڕكی لێ بباتە بەردەم پێغەمبەری خواو ئازاری بدات، ئەوا ئەویش لەئەژنۆیەوە بەنێو ئاگردا ڕادەكێشرێت وەك چۆن گوێدرێژ ڕادەكێشرێت لەبەرئەوەی بۆ شەڕ نەبوایە وەڵامی هیچی تری نەدەدایەوە.

## بانگەوازی دۆزەخیەكان:

سەیر دەكەین دۆزەخیەكان پێنج بانگەوازیان هەیە:

★ خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿قَالُواْ رَبَّنَآ أَمَتَّنَا ٱثۡنَتَيۡنِ وَأَحۡيَيۡتَنَا ٱثۡنَتَيۡنِ فَٱعۡتَرَفۡنَا بِذُنُوبِنَا فَهَلۡ إِلَىٰ خُرُوجٖ مِّن سَبِيلٖ ﴾[2] واتە: جا كافرەكان ئەڵێن: خوایە تۆ دوو جار ئێمەت مراندووە و دوو جارت زیندوو كردووینەتەوە، مردنی یەكەم ئەوەیە كە هێشتا نەهاتبووینە دنیاوەو مردنی دووهەم ئەوەیە كە یەكەمجار لە دنیادا مراندتمان. زیندووكردنەوەی یەكەمیش ئەوەیە كە یەكەمجار گیانت كرد بە بەرمانداو زیندووكردنەوەی دووهەمیش ئەوەیە لە قیامەتا زیندووت كردینەوە بۆ

---

١- المسد: ١ - ٥

٢- غافر: ١١

لێپرسینەوەی کردەوەمان لە دنیادا. دە ئاخۆ ڕێگایەك هەیە بۆ جۆرە دەرچوونێ لەناو ئاگری دۆزەخ بە هەر جۆرێ بێ؟

واتە ئێمە دانمان نا بەوەی لەدنیادا گوناهبارین بەوەی کە ئەنجاممان داوەو ستەممان دەکرد، ئەوانە مردنێکی دنیایی مردون، نەك مردنی ڕۆژی دوایی، پاشان خوا لە دنیادا زیندووی کردنەوە هەتا چاکە ئەنجام بدەن، بەڵام نەیانکرد، پاشان لەئاگردا زیندووی کردنەوە بەو ستەم و زۆرداریەی کە ئەنجامیان دەدا، خوای بالادەست دەفەرموێت: ﴿ ذَٰلِكُم بِأَنَّهُۥٓ إِذَا دُعِيَ ٱللَّهُ وَحۡدَهُۥ كَفَرۡتُمۡ وَإِن يُشۡرَكۡ بِهِۦ تُؤۡمِنُواْۚ فَٱلۡحُكۡمُ لِلَّهِ ٱلۡعَلِيِّ ٱلۡكَبِيرِ ﴾[1] واتە: ئەمەی ئێوەی تێدان بەهۆی ئەوەوەیە کاتێ بانگ بکرایەتە خوا بەتەنها خۆیو بێ‌هیچ هاوبەشێك ئینکاری ئەم تەنهاو تاکییەی خواتان ئەکردو، ئەگەر هاوبەشێکی بۆ دابنرایە باوەڕتان بەوە ئەکرد کە خوا هاوبەشێکی هەیە. بۆیە ئێستا بڕیار هیی خوای بەرزو بالاو گەورەیە کە ئەتانخاتە ناو ئاگری دۆزەخەوە.

★ خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿رَبَّنَآ أَبۡصَرۡنَا وَسَمِعۡنَا فَٱرۡجِعۡنَا نَعۡمَلۡ صَٰلِحًا ﴾[2]

واتە: ئەگەر چاوت لێ بێ کاتێ کە تاوانباران سەریان لە حوزووری خوای خۆیانا داخستووەو ئەڵێن: خوایە ئەوەمان بەچاوی خۆمان دی گفتت بەهاتنەدیی دابوو گوێمان لێبوو فەرمووت: پێغەمبەرەکانت کاتی خۆی چییان لەلایەن تۆوە وتووە ڕاستیان وتووە، دەسا بمانگێڕەرەوە بۆ دنیا تا ئەمجار کردەوەی چاك بکەین و بەپێی فەرموودەکانت بجووڵێینەوە.

---

١- غافر: ١٢

٢- السجدة: ١٢

خـوای گـەورە وەڵامیـان دەداتـەوەو دەفـەرموێت: ﴿فَذُوقُواْ بِمَا نَسِيتُمْ لِقَآءَ يَوْمِكُمْ هَٰذَآ إِنَّا نَسِينَٰكُمْ﴾[1] واتـە: دەسـا بـەهۆی ئـەوەوە کـە گەیشـتن بـەم ڕۆژەتانتـان فـەرامۆش کـرد، تـاڵیی دۆزەخ بچـێژن. ئێمـەیش ئێوەمـان لـە بیرچوەتەوە.

★ خـوای گـەورە دەفـەرموێت: ﴿ٱلَّذِينَ يُحِبُّونَ أَن تَشِيعَ ٱلْفَٰحِشَةُ فِى ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾[2] واتە: بەڕاستی ئەو کەسانەی پێیان خۆشە قسـەی ناشـیرین و بوختـانی ناڕەوا لە ناو ئەهلی ئیمان و باوەڕا بڵاو ببێتەوە.

وەڵامیـان دەداتـەوە: ﴿وَذُوقُواْ عَذَابَ ٱلْخُلْدِ بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ﴾[3] واتـە: کەواتـە سـزای نـەبڕاوەو پایـەدار بچـێژن بەرانبـەر بـەو کردەوانـەی لـە دنیـادا ئەتانکردن.

تەمەنی پێدرا بەڵام سودی لێوەرنەگرت، داوا لەخوا دەکات: ﴿رَبَّنَآ أَخِّرْنَآ إِلَىٰٓ أَجَلٍ قَرِيبٍ نُّجِبْ دَعْوَتَكَ وَنَتَّبِعِ ٱلرُّسُلَ﴾[4] واتـە: خودایـا ! بـۆ ماوەیـەکی کـەم دوامـان بخـە بـەڵکو تەوبـە بکـەین و بکەوینـە دوای بانگەوازەکـەت و پـەیڕەویی پێغەمبەران بکەین!

---

١- السجدة: ١٤

٢- النور: ١٩

٣- السجدة: ١٤

٤- إبراهيم: ٤٤

خوای میهرەبانیش وەڵامیان دەداتەوە: ﴿أَوَلَمْ تَكُونُوٓا۟ أَقْسَمْتُم مِّن قَبْلُ مَا لَكُم مِّن زَوَالٍ﴾[1] واتە: ئەی ئەوە نەبوو ئێوە پێش ئێستە، واتە لە دنیادا، سوێندتان ئەخوارد کە هەرگیز لەناوچوونتان بۆ نییە ؟

★ ﴿رَبَّنَآ أَخْرِجْنَا نَعْمَلْ صَـٰلِحًا غَيْرَ ٱلَّذِى كُنَّا نَعْمَلُ﴾[2] واتە: خوایە ! لەم دۆزەخەمان دەرکە با کردەوەیەکی چاك بکەین غەیری ئەو کردەوە خراپانەی لە دنیادا ئەمانکردن.

★خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿رَبَّنَا غَلَبَتْ عَلَيْنَا شِقْوَتُنَا وَكُنَّا قَوْمًا ضَآلِّينَ﴾[3] واتە: خوایە بەدبەختییەکەمان زاڵ بوو بەسەرماناو ئێمە کۆمەڵێکی گومڕا بووین ڕێگای ڕاستمان بەدی‌نەکرد !

خوای گەورەش وەڵامیان دەداتەوە: ﴿ٱخْسَـُٔوا۟ فِيهَا وَلَا تُكَلِّمُونِ﴾[4] واتە: بە سەرشۆڕیی خۆتانەوە بێدەنگ بن بۆخۆتان لەناو ئاگری دۆزەخداو لەم بارەوە قسەم لەگەڵ مەکەن .

شەیطان سەرپێچییەکانی ڕەنگ کردووە، ئەمە گەورەیە ئەمە بچوکە، وە کردویەتی بەچەند بەشێکەوە ئەمەیان بەشی جوانیە ئەوە بەشی ژیربێژیە، ئەمەیان بەشی پارەیە بەو جۆرە. خوای بەندەکان بانگی هەموو چین و توێژێك دەکات.. هاوەڵدانەران و بێ باوەڕو دووڕو و تێکۆشەر، بەدڕەوشت و بێ دین و ستەمکار پەلاماردەر،... سەیردەکەیت هەریەکەیان جۆرێك لەسزاو ئەشکەنجەی هەیە.

---

١- إبراهيم: ٤٤

٢- فاطر: ٣٧

٣- المؤمنون: ١٠٦

٤- المؤمنون: ١٠٨

ئاگر كەوتە قسەو شكاتی لای خوا كردو وتی: خوایە گرم زۆر بووەو تاریكیم و كێم و جەرەتاوم زۆر بووە، ڕێگەی بدە دوو هەناسە بدات هەناسەیەك لەهاویندا، هەناسەیەكیشیان لەزستاندا، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿يَوْمَ نَقُولُ لِجَهَنَّمَ هَلِ امْتَلَأْتِ وَتَقُولُ هَلْ مِن مَّزِيدٍ﴾[1] واتە: یادی ئەو ڕۆژە بكەرەوە كە ئێمە بە دۆزەخ ئەڵێین و لێیئەپرسین: ئاخۆ پڕ بوویت لەوانەی ئەبێ تیایا سزا بدرێن؟ ئەویش لە وەڵاما ئەڵێ: زیاتر هەیە بۆمیان بنێرن؟

بەم شێوەیە خوا پەنامان بدات دەبینین ئادەمیزاد بە زۆرداری و زۆرە ملیێ و بێ باوەڕ بوون بەخواو، ستەم لەخۆی دەكات و سنورەكانی خوا دەشكێنێت، حەرام كراوەكان ئەنجام دەدات، فەرمانەكانی خوا دەشكێنێت، بەو ڕێگایەدا دەڕوات كەخوا فەرمانی پێ نەكردووە، بۆیە سزاكەی بەئەندازەی تاوانەكانیەتی بۆ نموونە ئەوەی پەیوەندی خزمایەتی دەپچڕێنێت ئەوانە نوێژیان لێ وەرناگیرێت، چونكە ڕەحم بەپایەكانی عەرشەوە هەڵواسراوە دەڵێت: خوایە ئەمە جێگەی ئەو كەسەیە پەنا بەتۆ دەگرێت لەپچڕانی پەیوەندی خزمایەتی. وتی: ئەی ڕەحم ئەوە بەس نیە ئەوەی جێبەجێت دەكات، منیش دێم بۆلای ئەوەشی دەتپچڕێنێت دەیپچڕێنم،...

ئەی داخۆ ئەوانە چۆن بن كە سیلەی ڕەحمی ئیسلام دەپچڕێنن ئەمە پەنا بەخوا ستەمی لەخۆی كردووە، لەخوا داواكارین زەوی لەژێرماندا ئارام بكاتەوە وەك چۆن لەسەردەمی حەزرەتی عومەردا(ڕەزای خوای لێ بێ) كاتێك چووە سەر بڵندگۆو فەرمووی: ئەی خەڵكینە لەخوا بترسن، خوایە تیاچوونی ئەم ئوممەتە مەخەرە دەستی عومەرەوە. گوناهی داناوە بەهۆكاری تیاچونی كۆمەڵگا.

---

[1] - ق: ٣٠

سەیر دەکەین زەوی بەهاوەڵەکەی دەڵێت: ئەی دراوسێکەم کەسێکی یادکەری خوا بەلاتدا تێنەپەڕیوە ئەگەر بەلایدا تێپەڕێت شانازی پێوە دەکات، ئەمەش لەبەرئەوەیە سوننەتێکی گەردونیەو تەسبیحاتی خوا دەکات، بەپێچەوانەوە پەنا بەخوا بەرەو تیاچوون دەچێت ئیتر بەزەمین لەرزە بێت یان بەبورکان بێت لێخۆشبوون و سەلامەتی لەخوا داوا دەکەین.

# حەوت دەرگای هەیە

## ١- دۆزەخ

### تەقوا قەڵایە لەبەرامبەر ئاگردا:

ئەم جۆرە ناو و زاراوانە لەقورئانی پیرۆزدا هاتووەو لەڕێی زانایانەوە تێی گەیشتوین لە پلەکانی ئاگر یاخود دەرگاکانی دۆزەخ، ئەوە دەرگای دۆزەخە، ئەمە دەرگای (السعیر)ە، ئەوە دەرگای (الحُطمة)یە ئەوە دەرگای (الهاویة)، یاخود ئەوە دەروازەی خوارترین پلەی دۆزەخە.

وتراوە پێناسەیەکە بۆ خودی ئاگر، هەروەها وتراوە دۆزەخ ناوێکی گشتیە بۆ ئاگر، وتراوە چەند پلەیەکە هەر گەلەو پلەیەکی تایبەتی بەخۆی هەیە، هەموو تیرەیەك لەڕۆژی دوایدا شوێنێکی هەیە بەوەی کە لەدنیادا ئەنجامی داوە، پاداشتی براوەی خۆیان دەست کەوتووە.

زۆرێك لە تەفسیرو ڕاوبۆچونی زانایان گەڕاوم و سەیرم کردون، ئەوەی من تێی گەیشتوم کە دۆزەخ پلەی یەکەمی ئاگرە، لە سەرپێچیکارە یەکتاپەرستەکانی تێ دەخرێت، لە فەرمودەیەکدا هاتووە دەفەرموێت: (ڕۆژێك دێت بەسەر دۆزەخدا دەرگاکانی دەدات بەیەکدا) واتە چۆڵ دەبێت.

وە شەش پلەکەی دیکەی دۆزەخ پڕ دەبن، وە ئەم پلەی یەکەمەش بەتاڵ دەبێتەوە لەخەڵکانی ناوی دوای ئەوەی فریشتەکان فەرمانیان پێ دەکرێت هەرچیەك وتویەتی (لا إله إلاّ الله) بیهێننە دەرەوە پاشان هەموو پلەکانی تر دادەخرێنەوە لەسەر سەرپێچیکارە نایەکتاپەرستەکان.

ئەمەش پۆلێنێکە لە یەکتاپەرستان یاخود بۆ موسوڵمانان بەگشتی، کە سێ پۆلن:

١- هەیانە چاکەکانی پێش خراپەکانی کەوتووە دەچێتە بەهەشتەوە.

٢- هەشیانە خراپەکانی پێش چاکەکانی کەوتوە وە بەرەو دۆزەخ دەڕوات.

٣- هەشیانە چاکەو خراپەیان وەکو یەکە، دەبنە ئەعرافیەکان کاتێك شەفاعەتی خوای خۆیان دەست دەکەوێت دەیانخەنە بەهەشتەوە.

(٧٧) جار لەقورئاندا باسی دۆزەخ کراوە، خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿ وَإِذَا قِيلَ لَهُ اتَّقِ اللَّهَ أَخَذَتْهُ الْعِزَّةُ بِالْإِثْمِ فَحَسْبُهُ جَهَنَّمُ ﴾[1] واتە: ئەگەر بەم بنیادەمە بوترێ: لە خودا بترسەو بەدکاری مەکە، غیرەت و نەفامیی جاهیلییەت ئەیگرێو تووڕە ئەبێو ئەو گوناهە ئەکات کە لێی مەنع کراوە. ئەوکەسە سزای دۆزەخی بەسە. شوێنێکی زۆر بەدە ئەو شوێنەی لە دوارۆژدا ئەوی تێدا جێگیر ئەبێ.

جارێك حەزرەتی عومەر(رەزای خوای لێ بێ) بەرێگایەکدا دەڕۆشت کۆمەڵە منداڵێك یارییان دەکرد هەر کەحەزرەتی عومەریان بینی لەترسا خۆیان شاردەوە تەنها یەکێکیان نەبێت، ڕۆشت بە حەزرەتی عومەری وت: ئەی عومەر لەخوا بترسە. ئەمیری ئیماندارانیش دەستی کرد بەگریان لەترسی خوای گەورە. وە هەرکاتێك بەحەزرەتی عومەر دەوترا لەخوا بترسە بەمە دەهەژاو دەکەوتە

---

١- البقرة: ٢٠٦

لەرزین، کاتێك یەکێك ئامۆژگاریمان دەکات بەوەی بەتەقوا بین لەسەر ئەو ئامۆژگاریەی سوپاسی دەکەین، ملی بۆ کەچ دەکەین، هاوڕێیەتی کەسانێك دەکەین لەخواترسن و فەرمانمان پێ دەکەن بەتەقوا، نەك وەکو ئەوانە بین (أَخَذَتْهُ ٱلْعِزَّةُ بِٱلْإِثْمِ) بەوە دەخرێتە دۆزەخەوە.

بە پێغەمبەری خوا وتراوە لەخوا بترسە بەوە توڕەنەبوو هەڵنەچوو بەڵکو وەکو یادخستنەوەو ئامۆژگاریەك وەریگرت، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ أَفَمَنِ ٱتَّبَعَ رِضْوَٰنَ ٱللَّهِ كَمَنۢ بَآءَ بِسَخَطٍ مِّنَ ٱللَّهِ وَمَأْوَىٰهُ جَهَنَّمُ ۚ وَبِئْسَ ٱلْمَصِيرُ ﴾[1]

واتە: ئایا کەسێ بە دوای ڕەزامەندیی خودادا بگەڕێو هەمیشە خەریکی کرداری چاك بێ، وەك ئەو کەسەیە کە بەهۆی کرداری ناڕەوایەوە تووشی ڕقی خودا بووبێو خودا غەزەبی لێ گرتبێ کە ئەنجامی دۆزەخەو ئەوەیش ناخۆشترین ئەنجامە!؟ بێ گومان ئەم دوانە وەك یەك نین.

بەو مانایەی توڕەبوونی خوا بەهۆیەوە مسۆگەر دەبێت وەك چۆن لەبەنی ئیسرائیل توڕەبوو کردنی بەمەیمون و بەراز ئەوە توڕەبوونی خوایە لەبەندەکانی.

## کوشتنی جەستەیی و گیانی...

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَمَن يَقْتُلْ مُؤْمِنًا مُّتَعَمِّدًا ﴾[2]

واتە: هەرکەسێ موسوڵمانێ بە عەمدی بکوژێ .

ئەم ئایەتە بۆ بڕواداره، بەڵام ناکرێت بڕوادارێك بەئەنقەست بڕوادارێکی تر بکوژێت، ئەگەر ئەوە ڕوویدا ئەوا ئەوەی لێی کوژراوە دەبێت بڕوات بۆ لای

---

١- آل عمران: ١٦٢

٢- النساء: ٩٣

سەرپەرشتیاری یاخود ئەو کەسەی مافەکەی بۆ وەردەگرێتەوە نەك لەبەر خۆی تۆڵە بسێنێتەوەو بڕوات کەسێکی موسوڵمان بکوژێتەوە بەئەنقەست:

﴿فَجَزَآؤُهُۥ جَهَنَّمُ خَـٰلِدًا فِيهَا وَغَضِبَ ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَلَعَنَهُۥ وَأَعَدَّ لَهُۥ عَذَابًا عَظِيمًا﴾[1] واتە: ئەوە جەزاکەی دۆزەخێکە هەتاهەتایە تیا ئەمێنێتەوەو، خودا ڕقی لێی هەڵئەستێ و نەفرینی لێ ئەکاو سزاییێکی گەورەی بۆ ئامادە کردووە.

ئەی بۆچی ئەم پاداشتە توندە، لەبەرئەوەی ئەو کەسەی کەسێك زیندوو ڕاگرێت وەکو ئەوە وایە هەموو خەڵکی بەزیندوویی ڕاگرتبێت ئەوەشی کەسێك بکوژێت وەکو ئەوە وایە هەموو خەڵکی کوشتبێ، ئەمەش لەبەرئەوەی گەر بۆی ئاسان بوایە هەموو خەڵکی دەکوشت، ئەو مرۆڤایەتیەی کوشتووە کە لەو کەسە کوژراوەدایە کە کوشتویەتی، ئەوەش بوێری نواندنە لەبەرامبەر خوادا.

چەند جۆرێك کوشتن هەیە، لەوانە کوشتنی گیانیی یاخود ڕەوانیی بەمانای لەناوبردن بەمانای پاگەندەکردن بۆ یەکێك و ناشرین کردنی وێنەی ئەو کەسە لەنێو خەڵکیدا، یان ئەگەر کەسێك لەگەڵ خێزانەکەیدا بژی و زۆر خراپ ئەشکەنجەی بدات، یاخود ئافرەتێك مێردەکەی زۆر بەخراپی ئەشکەنجەی بدا ئەوە کوشتنی گیانی (معنوی)یە هیچ چارەیەك نیە بۆ ئەمە تەنها ئەو کەسە لەسەر ئەو ئەشکەنجەو خراپەیە ئارام بگرێت.

سەیردەکەیت پاداشتی ئارامگرتن زۆر گەورەیە، ئەگەر ئافرەتێك ئارامی گرت لەسەر ئازاردانی مێردەکەی خوای گەورە کۆشکێکی لەبەهەشتدا لەگەڵ ئاسیای ژنی فیرعەونـدا بۆ بنیات دەنێت، باسی ئارامگرتن باسێکی گرانە بەڵام پاداشتەکەی گەورەیە، ئەو کەسە ئارامگرو ستایش دەرە ڕاستەوخۆ لەگۆڕەکەیەوە بەرەو بەهەشت دێتە دەرەوە خوای گەورە دەفەرموێت:

---

١- النساء: ٩٣

﴿إِنَّمَا يُوَفَّى ٱلصَّـٰبِرُونَ أَجْرَهُم بِغَيْرِ حِسَابٍ﴾[1] واتە: کەسێکیش بەسەبر بێ و تەحەمولی مەینەتی فەرمانبەرداریی خوا بکاو لەپێناوی فەرمان بەرداریی خوای خۆیا نیشتمانی خۆی بەجێ بهێڵێ، پاداشێکی وای ئەدرێتەوە ژمارەی ژمێریار پیایا ناگاتەوە.

خوای گەورە دەفەرموێت:﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ تَوَفَّىٰهُمُ ٱلْمَلَـٰٓئِكَةُ ظَالِمِىٓ أَنفُسِهِمْ﴾[2] واتە: ئەوانەی مەلائیکە گیانیان ئەکێشێ و لە دنیادا ستەمیان لە خۆیان کردوە.

ئەمانە ستەمیان لەخۆیان کردووە بە کەمتەرخەمی کردن لە خواپەرستی و ئازاردانی موسوڵمانان و ڕێگەیان نەدات کار بەو شەرعەی خوا بکەن کەبۆیان دابەزیوە، خۆی بەدوور گرتووە لە گوێڕایەڵی کردنی خوا کاتێک فریشتەکان لێیان دەپرسن لەکوێ بوون؟ وتیان: ئێمە چەوساوە بووین لەسەر زەویدا واتە شوێنکەوتە بووین. وا لەفلان بکەن، لێی بدەن، ئازاری بدەن، تەنگی پێ هەڵچنن،.. فریشتەکان وەلامیان دەدەنەوە:﴿أَلَمْ تَكُنْ أَرْضُ ٱللَّهِ وَٰسِعَةً فَتُهَاجِرُوا۟ فِيهَا فَأُو۟لَـٰٓئِكَ مَأْوَىٰهُمْ جَهَنَّمُ وَسَآءَتْ مَصِيرًا﴾[3] واتە: ئەی موڵکی خودا پان و پۆڕ نەبوو و دنیا بەربڵاو نەبوو؟ بۆ وەکوو ئەوانەی چوون بۆ مەدینەو بۆ حەبەشەو مەککەیان بەجێهێشت ئێوەیش کۆچتان نەکردو وڵاتی ستەمتان بەجێنەهێشت؟ ئەوانە جێگایان دۆزەخە کە ناخۆشترین شوێنە.

لێرەدا ئەم ئادەمیزادە بێ ئاگایە لە: ﴿وَمَن يَتَّقِ ٱللَّهَ يَجْعَل لَّهُۥ مَخْرَجًا ۝٢ وَيَرْزُقْهُ مِنْ حَيْثُ لَا يَحْتَسِبُ﴾[4] واتە: هەرکەسیش لە خوا بترسێ خوا کەلێنێکی بۆ

---

١- الزمر: ١٠

٢- النساء: ٩٧

٣- النساء: ٩٧

٤- الطلاق: ٢ - ٣

ئەکاتەوە ڕزگاری ببێ پێی لە تەنگوچەڵەمە. ڕۆژیشی لەلایەکەوە بۆ ئەنێرێ خۆی گومانی نەبردبێ.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَا وَٱسۡتَكۡبَرُواْ عَنۡهَا لَا تُفَتَّحُ لَهُمۡ أَبۡوَٰبُ ٱلسَّمَآءِ وَلَا يَدۡخُلُونَ ٱلۡجَنَّةَ حَتَّىٰ يَلِجَ ٱلۡجَمَلُ فِي سَمِّ ٱلۡخِيَاطِ ﴾[1] واتە: بێگومان ئەوانەی باوەڕ بە ئایەتەکانی ئێمە ناکەن و خۆیان بە گەورەتر ئەزانن لەوەی ئیمانیان پێ بهێنن، ئەوانە هەرگیز دەرگای ئاسمانیان بۆ ناکرێتەوەو، ڕەحمەتی خودا ڕوویان تێ ناکات و، تا وشتر نەچێت بە کونی دەرزیدا ئەوانیش ناچنە بەهەشت، کە مەحاڵە وشتر بچێ بە کونی دەرزیدا. ئا بەم جۆرە عادلانە پاداشی تاونباران ئەدەینەوەو تۆڵەی لێ ئەسێنین.

ئەوەی ئایەتەکانی خوا بەدرۆ بخاتەوەو گاڵتەی پێ بکات یان ڕەدی بکاتەوە ئەم جۆرە کەسانە دەرگاکانی بەهەشتیان بۆ ناکرێتەوە، نە لە دنیاداو نە لە ڕۆژی دوایی واتە نزاکانیان قبولّ نابێت مەگەر ئەو کاتەی وشتر بڕوات بەکونی دەرزیدا.

خوای گەورە دەفەرموێت:﴿وَلَقَدۡ ذَرَأۡنَا لِجَهَنَّمَ كَثِيرٗا مِّنَ ٱلۡجِنِّ وَٱلۡإِنسِ ﴾[2] واتە: بەڕاستی ئێمە لە ئادەمزادو لە پەری گەلێ کەسی وامان دروست کردووە، لەوانەی ڕێگای گومڕاهی ئەگرن. (ذَرَأۡنَا ) واتە دروستمان کردووە، ﴿لَهُمۡ قُلُوبٞ لَّا يَفۡقَهُونَ بِهَا ﴾[3] ، واتە ژیریی یەك بە فەلسەفەی درۆ و مشتومڕ و ڕووپامایی دەدوێ.

---

١- الأعراف: ٤٠

٢- الأعراف: ١٧٩

٣- الأعراف: ١٧٩

﴿لَهُمْ قُلُوبٌ لَّا يَفْقَهُونَ بِهَا وَلَهُمْ أَعْيُنٌ لَّا يُبْصِرُونَ بِهَا وَلَهُمْ ءَاذَانٌ لَّا يَسْمَعُونَ بِهَآ﴾[1] واتـــه: دڵیان هەیە بەڵام هیچی پێ حاڵیناین، چاویان هەیە بەڵام شتی پێ نابینن، گوێیان هەیە بەڵام پێی نابیسن، ئەوانە وەکو حەیوانی چوارپێ وەهان بەڵکو گومڕاترن. ئەم جۆرە کەسانە لە ئاین و ڕەوشتی پێغەمبەران بێئاگان.

نەشارەزایە نەگوێ ڕائەدێرێت بۆ حەق و نەدەیبینێت، خوای گەورە لە زمانی بێ باوەڕانەوە دەفەرموێت: ﴿ٱللَّهُمَّ إِن كَانَ هَٰذَا هُوَ ٱلْحَقَّ مِنْ عِندِكَ فَأَمْطِرْ عَلَيْنَا حِجَارَةً﴾[2] واتە: یادی ئەوە بکە کە کافرەکان وتیان: خودایا! ئەگەر ئەم قورئانە حەقە کەچی ئێمە باوەڕی پێ ناکەین. بەردەبارانمان بکە بە بەردی ئاسمان.

﴿أُوْلَٰٓئِكَ كَٱلْأَنْعَٰمِ بَلْ هُمْ أَضَلُّ﴾[3] واتە: ئەوانە وەکو حەیوانی چوارپێ وەهان بەڵکو گومڕاترن.

لەبەرئەوەی گیانداران وەکو گوێدرێژو گامێش یەکتاپەرستن و، بێ گیانەکان و زەوی هیچ شتێك نیە لەم گەردونەدا هەمووی تەسبیحاتی خوا دەکەن، بەڵام ئێمە لێیان تێناگەین. بۆچی لەتەسبیحاتیان تێ ناگەین؟ ئیبن مەسعود دەڵێت: لەبەرئەوەی ئەگەر گوێمان لەتەسبیحاتیان بوایە هیچ سودێکمان لێ وەرنەدەگرت.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ يُنفِقُونَ أَمْوَٰلَهُمْ لِيَصُدُّواْ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ﴾[4]

---

١- الأعراف: ١٧٩
٢- الأنفال: ٣٢
٣- الأعراف: ١٧٩
٤- الأنفال: ٣٦

واتە: بێگومان کافرەکانماڵی خوایان لە پێنـاوی ئـەوەدا خـەرج دەکرد کـە مەنعی خەڵك بکەن لە ئاینی ئیسلام و ڕێگای ڕاست.

کار بەملیارەها دەکەن بەڵام بەبانگەشەی خراپ و دژی ئایینی خـوا خـەرجی دەکەن هەتا ڕێگە لەخەڵکی بگرن لەسەر ڕێگـەی خـوا نـەبن، ئەمـەیان لەدەست دەچـێت پاشـان دەبێتـە نائومێـدی بۆیـان پاشـان هـەر لـەدنیاو دوارۆژدا تێـك دەشـکێن لەپاداشـتی ئـەو کارانـەی ئـەنجامیان داو ئـەو مـاڵ و سـامانەی کـە لەخراپەدا خەرجیان کرد بۆ بەدڕەوشت کردنی موسوڵمانان و کچ و کوڕەکانیان، ئەمە بەرەو دۆزەخ حەشر دەکرێت.

خـوای گـەورە دەفـەرموێت: ﴿وَمَا كَانَ رَبُّكَ لِيُهْلِكَ ٱلْقُرَىٰ بِظُلْمٍ وَأَهْلُهَا مُصْلِحُونَ﴾[1] واتـە: خـودای تـۆ هـەرگیز لەوانـە نـەبوە بـە سـتەم و نـاڕەوایی ئاوەدانییەکان کاول بکات کە ئەهلەکانیان خاوەنی کرداری باش بووبن.

واتە سـتەم لەکـەس ناکـات، هـیچ ئومـەتێك لـەناونابات ئەگـەر چاکسـازانیان تێـدابێت، بـەڵام کـەی بەنەخۆشـیەکانی وەکـو ئایـدزو طـاعـون و ڤایرۆسـەکان لـەناویان دەبـات، ئـەو کاتـەی سـتەمکار دەبـن: ﴿وَلَوْ شَآءَ رَبُّكَ لَجَعَلَ ٱلنَّاسَ أُمَّةً وَٰحِدَةً وَلَا يَزَالُونَ مُخْتَلِفِينَ ﴿١١٨﴾ إِلَّا مَن رَّحِمَ رَبُّكَ وَلِذَٰلِكَ خَلَقَهُمْ وَتَمَّتْ كَلِمَةُ رَبِّكَ لَأَمْلَأَنَّ جَهَنَّمَ مِنَ ٱلْجِنَّةِ وَٱلنَّاسِ أَجْمَعِينَ﴾[2] واتە: ئەگەر خودای تۆ مەیلی ببوایە بەرەی بنیادەمی هەموو ئەکردە یەك ئوممەت و هەموو موسوڵمان ئـەبوون. ئـەم بەرەی بنیادەمە بەردەوام ناجۆرو لەیەك جیان، هەندێکیان ئیماندارو هەندێکیان بێئیمانن. ئەوانە نەبێ کە خودا هیدایەتی داون و ئیمانیان هێناوە لەناو خۆیاندا

---

١- هود: ١١٧

٢- هود: ١١٨ – ١١٩

یەکنو جیاوازییان نییە. ئەنجامی دروست کردنەکەیان ئەوەبوو هەندێ خاوەن ئیمانو هەندێ بێ ئیمان بن. قسەی خودات براوەتەوەو لە عیلمیدا تێپەڕیوە: ئەبێ دۆزەخ لە بنیادەمیش و لە جینییش پڕ بکەم.

## هیدایەت پاداشتێکی خواییە دوای ویست و ئیرادەی خۆت:

لەگەورەیی قورئان دووبارەو چەند بارەکان کۆنی ناکەن، چەندێك دەیخوێنیتەوە شتێکی تازەتری تێدا دەدۆزیتەوە مانایەکی نوێتری تێدا دەدۆزیتەوە بۆ نموونە فەرمایشتی پەروەردگار: ﴿مَّن كَانَ يُرِيدُ ٱلۡعَاجِلَةَ عَجَّلۡنَا لَهُۥ فِيهَا مَا نَشَآءُ لِمَن نُّرِيدُ ثُمَّ جَعَلۡنَا لَهُۥ جَهَنَّمَ يَصۡلَىٰهَا مَذۡمُومٗا مَّدۡحُورٗا﴾[1] واتە: ئەو کەسەی تەنها ڕابواردن و خۆشیی دنیای بوێ هەرچیمان بوێ ئەیدەینێ بەو کەسەی بمانەوێ بیدەینێ و، لە پاشەڕۆژیشدا دۆزەخ ئەکەینە جێگای و بە زەمکراویو دوورخراوەیی لە ڕەحمەتی خوداوە بەو دۆزەخە ئەسووتێ.

ئەوەی ڕۆژی دوایی بوێت و هەوڵی بۆ بدات و لەپێناویدا کاربکات و لەوە بترسێت کاری بۆ نەکات و لەپلەو پایەی خوای خۆی بترسێت، ئەگەر وا نەبێت ئەوا هەرچی کارەکانیەتی بەفیڕۆ دەڕۆن و لەپێناوی خوادا نابن ئەوا بە سەرشۆڕی و تێکشکاوی دەچێتە دۆزەخەوە.

وتراوە حەزرەتی عومەر(ڕەزای خوای لێ بێ) هاوەڵەکانی کۆکردەوە هەتا هەریەکەیان هیواو ئاواتی خۆیان بڵێن، یەکێك لەهاوەڵان وتی: بە ئاواتەوەم بەئەندازەی کێوی ئوحود زێڕم هەبێت لەپێناوی خوادا بیبەخشم، یەکێکی تریان وتی بەئاواتەوەم شیوێکم هەبێت پڕ بێت لەفەڕو پیت لەپێناوی خوا بیبەخشم ئەوانیش وتیان: ئەی تۆ ئەی پێشەوای باوەڕداران؟ فەرمووی: ئاواتێکی زۆر

---

١- الإسراء: ١٨

بەڕێزم هەیە، بەئاواتەوەم لەخوا مزگەوتێکم هەبێت پڕ بێت لەپیاوانێکی وەکو ئەبوبەکر(ڕەزای خوای لێ بێ).

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَمَن يَهْدِ ٱللَّهُ فَهُوَ ٱلْمُهْتَدِ ۖ وَمَن يُضْلِلْ فَلَن تَجِدَ لَهُمْ أَوْلِيَآءَ مِن دُونِهِۦ ۖ وَنَحْشُرُهُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ عَلَىٰ وُجُوهِهِمْ عُمْيًا وَبُكْمًا وَصُمًّا ۖ مَّأْوَىٰهُمْ جَهَنَّمُ ۖ كُلَّمَا خَبَتْ زِدْنَـٰهُمْ سَعِيرًا﴾[1] واتە: هەرکەس خودا هیدایەتی بدات ئەو کەسە شارەزای ڕێگای ڕزگاری بووەو، هەرکەسیش خودا گومڕای بکات ئەو جۆرە کەسانە دۆستی وەهایان نابێ سوودیان بۆیان هەبێ و، لە ڕۆژی قیامەتا لەپەوڕوو حەشریان ئەکەین و بە کوێریو کەڕولاڵی بەکێشیان ئەکەین و جێگایان دۆزەخە، هەرچەند بڵێسەی دامرکێتەوە ئێمە گڕەکەی زیاد دەکەین.

بەڵام گومڕایان خوای گەورە دەربارەیان دەفەرموێت: ﴿وَمَن يُضْلِلْ فَلَن تَجِدَ لَهُمْ أَوْلِيَآءَ مِن دُونِهِۦ﴾[2]

لێرەدا هیدایەت بەدەست خوایە وە گومڕاییش لەدەروونی ئادەمیزاددایە، بەڵام بە زانستی خوا، خوای بالادەست دەفەرموێت: ﴿إِنَّا هَدَيْنَـٰهُ ٱلسَّبِيلَ إِمَّا شَاكِرًا وَإِمَّا كَفُورًا﴾[3] واتە: ئێمە ئادەمزادمان شارەزا کردووە بە ڕێگای خێرو شەڕ، جا یا وەری ئەگرێو سوپاسی خوای خۆی ئەکا یا ئینکاری ئەکاو گوێی بۆ ناگرێ. هەروەها دەفەرموێت: ﴿وَنَفْسٍ وَمَا سَوَّىٰهَا ۝٧ فَأَلْهَمَهَا فُجُورَهَا وَتَقْوَىٰهَا﴾[4] واتە: سوێند بە نەفسی ئادەمزاد و بەو خوایەی وای دروست کردووە کە

---

١- الإسراء: ٩٧

٢- الإسراء: ٩٧

٣- الإنسان: ٣

٤- الشمس: ٧ - ٨

ئامادەی کردووە بۆ هەموو سیفەت و کردارەکانی. جا نیشانی داوە لەفەرمانیخوا دەرچوونی کامەیەو لەخواترسانی کامەیە.

هەروەها دەفەرموێت: ﴿وَعَرَضۡنَا جَهَنَّمَ يَوۡمَئِذٖ لِّلۡكَٰفِرِينَ عَرۡضًا﴾[1] واتە: لەو ڕۆژەدا دۆزەخ بۆ کافران دەرئەخەین و پیشانیان ئەدەین.

ئەم دەرخستنە بۆ سەیرکردن نیە بەڵکو بۆ کەوتنە ناویەتی، ئەوەش لەبەرئەوەی دووربوون لەخواوە، وە بەونیعمەتانەی پێیان بەخشراوە بێ باوەڕبوون، پێغەمبەر ﷺ بانگی گەلەکەی کرد (ئەی نەوەی عەبدولمەناف، ئەی بەنی هاشم، خەڵکی بەچاکەکانیانەوە نایەن بۆ لام ئێوەش بەخراپەکاریەکانتانەوە، دابێتتان بەکۆڵتاندا لەسەر پردی سیراط و بڵێن ئەی محەمەد فریامان بکەوە هیچتان پێ ناڵێم مەگەر قسەی پیاو چاکێك نەبێت): ﴿إِن تُعَذِّبۡهُمۡ فَإِنَّهُمۡ عِبَادُكَۖ وَإِن تَغۡفِرۡ لَهُمۡ فَإِنَّكَ أَنتَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ﴾[2] واتە: ئەگەر عەزابیان ئەدەی ئەوا بەندەی خۆتن و ئەتوانی بە ئارەزووی خۆت لەگەڵیان بجووڵێیتەوەو سزایان بدەیت. موڵکی خۆتن و کەس حەقی ڕەخنەی نیە. ئەگەر لە گوناهیشیان خۆش بیو چاوپۆشییان لێ بکەیت کەس ناتوانێ بڵێ: نەیتوانی سزایان بدات، بۆیە بەخشینی! تۆ زۆر بەهێزی و دەستت بەسەر هەموو شتێکدا ئەڕوات. ئەتوانی ببەخشیو ئەتوانی سزا بدەیت. کارەکانیشت پڕ لە حیکمەتن.

(کەواتە ئەی عەباسی مامی پێغەمبەری خوا هیچ سودێکت لای خوا پێناگەیەنم)[3].

---

١- الكهف: ١٠٠

٢- المائدة: ١١٨

٣- رواه البخاري

خـوای گـەورە دەفـەرموێت: ﴿قُلْ هَلْ نُنَبِّئُكُم بِالْأَخْسَرِينَ أَعْمَالًا ﴿١٠٣﴾ الَّذِينَ ضَلَّ سَعْيُهُمْ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَهُمْ يَحْسَبُونَ أَنَّهُمْ يُحْسِنُونَ صُنْعًا﴾[1] واتـە: پێیـان بڵـێ: ئایـا ئاگادارتـان بکەین لەوانـەی لـە کـردەوەدا لـە هـەموو کـەس زیانبـارترن؟ ئەوانـەی بـە هـۆی کوفریانەوە لە ژیانی دنیادا ڕەنجیان بە زایە بووە، کەچی ئەوەندە لەخۆبایین وا ئەزانن کاری چاك ئەکەن و لەسەر حەقن.

ئەوانە بوون بێ ئاگابوون کەوتنـە دزی و بـەرتیل خـۆری، پاشـان دەچـن بـۆ جێبـەجێ کردنـی فـەرزەکان، ئەوانـە خـوای گـەورە دەربارەیـان دەفـەرموێت: ﴿ثُمَّ لَنَنزِعَنَّ مِن كُلِّ شِيعَةٍ أَيُّهُمْ أَشَدُّ عَلَى الرَّحْمَٰنِ عِتِيًّا﴾[2] واتـە: پاشـان لـە هـەر تایەفەیەك کامیان لە خوا یاخیترو فیززلترو گوناهبارتر بووبێ، ئەوانەیان لە جێی خۆیان هەڵئەکەنین و فرێیان ئەدەینە ناو ئاگری دۆزەخەوە.

خوای گەورە لەهەر گرۆو دەستەیەك ئەوانە ڕادەکێشێت کە زۆر یاخی بـوون، پاشان ئەوانی تر بەدوایاندا دێن و نەفرینیان لێ دەکەن: ﴿كُلَّمَا دَخَلَتْ أُمَّةٌ لَّعَنَتْ أُخْتَهَا﴾[3] واتە: جا هەر تـاقمێ ئەڕۆیشـتە نـاو ئـاگر لەعنـەتی لـە ئوممەتەکـەی پێش خۆی ئەکرد کە دوایان کەوتبوون.

خـوای گـەورە دەفـەرموێت: ﴿وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنِ افْتَرَىٰ عَلَى اللَّهِ كَذِبًا﴾[4] واتـە: کێیە لەو کەسە ستەمکارترە کە درۆ بەدەم خوداوە هەڵبەستێ؟

---

١- الكهف: ١٠٣ - ١٠٤

٢- مريم: ٦٩

٣- الأعراف: ٣٨

٤- هود: ١٨

ئـادەمیزاد درۆ لەگـەڵ خـوادا دەکـات کاتێـک هـەموو نیعمەتـەکانی پـێ دەبەخشـێت بـەڵام سوپاسـگوزاری ئـەو نیعمەتانـە نیـەو فەرمانبـەرداری فەرمانەکانی ناکات و نەرێ ناکات بۆ ئەو کارانەی حەرامی کردووە.

خوای گەورە دەفەرمویت:

﴿وَسِيقَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ إِلَىٰ جَهَنَّمَ زُمَرًاۖ حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءُوهَا فُتِحَتۡ أَبۡوَٰبُهَا وَقَالَ لَهُمۡ خَزَنَتُهَآ أَلَمۡ يَأۡتِكُمۡ رُسُلٞ مِّنكُمۡ يَتۡلُونَ عَلَيۡكُمۡ ءَايَٰتِ رَبِّكُمۡ وَيُنذِرُونَكُمۡ لِقَآءَ يَوۡمِكُمۡ هَٰذَاۚ﴾[1]

واتە: ئەوانەیش کە لە دنیادا کافر بوون کۆمەڵ کۆمەڵ پاڵیان پێوە ئەنرێ بۆ ناو دۆزەخ، تا کاتێ کە ئەگەنە بەرەوە دەرگاکانی دۆزەخیـان بـۆ ئەکرێنـەوەو دەرگاوانـەکانی پێیـان ئـەڵێن: ئایـا پێغەمبـەرانێ لـە خۆتـان نەهاتنـە لاتـان ئایاتەکانی خوای خۆتانیان بەسەرا ئەخوێندنەوەو لەوەیان ئەترسـاندن کـە بـەم ڕۆژەتـان بگـەن؟ ئـەوانیش ئـەڵێن: بـەڵێ، بـەڵێ، هـاتن و ترسـاندینیان، بـەڵام فەرموودەی خوا بە سزادانی کافران ڕاستەو ئەبێ بێتەدی.

خـوای باڵادەسـت بـەدۆزەخ دەفـەرموێت: ﴿هَلِ ٱمۡتَلَأۡتِ﴾[2] واتـە: یـادی ئـەو ڕۆژە بکـەرەوە کـە ئێمـە بـە دۆزەخ ئـەڵێین و لێیئەپرسـین: ئـاخۆ پـڕ بوویـت لەوانەی ئەبێ تیایا سزا بدرێن؟

وەڵام دەداتـەوەو دەڵێـت: ﴿هَلۡ مِن مَّزِيدٖ﴾[3] واتـە: زیـاتر هەیـە بۆمیـان بنێرن؟

---

١- الزمر: ٧١

٢- ق: ٣٠

٣- ق: ٣٠

هەتا خوای گەورە قاچی تێدا دادەنێت، دەفەرموێت: بەدەسەڵاتی زاتی تۆ تەواو پڕ بوو. لێرەدا مەبەست لەقاچی واتە ئەو کۆمەڵانەی دەخرێنە دۆزەخەوە، خوای گەورە فرێیان دەداتە ناوی کەس نامێنێتەوە هەتا بخرێتە دۆزەخەوە.

## ئامادەبوونی دۆزەخ...!!

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَقَالَ رَبُّكُمُ ادْعُونِي أَسْتَجِبْ لَكُمْ إِنَّ الَّذِينَ يَسْتَكْبِرُونَ عَنْ عِبَادَتِي سَيَدْخُلُونَ جَهَنَّمَ دَاخِرِينَ﴾[1] واتە: خودای ئێوە وتی: بانگ بکەنە من بەدەنگتانەوە دێم . بەڕاستی ئەوانەی خۆیان بەزل ئەزانن بەرانبەر بە پەرستنی من و بە تەنیا خۆم نامپەرستن، لەمەوپاش بە داماوی‌و پەرێشانی ئەڕۆنە ناو دۆزەخەوە.

ئەوەی خۆبەگەورەزانە بەسەر خوادا زۆر بەڕیسوایی و سەری شۆڕییەوە فڕێدەدرێتە ناو ئاگر، ئەو خۆبەگەورەزانە شەرعی خوای پیادە نەدەکرد، لێرەدا خوای گەورە دەربارەیان دەفەرموێت: ﴿وَيُعَذِّبَ الْمُنَافِقِينَ وَالْمُنَافِقَاتِ وَالْمُشْرِكِينَ وَالْمُشْرِكَاتِ الظَّانِّينَ بِاللَّهِ ظَنَّ السَّوْءِ عَلَيْهِمْ دَائِرَةُ السَّوْءِ وَغَضِبَ اللَّهُ عَلَيْهِمْ وَلَعَنَهُمْ وَأَعَدَّ لَهُمْ جَهَنَّمَ وَسَاءَتْ مَصِيرًا﴾[2] واتە: تا سزای پیاوان و ژنانی منافق و دووڕوویش بدا کە بە دەم موسوڵمان و بە دڵ کافرن و، سزای ئەو پیاوو ژنانەیش بدا کە هاوبەش بۆ خوا دائەنێن و گومانی خراپ بە خوا ئەبەن و ئەڵێن: خوا یارمەتیی پێغەمبەرو موسوڵمانان نادا. هەموو ئەو خراپەی کافرەکان بۆ پێغەمبەرو موسوڵمانانیان ئەوێ، خوا بەسەر خۆیانیاناى ئەهێنێتەوەو، غەزەبی

---

١- غافر: ٦٠

٢- الفتح: ٦

لێ گرتوون و لە ڕەحمەتی خۆیی دوورخستوونەتەوەو دۆزەخی بۆ ئامادە کردوون کە سەرەنجامێکی ئێجگار زۆر خراپە.

واتە ئەوانەی کە وا گومان دەبەن ڕۆژی دوایی نیە.

هەموو ئەوانە فڕێ دەدرێنە نێو ئاگرەوە ئەوە چارەنوس و پاداشتیانە ﴿أَلۡقِيَا فِي جَهَنَّمَ كُلَّ كَفَّارٍ عَنِيدٖ﴾[1] واتە: هەموو کافرێکی کەللەڕەق کە بەگوێی فەرمانی خوای نەکردووە، فڕێی بدەنە ناو دۆزەخەوە.

ئەم فەرمانە بۆ فریشتەکانە هەتا فڕێیان بدەنە ئاگرەوە لەسورەتی (البروج)دا هاتووە دەفەرموێت: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ فَتَنُواْ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ وَٱلۡمُؤۡمِنَٰتِ ثُمَّ لَمۡ يَتُوبُواْ فَلَهُمۡ عَذَابُ جَهَنَّمَ وَلَهُمۡ عَذَابُ ٱلۡحَرِيقِ﴾[2] واتە: بێگومان ئەوانەی پیاوو ژنە موسوڵمانە خاوەن باوەڕەکانیان تووشی ئازارو نارەحەتی کردو پاشانیش پەشیمان نەبوونەوەو تۆبەیان نەکرد، ئەوانە سزای دۆزەخیان بۆ هەیەو سزای سووتاندنیان بۆ هەیە.

لێرەدا بۆ ئەوانەیە ئازاری موسوڵمانانیان داوەو ئەشکەنجەیان داون شتانێکیان داوەتە پاڵیان کە نەیانکردووە، ئەوا سزای ئاگریان دەدرێت بەسەردا، سزای سوتانیان بەسەردا زیاد دەکرێت بەهۆی ئەو خراپەکاریانەی ئەنجامیان داوە، مەگەر ئەوانەی تەوبەیان کردبێت و گەڕابێتنەوە بۆلای خواو پەشیمانیان دەربڕیبێ لەوەی کە کردویانە و ئەنجامیان داوە.

لەسورەتی (الفجر)دا هاتووە دەفەرموێت: ﴿وَجِاْيٓءَ يَوۡمَئِذِۭ بِجَهَنَّمَ﴾[3] واتە: ئەو ڕۆژە دۆزەخیش ئەهێنرێتە بەرچاوی خەڵک..

---

١- ق: ٢٤

٢- البروج: ١٠

٣- الفجر: ٢٣

واتە ئاگر لەشوێنێكدا دەبێت پاشان دەیهێنن بۆ زەوی مەحشەر یان (گۆڕەپانی مەحشەر) (٧٠) هەزار جڵەوی هەیە هەر جڵەوێكیان (٧٠) هەزار فریشتە ڕای دەكێشن وە گەردنیان هەیە.

وەكو وشتر گەردنیان هەیە وەكو باڵندە چۆن دەنكە گەنمێك هەڵدەگرن ئاوا دۆزەخیەكان قوت دەدەن، لەسورەتی (البینة)دا دەفەرموێت: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِنْ أَهْلِ ٱلْكِتَـٰبِ وَٱلْمُشْرِكِينَ فِى نَارِ جَهَنَّمَ خَـٰلِدِينَ فِيهَآ أُوْلَـٰٓئِكَ هُمْ شَرُّ ٱلْبَرِيَّةِ﴾[1] واتە: بێگومان ئەوانەی كافر بوون لە جولەكەو گاورو هاوبەشبۆخوادانەرەكان لە ئاگری دۆزەخدان و هەمیشە تیا ئەمێننەوەو ئەوانە خراپترین مەخلوقاتی خوان.

ئەمە قسەكردن بوو لەسەر پلەی یەكەم كە دۆزەخە.

## ٢- سەعیر (السعیر)

## شەیطانەكانی پەری و ئادەمیەكانیش شوێنكەوتەیان هەیە:

پلەی دووەم (السعیر)ە (كڵپەی ئاگر) لە (١٣) سورەتدا (١٦) جار ناوی هاتووە، ماناكەشی واتە: لەتوندی ئاگرەكەی كڵپە دەسێنێت، وەكو سەگی هاری لێ دێت ئەمەش لەدڕی و سەركەشیان. خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يَأْكُلُونَ أَمْوَٰلَ ٱلْيَتَـٰمَىٰ ظُلْمًا إِنَّمَا يَأْكُلُونَ فِى بُطُونِهِمْ نَارًا ۖ وَسَيَصْلَوْنَ سَعِيرًا﴾[2] واتە: بەڕاستی ئەوانەی بە ناحەق و بە ستەم و دەستدرێژی ماڵی

---

١- البینة: ٦

٢- النساء: ١٠

هەتیو ئەخۆن ئەوە ئاگر ئەخۆن و ئەو ماڵە ئەبێتە ئاگر لە سکیاناو، لە قیامەتیشدا ئەچنە ناو ئاگری دۆزەخ و تیا ئەبرژێن.

لێرەدا دەبێت بەئاگا بین ئەگەر کەسێك مرد کەسوکارەکەی ویستیان پرسەی بۆ بگێڕن و قورئان خوێنی بۆ بانگ بکەن یان لەرۆژنامەکاندا بانگەوازی بۆ بانگ بکەن دەبێت لەپارەی مام یان خاڵ بێت یاخود... نەك ماڵی مردووەکە لەبەرئەوەی ئەو پارەیەی مردووەکە هەیەتی بووە بە بەشی میراتگرەکانی، حەزرەتی عومەر(رەزای خوای لێ بێ) دوعای بۆ پیاوێك دەکرد کابرا مرد، حەزرەتی عومەر چراکەی کوژاندەوە کە داگیرسابوو کاتێك پرسیاریان لێ کرد فەرمووی: ئەو نەوتە بوو بەماڵی میراتگرەکانی.

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: (باشترین ماڵ لەنێو موسوڵماناندا ئەو ماڵەیە کە بێ باوکێکی تێدایەو بەجوانی مامەڵەی لەگەڵدا دەکرێت، وە خراپترین ماڵ لەنێو موسوڵماناندا ئەو ماڵەیە بێ باوکێکی تیدایەو بەخراپی مامەڵەی لەگەڵدا دەکرێت)[1]. پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: (من و بەخێوکاری بێ باوك وەکو ئەم دوو پەنجەیە واین لەبەهەشتدا)[2] .

وتراوە تەنها ئەوانە هەتیوو نین کە دایك و باوکیان مردووە، بەڵکو هەیە هەتیوەو باوك و دایکیشی زیندون بەڵام دەستیان لێ بەرداوەو سەرقاڵی شتی ترن، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَمَن يَهْدِ ٱللَّهُ فَهُوَ ٱلْمُهْتَدِ ۖ وَمَن يُضْلِلْ فَلَن تَجِدَ لَهُمْ أَوْلِيَآءَ مِن دُونِهِۦ ۖ وَنَحْشُرُهُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ عَلَىٰ وُجُوهِهِمْ عُمْيًا وَبُكْمًا وَصُمًّا ۖ مَّأْوَىٰهُمْ جَهَنَّمُ ۖ كُلَّمَا خَبَتْ زِدْنَٰهُمْ سَعِيرًا﴾[3]

---

١- سنن ابن ماجه.

٢- رواه مسلم.

٣- الإسراء: ٩٧

واتە: هەركەس خودا هیدایەتی بدات ئەو كەسە شارەزای ڕێگای ڕزگاری بووەو، هەركەسیش خودا گومڕای بكات ئەو جۆرە كەسانە دۆستی وەهایان نابێ سوودیان بۆیان هەبێ و، لە ڕۆژی قیامەتا لەپەڕوو حەشریان ئەكەین و بە كوێریو كەڕولاڵی بەكێشیان ئەكەین و جێگایان دۆزەخە، هەرچەند بڵێسەی دامركێتەوە ئێمە گڕەكەی زیاد دەكەین.

باسی سەعیر كراوە بۆ ئەوانەی كە مامەڵە بەماڵ و سامانێكەوە دەكەن كە هی هەتیوە، واز لەو ئایەتە دێنن كە دەفەرموێت: ﴿ وَإِذَا قِيلَ لَهُمُ اتَّبِعُوا مَا أَنزَلَ اللَّهُ قَالُوا بَلْ نَتَّبِعُ مَا وَجَدْنَا عَلَيْهِ آبَاءَنَا أَوَلَوْ كَانَ الشَّيْطَانُ يَدْعُوهُمْ إِلَىٰ عَذَابِ السَّعِيرِ ﴾[1]،

واتە: كە پێیان بوترێ: شوێنی ئەو كتێبە بكەون كە خوا ناردوویەتیە خوارەوە بۆ پێغەمبەر، ئەڵێن: نەخەیر، شوێنی ئەو ڕێوڕەسمانە ئەكەوین كە باوك و باپیرانی خۆمانمان دیوە لەسەریان ئەڕۆیشتن. جا ئایا ئەگەر شەیتان تەنانەت بۆ ئازارو سزای ئاگری بڵێسەداری دۆزەخیشتان بانگ بكا، هەر شوێنی ئەكەون؟

وە لە سوورەتی (سبأ)یشدا دەفەرموێت: ﴿ وَلِسُلَيْمَانَ الرِّيحَ غُدُوُّهَا شَهْرٌ وَرَوَاحُهَا شَهْرٌ وَأَسَلْنَا لَهُ عَيْنَ الْقِطْرِ وَمِنَ الْجِنِّ مَن يَعْمَلُ بَيْنَ يَدَيْهِ بِإِذْنِ رَبِّهِ وَمَن يَزِغْ مِنْهُمْ عَنْ أَمْرِنَا نُذِقْهُ مِنْ عَذَابِ السَّعِيرِ ﴾[2] واتە: بایشمان ڕام كردبوو بۆ سولەیمان تاقی بەیانیان مانگەڕێیەك و تاقی ئێواران مانگەڕێیەكی ئەبڕێ و، كانیی مسی تواوەمان بۆ ڕەوان كردبوو، هەروەها لە جنۆكەیش هەندێكیانمان خستبوە ژێر فەرمانی چیی بویستایە فەرمانی ئەدانێ بۆیان جێبەجێ ئەكردو لە بەردەستیا

---

١- لقمان: ٢١

٢- سبأ: ١٢

بوون به فەرمانی خوا کاریان بۆ ئەکرد و، هەرکەسێکیشیان لە فەرمانی ئێمە لابداو سەرپێچی بکا لە سزای دۆزەخی پێ ئەچێژین.

ئەمە تایبەتە بەپەریەکانەوە وەکو زانراویشە پەری لەئاگر دروستکراون بێ باوەڕەکانیان لەسەعیردا سزا دەدرێت.

لەسورەتی فاطردا هاتووە دەفەرموێت: ﴿إِنَّ ٱلشَّيْطَٰنَ لَكُمْ عَدُوٌّ فَٱتَّخِذُوهُ عَدُوًّا إِنَّمَا يَدْعُواْ حِزْبَهُۥ لِيَكُونُواْ مِنْ أَصْحَٰبِ ٱلسَّعِيرِ﴾[1] واتە: بێگومان شەیتان دوژمنتانە، کەواتە ئێوەیش بە دوژمنی خۆتانی دابنێن. ئەو کۆمەڵەکەی خۆی بانگ ئەکا بۆ ئەوەی کردەوەی خراپی خواپێڕازینەبوو بکەن تا لە ئەنجاما ببن بە هاوڕێو هاودەمی ئاگری دۆزەخ و بچنە جەهەنەم. لەکۆتایدا شەیطان خۆی لە شوێنکەوتەکانی بەری دەکات. لێرەدا دەوترێت چەند هۆکارێك هەیە وا دەکات نزاکان گیرا نەبن:

١- خوات خۆشبوێت و کار بەقورئانەکەی نەکەیت.

٢- پێغەمبەرت خۆشبوێت و کار بەڕێنمویی و سوننەتەکانی نەکەیت.

٣- قورئان بخوێنیت و کار بەوە نەکەیت کەشوێنکەوتنی شەیطانی حەرام کردووە.

٤- نەنگیەکانی خۆت لەبیر بکەیت و باسی نەنگی و کەم و کوڕیەکانی خەڵکی بکەیت.

لە سورەتی (الشوری)دا هاتووە دەفەرموێت: ﴿وَكَذَٰلِكَ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ قُرْءَانًا عَرَبِيًّا لِّتُنذِرَ أُمَّ ٱلْقُرَىٰ وَمَنْ حَوْلَهَا وَتُنذِرَ يَوْمَ ٱلْجَمْعِ لَا رَيْبَ فِيهِ فَرِيقٌ فِى ٱلْجَنَّةِ وَفَرِيقٌ فِى ٱلسَّعِيرِ﴾[2]

---

١- فاطر: ٦

٢- الشوری: ٧

واتە: هەروەها قورئانێکی عەرەبیزوبانمان وەحیکردووە بۆ تۆ بۆ ئەوەی خەڵکی مەککەو ئەوانەی لەدەوروبەری مەککە ئەژین، بترسێنیّ لە سزای ڕۆژی قیامەت و، بۆ ئەوەی خەڵك لە ڕۆژی کۆکردنەوەیان بۆ لێپرسینەوە بترسێنی کە ڕۆژی قیامەتەو هیچ گومانی تیا نییە ، جا لە پاش کۆکردنەوەو لێپرسینەوەیان ئەکرێن بە دوو بەشەوە، بەشێکیان لە بەهەشتدا ئەبن و بەشێکیان لە دۆزەخدا.

وە لەسورەتی (الملك)دا هاتووە دەفەرموێت: ﴿وَلَقَدْ زَيَّنَّا ٱلسَّمَآءَ ٱلدُّنْيَا بِمَصَٰبِيحَ وَجَعَلْنَٰهَا رُجُومًا لِّلشَّيَٰطِينِ وَأَعْتَدْنَا لَهُمْ عَذَابَ ٱلسَّعِيرِ﴾[1] واتە: بەڕاستی ئێمە ئاسمانی لە ئاسمانەکانی تر لە زەوییەوە نزیکمان بە کۆمەڵێ چرا ڕازاندووەتەوە کە ئەستێرەکان و مانگ و ڕۆژن و ئەو ئەستێرانەمان کردووە بە هۆی ڕەجمکردن و دوورخستنەوەی شەیتانەکان و ئاگری دۆزەخیشمان ئامادەکردووە بۆیان. لەوە دەچێت دانیشتوانی سەعیر لەپەری و شەیطانەکان لە شوێنێکی نەخۆشاویدا نیشتەجێ بن، خوای گەورە دەربارەیان دەفەرموێت: ﴿وَقَالُوا۟ لَوْ كُنَّا نَسْمَعُ أَوْ نَعْقِلُ مَا كُنَّا فِىٓ أَصْحَٰبِ ٱلسَّعِيرِ﴾[2] واتە: ئەیشڵێن: ئەگەر ئێمە گوێچکەمان ببوایە بۆ بیستنی قسەی پێغەمبەران یا هۆش و فاممان بوایە بیرمان بکردایەتەوە، ئێستا لە ئەهلی دۆزەخ نەئەبووین.

یەکێکی تر لەو تاقمە کۆمەڵی بێ باوەڕ و گومڕاکانە لەسورەتی (الأنسان)دا هاتووە: ﴿إِنَّآ أَعْتَدْنَا لِلْكَٰفِرِينَ سَلَٰسِلَا۟ وَأَغْلَٰلًا وَسَعِيرًا﴾[3] واتە: ئێمە ئامادەمان کردووە بۆ کافران کۆمەڵێ زنجیر پێیان ڕائەکێشرێن بۆ دۆزەخ و کۆمەڵێ کۆت ئەکرێنە ملیان و، ئاگری بڵێسەداری دۆزەخیش کە پێی ئەسووتێنرێن.

---

١- الملك: ٥

٢- الملك: ١٠

٣- الإنسان: ٤

## ٣- (الحطمة) تێك شكێنەر

### هەموو دڵێك نكوڵی كردن و كینەی تێدایە:

پلەی سێیەم (حطمة)یە واتە ئەوەی بكەوێتە ناوی تێكی دەشكێنێت و دەیسوتێنێت، لەسورەتی (الهمزة)دا هاتووە دەفەرموێت:

﴿وَيْلٌ لِّكُلِّ هُمَزَةٍ لُّمَزَةٍ ۝١ ٱلَّذِى جَمَعَ مَالًا وَعَدَّدَهُۥ ۝٢ يَحْسَبُ أَنَّ مَالَهُۥٓ أَخْلَدَهُۥ ۝٣ كَلَّا ۖ لَيُنۢبَذَنَّ فِى ٱلْحُطَمَةِ ۝٤ وَمَآ أَدْرَىٰكَ مَا ٱلْحُطَمَةُ ۝٥ نَارُ ٱللَّهِ ٱلْمُوقَدَةُ ۝٦ ٱلَّتِى تَطَّلِعُ عَلَى ٱلْأَفْـِٔدَةِ ۝٧ إِنَّهَا عَلَيْهِم مُّؤْصَدَةٌ ۝٨ فِى عَمَدٍ مُّمَدَّدَةٍۭ﴾[1] واتە: هاوار بۆ هەموو ئەوانەی عەیب و عار لە خەڵك دەردێنن و هەموو ئەوانەی ناوونـاتۆرە لـە خـەڵك ئەنێن. بۆ هەموو عەیب و عار لە خەڵك دەرهاوەرو ناووناتۆرە لەخـەڵكنـەرێ كـە پارەی كۆكردووەتـەوەو جـار لـەپاش جـار ئەیـژمێرێ. وا ئـەزانێ ئـەو پارەیـەی هەیەتی هەتا هەتایە ئەیهێڵێتەوەو نامێڵـێ هـەرگیز بمـرێ. بـا واز لـەم كـردەوەو بیرو بۆچوونانەی بهێنێ. بەڕاستی ئەو فڕێ ئەدرێتە ناو (حوتەمە)وە كـە وشـەی (حوتەمـە) واتـە: ئـەو ئـاگرەی هەرچـیی تێبكـەوێ دایئـەڕزێنێ. تـۆ چـوزانی (حوتەمە) چییە؟ ئـەو ئـاگرە هەڵگیرسـاوەی خوایـە.. كـە تەنانـەت ناوەڕاسـتی دڵانیش ئەگرێتەوە، واتە ئازارەكەی ئەگاتە ناو كورۆكی دڵ. بێگومان ئەو ئاگرە بەسەر ئەوعەیب لەخەڵكدەرهاوەرو ناووناتۆرە لەخەڵكنەرانەدا قەپات كـراوە لـە ژووری تایبەتیی دۆزەخـدا. كـە حـاڵی ئـەو كەسـانە وایـە بەسـراون بـە ستوونی ڕاكێشراوەوە.

ئەو كەسەی هـەر پـارە كۆدەكاتـەوەو دەیبـژێرێت و زەكـاتی لێ نـادات، ئـەو پارەیـە دەیخاتـە نـاو ئـاگرەوە، كاتێـك گەیشـتە دڵ لاشـەش جـارێكی تـر دەگەڕێتەوە، سزاكەشی جارێكی تر دەگەڕێتەوە.

---

[1] - الهمزة: ١ - ٩

ئـەو زمانــە دەسـوتێت کەشـایەتی درۆی پێـدراوە، ئـەو چـاوەی کەسـەیری حەرامی پێ کراوە، ئەو گوێچکەی کەگوێی لەدەنگانێك گرتووە کەنەدەبوو گوێی لێ بگرێت، ئەو دەستەی بۆ حـەرام درێـژکراوە پاشـان دەچێتە نێـو پاشمـاوەی لاشەو ئەندامەکانی تری و دەیانسوتێنێت.

## ٤- (اللظی) پریشکی ئاگر

### بۆ هەرکەسێك پشت لەحەق بکات:

پاشـــان پلـــەی چـــوارەم دێـــت، ﴿نَارًا تَلَظَّىٰ﴾[1] واتـــە پریشـــکی ئـــاگری لێ دەکەوێتەوە، (لظی) واتە پێستی سەریان دەبرژێنێت، (الشوی) پێستی سـەرە، پاشان هـەردوو دەسـتی و هـەردوو قاچـی، وە پاشـان: ﴿تَدْعُواْ مَنْ أَدْبَرَ وَتَوَلَّىٰ ۝١٧ وَجَمَعَ فَأَوْعَىٰ﴾[2] واتـە: بـانگ ئەکاتـە ئـەو کافرانـەی پشـتیان پـێ هـەڵکردو لایـان داو شوێنی بانگەوازی ئیسلامەتی نەکەوتن و، دارایی و پارەیان کۆکردەوەو خستیانە نـاو توورەکەو هەڵیانگرت.

## ٥- سـقر (دۆزەخـی هـەڵقرچێنـەرو توێنـەرەوە)

### بۆ ئەوانەی واز لەنوێژ دەهێنن و ڕێگە لەخێر دەگرن:

پاشان پلەی پێنجەم دێت (سقر) (٤) جار لەسورەتەکانی (القمر)و (المدثر)دا هاتووە، لە (القمر)دا دەفەرموێت:

---

١- اللیل: ١٤

٢- المعارج: ١٧ - ١٨

﴿ يَوْمَ يُسْحَبُونَ فِي ٱلنَّارِ عَلَىٰ وُجُوهِهِمْ ذُوقُواْ مَسَّ سَقَرَ ﴾[1] واته: لەو ڕۆژەدا لەسەر ڕوو بەسەر ئاگری دۆزەخدا ڕادەکێشرێن و پێیان ئەوترێ: لێکەوتنی ئاگری دۆزەخ بچێژن.

ئەو کەسانەی کە بەسەر ڕوخسارياندا ڕادەکێشرێن بێ باوەڕەکانن. خوای گەورە لەسورەتی (القمر)دا دەفەرموێت: ﴿ ذُوقُواْ مَسَّ سَقَرَ ﴾لێرەدا (ذوقوا) ئەو ڕایەت لا دروست دەکات کە کاتێکی کەم بێت، لەوانەیە ئەم پلەیە بۆ کۆمەڵێکی دیاریکراو بێت، پاشان بەرەو دۆزەخ و ئاگر دەگەڕێنەوە.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ ثُمَّ نَظَرَ ﴿٢١﴾ ثُمَّ عَبَسَ وَبَسَرَ ﴿٢٢﴾ ثُمَّ أَدْبَرَ وَٱسْتَكْبَرَ ﴿٢٣﴾ فَقَالَ إِنْ هَٰذَآ إِلَّا سِحْرٌ يُؤْثَرُ ﴿٢٤﴾ إِنْ هَٰذَآ إِلَّا قَوْلُ ٱلْبَشَرِ ﴿٢٥﴾ سَأُصْلِيهِ سَقَرَ ﴿٢٦﴾ وَمَآ أَدْرَىٰكَ مَا سَقَرُ ﴿٢٧﴾ لَا تُبْقِي وَلَا تَذَرُ ﴿٢٨﴾ لَوَّاحَةٌ لِّلْبَشَرِ ﴾[2] واتە: جا تەماشای کرد. ئەنجا ڕووی گرژکردو چارەی ترش کرد. ئەنجا پشتی لەوە هەڵکرد کە شوێنی پێغەمبەر بکەوێو خۆی لە موسوڵمانان بە زلتر زانیو فیزی کرد بە سەریانا. جا وتی: ئەم قورئانە لە جادوویەکی گێڕراوە بەولاوە نییە کە ئەگێڕرێتەوەو کەسانێ فێری ئەبن. ئەم قورئانە لە قسەی ئادەمزاد بەولاوە نییە. لەمەولا ئەیهاوێمە سەقەرەوە. تۆ چوزانی سەقەر چییە؟ هەرچیی تێ فڕێبدرێ لێی ناگەڕێ و بەجێی ناهێڵێ، ئەیبرژێنێ. توێژی سەرووی پێستی ئەوانە ڕەش هەڵئەگەڕێنێ کە فڕێ ئەدرێنە ناوی.

لێرەدا باسی وەلیدی کوڕی موغیرە دێت کە ئەم ئایەتانەی لەسەر دابەزی، کاتێک ئەبو جەهل وەکو باڵوێزی قورەیش ناردی بۆ لای پێغەمبەرو چەند

---

١- القمر: ٤٨

٢- المدثر: ٢١ - ٢٩

خالێکی خستە بەردەست و وتی: ئەگەر پارەت دەوێت ئەوا ئەوەندە پارەت دەدەینێ ببیتە دەوڵەمەندترینی هەموومان، پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو: ئەی باوکی وەلید تەواو بوویت؟ پاشان چەند ئایەتێکی قورئانی بۆ خوێندەوە کاتێك وەلید گەڕایەوە بۆ لای ئەبو جەهل دەربارەی پێغەمبەر پێی وت: بەڕاستی وتەکانی شیرینیەکی تێدایە، ئەگەر دەڵێن هۆنراوەیە نەخێر هۆنراوە نیە، فالگرەوەش نیە ئێوە زۆر باشتر لە فالگرتنەوە تێ دەگەن، سوێند بەخوا شیرینی تێدایە، ڕازاوەیە، بەرزییەکەی بەخورو لێشاوە ئەو بەرز دەبێتەوەو هیچیش بەسەریدا بەرزنابێتەوە وتەی مرۆڤ نیە ئەبو جەهل وتی: سوێند بەخوا محەمەد سیحری لێ کردویت. وتی: بەڵێ محەمەد سیحری لێ کردم.

مانای (سقر) واتە ئەوەی لەبەردەمیدا بێت لەڕوخسارو پێست دەیسوتێنێت.

پاشان دێینە سەر ئایەتی: ﴿مَا سَلَكَكُمْ فِي سَقَرَ ﴿٤٢﴾ قَالُوا لَمْ نَكُ مِنَ الْمُصَلِّينَ ﴿٤٣﴾ وَلَمْ نَكُ نُطْعِمُ الْمِسْكِينَ ﴿٤٤﴾ وَكُنَّا نَخُوضُ مَعَ الْخَائِضِينَ﴾[1] واتە: چی ئێوەی خستە ناو سەقەرەوە؟ ئەوانیش لە وەڵاما ئەڵێن: ئەوە خستینیە سەقەرەوە کەوا لە ڕیزی نوێژکەرانا نەبووین و، خۆراکمان نەئەدا بە هەژارو، لەگەڵ هەرزەگۆیانا بە بیروباوەڕی پووچ و بێدینیانەوە خەریك ئەبووین .

ئەمە پاداشتیانە چونکە نوێژیان نەدەکرد خواردنیان بەهەژار نەدەدا هەر خەریکی قسەو چەلەحانێ بوون لەگەڵ یەکتردا.

---

١- المدثر: ٤٢ - ٤٥

## ٦- (الجحيم) دۆزەخی کڵپەسەندو - بڵێسەدار بەڵایە بۆ هەموو ستەمکارێك:

باسی پلەی شەشەم دەکەین ئەویش دۆزەخە، (٢٦) جار ئەم ناوە لەقورئانی پیرۆزدا هاتووە.

واتای (الجحيم) واتە ئەو شوێنەی کە ئەوپەڕی سزاو توندترینیانە لەسەر بەندەکان، وتراوە پشکۆکانی وەکو کێوەکان وایە، هاوەڵان کاتێك لەبەردەمیاندا باسی دۆزەخ دەکرا موچڕکە بەگیانیاندا دەهات.

کاتێك بەهەشتیەکان دەچنە بەهەشتەوەو جێگیر دەبن و دەکەونە قسەکردن لەگەڵ یەکدا بەیەکتری دەڵێن: من نزیکێکم هەبوو کوا ئەو نزیکە؟ فریشتەیەك وەڵامی دەداتەوە بەڵێ نزیکێکت هەبوو بەڵام ڕێگەی شەیطانی گرتەبەر بۆیە ئێستا شوێنی ئاگرە، لەنێوان دۆزەخی و بەهەشتیەکاندا دیوارێك هەیە ئەگەر بەهەشتیەکان بێنە دەرەوە دۆزەخیەکان دەبینن، خوای گەورە باسیان دەکات:

﴿إِنِّي كَانَ لِي قَرِينٌ ۝٥١ يَقُولُ أَءِنَّكَ لَمِنَ ٱلْمُصَدِّقِينَ ۝٥٢ أَءِذَا مِتْنَا وَكُنَّا تُرَابًا وَعِظَٰمًا أَءِنَّا لَمَدِينُونَ ۝٥٣ قَالَ هَلْ أَنتُم مُّطَّلِعُونَ ۝٥٤ فَٱطَّلَعَ فَرَءَاهُ فِي سَوَآءِ ٱلْجَحِيمِ﴾[1] واتە: یەکێکیان لەناو قسەدا بە یەکێکیان ئەڵێ: من لە دنیادا هاوڕێیەکم هەبوو. پێی ئەوتم: ئایا تۆ لەوانەی باوەڕ بە قسەی ئەو پێغەمبەرە ئەکەن لە بارەی زیندووبوونەوەوە لە پاش مردن؟ ئایا ئێمە کە مردین و بووین بە خۆڵو ئێسقان، ئایا ئێمە زیندووئەکرێینەوەو جەزامان ئەدرێتەوە؟ وتی: ئایا ئێوە تەماشای ئەهلی دۆزەخ ئەکەن و بۆیان ئەڕوانن تا بزانن ئەو شەخسەی لە دنیادا برادەرم بوو و وای پێ ئەوتم، ئێستا لە دۆزەخدا لە چ شوێنێکایە؟ جا سەیری کردن، واتە: سەیری دۆزەخییەکانی کردو، ناسراوەکەی خۆی دی لە ناوەڕاستی دۆزەخا.

---

١- الصافات: ٥١ - ٥٥

ڕوی دەرەوەی سورەتەکە ڕەحمەتەو ناوەڕۆکیشی سزاو ئازارە، ئەو کەسەی کە لەبەهەشتدایە دێتە دەرەوەو ئەو کەسە دەبینێت کە لەدۆزەخدایە، کاتێك بینی و گوێی لەدەنگی بوو لەنێو ئاگردا پێی دەڵێت: ﴿تَٱللَّهِ إِن كِدتَّ لَتُرۡدِينِ﴾[1] واتە: قەسەم بە خوا نزیك بوو بمفەوتێنی و ببی بە هۆی کافربوونم.

لەبەرئەوەی شەیطان دوو جۆرە: شەیطانی ئادەمی و شەیطانی پەری. بەڵام شەیطانی ئادەمیەکان بەهێزترن لەوانی تر خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ٱلَّذِينَ يَبۡخَلُونَ وَيَأۡمُرُونَ ٱلنَّاسَ بِٱلۡبُخۡلِۗ﴾[2]

واتە: خۆبەزلزانیی‌و فیزبەسەرخەڵکاکەریش ئەوانەن کە خۆیان ڕژدن و فەرمان بە خەڵکیش ئەدەن کە ڕژدی بکەن.

ئەو خۆی ڕژدو پیسکەیە فەرمانیش بەخەڵکی دەکات وەکو خۆی بن، بۆ نموونە بۆ نوێژ کردن تەمەڵیان دەکات و دەڵێت: فلانە شت دەکەین و ئینجا نوێژ دەکەین، فلانە کار تەواو دەکەین ئینجا نوێژەکە دەکەین هەتا نوێژەکە دەفەوتێت.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلَوۡلَا نِعۡمَةُ رَبِّي لَكُنتُ مِنَ ٱلۡمُحۡضَرِينَ﴾[3] واتە: ئەگەر نیعمەتی خوای خۆم نەبوایە منیش یەکێك ئەبووم لەوانەی ئامادەی ناو دۆزەخ کراون.

باوەڕداران لەبەهەشتدا ئەم فەزڵە بۆ خوا دەگێڕنەوە ئەگەر نا لەگەڵ ئەو نزیکەدا دەبوون لەدۆزەخدا، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿أَفَمَا نَحۡنُ بِمَيِّتِينَ ﴿٥٨﴾

---

١- الصافات: ٥٦

٢- الحديد: ٢٤

٣- الصافات: ٥٧

﴿ إِلَّا مَوۡتَتَنَا ٱلۡأُولَىٰ وَمَا نَحۡنُ بِمُعَذَّبِينَ ﴾[1] واتە: جا توخوا بەڕاست ئێمە لەوانە بووین کە نەمرین. تەنها مردنی یەکەممان نەبێ و، لە قیامەتا سزامان نەدرێ؟

ئێمە جارێکی تر لەبەهەشتدا نامرین و سزا ناکێشین ئەمەش فەزڵێکی گەورەیە، ڕەحمەتی خوایە لەبەرئەوەی خوای پەروەردگار ڕەحمەتی لەسەر خۆی نوسیوە.

ئەوەتا قسەیان لەگەڵدا دەکات و دەفەرموێت: ﴿ أَذَٰلِكَ خَيۡرٞ نُّزُلًا أَمۡ شَجَرَةُ ٱلزَّقُّومِ ﴿٦٢﴾ إِنَّا جَعَلۡنَٰهَا فِتۡنَةٗ لِّلظَّٰلِمِينَ ﴾[2] واتە: ئایا بەهەشت و نازو نیعمەتی بەهەشت ماواو مەنزڵی چاکە، یا درەختی زەققووم کە لە بەرەکەی بخۆی؟ ئێمە ئەو درەختەمان کردووە بە مایەی سەرلێشێوانی کافرەکان کە خۆیان بەوە کافر ئەکرد ئەیانوت درەخت چۆن لەناو ئاگری دۆزەخا ئەڕوێ و سەر دەردێنێ؟

ئەو درەختە (الزقوم) لەبن و ڕەگی دۆزەخەوەیە، سەرچاوەی ئەم درەختە، ئەم پلەیەیە، درەختی دڕکە، هەر کەدەستی بۆ برد گۆشتی دەستی لەبەر گەرمی دەکەوێتە خوارەوە، ئەگەر خواردی تێری ناکات. هەموو ئەمانە لەبەرئەوەیە وازی لەفەرمانەکانی خواو نەرێکانی و فەرمایشتەکانی خواو پێغەمبەرەکەیﷺ و وتەی زانایان هێناوە.

بۆیە ئەمڕۆ پێی دەوترێت لەو درەختە بچێژە کە ڕەگەکەی لە بنی دۆزەخەوە دەڕوێت: ﴿ طَلۡعُهَا كَأَنَّهُۥ رُءُوسُ ٱلشَّيَٰطِينِ ﴾[3] واتە: هێشووی ئەو درەختی زەققوومە لە ناشیرینییا لە سەلکە شەیتان ئەچێ.

---

١- الصافات: ٥٨ - ٥٩

٢- الصافات:٦٢ - ٦٣

٣- الصافات: ٦٥

( طَلْعُهَا ) واتە بەرەکەی یان بەرهەمەکەی، کاتێك خوای گەورە نموونە لەسەر نورانی بوون دەهێنێتەوە دەفەرموێت: ﴿مَثَلُ نُورِهِۦ كَمِشْكَوٰةٖ فِيهَا مِصْبَاحٌ﴾[1] واتە: نموونەی ڕوناکیی ئەو وەك ڕووناکیی تاقێکی بێکەلێنە چرایەکی داگیرساوی تیا بێ.

ئەمە ئەو وێکچونەیە کە هێوری و ئارامی بۆ دەروون دەگێڕێتەوەو باوەڕو دڵنیایی پێ زیاد دەکات، بەڵام هەرکەسێ لەخەیاڵدا ژیا ئەوا خوای گەورە زیاترو زیاتر لەخەیاڵدا دەیژێنێت.

دەربارەی درەختی (الزقوم) دەفەرموێت:﴿ طَلْعُهَا كَأَنَّهُۥ رُءُوسُ ٱلشَّيَٰطِينِ ﴾[2] کەس شێوەی شەیطانەکانی نەدەزانی لەبەرئەوە وای لێ کردووە شێوەی شەیطانەکان بێنێتە بەرچاویان، ئەوەی دیارە کە شێوەی زۆر ناشرینە، بیهێنەرە بەرچاوت درەختێك لە بنی دۆزەخەوە بڕوێت بەرەکەی وەکو سەری شەیطانەکان بێت بەکێم و جەرەتاو و ئاگر ئاو بخواتەوە، داخۆ تام و شێوەی چۆن بێت؟!! بەروبومەکانی گڕگرتو و درەوشاوەیە، لەبەرئەوە خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿ أَذَٰلِكَ خَيْرٞ نُّزُلًا أَمْ شَجَرَةُ ٱلزَّقُّومِ ﴾[3] واتە: ئایا بەهەشت و نازو نیعمەتی بەهەشت ماواو مەنزڵی چاکە، یا درەختی زەققووم کە لە بەرەکەی بخۆی؟

فەرمایشتەکە لێرەدا بەهەشتە بە بەراورد لەگەڵ دۆزەخدا باشە بەندە چی دەوێت؟ هەردوو وێنەکەی بەجوانی بۆ دەرخستویت بەئارەزووی خۆت یەکێکیان بۆ خۆت هەڵبژێرە.

---

١- النور: ٣٥

٢- الصافات: ٦٥

٣- الصافات: ٦٢

خـوای گـەورە دەفـەرموێت: ﴿ فَإِنَّهُمْ لَآكِلُونَ مِنْهَا فَمَالِـُٔونَ مِنْهَا ٱلْبُطُونَ ﴾[1] واتـە: بەڕاسـتی ئـەهلی دۆزەخ لـە بـەری ئـەو درەختـە ئـەخۆن و ورگـی خۆیـانی لێ هەڵەئاوسێنن و پڕی ئەکەن.

فەرمانی بەسەردا کردووە لێی بخوات، بەڵام هیوای نیە کەتێر بخوات، هەر لە سـورەتی (الصـافات)دا دەفـەرموێت: ﴿ ثُمَّ إِنَّ لَهُمْ عَلَيْهَا لَشَوْبًا مِّنْ حَمِيمٍ ﴾[2] واتـە: سەرەڕای ئەوەیش ئەو درەختی زەققوومە شلەیەکی ئاوێتەی کوڵ بـە کوڵیشـی بەسەرەوەیە.

واتـە تێکەڵـە بـەو کـێم و زوخـاوە کـوڵاوەو لەسـەر ئـەو دڕکـە گڕگرتـووە دەیخواتەوە، پاشان کۆتاییەکەی گەڕانەوەیانە بەرەو دۆزەخ.

واتە لـەکاتی نـان خواردنیانـدا دەڕۆن بـۆ شـوێنێکی تـر نـان دەخـۆن کاتێك دەڕوات سەردەکەوێت بەسەر کێوێکدا، لەوانەیە بڕوات بۆ پلەیەکی نزمتری ئاگر، لەوێ دەخوات و پاشان دەگەڕێتەوە بـۆ نـاو دۆزەخ، ئـەم هـەموو کەللـەڕەقی و سەرپێچی کردنە بۆچی؟ یاخود بیانو چییە؟

﴿ إِنَّهُمْ أَلْفَوْا۟ ءَابَآءَهُمْ ضَآلِّينَ ﴿٦٩﴾ فَهُمْ عَلَىٰٓ ءَاثَـٰرِهِمْ يُهْرَعُونَ ﴾[3] واتە: ئەمانە باوك و باپیرانی خۆیانیان بە گومڕایی دیوە. جا بۆیە ئەوانیش بە هەڵەداوان شوێن پێـی ئەوان هەڵئەگرن.

ئەوانە شوێن بـاو و باپیریـان دەکـەوتن لـەبێ بڕوایـی و گـومڕاییدا، ئەمـەش پێچەوانەی ئەو موسوڵمانانەیە کەخوو نەریتیان بۆ گوێڕایەڵی و بەندایەتی کردنی خوای گەورە گۆڕیوە، بەڵام ئەو بێ باوەڕانە بەهۆی کوفرو کەللە ڕەقیانەوە:

---

١- الصافات: ٦٦

٢- الصافات: ٦٧

٣- الصافات: ٦٩ - ٧٠

﴿إِنَّهُمْ أَلْفَوْا آبَاءَهُمْ ضَالِّينَ ﴿٦٩﴾ فَهُمْ عَلَىٰ آثَارِهِمْ يُهْرَعُونَ ﴿٧٠﴾ وَلَقَدْ ضَلَّ قَبْلَهُمْ أَكْثَرُ الْأَوَّلِينَ ﴿٧١﴾ وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا فِيهِم مُّنذِرِينَ ﴿٧٢﴾ فَانظُرْ كَيْفَ كَانَ عَاقِبَةُ الْمُنذَرِينَ﴾[1]

واته: ئەمانە باوك و باپیرانی خۆیانیان بە گومڕایی دیوە. جا بۆیە ئەوانیش بە هەڵەداوان شوێن پێی ئەوان هەڵئەگرن. بەڕاستی، پێش ئەوانیش بەشی زۆری خەڵکە پێشینەکان گومڕا بوون. ئێمەیش، بەڕاستی، چەند پێغەمبەری خەڵك لەسزای خواترسێنمان ناردە سەر ئەوان. جا سەیرکە سەرەنجامی ئەو ترسێنراوانە چۆن بوو کە گوێیان بۆ پەیامی خوا شل نەکرد کە بە پێغەمبەرانا بۆیان نێررابوو.

ئەمەش جیاوازە لەکەسێکی دۆزەخیەوە بۆ کەسێکی موسوڵمان خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَرَحْمَتِي وَسِعَتْ كُلَّ شَيْءٍ﴾[2] واتە: ڕەحمەت و میهرەبانیشم زۆر فراوانەو هەموو شت ئەگرێتەوە.

بەڵام کافر پێغەمبەر ﷺ دەربارەی دەفەرموێت: (هەرکەسێ ڕازی نەبێت ناچێتە بەهەشتەوە! وتیان کێ ڕازی نابێت؟! فەرمووی: ئەوەی ڕازی نەبێت بڵێت "لا إلـه إلا الله" ) هەروەها پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: (خوای گەورە ئازاری بەندەکانی نادات مەگەر کەسێکی سەرکێشی هەڵگەڕاوە کە لەخوا هەڵدەگەڕێتەوەو ئامادە نیە بڵێت "لا إلـه إلا الله" )[3]. بەڵام ئەوەی وتی ئەوا ڕەحمی پێ دەکات، لەبەرئەوەی شایستەی ئەو هەموو سزاو ئازارە نیە بەو پێناسە ترسناکەوە، لەبەرئەوە خوای گەورە بەفریشتەکانی فەرموە: (ئەگەر ئێوە دروستتان بکردنایە ڕەحمتان پێ دەکردن).

---

١- الصافات: ٦٩ – ٧٣

٢- الأعراف: ١٥٦

٣- سنن ابن ماجه.

## خەون دوای زانست... لێبوردن دوای دەسەڵات:

لێرەدا دوای هەموو ئەو ئایەتانەی باسیان لەئاگر کرد وە بۆ ئەوەی ئادەمیزاد ستەم لەبرا ئادەمیزادەکەی نەکات لەبەرئەوەی کۆتاییەکەی بەئازارە، خوای گەورە لە سورەتی (غافر)دا دەفەرموێت: ﴿ٱلَّذِينَ يَحۡمِلُونَ ٱلۡعَرۡشَ وَمَنۡ حَوۡلَهُۥ﴾[1] واتە: ئەو فریشتانەی عەرشی خوایان هەلگرتووەو ئەو فریشتانەی تریش کە بەدەوروبەریدان.

ئەم وتانە دەربارەی فریشتەکانە کە هەشتن: ﴿وَيَحۡمِلُ عَرۡشَ رَبِّكَ فَوۡقَهُمۡ يَوۡمَئِذٖ ثَمَٰنِيَةٞ﴾[2] واتە: لەو ڕۆژەدا هەشت فریشتە عەرشی خوا هەڵئەگرن بەسەر سەری ئەو فریشتانەی ترەوە کە لە سووچەکانی ئاسماندان.

چواریان یادی خوا بەیادێك دەکەن، وە چوارەکەی تریشیان بەزیکرێکی تر بەڵام زیکرو یادی جوان و هەمیشەیی و بەردەوام، و لەو کاتەوەی خوای میهرەبان بەدیهێناون هەتا ئەمڕۆمان هیچ شتێك لەسەر زمانیان نیە تەنها زیکر نەبێت.

چواری یەکەمیان دەڵێن: "سبحانك سبحانك" پاکی و بێگەردی بۆ تۆ لەمیهرەبانی و هێمنیت دوای زانابیت، چوارەکەی تریش وەڵام دەدەنەوە: "سبحانك سبحانك" پاکی و بێگەردی بۆ لێبوردەیت لەدوای تواناو دەسەڵاتت.

لێرەدا بەستنەوەی ئەسپەکەیە لێبوردن دوای تواناو دەسەڵات. ساڵانێکی زۆر هەموو شتێکی دایە دەست خۆت وازی لێ هێنایت خۆشی و ڕابواردنت کردو ئەوەی ویستت ئەنجامتدا، بەڵام ئەی کێ خەڵکی کوشت و ستەمی لێ کردن و زۆرە ملێیی لەبەرامبەردا کردن، کێ شارانێکی بەتەواوی لەناوبرد دێهاتی

---

١- غافر: ٧

٢- الحاقة: ١٧

بەتــەواوی لــەناوبرد ئــەوا دەبێــت لــەدەرگای (الجــبروت)ەوە بڕواتــە ژوورەوە لەبەرئەوەی چەکی سزادانیان لای خوا زۆر توندە.

ئێمە فـەرمانمان بـەمیهرەبانی پـێ کـراوە لەبەرامبـەر گیاندارانـدا، ئافرەتێك بەهۆی بەستنەوەی پشیلەیەکەوە خرایە نێو ئاگر ئەی داخۆ ئەوانە چۆن بـن کـە وشەو هەناسەی خەڵکی دەگرن و سەرشۆڕیان دەکـەن؟!! مەگـەر ئـەو کەسـانە نەبێت کە هەڵە دەکەن و دەگەڕێنەوە، خوای گـەورە ئـەو کەسـەی خۆشـدەوێت کەهەڵە دەکات و دوایی تەوبە دەکات، ئەگەر وانەبێت ئەوا دەیانگۆڕین بەگـەل و کۆمەڵێکی تر هەڵە بکەن و بگەڕێنەوە.

جیاوازی هەیە لەنێوان ئەو کەسەی هەڵە دەکات و پاشان دەگری و پەشیمان دەبێتەوەو دەگەڕێتەوە لای خوا لەگـەڵ ئـەو کەسـەی هەڵـە دەکـات و لەهـەمان کاتدا پێدەکەنێت، خوای گەورە دەربارەیان دەفـەرموێت: ﴿ وَإِذَا قِيلَ لَهُ اتَّقِ اللَّهَ أَخَذَتْهُ الْعِزَّةُ بِالْإِثْمِ فَحَسْبُهُ جَهَنَّمُ وَلَبِئْسَ الْمِهَادُ ﴾[1] واتــە: ئەگــەر بــەم بنیادەمە بوترێ: لە خودا بترسەو بەدکاری مەکە، غیرەت و نەفامیی جاهیلییەت ئەیگرێو توورە ئەبێو ئەو گوناهە ئەکات کە لێی مەنع کـراوە. ئەوکەسـە سـزای دۆزەخی بەسە. شوێنێکی زۆر بەدە ئەو شوێنەی لە دوارۆژدا ئەوی تێـدا جـێگیر ئـەبێ. ئـەوە پاداشـتی سـتەمکارە لـەدەروونی خـۆی کـە سـنورەکانی خـوا دەشکێنێت.

---

١- البقرة: ٢٠٦

## ئەمەش لە ڕەحمەتەوەیە...

ئەی چۆن لەگەڵ ئەم سزایە لێکدانەوە بۆ فەرمایشتی خوای پاك و بێگەرد دەکەیت، لە فەرمایشتێکی قودسیدا دەفەرموێت: (إن رحمتي سبقت غضبي)[1].
واتە: ڕەحمەتی من پێش توڕەبوونم کەوتووە. ڕەحمەتی خوا لەژیانی دنیا لەقورئان و سوننەت و زانایاندایە هەروەها لەو خەڵکانەشدایە کە دەستی خەڵکی دەگرن، ئەوەتا مزگەوت هەیە وە ڕۆزی و خێری زۆر هەیە کەدەیدات بەمنداڵەکان و هاوسەریان هەروەها کاری فرۆکەو کەشتیەکان. ئایا هەموو ئەمانەو شتەکانی تریش ڕەحمەتی خوا نین؟

ئەوەتا محەمەدی ﷺ بۆ ناردوین کاروباری ئایینەکەمانی بۆ ڕوون کردوینەتەوەو لەسەر ڕێیەکی سپی جێی هێشتوین شەوی وەکو ڕۆژی وایە کەس لێی ناترازێت مەگەر تیاچوەکان نەبێت، بۆیە دەبێت ئەو تاوانبارە سزایەکی هەبێت، ئایا ئەوانەی دەزانن وەکو ئەوانەن کە نازانن، ئەوەی چاوی دادەخات وەکو ئەوەیە کە چاوی داناخات؟ ئەوەی لەسەر حەرام دەژی وەکو ئەوە وایە کە بەقەناعەتەوە دەژی؟

ئەوە حەزرەتی عەلیە(رەزای خوای لێ بێ) ئاو بەسەتڵ لەبیر دەردەهێنێت بۆ ئافرەتێکی جولەکە هەموو سەتڵێك بە دەنکە خورمایەك، بەوەش (١٦) دەنکی بەدەست هێنا، دەیدات بە پێغەمبەر ﷺ و ئەویش دەفەرموێت: باشترین خواردنێك کە ئادەمیزاد بیخوات لەبەری ڕەنجە شانی خۆی بخوات، داود پێغەمبەری خوا ﷺ لەبەری ڕەنجە شانی خۆی دەخوارد.

---

١- رواه البخاري.

## کار بۆ فریشتەکان لەپێناوی تۆدا...!!

سەیر دەکەیت دوو جۆر هاوەڵدانان هەیە: هاوەڵدانانی بچوکتر، وە هاوەڵدانانی گەورەتر. لەوانەیە لە بەدیهێنراوێك بترسێت نەك لە بەدیهێنەر کە خوایە.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ٱلَّذِينَ يَحۡمِلُونَ ٱلۡعَرۡشَ وَمَنۡ حَوۡلَهُۥ يُسَبِّحُونَ بِحَمۡدِ رَبِّهِمۡ وَيُؤۡمِنُونَ بِهِۦ وَيَسۡتَغۡفِرُونَ لِلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾[1] واتە: ئەو فریشتانەی عەرشی خوایان هەڵگرتووەو ئەو فریشتانەی تریش کە بەدەوروبەریدان بۆ سوپاس و سەنای خوا تەسبیحاتی بۆ ئەکەن و باوەڕیان پێی هەیەو داوای لێبووردن لە خوا ئەکەن، بۆ ئەوانەی ئیمانیان هێناوە.

خوای گەورە کاتێ فریشتەی دروست کرد بەندایەتی خوا دەکەن و بەپیرۆز ڕایدەگرن، کاتێك ئادەمی دروست کرد، کارێکی تری دانە دەست، داوای لێخۆشبوون کردن بۆ بڕواداران، لەبەرئەوە لەسەر زەویدا فریشتەی گەڕۆك هەن دەڕۆنە ناو ئەو شوێنانەی یادی خوای تێدا دەکرێت دەوری ئەو دانیشتنە دەگرن پاشان دەچن بۆ لای خوا خوای گەورە پێیان دەفەرموێت: چۆن بەندەکانی منتان جێ هێشت؟ فریشتەکانیش وەڵام دەدەنەوە: یادی تۆو تەسبیحاتی تۆیان دەکرد، خوای میهرەبان لێیان دەپرسێت: چیان دەوێت؟ فریشتەکانیش دەڵێن: بەهەشتیان دەوێت. خوای گەورەش دەفەرموێت: ئایا بەهەشتی منیان بینیوە؟ دەڵێن: نەخێر. خوای گەورە دەفەرموێت: ئەی چۆن دەبێت ئەگەر ببینن؟ فریشتەکانیش دەڵێن: زیاتر داوای لێخۆشبوون دەکەن. لەوێدا خوای گەورە دەفەرموێت: (ئێوە بەشاهید بن ئەوا لێیان خۆشبووم).

---

١- غافر: ٧

ئایا لەوە زیاتر بەزەیی و ڕەحم کردن هەیە، ئەگەر تۆ ئەو جۆرە ڕەحمەتـەت دەوێت ئەوا یەك دانیشتنی فێربوونی زانست کەفارەتی (٧٠) دانیشـتنی شوێنی خراپە.

بەڵام بەمەش خەڵکی بانگ ناکەین بۆ ئەوەی سـەیری کـەناڵی خـراپ بکـات و لەڕۆژی دوایدا سەیری کەناڵی یادو نـزاو قورئـان بکـات، ئـەم ئومێـدی ڕەحمەتـە دەینێرین بۆ خەڵکی ئەوانەی هێشتا لە بێ ئاگایی خۆیان هەڵنەساونەتەوە.

ڕۆژێك حەسەنی بەصری کوڕێکی بینی پێدەکەنی پێی وت: ئایـا ئـەوەت پـێ گەیشـتووە کـە تـۆ بـەرەو ئـاگر دەڕۆیـت؟ وتـی: بـەڵێ. پێـی وت: ئـەی پێـت گەیشتووە کە بەرەو بەهەشت دەڕۆیت؟ وتی: بەڵێ. حەسـەنی بەصـریش وتـی: ئیتر کەواتە بۆچی پێدەکەنیت و لەبەرچی؟!

ئەمەش مانای وانیە ئادەمیزاد هەمیشە بەغەمباری ژیانی بەرێتە سـەر بـەڵکو کات و ژیـانی بخاتـە کـارو غـەمی ئیسـلام هـەڵبگرێت ئەوەشـی غـەمی ئیسـلامی هەڵگرت دەبێت پەیوەندی بەردەوامی بەخواوە هەبێت، ئەم ئیسلامە بـۆ هـەموو کات و شوێنێك گونجاوە وە بۆ هەموو سەردەم و ڕۆژگارێك.

پێغەمبەری خوا ﷺ هۆشیاری پێ داوین لەسـەر دانیشـتن لەسـەرە ڕێگاکـان زۆر بەتوندی ڕێگەی لێ گرتین و فەرمووی: (نەکەن لەسـەرە ڕێگاکـان دابنیشـن! وتیان: ئەی پێغەمبـەری خـوا چـی بکـەین ناچـارین دابنیشـین شـوێنمان نیـە... فـەرمووی: کەواتــە مــافی ڕێگاکـە بـدەن وتیـان: مافـەکانی چـیە؟ فـەرمووی: داخستنی چاو، سەندنەوەی سڵاو، ئازارنەدانی خەڵکی، فـەرمان بەچـاکەو نـەریێ بۆ خراپە).

خـوای گـەورە دەفـەرموێت: ﴿رَبَّنَا وَسِعْتَ كُلَّ شَيْءٍ رَّحْمَةً وَعِلْمًا﴾[1]

واتە: خوایە ! تۆ بە میهرەبانیو زانایی خۆت هەموو شتێکت گرتووەتەوە.

ڕەحمەت یەکەم ڕەحمەتی زانینی حاڵی بەدیهێنراوەکانە، سەرەتا ڕەحمەت هـاتووە چـونکە لـە فەرمایشـتە قودسـیەکەدا دەفـەرموێت: (ڕەحمـەتم پـێش تورەبـوونم کـەوتووە) فریشـتەکان تـەواوی دەکـەن: ﴿فَاغْفِرْ لِلَّذِينَ تَابُوا وَاتَّبَعُوا سَبِيلَكَ وَقِهِمْ عَذَابَ الْجَحِيمِ﴾[2] واتە: دەسا لەوانە ببوورە کە تۆبەیان کردووەو ڕێـی تۆیان گرتووەتەبەرو لە ئاگری دۆزەخیان بپارێزە.

## خۆراکـی دۆزەخـیەکـان و سـزاکـانیان:

ئەوە تەنها بۆ ئەو کەسەیە کە تەوبە دەکات و شوێن ڕێگەی خـوا دەکـەوێت، ئەوە ناچێت بۆ دۆزەخ، ئەوەی تەوبەی کردو گەڕایـەوە بـۆ لای خـواو پەشیمان بوویەوە لەوەی ئەنجامی داوە، ئەوا خوا تەوبەی لێ وەردەگرێـت و لـە دۆزەخـدا سزای نادات.

هـەروەها خـوا (جـل جلالـه) دەفـەرموێت: ﴿خُذُوهُ فَغُلُّوهُ (٣٠) ثُمَّ الْجَحِيمَ صَلُّوهُ﴾[3]

واتە: خوا بە دۆزەخەوانەکان ئەفەرموێ: بیگرن و کۆت و زنجیری کـەن. پاشـان بیخەنـە ئـاگرە سـەختەکەی دۆزەخـەوەو مەیخەنـە شـوێنێکی تـر. لەسـورەتی (المزمل)دا دەفەرموێت:

---

١- غافر: ٧

٢- غافر: ٧

٣- الحاقة: ٣٠ - ٣١

﴿ إِنَّ لَدَيْنَآ أَنكَالًا وَجَحِيمًا ﴾[1] واتە: ئێمە کۆت و زنجیری قورس و دۆزەخمان لایە.

بە پەندکردن بەهۆی توندی سزاوە: ﴿ وَطَعَامًا ذَا غُصَّةٍ وَعَذَابًا أَلِيمًا ﴾[2] واتە: خۆراکی وامان لایە ئەگیرێتە گەروو و پیا ناچێتە خوارو، سزای پڕ ئێش و ئازارمان لایە.

سەیری خۆت بکە کاتێك ستەم لەیەکێك دەکەیت یاخود بێ باوکێك تورە دەکەیت یاخود ئازاری لاوازێك دەدەیت یان کارمەندێك دەچەوسێنیتەوە هەتا رقی لە کارەکەی بێت یان ئازاری دایك و باوکت بدەیت، هەموو ئەمانە دڵ دەسوتێنن، فرمێسکی هەژارێك دڵ شەقار دەکات.

با لە چاکسازی کردنی کورەکەمان یان خۆمانەوە دەست پێ بکەین سەرەتا دەبێت مامەڵەت لەگەڵ خوای بەندەکاندا چاك بکەیت پاشان لەگەڵ خەڵکیدا: ﴿ خُذُوهُ فَغُلُّوهُ ﴿٣٠﴾ ثُمَّ الْجَحِيمَ صَلُّوهُ ﴿٣١﴾ ثُمَّ فِي سِلْسِلَةٍ ذَرْعُهَا سَبْعُونَ ذِرَاعًا فَاسْلُكُوهُ ﴾[3] واتە: خوا بە دۆزەخەوانەکان ئەفەرموێ: بیگرن و کۆت و زنجیری کەن. پاشان بیخەنە ئاگرە سەختەکەی دۆزەخەوەو مەیخەنە شوێنێکی تر. ئەنجا بیپێچن بە زنجیرێکی حەفتا گەزییەوە.

قەبارەی جەستەی ئادەمیزاد لەرۆژی دوایدا (٧٠) باڵە، لچ و لێوی ئازار دەدرێن لەئاگردا هەتا دەگاتە ناوکی، لێوی سەرەوەی بەرز دەبێتەوە هەتا قژی سەری دادەپۆشێت، ددانی کافر بەئەندازەی کێوی ئوحودی لێ دێت، پێستی

---

١- المزمل: ١٢

٢- المزمل: ١٣

٣- الحاقة: ٣٠-٣٢

بەئەندازەی (٣) ڕۆژ درێژ دەبێت، دڵ وەکو خۆی دەبێت ڕۆحیش وەکو خۆی دەمێنێتەوە.

لە سوورەتی (النازعات)دا دەفەرموێت: ﴿ وَبُرِّزَتِ ٱلْجَحِيمُ لِمَن يَرَىٰ ﴾[١] واتە: دۆزەخ دەرئەخرێ بۆ هەرکەسێ ببینێ.

لەبەرئەوەی فریشتە هێناویەتی، لەبەرئەوەی بەئاشکرا سەرپێچی خوای دەکرد، بۆیە دۆزەخ بۆی دەرکەوت، وە لەوێ خەڵکانێك هەن لەسەر ڕوخساریان ڕادەکێشرێن بەکەڕی و لاڵی و کوێری.

سزا بەئەندازەی ستەم کردنە لەدنیادا تەنانەت بینینی دۆزەخیش بۆ خۆی سزایەکە، بۆ نموونە کەسێك دەخرێتە زیندانەوە خستنە نێو زیندانیەوە بۆ خۆی سزایەکە، هەست کردنی بەتەنیایی سزایەکە، نەبوونی ئازادی سزایەکە، ئەو کاتەی کارەکانی بەدەست یەکێکی تر دەبێت ئەوەش سزایەکە، پاشان خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿ وَءَاثَرَ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا ۝٣٨ فَإِنَّ ٱلْجَحِيمَ هِىَ ٱلْمَأْوَىٰ ﴾[٢] واتە: ژیانی دنیاو ڕابواردنی دنیای بەسەر ژیانی پاش زیندووکردنەوەدا هەڵوێردبێ، ئەوە دۆزەخ شوێن و ماوایەتی.

واتە دۆزەخ شوێنگەیانە کەپەنای بۆ دەبەن، ئەمەش لەبەرئەوەی کاری دنیای بەسەر کاری ڕۆژی دواییدا پێش خستووە.

حەزرەتی موسا عليه السلام فەرمووی: خوایە خۆشەویسترین بەندەت کێیە؟ فەرمووی: ئەو کەسەیە وەك خێرایی باز بۆ گرتنی نێچیرەکەی پەلەدەکات بۆ

---

١- النازعات: ٣٦

٢- النازعات: ٣٨ - ٣٩

ڕازیکردنم، ئەوەتا دەفەرموێت: ﴿وَعَجِلْتُ إِلَيْكَ رَبِّ لِتَرْضَىٰ﴾[1] واتە: مووسایش وتی: خودایە! ئەوانیش وان لە دوامەوە بەشوێنما دێن، بەڵام من پەلەم کرد بۆ هاتن بۆ لای تۆ بەڵکو تۆ ڕازی بی لێم.

ئەی ڕازی بوون لەکوێوە دێت لە پەلەکردن بۆ ڕازیکردنی خوا.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَإِذَا الْجَحِيمُ سُعِّرَتْ﴾[2] واتە: کە دۆزەخ سەخت هەڵگرێنراو، بەئاگر کڵپە دەکات، لەسورەتی (الانفطار)دا دەفەرموێت: ﴿وَإِنَّ الْفُجَّارَ لَفِي جَحِيمٍ﴾[3] واتە: ئەوانەیش کە لە ڕاستی لایانداوەو بیروکرداریان خراپ بووە لە دۆزەخدان.

(فاجر) واتە ئەو کەسەی پەلامار دەدات، لەکارەکانی فاجر فەرمانبەرداری فەرمانەکانی خوا ناکات و نەریَ ناکات بۆ حەرام کراوەکانی خوا، ئەوەش وێنەیەکە لە (فجور)، (فجور) واتە خۆ بەگەورەزان لەبەردەم خواداو هەڵگەڕانەوە لێی.

ئەگەر کارمەندێکت هەبێت داوای لێبکەیت بڕوات بۆ شوێنێك ئەویش گوێڕایەڵت نەبێت چی دەکەیت؟ دەری دەکەیت. حەزرەتی جبریل شەوی نقوم بوونەکەی فیرعەون لەئاوەکەدا هات بۆ لای، ئەمە لەتەفسیرەکاندا گێڕدراوەتەوە، پێی فەرمو: ئەی پیاو ئەگەر تۆ پیاوێك بکڕیت لەخاوەنەکەی پارەی تێدا خەرج بکەیت پاشان فەرمانێك بدەیت بەسەریدا ئەویش سەرپێچیت بکات، چی دەکەیت؟ وتی: نغرۆی ئاوی دەکەم، پرسیارەکەی لێ دوبارە کردەوە

---

١- طه: ٨٤

٢- التكوير: ١٢

٣- الانفطار: ١٤

ئەویش هەمان وەڵامی دایەوە پاشان جبریل دیار نەما، ئەوەبوو کۆتایی فیرعەون خنکان بوو لە ئاوەکەدا. لەبەرئەوەی خۆی فەرمانیدا بەسەر خۆیدا.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ لَتَرَوُنَّ ٱلْجَحِيمَ ﴾[1] واتە: دۆزەخ بە ڕاستی ئەبینن.

وتارەکە لێرەدا بۆ هەموان جەخت دەکاتەوە، ئەوەی بەسەر پردی سیراطدا بڕوات هەموو پلەکان دەبینێت، لەسورەتی (الدخان)دا هاتووە: ﴿ ذُقْ إِنَّكَ أَنتَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْكَرِيمُ ﴾[2]. واتە: دەفەرموو بیخۆو بیچەژە، تۆ بەڕاستی گەورەو خاوەن شان و شکۆی!

ئەمەش سزایەکی گیانی‌یە لەپاڵ سزای ماددی بەئاگر.

## ٧- (الهاوية) قوڵایی دۆزەخ

### بۆ هەموو دووڕوو و ستەمکارێکە:

- پلەی هاویەش هەیە، وتراوە لەپلەی حەوتەمدایە، کە پلەی هەرە خوارەوەیە، دوا پلەی ئاگرە.

خەڵکەکەی بریتین لەفیرعەون و گەلەکەی ئەوانەی لەوکاتەدا لەگەڵیدا ژیان، هەروەها (أصحاب المائدة) :﴿ وَيَوْمَ تَقُومُ ٱلسَّاعَةُ أَدْخِلُوٓا۟ ءَالَ فِرْعَوْنَ أَشَدَّ ٱلْعَذَابِ ﴾[3] واتە: کە ڕۆژی قیامەتیش دێ فەرمان لای خواوە دێ کەوا دەستەو دائیرەی فیرعەون بخەنە ناو سەختترین سزاوە.

---

١- التكاثر: ٦

٢- الدخان: ٤٩

٣- غافر: ٤٦

توندترین سزا پلەی هەرە خوارەوەیە، (أصحاب المائدة) لەسەردەمی حەزرەتی عیسادا بوو پێیان وت: ﴿يَٰعِيسَى ٱبْنَ مَرْيَمَ هَلْ يَسْتَطِيعُ رَبُّكَ أَن يُنَزِّلَ عَلَيْنَا مَآئِدَةً مِّنَ ٱلسَّمَآءِ﴾[1] واتە: ئەی عیسای کوڕی مەریەم ئایا خودای تۆ ئەتوانێ، یا بەگوێت ئەکا لە ئاسمانەوە خوانێکمان بۆ دابەزێنێ؟

ئەوە بێ ئەدەبیە، لەجیاتی ئەوەی پێی بڵێن: ئەی عیسا خواکەت بانگ بکە یاخود بڵێن وەرە با خوا بانگ بکەین.

پاشان خوای گەورە وەلامی دانەوە: ﴿إِنِّي مُنَزِّلُهَا عَلَيْكُمْ فَمَن يَكْفُرْ بَعْدُ مِنكُمْ فَإِنِّيٓ أُعَذِّبُهُۥ عَذَابًا لَّآ أُعَذِّبُهُۥٓ أَحَدًا مِّنَ ٱلْعَٰلَمِينَ﴾[2] واتە: وا ئەو خوانەی داواتان کرد بۆتان ئەنێرمە خوار. ئیتر هەرکام لە ئێوە پاش ئەوە کافر بوو و گوێی نەدایە ئامۆژگاریی پێغەمبەر سزایێکی گران و توندوتیژی وەهای ئەدەم لە عالەمدا سزای کەس بەو جۆرە نادەم. ئەوەبوو ئەوانەی کافر بوون خودا پێستی مەیموون و بەرازی بە بەردا کردن کە کەس سزای وەها نەدراوە.

حەزرەتی عیسا ﷺ یەك داواکاری هەبوو لێیان فەرمووی: (بخۆن و خۆراك پاشەکەوت مەکەن). وتیان: بۆچی؟ فەرمووی: لەبەرئەوەی خوای گەورە هەموو ڕۆژێك مێزێکتان بۆ دادەبەزێنێت هەموو جۆرە خواردنێکی ئەم دنیایەی تیایە. بەنی ئیسرائیل وتیان: کێ ئەم وادەیەی تۆمان بۆ مسۆگەر دەکات مێزێکی تری خواردنمان بۆ دادەبەزێنێت، بۆیە دەیانخواردو کۆیان دەکردەوە پاشان بێ باوەڕبوون لەسەری بەوەی خراپەیان لەگەڵ خواو پێغەمبەرەکەیدا کرد.

---

١- المائدة: ١١٢

٢- المائدة: ١١٥

خـــوای گـــەورە دەربـــارەی دووڕووەکـــان دەفـــەرموێت: ﴿إِنَّ ٱلۡمُنَٰفِقِينَ فِي ٱلدَّرۡكِ ٱلۡأَسۡفَلِ﴾[1] واتـــە: بێگومـــان منافقـــەکان لـــە نـــاخی هـــەرە خـــوارووی دۆزەخدان لە قیامەتدا.

لەسەردەمی پێغەمبەردا ﷺ (عەبدوڵای کوڕی ئوبـەی) سـەرۆکی دووڕووەکـان بـوو هـەر پێـنج نوێژەکـەی دەکـرد، زەکـاتی دەداو ڕۆژوی ڕەمـەزانی دەگـرت و ئەوەی دەری دەخست لەناوەڕۆکیدا وانەبوو.

دووڕوو (٤) خەسڵەتی سەرەکی تێدایە ئەوانیش:

١- ئەگەر قسەی کرد درۆ دەکات.

٢- ئەگەر پەیمانێکی دا لێی پەشیمان دەبێتەوە.

٣- ئەگەر ئەمانەتێکی درایە دەست ناپاکی تیا دەکات.

٤- ئەگەر شەڕی بوو بەد زمانە.

لەفەرمودەیەکدا هاتووە کە (موسلیم) گێڕاویەتیەوە: (کەسێك بـەردەوام درۆ دەکات و بەدوای درۆدا دەگەڕێت، هەتا لای خوا بەدرۆزن دەنوسرێت).

## درۆ بەرەو ئاگرت دەبات...

لێرەدا جیاوازی نیە لەنێوان درۆی سپی یان هەر درۆیەکی تردا ئەمە حەرامەو دروست نیە، جیاکاری نیە لەدرۆکردندا مەگەر ئەوە نەبێت خواو پێغەمبەرەکـەی فەرمانیان پێ کردووە: لەکاتی جەنگ و ئاشتی و لەگەڵ خێزانەکەتدا وەکو ڕازی کردنـی و هێورکردنـەوەی ئێرەییەکـە بەمەبەسـتی چاکسـازی کردنـی ژیـانی هاوسەرییان و بەردەوامیدان بەپێکەوە ژیان و خۆشەویستی نێوانیـان، هـەروەها درۆکردن بۆ ئاشتەوایی نێوان دوو کـەس جگـە لـەم حاڵەتانـە درۆکـردن دروسـت نیە.

---

١- النساء: ١٤٥

ئەوە عائیشەی دایکی باوەڕدارانە بەخوشکەکەی دەڵێت: ئەوە خورمایەکە. پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: عائیشە هیچ لەدەستتدایە؟ وتی: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا. فەرمووی: ئەگەر شتێك لەدەستتدا نەبوایە لای خوا بەدرۆیەك بۆت دەنوسرا لای خوا درۆی بچوکیش بەدرۆی بچوك دەنوسرێت.

ئەگەر بەندەیەك درۆیەکی کرد فریشتەی کردەوە چاکەکانی ماوەی دوو میل لێی دوردەکەوێتەوەو دەڵێت: ئاه لەو بۆنە ناخۆشە کە ئەو درۆیەی لێوە هاتە دەرەوە. گوناه کردن بۆنی هەیە ئادەمیزاد بۆنی ناکات بەڵام فریشتەکان بۆنی دەکەن.

بۆ نموونە لەکاتی دەستگیرانیدا کە تەواو نابێت و لەیەك جیادەبنەوە، سەیر دەکەیت خەڵکانێك درۆی بەدەمەوە دەکەن و ئەوە باس دەکەن کەهیچ ڕاستیەکی تێدا نیە وەکو بیانویەك دەیگێڕنەوە بۆ ئەوەی کە ڕوویداوە، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: (خراپترین بەندەکانی خوا ئەوانەن قسە دەهێنن و دەبەن خۆشەویستان لەیەك دەکەن دەست درێژکارو خۆ بێ بەری کردن و نەفرین کار)[1]. بەدوای نەنگیەکەتدا دەگەڕێت، ئەم جۆرە کەسانە لەپلەکانی خوارەوەی دۆزەخدان.

ناپاکی لە پەرستشەکان و شتی تریشدا دەکات، خراپترین دزی لای خوا ئەوەیە دزی لەنوێژ بکەیت، وەکو کەڵەشێر بەدەنوك ئەنجامی بدات واتە بەخێرایی بیکات.

دووڕو هەرگیز لەدۆزەخ نایەتە دەرەوەو بەهەمیشەیی دەمێنێتەوە.

لێرەدا دێینە سەر چەند شوێنێکی تر لەدۆزەخدا، لەسورەتی (المطففین)دا هاتووە دەفەرموێت:﴿ كَلَّآ إِنَّ كِتَٰبَ ٱلْفُجَّارِ لَفِى سِجِّينٍ ﴿٧﴾ وَمَآ أَدْرَىٰكَ مَا سِجِّينٌ ﴿٨﴾ كِتَٰبٌ

---

١- رواه أحمد

﴿مَّرْقُومٌ﴾[1] واتە: با ناتەواوپێوو ناتەواوکێشەکان دەسبەرداری ئەم کارە خراپـەیان بن، سیاهەی کردەوەی پیاوخراپان لە (سـیججین) دایـە. تـۆ چـوزانی سـیججین چییە؟ . کتێبێکی نووسراوە.

وتـراوە شـوێنەکان ژمـارەدارن بـەردێك نیـە نـاوی خاوەنەکـەی لەسـەر نەنوسرابێت، دیارە نامەی کردەوەی بـاوەڕداران لەشـوێنە هـەرە بەرزەکاندایـە، وە نامەی کردەوەی بێ باوەڕانیش دیارو ئاشکرایە کە خێری تێدا نیـە، مـۆرکراو و لۆك کراوە، نامەی کردەوەی خراپەکانیەتی.

وتراوە سجین دوا شوێنی زەویە لەگەڵ شەیطـانـدا، کـاتی دەرچـوونی گیـانی خراپـەکار هـەموو زەوی ڕەدی دەکەنـەوە، یەکـەم و دووەم و سـێیەم هـەتا حەوتەم، لەدوا شوێنی زەویدا لەگـەڵ شـەیطـانـدا جـێگیر دەبێـت، لەبەرئـەوەی شوێنی شەیطان لەزەوی حەوتەمە.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ لِّلْمُكَذِّبِينَ﴾[2] واتە: هـاوار لـەوڕۆژەدا بـۆ ئەوانەی باوەڕیان نییە.

وتراوە (ویل) شیوێکە لەدۆزەخدا هەموو ڕۆژێـك سـەد جـار ئـاگر پـەنای پـێ دەگرێت، ئەمە بۆ ئەو کەسانەیە نوێژەکانیان دوا دەخەن نیوەڕۆ لەگەڵ عەسردا دەکات دەستنوێژی نوێژەکان دوا دەخات، خوای گەورە دەفـەرموێت: ﴿فَوَيْلٌ لِّلْمُصَلِّينَ ۝٤ ٱلَّذِينَ هُمْ عَن صَلَاتِهِمْ سَاهُونَ﴾[3] واتـە: دەی هـاوار بـۆ ئـەو نوێژکەرانـەی . لـە نوێـژەکانی خۆیـان بێئاگـان و زۆر جـار نایانکـەن و گوێیـان نادەنێ.

---

١- المطففين: ٧ — ٩

٢- المطففين: ١٠

٣- الماعون: ٤ - ٥

ئەمە بۆ ئەو موسوڵمانانەی کە نوێژەکانیان دوا دەخەن ئەی داخۆ بۆ ئەوانەی کە هەر نوێژ ناکەن، بۆ نموونە ئەو پیاوەی کە نوێژ ناکات گرێبەستی هاوسەریەکەی هەڵوەشاوەتەوەو دروست نیە کەسیش شووی پێ بکات، حەزرەتی عومەر(رەزای خوای لێ بێ) هەرکەسێك بمردایە پارەی هەبووبێت و حەجی نەکردبێت نوێژی مردووی لەسەر نەکردووە.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ لِّلْمُكَذِّبِينَ ۝١٠ الَّذِينَ يُكَذِّبُونَ بِيَوْمِ الدِّينِ ﴾[1]

واتە: هاوار لەورۆژەدا بۆ ئەوانەی باوەڕیان نییە، ئەوانەی ڕۆژی جەزادانەوە بە درۆ ئەزانن و باوەڕی پێناکەن.

لێرەدا درۆزنەکانی دیاری کردووە، ئەوانەی بەکردارو گوفتار درۆ دەکەن، کەسی بێ باوەڕ ڕۆژی دوایی نیە خەڵکانێك هەن بڕوایان بەڕۆژی دوایی هەیە بەڵام نوێژ ناکەن و زەکات نادەن و مامەڵە بەسو دەکات مەی دەخواتەوە قومار دەکات فێڵ لەخەڵکی دەکات لەم دەدات و جنێو بەو دەدات ئەوە بەدرۆخستنەوەی ڕۆژی دواییە و تەنها بانگەشەیەکە بەزمان.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ ﴾[2]

﴿ وَقُلِ اعْمَلُوا ﴾[3] واتە: پێیان بڵێ: چی ئەکەن بیکەن.

ئەمە پایەیەکە لەپایەکانی ئیمان ئەویش باوەڕهێنانە بەخواو بەڕۆژی دوایی، ئەوەی باوەڕ بێنێت وکاری بۆ نەکات وەکو کەسێکی سنورشکێن ئەژمارد دەکرێت ئەوەتا خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ الَّذِينَ يُكَذِّبُونَ بِيَوْمِ الدِّينِ ۝١١ وَمَا يُكَذِّبُ

---

١- المطففين: ١٠ – ١١

٢- البقرة: ٢٥

٣- التوبة: ١٠٥

﴿بِهِۦٓ إِلَّا كُلُّ مُعْتَدٍ أَثِيمٍ﴾[1] واته: ئەوانەی ڕۆژی جەزادانەوە بە درۆ ئەزانن و باوەڕی پێناکەن. ئەو ڕۆژەیش بە درۆ نازانێ هەموو مرۆیەکی لەحەقلادەری تاوانبار نەبێ.

واتە سنوری خواو فەرمانەکانی بەزاندووە: ﴿إِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِ ءَايَٰتُنَا قَالَ أَسَٰطِيرُ ٱلْأَوَّلِينَ﴾[2] واتە: کە ئایەتەکانی ئێمەی بەسەرا ئەخوێنرێتەوە ئەڵێ: ئەمە ئەفسانەی پێشینانە.

ئەوەشی حەق بەناحەق بزانێت ناحەقیش بەحەق ئەوانە لەخوا دابڕاون:

﴿كَلَّآ إِنَّهُمْ عَن رَّبِّهِمْ يَوْمَئِذٍ لَّمَحْجُوبُونَ ۝١٥ ثُمَّ إِنَّهُمْ لَصَالُوا۟ ٱلْجَحِيمِ﴾[3] واتە: ئەمانە لەو ڕۆژی قیامەتەدا ڕێیان لێ ئەگیرێ کە وەك موسوڵمانان خوای خۆیان ببینن. پاش ئەمەیش ئەوانە ئەچنە ناو دۆزەخ و بە ئاگری دۆزەخ ئەسووتێنرێن.

پلەی خواری خوارەوە: ﴿ثُمَّ يُقَالُ هَٰذَا ٱلَّذِى كُنتُم بِهِۦ تُكَذِّبُونَ﴾[4] واتە: جا پێیشیان ئەوترێ: ئەم دۆزەخە ئەوەیە باوەڕتان پێ نەئەکردو بە درۆتان ئەزانی.

پێغەمبەر ﷺ لەفەرمایشتێکدا دەفەرموێت: (ئەرێ پێتان نەڵێم کێ ئەهلی ئاگرە؟ هەموو دڵ ڕەقێکی بەفیزو دەعیەی ستەمکار)[5]. (العتل) واتە ئەوەی دەستدرێژی دەکاتە سەر مافی خەڵکی، (الجواظ) دڵ ڕەق و کەللە ڕەق خۆبەگەورەزان، کەسی دڵ ڕەق و زمان پیس ناچنە بەهەشتەوە.

---

١- المطففين: ١١ - ١٢
٢- المطففين: ١٣
٣- المطففين: ١٥ - ١٦
٤- المطففين: ١٧
٥- رواه البخاري

لەڕەحمەتی خوا بۆ باوەڕداران پێغەمبەرێکی بەبەزەیی و میهرەبانە خوای گەورە پێی دەفەرموێت: ﴿وَلَوۡ كُنتَ فَظًّا غَلِيظَ ٱلۡقَلۡبِ لَٱنفَضُّواْ مِنۡ حَوۡلِكَ﴾[1] واتە: خۆ ئەگەر ئینسانێکی توندخوو بوویتایە بڵاوەیان لێ ئەکردو لێت دوور ئەکەوتنەوەو ئەڕۆیشتن بەم لاولادا.

لە فەرمودەیەکدا هاتووە دەفەرموێت: (خوای گەورە سزای بەندەکانی نادات مەگەر ئەوانە نەبێت کە کەللە ڕەق و هەڵگەڕاوەیە لەخوا)[2]. واتە ئەو نغرۆ بووەی کە لەسەر نکوڵی کردن سورەو لەخوا هەڵدەگەڕێتەوەو ئامادە نیە بڵێت (لا إله إلا الله) خۆی لەوە بە گەورەتر دەزانێت لە دنیادا لەسەر وشەی یەکتاپەرستی بێت.

## بەهەشت ڕەحمەتێکی جێگیرە:

تێبینی بکە ژمارەی ئەو ئایەتانەی باس لەڕۆژی دوایی دەکەن (٢٣٧٩) ئایەتە لەکۆی ژمارەی ئایەتەکان کە (٦٢٣٦) ئایەتە، ژمارەی ئایەتەکانی ڕەحمەتی خوایی هەمان ژمارەی ئایەتەکانی سزایە (٢١٣) ئایەتە.

خوای بالادەست لێخۆشبوو میهرەبانە سزاشی زۆر توندە، لێخۆشبووە لەبەندە بڕوادارەکان، وە سزای توندە بۆ ئەوانەی پشت دەکەنە یادکردنەوەو پەرستشی.

خوای گەورە لەسورەتی (الصافات)دا باسی ڕابواردنی بەهەشتیەکان دەکات:

---

١- آل عمران: ١٥٩

٢- سنن ابن ماجة

﴿ أُوْلَٰٓئِكَ لَهُمْ رِزْقٌ مَّعْلُومٌ ﴿٤١﴾ فَوَٰكِهُ وَهُم مُّكْرَمُونَ ﴿٤٢﴾ فِي جَنَّٰتِ ٱلنَّعِيمِ ﴿٤٣﴾ عَلَىٰ سُرُرٍ مُّتَقَٰبِلِينَ ﴿٤٤﴾ يُطَافُ عَلَيْهِم بِكَأْسٍ مِّن مَّعِينٍ ﴿٤٥﴾ بَيْضَآءَ لَذَّةٍ لِّلشَّٰرِبِينَ ﴿٤٦﴾ لَا فِيهَا غَوْلٌ وَلَا هُمْ عَنْهَا يُنزَفُونَ ﴿٤٧﴾ وَعِندَهُمْ قَٰصِرَٰتُ ٱلطَّرْفِ عِينٌ ﴿٤٨﴾ كَأَنَّهُنَّ بَيْضٌ مَّكْنُونٌ ﴿٤٩﴾ فَأَقْبَلَ بَعْضُهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ يَتَسَآءَلُونَ ﴿٥٠﴾ قَالَ قَآئِلٌ مِّنْهُمْ إِنِّي كَانَ لِي قَرِينٌ ﴿٥١﴾ يَقُولُ أَءِنَّكَ لَمِنَ ٱلْمُصَدِّقِينَ ﴿٥٢﴾ أَءِذَا مِتْنَا وَكُنَّا تُرَابًا وَعِظَٰمًا أَءِنَّا لَمَدِينُونَ ﴾[1]

**واتە: ئەوانە ڕۆزییەکی دیاری کراویان لە لایەن خواوە بۆ هەیە. ڕۆزییەکەیان بریتییە لە میوەجات و قەدریان لێ ئەگیرێ. لە بەهەشتی نازو نیعمەتا. لە سەر تەختێ بەرانبەر بەیەك. پیاڵەی شەرابی سافیان بەسەرا ئەگێڕن. شەرابەکەی بەسەریانا ئەگێڕن سپییەو مایەی لەزەت و خۆشییە بۆ ئەو کەسانەی ئەیخۆنەوە. نە هیچ گێژوگرفتێکی پێوەیە وەك شەرابی دنیاو، نە ئەو کەسەی پێ سەرخۆش ئەبێ کە ئەیخواتەوە. حۆریگەلی وایشیان لایە کە چاویان تەنها بڕیوەتە مێردەکانیان و چاوڕەشن. ئەڵێی هێلکەی داپۆشراون کە گەردی لێ نەنیشتبێ. دوای خواردنەوەی شەرابەکەیان هەندێکیان ڕووئەکەنە لای هەندێکیان و لە یەکتری ئەپرسن. یەکێکیان لەناو قسەدا بە یەکێکیان ئەڵێ: من لە دنیادا هاوڕێیەکم هەبوو. پێی ئەوتم: ئایا تۆ لەوانەی باوەڕ بە قسەی ئەو پێغەمبەرە ئەکەن لە بارەی زیندووبوونەوەوە لە پاش مردن؟ ئایا ئێمە کە مردین و بووین بە خۆڵو ئێسقان، ئایا ئێمە زیندووئەکرێینەوەو جەزامان ئەدرێتەوە؟**

**بەهەشتیەکان بۆ گفتوگۆو هۆگربوونی یەك و کەمەندکێشکردنی یەکتر بۆ قسەکانیان، لەسەر کورسی ڕازاوە لەبەرامبەر یەکەوە دانیشتون و تەماشای**

---

[1] - الصافات: ٤١ - ٥٣

یەکتر دەکەن و سەلام لە یەکتر دەکەن. یەکێکیان ژیانی دنیای بیردەکەوێتەوە و دێتە پێش چاوی، لەبەردەمیدا نوێ دەبێتەوەو بەچاوی سەر دەیبینێت، وەکو وتمان خەڵکی نوستون کاتێك مردن، بەئاگا دێن و لەهەموو شتێك تێ دەگەن هەرچی ڕاستی شتەکان و ناوەڕۆکیان هەیە پێیان دەوترێت.

ئینجا دەکەونە قسەکردنی ڕوون و ڕاشکاو لەگەڵ یەك، یەکێکیان دەڵێت: لەدنیادا نزیکێکم هەبوو، ئایا مەبەستی لەئادەمیزادی وەکو خۆی، یان پەری؟ ئەوەی ڕێگای خێر بگرێتەبەر ئەوا نزیکەکەی فریشتەیە بەڵام ئەوەی ڕێگەی شەڕ بگرێتەبەر ئەوا نزیکەکەی شەیطانە، دیارە شەیطانی ئادەمی هەیەو شەیطانی پەری هەیە.

کاتێك تۆ لەماڵەکەت دێیتە دەرەوە لەبەر دەرگاکەتدا فریشتەو شەیطانیش وەستاون، هەڵبژاردنیان بەدەست خۆتە، فریشتەکە ئاڵایەکی بەرزکردۆتەوە شەیطانیش بەهەمان شێوە، ئەگەر ڕێگای خێرت گرتبێتە بەر ئەوا فریشتەکە ڕێگات بۆ ڕووناك دەکاتەوە، ئەو کاتە تۆ لەگەڵیدایت، بۆ خێرو چاکە نەبێت بانگ ناکات و هانت نادات هەرگیز پارێزگاری کردنی خواییت لەسەر لاناچێت. دڵنیابە کە تۆ خاوەن بڕیاریت و کلیلەکە بەدەست خۆتە.



# دەرگاكانی بەهەشت

بەهەشت چوار دەرگای هەیە:

١- دەرگایەك پەریەكانی بەهەشت و هاوسەری بڕواداران لێوەی دەچنە ژوورەوە.

٢- دەرگایەك هاوڕێكانی یەكتر كە خەڵكی چاك بوون لەدنیادا خۆشەویستی یەك بوون و بەرگرییان لەحەق كردووە.

٣- دەرگایەك بۆ بەڕێكردن.

٤- دەرگایەك بۆ منداڵە هەمیشە زیندووەكان كەدەبنە خزمەتكاری نێو بەهەشت لێوەی دەچنە ژورەوە. ﴿إِذَا رَأَيْتَهُمْ حَسِبْتَهُمْ لُؤْلُؤًا مَّنثُورًا﴾[1] واتە: ئەگەر بیبیانبینی وا ئەزانی مرواریی هەڵرژاون.

كەواتە فریشتەكان لەكام دەرگایەوە دێنە ژوورەوە؟ فریشتە لە هەموو دەرگایەكەوە دەچن بۆ لایان، ئەمەش بۆ پیرۆزبایی و مژدەپێدان و خۆشی و شادی دەخەنە دەروونی باوەڕداران.

گفتوگۆیان لەسورەتی (الصافات)دا: ﴿أَءِذَا مِتْنَا وَكُنَّا تُرَابًا وَعِظَامًا أَءِنَّا لَمَدِينُونَ ﴿٥٣﴾ قَالَ هَلْ أَنتُم مُّطَّلِعُونَ ﴿٥٤﴾ فَاطَّلَعَ فَرَآهُ فِي سَوَاءِ الْجَحِيمِ ﴿٥٥﴾ قَالَ تَاللَّهِ إِن كِدتَّ لَتُرْدِينِ ﴿٥٦﴾ وَلَوْلَا نِعْمَةُ رَبِّي لَكُنتُ مِنَ الْمُحْضَرِينَ﴾[2] واتە: ئایا ئێمە كە مردین و

---

١- الإنسان: ١٩

٢- الصافات: ٥٣ - ٥٧

بووین بە خۆڵو ئێسقان، ئایا ئێمە زیندووئەکرێینەوەو جەزامان ئەدرێتەوە؟ وتی: ئایا ئێوە تەماشای ئەهلی دۆزەخ ئەکەن و بۆیان ئەڕوانن تا بزانن ئەو شەخسەی لە دنیادا برادەرم بوو و وای پێ ئەوتم، ئێستا لە دۆزەخدا لە چ شوێنێکایە؟ جا سەیری کردن، واتە: سەیری دۆزەخییەکانی کردو، ناسراوەکەی خۆی دی لە ناوەڕاستی دۆزەخا. جا ئەم شەخسە بەهەشتییە بە کۆنەبرادەرە ئێستا دۆزەخییەکەی خۆی وت: قەسەم بە خوا نزیك بوو بمفەوتێنی و ببی بە هۆی کافربوونم. ئەگەر نیعمەتی خوای خۆم نەبوایە منیش یەکێك ئەبووم لەوانەی ئامادەی ناو دۆزەخ کراون.

فریشتە بەکەسی باوەڕدار دەڵێت: ﴿أَءِنَّكَ لَمِنَ ٱلْمُصَدِّقِينَ﴾[1] واتە: پێی ئەوتم: ئایا تۆ لەوانەی باوەڕ بە قسەی ئەو پێغەمبەرە ئەکەن لە بارەی زیندووبوونەوەوە لە پاش مردن؟

کاتێك باوەڕدار گوێی لەدەنگی قسەکەرەکەی دەبێت لەدنیادا نکۆڵی لە زیندوبوونەوەو سزا دەکات دەڵێت: خەریك بوو لەناوم بەریت، پاشان ئەو نیعمەتانەی بیردەکەوێتەوە کە لەگومڕایی ڕزگاری کرد سەیری هاوڕێکەی دەکات لەدۆزەخدا دەیبینێت سزا دەدرێت.

دەلاقەیەك هەیە بەهەشتیەکان لێوەی سەیری دۆزەخیەکان دەکەن کەچۆن نیعمەتەکان لەسەر دۆزەخیەکان هەڵدەگیرێن و دۆزەخیش لەسەر خەڵکی خاوەن نیعمەتەکان هەڵدەگیرێن:

﴿فَضُرِبَ بَيْنَهُم بِسُورٍ لَّهُۥ بَابٌۢ بَاطِنُهُۥ فِيهِ ٱلرَّحْمَةُ وَظَٰهِرُهُۥ مِن قِبَلِهِ ٱلْعَذَابُ﴾[2] واتە: ئا لەوکاتەدا شوورەیەك لەنێوان ئەوان و خاوەن باوەڕەکانا دروست ئەکرێ

---

١- الصافات: ٥٢

٢- الحديد: ١٣

دەرگایەکی هەیە ئەوسیوی لەبەرچاو نەبووی دەرگاکە ڕەحمەتی خوای تیایە چونکە سیوی بەهەشتەو، سیوە سیارەکەی کە لای کافرەکانەوەیە سزاو عەزابی تیایە چونکە سیوی دۆزەخە.

## خۆراکی دۆزەخیەکان:

﴿أَفَمَا نَحْنُ بِمَيِّتِينَ ﴿٥٨﴾ إِلَّا مَوْتَتَنَا الْأُولَىٰ وَمَا نَحْنُ بِمُعَذَّبِينَ ﴿٥٩﴾ إِنَّ هَٰذَا لَهُوَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ ﴿٦٠﴾ لِمِثْلِ هَٰذَا فَلْيَعْمَلِ الْعَامِلُونَ ﴿٦١﴾ أَذَٰلِكَ خَيْرٌ نُّزُلًا أَمْ شَجَرَةُ الزَّقُّومِ ﴿٦٢﴾ إِنَّا جَعَلْنَاهَا فِتْنَةً لِّلظَّالِمِينَ ﴿٦٣﴾ إِنَّهَا شَجَرَةٌ تَخْرُجُ فِي أَصْلِ الْجَحِيمِ ﴿٦٤﴾ طَلْعُهَا كَأَنَّهُ رُءُوسُ الشَّيَاطِينِ ﴿٦٥﴾ فَإِنَّهُمْ لَآكِلُونَ مِنْهَا فَمَالِئُونَ مِنْهَا الْبُطُونَ﴾[1]

واتە: جا توخوا بەڕاست ئێمە لەوانە بووین کە نەمرین. تەنها مردنی یەکەممان نەبێ و، لە قیامەتا سزامان نەدرێ؟ بەڕاستی سەرکەوتنی گەورە ئەم باوەڕیەخواو بەڕۆژیدواییکردنو ڕزگاربوون لە ئاگری دۆزەخەیە. دەسا با ئەوانەی کار ئەکەن، کار بۆ ئامانج و مەبەستی وا بکەن. ئایا بەهەشت و نازو نیعمەتی بەهەشت ماواو مەنزڵی چاکە، یا درەختی زەققووم کە لە بەرەکەی بخۆی؟ ئێمە ئەو درەختەمان کردووە بە مایەی سەرلێشێوانی کافرەکان کە خۆیان بەوە کافر ئەکرد ئەیانوت درەخت چۆن لەناو ئاگری دۆزەخا ئەڕوێ و سەر دەردێنێ؟ زەققوومیش درەختێکە لە بێخی دۆزەخەوە ئەڕوێ و سەر دەردێنێ. هێشووی ئەو درەختی زەققوومە لە ناشیرینییا لە سەلکە شەیتان ئەچێ. بەڕاستی ئەهلی دۆزەخ لە بەری ئەو درەختە ئەخۆن و ورگی خۆیانی لێ هەڵئاوسێنن و پڕی ئەکەن.

---

١- الصافات: ٥٨ - ٦٦

ئەوە باوەڕدارە دەترسێت جارێکی تر بگەڕێتەوە بۆ دنیاو لەنیعمەتـەکان بـێ بـەش بکرێـت بـەڵام فریشـتەکان دڵنیایـان دەکەنـەوە بـەوەی بـۆ هەمیشـە لەبەهەشتدا دەمێننەوە، ئەمەش گەورەترین بردنەوەیە.

بەڵام بۆ دۆزەخیەکانیش و درەختـی زەقـوم کـە لـەبنی دۆزەخـەوە دەڕوێـت خوای گەورە کردویەتیـە بـەڵا بۆ کـێ؟ بـەڵا بـۆ نموونـەی وەکو عـەمری کـوڕی هیشام (ئەبو جەهل) و (ئەبو لەهەب)، ئەبو جـەهل دەربـارەی درەختـی زەقـوم وتویەتی: وەکو خورمای کەپس کراوی یەثریب وایە دەیخۆین و زۆر ئاسان قـوت دەدرێـت. گاڵتــە بــەدرەختی زەقــوم دەکــەن، ئــەوە چ بەڵایەکــە، دەخرێتــە بەردەستیان و چێژ لەگەرمیەکەی وەردەگرن، هەر کـە لێیـان خـوارد لـە بینیـان دەگیرێت چونکە دڕکە، کاتێکیش دەستی درێژ دەکات هـەتا بیگرێـت و هەسـتی برسـیەتی لـەخۆی دەربکـات گۆشـتی دەستیشـی هەڵـدەوەرێت لەبـەر زۆری گەرمیەکەی، خۆی وا لێ دەکات کە تێری خـواردووە، چـەندێك بەتەوسـەوە لێـی بخوات هەستی برسیەتی زیاتر دەبێت، ژیانی بەم شێوەیە دەباتە سەرو بـەدوای خەیاڵ یاخود تراویلکەدا دەڕوات و پێی ناگات.

ئەمەش سزایەکە لەگەڵیاندایە نە لێی جیادەبنەوە نـە لێیـان جیـا دەبێتـەوە، بەری ئەم درەختە لەسەری شـەیطانـەکان دەچێت. کـەس لـەئێوە شـەیطانـی بینیوە؟

نەخێر... ئەی بۆچی خوای باڵادەسـت وێنـای شـتێکی کـردووە کـەئادەمیزاد لەڕۆژی دوایدا سزای وای نەبینیوە هـەروەها لـەدنیادا (سـەری شـەیطانـەکان؟) ئێمە وێنـەی شـەیطـان بەناشـرینترین شـێوە دەبیـنین، هەرکەسـەو بەوێنەیـەکی جیاواز لەوی تر دەیبینێت.

ئێمـە ئەگـەر پێشـبڕکێیەکی وێنەکێشـانی شـەیطـان ئـەنجام بـدەین، ئـەوا هەریەکەیان بەشێوەیەکی جیاواز لەناشرینی وێنەی دەکێشن، ئەمە باسی وێنـەو

وێکچواندنه لەزمانی عەرەبدا هەیە. ئـەوەتا (امـرؤ القـیس) باسـی غـۆلی کـردووە کەگیاندارێکی خەیاڵیەو بوونێکی ڕاستەقینەی نیە، بـەڵام لەئەندێشـەی خەڵکیـدا بوونی هەیە وە هەر ئەمەش داواکراوە، إمرؤ القیس دەڵێت:

أیقـتلني والمشرفـي مُضَاجـعي وأسنـــانه زُرْق كـأنيـــاب أغـــوال

هــەر لــەم ڕووەوە دەربـارەی (جـاحظ) کەنوسـەرێکی بەناوبانگـە، جارێـك دانیشـتبوو ئـافرەتێکی جـوان بەلایـدا تێپـەڕی داوای لێ کـرد هاوڕێیـەتی بکـات جاحظیش بەگوێی کردو پرسیاری نەکرد، بردی بۆ بازاڕ بۆ دوکانی زەڕەنگـەرێك بەکابرای خاوەن دوکانی وت: وەکو ئەمـە، پاشـان ڕۆشـت! جاحظ زۆر سـەری سوڕما لەو کارەی و هیچ تێنەگەشت، کاتێك ئافرەتەکە ڕۆیشـت، پرسـیاری لـە پیاوەکە کرد: مەبەستی لەچی بوو؟ وتی: ئەم ئافرەتە پێش کەمێك هات بـۆ لام پێی وتم لەسەر ئەم ئەنگوستیلەیە وێنەی شەیطانم بۆ بکێشـە، منـیش پـێم وت: خانمەکەم من هەرگیز شەیطانم نەبینیوە هـەتا وێنـەی بکێشـم، ئـەوەبوو ڕۆشـت هەتا تۆی هێناو وتی وەکو ئەمە بێت!. لەبەرئەوەی کەسێکی ناشـرین و ڕیوەڵـە بوو لەبەر زۆر خوێندنەوەی چاوی دەرپەڕیو بوو.

ئەم درەختی زەقومە بەکێم و جەرەتاو ئاو دەدرێت، ئیتر چی دەگرێـت جگـە لەبەرێك لەسەری شەیطانەکان بچێت.

## هۆکارەکانی گومڕابوون و بەدیهاتنی سزا:

خـوای گـەورە دەفـەرموێت: ﴿ ثُمَّ إِنَّ مَرْجِعَهُمْ لَإِلَى الْجَحِيمِ ﴿٦٨﴾ إِنَّهُمْ أَلْفَوْا آبَاءَهُمْ ضَالِّينَ ﴿٦٩﴾ فَهُمْ عَلَىٰ آثَارِهِمْ يُهْرَعُونَ ﴿٧٠﴾ وَلَقَدْ ضَلَّ قَبْلَهُمْ أَكْثَرُ الْأَوَّلِينَ ﴾[١] واتـــە: پـاش ئەمـەیش بەڕاسـتی سـەرەنجامیان بـۆ دۆزەخـەو بـۆ ئـەوێ ئەگێڕرێنـەوە.

---

١- الصافات: ٦٨ - ٧١

ئەمانە باوك و باپیرانی خۆیانیان بە گومڕایی دیوە. جا بۆیە ئەوانیش بە هەڵەداوان شوێن پێی ئەوان هەڵئەگرن. بەڕاستی، پێش ئەوانیش بەشی زۆری خەڵکە پێشینەکان گومڕا بوون.

بێ باوەڕان لەسەر ڕەویەی باوانیان ڕۆشتن و شوێنی بیروباوەڕیان کەوتن و بەژیری خۆیان بیریان نەکردەوە بەڕاستی ئەوانە کۆمەڵێکن هەرگیز هۆشمەند نابن باوو باپیرانیان لەسەر چەند باو و نەریتێك بوون ئەمانیش لەسەری ڕۆشتون و نەیانگۆڕی بەڵکو شوێنی کەوتن دیارە شوێنکەوتنی کوێرانە واتە لەدەستدانی ژیری و هۆشمەندی دیارە پاداشتیان ئاگر دەبێت و بۆ هەمیشە تیایدا دەمێننەوە.

قورئان ئەم بێ باوەڕە سەرسەختانەی ئاگادار کردۆتەوە کەخۆی ژیریی و تێگەشتنی پێ بەخشیون بەڵام ئەوان هەر گومڕایی و شوێنکەوتنی کوێرانەیان ویست، قورئانیش پێیان دەفەرموێت ئەگەر باوانتان خاوەنی ژیریی و هۆش نەبوون ڕێنموییان نەدەویست ئەی نەدەبوو لەڕویاندا بوەستنەوەو شوێن ئەو ڕێنموییە بکەون کە لە پەروەردگارتانەوە هاتووە!

ئەم باو و نەریتانە زاڵن بەسەر دەروونەکاندا، بەڵام دەبێت لەبەرامبەریدا بوەستین، دەبێت گفتوگۆی لەسەر بکەین، ڕاستەکەی وەربگرین و واز لەهەڵەو خراپەکانی بهێنین و فڕێی بدەینە پشتی خۆمان، ئەم خووانە زاڵن بەسەر پەرستشەکاندا لەمڕۆدا لەنێو ئێمەی موسوڵماندا بوونی هەیە، سەیری زاڵبوونی دەسەڵاتداری هۆز بکە چەندێك بەسەر دەروونی شاعیری دێرینی عەرەبدا زاڵ بووە کەدەڵێت شوێن هۆزەکەم (غُزَيَّة) دەکەوم هەرچیەك بکات و لەهیچ شتێکدا پێچەوانەی ناجوڵێمەوە ئەگەر چاك بێت یان خراپ:

وما أنا إلا من غُزَيَّةَ إن غَوَتْ     غويت، وإن ترشد غُزَيَّةُ أرْشُدَ

بۆیە دەبێت ئادەمیزاد لەدەسەڵاتی باو و نەریت و خووەکان کە لەباوو باپیریەوە بۆی ماوەتەوە جیابێتەوەو بڕوات بەرەو دەسەڵاتی ژیری و ڕێنمویی خوای بەندەکان، لەبەرئەوە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: (هەمووتان دەچنە بەهەشتەوە ئەوانە نەبێت کە نایانەوێت وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا کەس هەیە نەیەوێت بچێتە بەهەشتەوە. پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەوەی گوێڕایەڵیم بکات دەچێتە بەهەشتەوە ئەوەشی سەرپێچیم بکات ئەوەیە نەیویستووە)[1].

ڕەحمەتی خوا بەرفراوانە: ﴿وَرَحْمَتِي وَسِعَتْ كُلَّ شَيْءٍ﴾[2] خوای گەورە لەدنیادا دایناوە بۆ باوەڕداران.

## خەسڵەتی بەهەشتیەکان:

ڕەحمەتی خوا پێش توڕەبوونی کەوتووە، خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿وَيَحْمِلُ عَرْشَ رَبِّكَ فَوْقَهُمْ يَوْمَئِذٍ ثَمَانِيَةٌ﴾[3]

ئەم فریشتانە تەنها یادی خوای گەورە لەسەر زمانیانە، هەر دەڵێن: سبحانك سبحانك لەئارام و هێمنیت لەدوای زانینت، سبحانك سبحانك لە لێبوردەیت لەدوای تواناو دەسەڵاتت.

ئەگەر گوناه نەکەن خوای گەورە لاتان دەبات و دروستکراوێکی نوێتر دێنێت هەتا گوناه بکەن و داوای لێخۆشبوون بکەن و لێیان خۆش بێ، بەڵام جیاوازی هەیە لەنێوان ئەوەی بەبێ ئاگایی و بێ مەبەست دەکەوێتە گوناهەوە، لەگەڵ ئەوەی بەویستی خۆی گوناه دەکات، وە جیاوازی هەیە لەنێوان ئەو کەسەی گوناهێك دەکات خێرا پەشیمان دەبێتەوەو دەگری بۆی و تەوبە دەکات و خوای

---

١- رواه البخاري.
٢- الأعراف: ١٥٦
٣- الحاقة: ١٧

گەورەش لەڕۆژی دواییدا لێی خۆش دەبێت، لەگەڵ ئەو کەسەی گوناهو سەرپێچیەکانی لەنێو خەڵکیدا ئاشکرا دەکات و زۆران لەگەڵ خوادا دەگرێت بەگوناهو سەرپێچی.

ئەم فریشتانە داوای لێخۆشبوون دەکەن بۆ ئەوانەی باوەڕیان هێناوە لەگەڵ پەرستش کردن بۆ خواو بەپیرۆز ڕاگرتنی، وە کۆمەڵێك فریشتەی گەڕۆك هەن لەسەر زەوی کە بەدوای کۆڕی زیکرو زانستدا دەگەڕێن، کاتێ کۆڕێکیان بینی یادی خوا دەکەن لەگەڵیان دادەنیشن، کاتێ ئەو کۆڕە بڵاوەی لێ دەکەن ئەوانیش سەردەکەونەوە بۆ ئاسمان، ئینجا خوای باڵادەست لێیان دەپرسێت ـ لەکاتێکدا ئەو خۆی لەوان چاکتر دەزانێ لەکوێوە هاتون ـ دەفەرمووی: ئەی فریشتەکانم بەندەکانم خەریکی چی بوون؟ دەڵێن: پەروەردگارا تۆ خۆت زانای بە حاڵی ئەوان، بەندەکانت یادی تۆیان دەکردو "سبحان الله، الحمدلله، الله أكبر"یان دەکرد. خوای گەورە دەفەرموێت: داوای چی دەکەن؟ دەڵێن: بەهەشت. خوای گەورە دەفەرموێت: ئایا بینیویانە؟ دەڵێن: نەخێر. پەروەردگار دەفەرموێت: جا ئەوە چۆن دەبوو ئەگەر بەهەشتەکەمیان ببینیایە؟ دەڵێن: ئەوا زیاتر داوایان دەکرد و سوردەبوون لەسەر داواکەیان.

خوا دەفەرمووی: ئەی بەندەکانم پەنا بەکێ دەگرن؟ دەڵێن: پەنا بەتۆ دەگرن لە ئاگر. خوا دەفەرمویێ: ئایا بینیویانە؟ دەڵێن: نەخێر. خوا دەفەرمووی: جا چۆن دەبوو ئەگەر ئاگرەکەیان ببینیایە؟ دەڵێن: زیاتر ڕایان دەکرد لێی. فریشتەکان بەخوای گەورە دەڵێن: ئەی پەروەردگار فڵانە کەسیان تیایە کە لەوان نی‌یە، بەڵام لەبەر پێویستی‌یەك لەگەڵیان دانیشتووە! خوای گەورە دەفەرموێت: ئەوانە کۆمەڵێکن ئەوەی دانیشتووە لەگەڵیان بەدبەخت نابێت.

وە لەفەرمودەدا هاتووە کە خوای گەورە بەدانیشتن لە کۆڕێکی زانستدا گوناهی (٧٠) کۆڕی خراپەی پێ دەسڕێتەوە: ﴿أَلَا بِذِكْرِ ٱللَّهِ تَطْمَئِنُّ ٱلْقُلُوبُ﴾[1] واتە: بێگومان دڵ هەر بە یادی خودا دائەمەزرێو لە دڵەڕاوکێ ئەکەوێ.

نەفس پاك دەبێتەوەو، بەنوری ئیمان دەدرەوشێتەوەو، مرۆڤ بەلێخۆشبوونی خوا بەختەوەر ئەبێت.

پێغەمبەری ئازیز داوای لەئوممەتەکەی کردووە کە هەموو کۆڕەکانیان بۆ خواپەرستی و بەندایەتی بێت، چۆن؟ ئەمە بەوە دەبێت مافی تەواو بدەین بەڕێبازەکەمان، چۆن ئەی پێغەمبەری خوا؟ فەرمووی: بەچاوداخستن لەئاستی حەرامدا، وەڵامدانەوەی سڵاو و، لابردنی ئازارو فەرمان بەچاکەو ڕێگری لە خراپە.

## جۆرەکانی سزا لەدۆزەخدا:

خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿خُذُوهُ فَغُلُّوهُ ﴿٣٠﴾ ثُمَّ ٱلْجَحِيمَ صَلُّوهُ ﴿٣١﴾ ثُمَّ فِي سِلْسِلَةٍ ذَرْعُهَا سَبْعُونَ ذِرَاعًا فَٱسْلُكُوهُ﴾[2] ئەمە زنجیرێکی درێژە، درێژی بالای مرۆڤیش لەڕۆژی دواییدا جیاوازە لەو درێژی بالایەی لە دونیادا هەیبوە، لێوی ئەو کەسەی لە ئاگردا سزا دەدرێت شۆڕ دەبێتەوە تا دەگاتە ناوکی و لێوی سەرەوەی بەرز دەبێتەوە تا قژی سەری دادەپۆشێ و خڕێکانی وەکو کێوی ئوحود وایە ...... هەموو ئەمانە سزا دەچێژن.

---

١- الرعد: ٢٨

٢- الحاقة: ٣٠ – ٣٢

لەسورەتی (النازعات)دا دەفەرموێت: ﴿ وَبُرِّزَتِ ٱلْجَحِيمُ لِمَن يَرَىٰ ﴾[1]

(وَبُرِّزَتِ ) فرمانێکە شەددەی لەسەرە، لەبەرئەوەی هاوەڵدانەران بە سەرپێچیەکانیان زۆرانیان لەگەڵ خوادا دەگرت، (بُـرِّزَت) دەردەخرێت لەبەرئەوەی هەندێك لەسزاو ئەشكەنجە دراوەكان لەڕۆژی قیامەتدا بەكەڕو لاڵ و كوێر حەشر دەكرێن، بەلاڵانەوە سكاڵا دەكا:

﴿ قَالَ رَبِّ لِمَ حَشَرْتَنِيٓ أَعْمَىٰ وَقَدْ كُنتُ بَصِيرًا ﴿١٢٥﴾ قَالَ كَذَٰلِكَ أَتَتْكَ ءَايَٰتُنَا فَنَسِيتَهَا ۖ وَكَذَٰلِكَ ٱلْيَوْمَ تُنسَىٰ ﴾[2] واتە: ئەویش ئەڵێ: خوایە بۆ بەكوێری حەشرت كردم لە كاتێكا من لە دنیادا چاوساغ و بینا بووم؟ . خوا فەرمووی: وامان پێ كردی چونكە لە دنیادا ئایەتی ئێمەت بۆ هات كەچی فەرامۆشت كردو گوێت نەدایێ، تۆیش هەروا ئەمڕۆ لە بەرچاو ئەكەویو فەرامۆش ئەكرێی.

دڵتان كوێر بووە لەنوری ئیمان ئەوا پاداشتتان ئەوەیە بەكوێری زیندوو بینەوە، گوێی خۆت لەحەق و ڕاستی كەڕ كرد، ئەوا خوا بەكەڕی زیندوی كردویتەوە، ئەوە سزاو پاداشتێكی شایستەیە لەئەنجامی ئەوەی كە كردویانە.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ لَتَرَوُنَّ ٱلْجَحِيمَ ﴾[3]

بەدڵنیاییەوە ئەو كارە دەبینن، گوتارەكە بۆ هەموانە، ئادەمیزاد كاتێك بەسەر پردی سیراطدا تێدەپەڕێت هەموو پلەكانی دۆزەخ دەبینێت، زۆر تاریكە، بەڵام خوای گەورە پیشانی دەدات، سەیری ئەبو جەهل دەكات جۆرەها سزا دەدرێت:

---

١- النازعات: ٣٦

٢- طه: ١٢٥ - ١٢٦

٣- التكاثر: ٦

﴿ ذُقۡ إِنَّكَ أَنتَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡكَرِيمُ ﴾[1]

سەرکۆنەو سوکایەتی پێ دەکرێت لەبەرئەوەی سەرۆکی گەلەکەی بوو لەدنیادا خەڵکی لەباوەڕداران هان دەدا بەڵام پلەو پایەو شوێنی لەنێو گەلەکەیدا لای خوا هیچ سودێکی پێ نەگەیاند، بەڵکو بوبووە بەڵا بەسەریەوە لەبەرئەوەی کردیە هۆکارێك بۆ جەنگان لەگەڵ خواو پێغەمبەرەکەی و هاندان بۆ هاوەڵدانان بۆ خوا.

خوارترین پلەی دۆزەخ شوێنی فیرعەون و هامان و گەلەکەیانە، هەروەها (أصحاب المائدة) خاوەن سفرەو مێز لەبەنی ئیسرائیل ئەوانەی داوایان لە حەزرەتی عیسا پێغەمبەر عليه السلام کرد سفرەو خوانێکیان لەئاسمانەوە بۆ دابەزێنرێ، کەئەویش لەخوای داواکردو دابەزی، بەڵام لەدوایدا هەر باوەڕیان بە خوا نەهێنا بۆیە خوای گەورە هەڕەشەی لێ کردن

﴿ قَالَ ٱللَّهُ إِنِّي مُنَزِّلُهَا عَلَيۡكُمۡۖ فَمَن يَكۡفُرۡ بَعۡدُ مِنكُمۡ فَإِنِّيٓ أُعَذِّبُهُۥ عَذَابٗا لَّآ أُعَذِّبُهُۥٓ أَحَدٗا مِّنَ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴾[2] واتە: خودا تکاکەی عیسای قبووڵ کردو وتی: وا ئەو خوانەی داواتان کرد بۆتان ئەنێرمە خوار. ئیتر هەرکام لە ئێوە پاش ئەوە کافر بوو و گوێی نەدایە ئامۆژگاریی پێغەمبەر سزاییێکی گران و توندوتیژی وەهای ئەدەم لە عالەمدا سزای کەس بەو جۆرە نادەم. ئەوەبوو ئەوانەی کافر بوون خودا پێستی مەیموون و بەرازی بە بەردا کردن کە کەس سزای وەها نەدراوە.

هەروەها (درك الاسفل) خوارترین پلەو جێگەی دوڕووەکان و سەرۆکەکەیانە عەبدوڵای کوڕی ئوبەی کوڕی سەلولە کە لەژێرەوە کوفرو بێ باوەڕی خۆی شاردبوویەوە لە پێغەمبەرو موسوڵمانان کەچی لەپشت پێغەمبەری خواوە

---

١- الدخان: ٤٩

٢- المائدة: ١١٥

نوێـژی دەکـردو خـۆی بەموسـوڵمان پیشـان دەدا خـوای گـەورە لەبەرامبـەر پێغەمبەرە بەڕێزەکەیدا ئاشکرای کردن.

* ئیسـلام هـانی داویـن لەسـەر ڕاسـتگۆیی، و درۆکردنـی لا ناشـرین کـردوین پێغەمبـەر ﷺ دەفـەرموێت: (ڕاسـتگۆیی بـەرەو چـاکەکردن و ڕێنمویـت دەبـات چاکەکردن بەرەو بەهەشت ڕێنمویـت دەکـات، کەسـێك ڕاسـتگۆ دەبێـت (کـە لـە قسەکانیدا ڕاستگۆیەو سورە لەسەری) هەتا لای خوا بەڕاسـتگۆ دەنوسـرێ، درۆ بەرەو خراپەکاریت دەبات خراپەکاریش بەرەو دۆزەخت دەبات، کەسێك هەر درۆ دەکات هەتا لای خوا بە درۆزن دەنوسرێ)[1]

* لەسـیفاتەکانی دووڕوو ئەوەیـە کـاتێ پەیمانیـدا نەیباتەسـەر بۆیـە خـوای گەورەش ئەو پەیمانەی پێی داوە بۆی بەدی ناهێنێت، پـەیمانی خـوا بەهەشـتە، واتە لە بەهەشت بێ بەشی دەکات لەپاداشتی ئەوەی پەیمانی نەبردۆتە سەر.

* لە سیفەتەکانی دووڕوو ئەوەیە کاتێ دوچاری شەڕێك بوو بەدزمان دەبێت، لە خوا ناترسـێ لەبەرامبـەر ئەوانـەی کـە لەگەڵیانـدا دەژی، کـاتێ سـەرەتاکانی دووبەرەکی دەرکەوت لەخوا ناترسێت و پـەیمانی خۆشەویسـتانی ناباتـە سـەرو مـافی هاوڕێکـەی نـادات و سەرپێچـی ئـەنجام دەدات بـەجۆرێك شـەرمەزاری ڕوخساری دەگرێت و شایستەی دەرکردن دەبێت لەڕەحمی خـواو بـێ بەشـبوون لەبەهەشت ئەوکاتە سزای ئاگر دەبێتە بەشی.

* یەکێکی تر لەسیفەتەکانی دووڕوو ئەوەیە کاتێك ئەمانەتێك درایـە دەسـتی ناپاکی لێدەکات، هەموو شتێك لەژیاندا ئەمانەتێکە، ئەمانەتی زارەکی و کردەیی ئەمانـەتی زمـان، درۆی پـێ نەکـەم و لەباسـی شـەرەفی خەڵکیـدا نـەی بزوێنم، ئەمانەتی دەست، بەکاری نەهێنم بۆ خراپەو ستەم لەخـەڵکی نەکـەم، ئەمانـەتی

---

١- رواه البخاري.

پێکـان، لەخراپـەدا نەیخەمـە ڕێ و حـەرامی پـێ ئـەنجام نـەدەم، ئەمانـەتی چاوەکان، سەیری حەرامی پێ نەکەین، ئەمانەتی گوێکان گوێ نـەگرم لـەدەنگی خراپ و بەدڕەوشتی و غەیبەت کردن و بوختان و باسی شەرمگای خەڵکی، ئەوە بزانین توندترین سزای ڕۆژی دوایی ئەوانەن کەجیایی و دووبەرەکی لەنێوان خۆشەویستاندا دروست دەکەن، وەکەسانی پاك و بێ تاوان تۆمەتبارو عەیبدار دەکەن.

کەواتـە هـەموو ئەنـدامێکی جەسـتە ئەمانەتێکـەو خاوەنەکـەی دەبێـت بەشێوەیەك بەکاریبهێنی کەخوا دەیەوێت، خوای گەورە ئەم ئەندامانـەی بـۆ ڕام کـردوین هـەتا لەخواپەرستی و گوێڕایـەڵی کردنـی فەرمانـەکانی و ڕازیکردنیـدا بـەکاری بێنێـت، ئەگـەر ئـەوەمان نـەکردو لەسەرپێچـی کردنـی خـواو گونـاهو بەدڕەوشتیدا بـەکارمان هێنـا ئـەوا ناپاکیمـان کـردووە. خـراپترین ناپـاکی ئـەو ناپاکیەیە لەبەرامبـەر خـوادا ئـەنجامی بـدەیت، خـراپترین دزی ئـەو دزیەیـە کـە لەنوێژەکانت بدزی واتە وەك دەنوکی کەڵەشێر ئەنجامی بدەیت دوور لەملکەچی و بیرکردنـەوەو نەپاراسـتنی زیندویـەتی نوێژەکـەت بۆیـە دەیپێچـن لـەجلێکی شڕوپڕو دەیدەنەوە بەنێو چـەوانیدا ئـەویش دەڵێـت منـت فەوتانـد خـوا لـەناوت بەرێت.

جیاوازی هەیە لەنێوان ئەوانەی تیایدا دەمێننەوەو ئەوانـەی کـە دەفـەرموێت بۆ هەمیشەیی تیایدا دەمێننەوە، ئەوەی یەکەمیان بـۆ یەکتاپەرسـتە سەرپێچـی کارەکانەو وادەیەکی دیاری کراوە، بەڵام بۆ هەمیشەیی لە دۆزەخدا مانـەوە بـۆ بێ باوەڕانە.

## کێن ئەوانەی شایستەی سزان:

**خوای گەورە لە سورەتی المطففين دا دەفەرموێت:**

﴿وَيۡلٞ لِّلۡمُطَفِّفِينَ ١ ٱلَّذِينَ إِذَا ٱكۡتَالُواْ عَلَى ٱلنَّاسِ يَسۡتَوۡفُونَ ٢ وَإِذَا كَالُوهُمۡ أَو وَّزَنُوهُمۡ يُخۡسِرُونَ﴾[1] واتە: هاوار بۆ ئەوانەی لە کێشانەو پێوانەدا زیادوکەم ئەکەن. ئەوانەی کە شتی خەڵکیان بۆ خۆیان پێوا بەتەواوی حەقی خۆیان وەرئەگرن. کە شتیشیان بۆ ئەوان پێوا یا کێشا زەرەریان لێ ئەدەن و کەمیان بۆ دائەنێن. (ویل) ناوی شیوێکە لەدۆزەخ. خوا گەورە دەفەرموێت:

﴿كَلَّآ إِنَّ كِتَٰبَ ٱلۡفُجَّارِ لَفِي سِجِّينٖ ٧ وَمَآ أَدۡرَىٰكَ مَا سِجِّينٞ ٨ كِتَٰبٞ مَّرۡقُومٞ ٩ وَيۡلٞ يَوۡمَئِذٖ لِّلۡمُكَذِّبِينَ ١٠ ٱلَّذِينَ يُكَذِّبُونَ بِيَوۡمِ ٱلدِّينِ ١١ وَمَا يُكَذِّبُ بِهِۦٓ إِلَّا كُلُّ مُعۡتَدٍ أَثِيمٍ﴾[2]

واتە: با ناتەواوپێوو ناتەواوکێشەکان دەسبەرداری ئەم کارە خراپەیان ببن، سیاهەی کردەوەی پیاوخراپان لە (سیججین) دایە. تۆ چوزانی سیججین چییە؟ کتێبێکی نووسراوە. هاوار لەوڕۆژەدا بۆ ئەوانەی باوەڕیان نییە، ئەوانەی ڕۆژی جەزادانەوە بە درۆ ئەزانن و باوەڕی پێناکەن. ئەو ڕۆژەیش بە درۆ نازانێ هەموو مرۆیەکی لەحەقلادەری تاوانبار نەبێ. لەوە دەچێت زاراوەی (سجین) بەهزری عەرەبەکاندا نەهاتبێ، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَمَآ أَدۡرَىٰكَ مَا سِجِّينٞ ٨ كِتَٰبٞ مَّرۡقُومٞ﴾[3]

جۆرێکە لەسزا یاخود بەرد یان زنجیر، ناوی ئەو کەسەی لێ نوسراوە کەسزای دەدرێت، تەواو وەکو ئەو بەردەی خوا باراندی بەسەر گەلی ئەموددا لەسەر هەر بەردێك ناوی ئەو کەسە نوسرابوو کەدەبێت بکوژرێت.

---

١- المطففين: ١- ٣

٢- المطففين: ٧ — ١٢

٣- المطففين: ٨ - ٩

وەك چۆن بێ باوەڕ لە ژیانی دنیادا پیلان و کەللەرەقی و نکوڵی کردن و ڕێگریکردنی لەبەرامبەر خواداو ماڵ و سامانی خەرج دەکات بۆ کوژاندنەوەی نوری خوایی، ئەوا هەر بەو شێوەیەو زۆر تایبەمەندانە سزای بۆ ئامادە دەکرێت.

دیارە باوەڕدار نامەی کردەوەکانی بەدەستی ڕاستی و لە (علیین) واتە لەژێر عەرشی پەروەردگاردا وەردەگرێت، بەڵام ئەوەی هاوەڵی بۆ خوا بڕیار داوە ئەوا پەرتوکی کردەوەکانی لە (سجین)دایە واتە لەژێر حەوت چینی زەویدایە واتە لەقوڵاییەکانی زەویدایە.

خوای گەورە دەفەرمویت: ﴿فَوَيْلٌ لِّلْمُصَلِّينَ ۝٤ الَّذِينَ هُمْ عَن صَلَاتِهِمْ سَاهُونَ﴾[1]

واتە: دەی هاوار بۆ ئەو نوێژکەرانەی لە نوێژەکانی خۆیان بێئاگان و زۆر جار نایانکەن و گوێیان نادەنێ.

مەبەستی لە (المصلین) واتە ئەوانەی کە خوای گەورە فەرمانی بە نوێژکردن پێ کردون ئەنجامی نادەن و خۆیانی لێ بێ ئاگاو سەرقاڵ دەکەن بەڵام ئەوەی نوێژ ناکات موسوڵمان نیە، پێشەوا ئەحمەدی کوڕی حەنبەل دەفەرموێت: (ئەو مێردەی نوێژ ناکات و سورە لەسەر وازهێنان لەنوێژ ئەوا دەبێت گرێبەستی هاوسەریەکەی هەڵوەشێنرێتەوە) هەوەرها حەزرەتی عومەریش(رەزای خوای لێ بێ) ڕایەکی لەم شێوەیەی هەیە لەپایەی پێنجەمی ئیسلامدا، دەفەرموێت: ئەگەر کەسێك توانیبوی حەج ئەنجام بدات و بەڵام ئەنجامی نەدا ئەگەر بۆم بهێنن نوێژی لەسەر ناکەم، بەدرۆخستنەوەی ڕۆژی دوایی بەزارەکی و کردەوە دەبێت، خەڵکانێك هەن ڕۆژی دوایی بەزارەکی ڕەد دەکەنەوە، ئەو کەسانە

---

١- الماعون: ٤ - ٥

هاوەڵ دانەرانن بۆ خوای گەورە، هەروەها لەنێو موسوڵمانان خەڵكانێك هەن دان بەڕۆژی دوایی و سزاكانی دادەنێن، لەگەڵ ئەوەشدا نوێژ ناكات و ڕۆژوو ناگرێت و خۆی پاك ڕاناگرێت و مامەڵە بە سو دەكات و مەی دەخواتەوەو قومار دەكات... ئایا هەموو ئەمانە بەدرۆخستنەوەی ڕۆژی دوایی نین! خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ كَلَّا بَلْ رَانَ عَلَى قُلُوبِهِم مَّا كَانُوا يَكْسِبُونَ ﴾[1] واتە: با دەس لە قسەی هیچوپووچی لەم جۆرە هەڵگرن. ئەو تاوانانەی ئەیانكردن وەك خاڵێكی ڕەش بووە بە ژەنگ بەسەر دڵیانەوەو دڵی داگرتوون، بۆیە ناتوانن ڕاست و چەوت لێك جوێكەنەوەو ئەم جۆرە قسانە ئەكەن.

## كۆپلەیەك لەو ئامۆژگاریانەی كە لە گەرمای ئاگر دوورمان دەخەنەوە:

وابەستەبوون بەوەی كە خوا فەرمانی پێ كردوم و دوركەوتنەوەم لەوەی كە لێی قەدەغە كردوم. سەهلی كوڕی عبدالله(ڕەزای خوای لێ بێ) دەفەرموێت: (٤)كردەوە وایان لێكردم ژیانم لەسەر پرۆگرامی ئیسلام ڕاست بكەمەوە.

١- بەئەندازەی پێداویستیەكانم كار بۆ خوای گەورە دەكەم.

٢- بەئەندازەی مانەوەم لەدنیادا كار بۆ دنیا بكەم.

٣- كار بۆ ئاگر بكەم بەئەندازەی ئارامگریم لەسەری.

٤- بەئەندازەی مانەوەم لەڕۆژی دواییدا كاری بۆ بكەم.

لەكۆتایدا هەموان بەوە دەترسێنم كە ستەم مەكەن... ستەم مەكەن، ستەم لەخودی خۆت مەكە بەهەڵگەڕانەوەت لەخوا، بەوەی پەلاماری خەڵكی بدەیت و ستەمیان لێ بكەیت، ئەگەر ستەمكار بیزانیایە كەستەم لێكراو چی هەیە گومانی بەستەمەكەی خۆی دەبرد، ئەگەر تۆ لەگەڵ خەڵكیدا بە فەزڵ مامەڵەیان لەگەڵدا

---

١- المطففين: ١٤

ناکەیت وە نە دادپەروەری (واتە مافی من و مافی تۆ)، ئەوا خوای گەورە بەفەزڵی خۆی مامەڵەمان لەگەڵدا دەکات، ئیتر بۆچی بەفەزڵەوە هەڵسوکەوت لەگەڵ یەکتری نەکەین، بۆیە دەبێت ستەم لێکراو ئارام بگرێت.



# کلیلەکانی بەهەشت

## بەهەشت بۆ دڵ میهرەبان و موسوڵمانەکانە:

سروشتی باسکردنی بەهەشت کرانەوەو گوشادبوونی دڵەو ئەو دڵانە بۆلای خۆی کەمەندکێش دەکات کە تامەزرۆی ڕەحمەتی پەروەردگارن و دەیانەوێ لەو خولگەیە نزیکبنەوە، گەورەترین ڕەحمەتی خوا بۆ ئێمە ئەوەیە کە چارەنوسی باوەڕداران بێنینەوە یادی یەك.

ئەمە مژدە گەورەکانە، بەهەشتیەکان لەدنیادا بەبەزەیی بوون، بۆیە خوای گەورە بەهەشتی پێ بەخشین.

کاتێك دەڕۆینە باخێکەوە درەخت و بەروبومی زۆری تێدایە، شێوەیان دڵ گوشاد دەکەن و بەختەوەری دەبەخشن بەجۆرێك بینەرانی دڵخۆش دەکات، ئەوەتا دەبینین جۆرەها میوەی جیاواز بەتامی جیاواز هەیە، ئەو میوانە وێنای پێکهاتەی باخەکەیە.

ئایین بۆ ڕێنمایی ئادەمیزادەکان دابەزیوە بەمەبەستی بەختەوەرکردنی لەهەردوو شوێنگەی دنیاو دواڕۆژیی، ئێمە وانازانین ئەو مرۆڤەی هیچی نیە هەژارە، مادام دڵی بە باوەڕبوون بەخوا ئاوەدانە، دەوڵەمەندترینی دەوڵەمەندەکانە کەواتە دەوڵەمەندی بەزۆری ماڵ و سامان نیە، بەڵکو دەوڵەمەندی لەدڵدایە.

ڕووی داوە کە دەوڵەمەندێك بەبەرچاوی پێغەمبەرەوە ﷺ کاتێك بەلای هەژارێکدا تێدەپەڕێت عەباکەی کۆدەکاتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی:

ترسایت لەوەی هەژاریەکەی بتگرێتەوە یان ترسای لەوەی دەوڵەمەندیەکەتی پێ بگات؟ پیاوەکە پەشیمانی دایگرت، بۆیە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئەوا نیوەی ماڵەکـەمم پـێ بەخشـی، نیـوەی سـامانەکەمی دەدەمـێ بـەهیوای سـڕینەوەی گوناهەکانم. پێغەمبەر ﷺ سەیری کرد فەرمووی: ئـەوە لەبراکـەت وەردەگـری؟ پیاوەکـە وتـی: نـەخێر ئـەی پێغەمبـەری خـوا، دەترسـم بمخاتـە حاڵـەتی لەخۆباییبونەوە. دەیەوێت ئەو ڕێگەیە نەگرێتە بەر.

خوای "الرحمن" ڕەحم بەوانە دەکات کەڕەحم بەخەڵکی دەکەن ئەگەر ڕەحم بەیەك بکەین ئەوا دەبێتـە هۆکارێـك بـۆ ئـەوەی الـرحمن ڕەحممـان پـێ بکـات و ڕوخسارمان لەئاگر دوور بخاتەوەو بمانخاتە نازو نیعمەتی بەهەشتەوە.

ناگەم بـە بەهەشـت هـەتا خـوای گـەورە تەویـەو پەشـیمانیم لێ وەرنـەگرێ و گوناهو سەرپێچیەکانم نەسڕێتەوە.

وتراوە: أويتي، واتە بەتەوبە کردنەوە بگەڕێتەوە لای خـوا، بەئەنـدازەی ئـەو ماوەیەی کە لەنێوان ئاسمانەکان و زەویدایە نزاکانی گیرا دەبێ.

ئەگەر تۆ کەسێکی گوێڕایەڵی و وتت: خوایە، خوای باڵادەسـت دەفـەرموێت: بەڵێ بەندەکەم، بەڵام ئەگەر سەرپێچیکارو گوناهباربوویت و وتت: خوایە، خوای گەورە دەفەرموێت: فەرموو بەندەکەم. ئەمە لێخۆشبوونە خۆزگـە بەلێخۆشـبوان و ئەوانەی کەچارەنوسیان ڕۆشنە.

ئەگەر گوناه نەکـەن و پاشـان داوای لێخۆشـبوون بکـەن ئـەوا خـوای گـەورە ئێوە لەناو دەبات و گەلێکی تر دەهێنێت گوناه بکەن و داوای لێخۆشبوون بکەن ئەوکاتە خوا لێیان خۆش دەبێت. هەر بەو شێوەیە بەهەشـت بـە لێخۆشـبووەوە بەندە.

## بەهەشت و ڕازی بوونی خوا:

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَرِضْوَانٌ مِّنَ ٱللَّهِ أَكْبَرُ﴾[1] واتە: لەگەڵ ڕەزامەندی خودای گەورە، کە گەورەترە لە هەموو پایەیێك.

رضوان چیە.. ئایا ڕازی بوونە؟.

رضوان ئەوەیە خوای بەندەکان لەدنیادا لێت ڕازی بێت، ناو گۆڕەکەت بۆ بکاتە باخێك لەباخەکانی بەهەشت، ئەگەر بڕوات بەڕۆژی زیندوبونەوە هەبێت لەژێر سێبەری عەرشدا دەبیت ئەو ڕۆژەی کە هیچ سێبەرێکی تر نیە تەنها سێبەری خوا نەبێت ئەمە (رضوان)ە واتە ڕازیبوونی خوا، ئەگەر قومێك ئاوت لەحەوزی کەوثەر خواردەوە بەدەستی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەمەش ڕازی بوونی پەروەردگارە، ئەگەر إن شاء الله ڕۆشتیتە نێو بەهەشتەوە ئەوەش ڕازی بوونی پەروەردگارە لێت.

لەناو بەهەشت خوای بالادەست بانگ دەکات: ئەی بەندەکانم ڕازی بوون. دەڵێن: بەڵێ خوایە ڕازی بووین، خوای گەورە دەفەرموێت: لەوە باشترتان هەیە؟ ئەوانیش دەڵێن: خوایە بەفەزڵی خۆت نیعمەت گەیاندۆتە ئەم نیعمەتە گەورەیە ئایا دوای ئەمە خێری زیاتر هەیە؟ خوای گەورە دەفەرموێت: بەڵێ ڕازی بوونی من هەموتان بگرێتەوە ئیتر هەرگیز لێتان تورەو نیگەران نەبمەوە.

جبریل هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ و فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوا خوای بالادەست دەفەرموێت: سڵاوی من بگەیەنێت بە ئەبوبەکر پێی بفەرمو خوای تۆ لێت ڕازییە ئایا ئەویش لەخوا ڕازییە؟

ئەبوبەکر دەستی کرد بەگریان و فەرمووی: من لەخوا ڕازیم.. چۆن لێی ڕازی نابم، من کە بەشەو و ڕۆژ بانگی دەکەم لێم ڕازی بێ...!!

---

١- التوبة: ٧٢

## چۆن بەندە لەخوای باڵادەست ڕازی دەبێت...؟!

ڕازی بوونم لە خوای باڵادەست، ڕازی بوونمە بەو بەشەی کە خوای بەندەکان پێی داوم دەزانم بەوەی کە خوای گەورە بەرژەوەندی منی بەندە دەزانێ و داهاتوم دیاری دەکات و ئەوەی کەبەسودە بۆم، بەرزترین پلەکانی دڵنیایی ڕازی بوونە بەقەدەر، واتە ڕازی بوونە بەویستی خوا: خێرو شەری.

لەکاتی تەندروستی و لەش ساغمیدا لێم ڕازی بێ، لەکاتی نەخۆشیدا ڕازی بوون بۆیە حەزرەتی زەکەریا ﷺ فەرموی: ﴿وَٱجۡعَلۡهُ رَبِّ رَضِيّٗا﴾[1] واتە: خودایا بیشیکە بە کوڕێکی کردەوە پەسەند کە خۆت لێی ڕازی بیت. واتە بەتایبەتی نزایەکی دیارکراوی کرد ئەویش ڕازی بوونە بەویستی خوا، ئەمەش دەتگەیەنێ بەوەی خۆت بدەیت بەدەست خواوە. ﴿وَأُفَوِّضُ أَمۡرِيٓ إِلَى ٱللَّهِۚ إِنَّ ٱللَّهَ بَصِيرُۢ بِٱلۡعِبَادِ﴾[2] واتە: من کاری خۆم بە خوا ئەسپێرم تا لە هەموو نیازێکی خراپی هەر بەدنیازێکم بپارێزێ . خوا چاوی لە هەموو بەندەکانیەوەیە.

دیارە ئەو خۆدانە دەستی خوایە دەتگەیەنێتە تەسلیم بوونی خوا :

﴿إِذۡ قَالَ لَهُۥ رَبُّهُۥٓ أَسۡلِمۡۖ قَالَ أَسۡلَمۡتُ لِرَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ﴾[3] واتە: ئەو کاتە کە خودا فەرمووی بە ئیبراهیم ملکەچ بە بۆ خوداو لە ئەمری دەرمەچۆ، ئەویش وتی: وا ملکەچ و گوێڕایەڵ بووم بۆ خوداو پەروەردگاری هەموو جیهانەکان، دنیاو قیامەت .

---

١- مریم: ٦

٢- غافر: ٤٤

٣- البقرة: ١٣١

ئەو کاتەی بە بەشی خوا رازی دەبم کە بۆی داناوم ئـەوە رازی بـوون بەسـەر دڵمدا دادەبارێنێت، بەمـەش هەست بەرەحمـەتی خـوا دەکـەم کاتێك بەڵایـەك بەسەر بەندەیەکدا دادەبەزێت دەڵێت: (إنا لله وإنا إليه راجعون).

خوای گەورە دەفەرموێت بەندەکەم موسوڵمان بوو خۆی دایە دەستم:

﴿قُلْ إِنَّ صَلَاتِي وَنُسُكِي وَمَحْيَايَ وَمَمَاتِي لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ ﴿١٦٢﴾ لَا شَرِيكَ لَهُ وَبِذَٰلِكَ أُمِرْتُ وَأَنَا أَوَّلُ الْمُسْلِمِينَ﴾[1] واتە: ئەی موحەممەد! تۆ بڵێ: بەڕاستی نوێژو هەموو جۆرە عیبادەتێکم یا حەج و قوربانیم و هەر عیبادەتێ لە کاتی زیندوویەتیدا ئەیکەم و لەسەری ئـەمرم هـەمووی بـۆ خودایـە کـە خـوای هـەموو جـۆرە مەخلوقێکە. هاوبەشی نی‌یە و من بەم جۆرە ڕاستی و دڵسۆزی و خاوێنییە لە لایـەن خـوداوە فـەرمانم پـێ دراوەو مـن لـەپێش هـەموو ئوممـەتی خۆمـەوە موسوڵمان بووم و ڕێگای ڕاستی ئیسلامەتیم گرتووەتەبەر.

ئەمە تەسلیم بوونی تەواوە.

کاتێك حەزرەتی عومەری کوڕی خـەتاب ڕۆشـت بـۆ شـام، طـاعون لـە دێـی عەمواس بڵاوبوبویەوە، ئەویش وەستاو نەڕۆشتە ناوی، پێیان وت، لەقەزای خوا ڕادەکەیت؟!

یـەکێك لـەو هاوەڵانـەی لەوێدا ئامـادەبوو باسـی فەرمایشـتێکی پێغەمبـەری خوای کرد ﷺ وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموی: (ئەگەر طـاعون لەسـەر هـەر خاکێك بڵاوبویەوەو خۆتانی تیابوون مەڕۆنـە دەرەوە بـەڵام ئەگـەر لـەدەرەوەی ئەو خاکە توشبووە بوون بەو نەخۆشیە مەڕۆنە ناوی)[2]. بۆیـە حـەزرەتی عومـەر

---

١- الأنعام: ١٦٢ - ١٦٣

٢- رواه أحمد.

لەبەر پابەندبونی بەو فەرمایشتەوە نەڕۆشتە ناوی و پاشان فەرموی لەقەزایەکی خواوە ڕادەکەین بۆ قەزایەکی تری خوا.

قەزای خوا بەدڵنیاییەوە پێمان دەگات لەهەر شوێن و لەهەر حاڵەتێکدا بین، ئێمە باوەڕمان بەمە هەیە تەسلیم بوین پێی بەڵام دەبێت خۆپاراستن و بەئاگابوون و دەست گرتن بە هۆکارەکانیش بگرینە بەر، بڕوادارەکەی ئەهلی فیرعەون وتی:

﴿وَأُفَوِّضُ أَمْرِيٓ إِلَى ٱللَّهِۚ إِنَّ ٱللَّهَ بَصِيرُۢ بِٱلْعِبَادِ ﴿٤٤﴾ فَوَقَىٰهُ ٱللَّهُ سَيِّـَٔاتِ مَا مَكَرُواْۖ وَحَاقَ بِـَٔالِ فِرْعَوْنَ سُوٓءُ ٱلْعَذَابِ﴾[1]

واتە: من کاری خۆم بە خوا ئەسپێرم تا لە هەموو نیازێکی خراپی هەر بەدنیازێکم بپارێزێ . خوا چاوی لە هەموو بەندەکانیەوەیە. خوایش ئەوی لەو فروفێڵانە پاراست کە بۆیان سازکردبوون و ، سزای بەدو ناهەمواریش دەورو گەمارۆی دەستەو دائیرەی فیرعەونی دا.

کاتێك بەندەیەك دەکەوێتە گێژاو و گرفتێکەوەو خۆی دەداتە دەست خواو خوای گەورە بەهانایەوە دێت.

کاتێك ئادەمیزاد دوچاری بەڵایەك دەبێت و ئارام دەگرێت ئەوا پاداشتەکەی ئارامگری و ڕازی بوون دەبێت بەمەش خوای گەورە لێی ڕازی دەبێت، بەڵام ئەوەی خۆی دوچاری توڕەبون و سەرلێشێوان و ترس دەبێت ئەوا گوناهەکەی لەسەر خۆیەتی و لە پاداشتیش بێ بەش دەبێت. خوای گەورە فەرمانی کردووەو خواش بەجێیە و گەڕانەوەی بۆ نییە، ئیدی کردی بەتاوان بەکۆڵ خۆیەوەو بێبەش بوو لەپاداشت، دەرك بەوە ناکات کە لەدەستی چووە.

---

١- غافر: ٤٤ - ٤٥

لەبەرئەوە وتویانە: دوو بەڵا بەسەر خۆتدا مەهێنە: بەڵای کۆست کەوتن، بەڵای بێ ئارامی، دەتوانی ڕازی بونیان لێ بەدەست بهێنیت.

بەحەسەنی بەصریان وت: دوعا لەو کەسە بکە کە ستەمی لێ کردویت، فەرمووی: دوعای لێ بکەم، ئایا ڕەحم لەدڵتدا نیە، دەتەوێ ستەم و دوعا لێکردنی لەسەر کۆبکەمەوە !.

سەیری ئەو ناسکی و بە بەزەییەی دڵی. ئەی کەواتە بۆچی ئێستا ڕازی بون بووە بە هەڵم و نەماوە؟

لەبەرئەوەی درەختی دڵنیایی لەرزی، ئەگەر ئادەمیزاد درەختی دڵنیایی جێگیر بکات لەنێوان دڵیداو، ئاوی پشت بەستن بەخوای باڵادەستی بە بەندەکانی پیادا بکات، ئەوا گەشەو نەش و نما دەکات و پێ دەگات.

نابێت سەرپێچی کردن هیواو ئومێدبوون بەخوا نەهێڵێت.

ئەبوحازم (خوا لێی ڕازی بێت) کە یەکێکە لە شوێنکەوتووانی تابعین دەفەرموێت: خوایە خەریکە ئومێدو هیوا بەتۆ بوونم لەگەڵ گوناهەکانم زاڵ دەبێت بەسەر هیوابوونم بەتۆ لەگەڵ کارکردندا، (واتە من گوناهبارم، ئومێدو هیوام بەڕەحمەتی تۆیە زیاد لەوەی کەهیوام بەتۆ بێ لەکاتێکدا کاری بۆ دەکەم و خۆم ماندوو دەکەم و نوێژ دەکەم و ڕۆژو دەگرم) لەبەرئەوە ئومێدم بەتۆ لەگەڵ گوناهەکانمدا زیاتر پشتم بە لێخۆشبوونت زیاترە تۆ خوایەکی لێبوردەیت بە لێخۆشبوو وەسفی خۆتت کردووە، کاتێك منی بەندە پشت بەکارەکەم دەبەستم ئەوا من بەکەم و کوڕ وەسف کراوم.

# کلیلەکانی بەهەشت

## نوێژکردن لە مزگەوتدا:

پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت: ئەوەی نوێژی (بەیانی و عیشا) بکات دەچێتە بەهەشتەوە)[1]. هەروەها دەفەرموێت: (مژدە بدە بەو کەسانەی لەتاریکی شەودا بەپێ دەکەونە ڕێ بەرەو مزگەوت بە ڕووناکی تەواوی ڕۆژی قیامەت)[2].

هەروەها دەفەرموێت: (حەجێکی تەواوی بێ کەم و کوڕی پاداشتی نیە بەهەشت نەبێ)[3]، دەرگایەك هەیە لە بەهەشتدا پێی دەوترێت دەرگای (ڕەییان) ڕۆژووانەکان لێوەی دەچنە ژورەوە، هەروەها نوێژکردنیش لەکاتی خۆیدا، وتیان ئەی پێغەمبەری خوا چ کارێك زۆر چاکە، فەرمووی: نوێژکردن لەکاتی خۆیدا هەر کەسێك نوێژ لەکاتی خۆیدا ئەنجام بدات ئەوا دەبێتە کەسێکی بەهەشتی.

بەڵام سونەتەکان، ئەوا خوای گەورە (٩٩) ناوی هەیە ئەوەی بیان ژمێرێت دەچێتە بەهەشتەوە، واتە کار بەو ناوانەوە بکات، واتە زانست و کار نەك تەنها وتنەوەی ناوەکان.

پیاوێ بەڕێگادا دەڕۆشت لقە دارێکیان لەسەر ڕێگاکە فڕێدابوو خەڵکی ئازار دەدا ئەویش بڕییەوەو لەسەر ڕێگاکە لایداو دووری خستەوە، خوای گەورە فەرمووی: ئەی بەندەکەم تۆ درەختی سەر ڕێگای موسوڵمانانت بڕیوە ئەوا منیش ڕێگای نێوان تۆو ئاگر دەبڕم و ڕێگای بەهەشتت بۆ دەکەمەوە. پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: (هیچ چاکەیەك بەکەم مەزانە ئەگەر زەردەخەنەیەکیش بێت بەڕووی براکەتدا) هەروەها فەرمویەتی: (ئەی ئافرەتانی موسوڵمان هیچ

---

١- رواه البخاري.

٢- رواه الترمذي.

٣- رواه أحمد.

دراوسـێیەك دراوسـێکەی بەکـەم نـەزانێت ئەگـەر گرتنـی بـەرانێکیش بـووە)[1]،

هەروەها فەرمویەتی ﷺ: (دیاری بۆ یـەك بـەرن هـەتا خۆشەویستیتان بۆیـەکتر زیاتر بێت)[2]

هـەروەها سـڵاوکردن لـەنێو خەڵکیـداو سـۆزو خۆشەویسـتی و برایـەتی لەکۆمەڵگـەی موسـوڵماناندا بڵاودەکاتـەوە هـەروەها دەفـەرموێت ﷺ ڕێگـای بەهەشتی دەکێشاو پاشان فەرمووی: (ناچنە بەهەشـتەوە هـەتا بـاوەڕ نـەهێنن بـاوەڕ نـاهێنن هـەتا یـەکترتان خۆشـنەوێت) (کارێکتـان نیشـان بـدەم ئەگـەر ئەنجامتاندا یەکترتان خۆش دەوێت.. لەناو خۆتاندا سڵاو لەیەکتر بکەن)[3]

بەڵام لەسەر دیاری بردن بۆ یەك لەنێو موسوڵماناندا، کەنیزەکێك ڕۆیشت بۆ لای ئیبن عەباس(ڕەزای خوای لێ بێ) قاپێك شیری بۆ هێنا ئەویش ڕانە مـەڕێکی پێدا! وتیان ئەی ئیبن عەباس: ئەو ئافرەتە زۆر هەژار بوو، یەك مەڕی بەس بوو بەکەمێکیش لە تۆ ڕازی دەبوو بۆچـی ئـەو هـەمووەت پـێ بەخشـی؟ فـەرمووی: بەئەنـدازەی توانـای خـۆی بەخشـی بەئێمـە ئێمـەش بـەپێی توانـای خۆمـان بەخشیمان بەو.

بەسەرهاتێکی تر، کەنیزەکێك ڕۆشت بۆ لای پێشـەوا حەسـەنی کـوڕی عـەلی، شوڵکێکی سەوزی بۆ هێنا، ئەویش پێی فەرمو: بـڕۆ تـۆ لـەڕێی خـوادا ئازادیـت، بەهۆی ئەو چاکەیەوە ئازادی کرد.

هەروەها پێغەمبـەر ﷺ دەفـەرموێت: (هەرکەسێك مزگـەوتێك بنیـات بنێت بەئەندازەی هێلکەی قەتێیەك یان بچوکتر ئەوا خوای گەورە ماڵێکی لەبەهەشـتدا بۆ بنیات دەنێت)[4]

---

١- رواه البخاري.

٢- رواه أبو داود في سننه.

٣- رواه مسلم.

٤- سنن ابن ماجه.

هەروەها دەفەرموێت ﷺ: (هەر کەسێك بەیانیان و ئێواران بڕوات بۆ مزگەوت، خوای گەورە جێگەیەکی بۆ ئامادە دەکات لە بەهەشتدا لەگەڵ هەموو هاتن و ڕۆشتنێکیدا)[1]

﴿إِنَّمَا يَعْمُرُ مَسَٰجِدَ ٱللَّهِ مَنْ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ﴾[2]

واتە: مزگەوتەکانی خودا ئەوانە ئاوەدانیان ئەکەنەوە کە باوەڕیان بە خوداو بە ڕۆژی دوایی هەیە. باوەڕی تەواو بەدی دێنێ.

## بەخشینی خوایی بێ ئەژمارە:

خوای خاوەن دەسەلات لەلای فریشتەکاندا شانازی بەو بەندانەوە دەکات و دەفەرموێت: ئەی فریشتەکانم سەیری ئەو بەندانەم بکەن کە لەبەر من سەردانی یەکتر دەکەن، لەبەر من پێکەوە دادەنیشن، فریشتەکانم ئێوە بەشاهید بن ئەوا من لێیان خۆشبوم. فریشتەکانیش دەڵێن خوایە: کەسێکیان تیایە لەوان نیە، خوای گەورە دەفەرموێت: ئەوەی لەگەڵ ئەوانە دانیشێت بەدبەخت نابێت... ئەگەر خەڵکی سەر زەوی سزا بدرێت سەردانکەرانی مزگەوت سزا نادرێن.

هەر بەندەیەك بەجوانی دەستنوێژ بگرێت و پاشان بڕواتە ماڵێکی خواوە ئەوا هەر هەنگاوێك کەدەینێت چاکەیەکەو هەنگاوەکەی تری سڕینەوەی گوناهەکانیەتی، فریشتەکان بەڕووی خۆشەوە پێشوازی لێدەکەن، ئەگەر ڕۆیشتە مزگەوتەکەوەو چاوەڕوانی نوێژەکەی کرد هەتا نوێژ دادەبەسترێت، فریشتەکان هەمووساتێك سەد چاکەی بۆ دەنوسن، سەد چاکە چەندێ ئەو بەخشندەییە گەورەیە !.

---

١- رواه البخاري.

٢- التوبة: ١٨

کاتێـك پێغەمبــەر ﷺ یـەکێك لـەهاوەڵانی بـینی بەغەمباریـەوە لەمزگـەوت دانیشتووە، غەم باری گرانکردووە پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو شـتێکت پـێ بڵـێم ئەگەر وتت خوای گەورە غەم و پەژارەکەت لەسەر لابیـات؟ وتـی بـەڵێ یارسـول الله. فەرموی: بڵێ (خوایە پەنا دەگرم بەتۆ لەغەم و غەمباری، پەنا دەگرم بـەتۆ لەکـەم توانـایی و تەمبـەڵی، لەترسـنۆکی و ڕژدی لـە کەڵەکـەبوونی قـەرزەکان و زاڵکردنی پیاوان بەسەرمدا)[1]. ئەڵڵاھ لەفەرو پیتی نوێژ!

پێغەمبەر ﷺ ئەگەر شتێك غەمباری بکردایـە خێـرا پـەنای دەبـرد بـۆ نوێـژو دەیفــەرمو: (ئــادەی بــیلال بەنوێــژ ئارامـمــان بکـــەرەوە)[2]. هـــەروەها فەرموی:(سۆمای چاوەکانم لە نوێژکردندایـە)[3]. لەنوێژکردنـدا تـۆ لەگـەڵ خـوادا دەبیت کەواتە غەمبار مەبە ﴿لَا تَحْزَنْ إِنَّ ٱللَّهَ مَعَنَا﴾[4] واتە: خـەم مـەخۆ خودا لەگەڵماندایە.

## لاحول ولا قوة إلا بالـلـه العلي العظيم:

یەکێکی تر لەکلیلەکانی بەهەشت زۆر وتنەوەی (لاحول ولا قوة إلا بـالله العلـي العظیم)ە لەبەرئەوەی گەنجینەی ژێرعەرشی پەروەردگار(٧٠)جـۆر لـەجۆرەکانی بەڵا لەسەرت هەڵدەگرێت کەمترینیان غەم و پەژارەیە، بەو مەرجەی بەدڵنیایی و یەقینەوە بیڵێیی.

لەسەردەمی هاوەڵاندا بوو دوژمنان کوڕەکەیان بەدیل گرتبوو کەخـەریکی دار بڕینەوەو فرۆشتنی بوو یارمەتی باوکی دەدا ئەو هاوەڵە وتی: (لاحول ولا قوة إلا

---

١- سنن أبو داود.

٢- رواه أحمد.

٣- رواه أحمد.

٤- التوبة: ٤٠

بالله العلي العظيم)، لەناکاو بەفەڕو پیتی ئەو دوعایە کوڕەکەی هاتەوە ماڵەوە ئینجا کوڕەکەی بۆی گێڕایەوە، وتی لەوکاتەدا کە لەتاریکی شەودابووم و ئەو خەڵکە نوستبوون، لەناکاو کەلەپچەکەی دەستم گەورە بوو هەر گەورە بوو هەتا کەوتە خوارەوە لەدەستم ئینجا ئەو ڕانە مەڕەم بردو بەرەو ڕانە مەڕی دوژمنانم برد. ئەڵڵاە ئەڵڵاە لەو دوعایە.

## سوپاسگوزاری کۆتی نیعمەتەکانە:

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿لَئِن شَكَرْتُمْ لَأَزِيدَنَّكُمْ﴾[1] واتە: بەڕاستی ئەگەر سوپاسم بکەن نیعمەتتان بۆ زیاد ئەکەم. نیعمەت بەسوپاسگوزاری کۆت دەکرێت وە بە زۆر سوپاس کردن، چەندێك سوپاسگوزار بیت ئەوەندە خوای گەورە بۆت زیاد دەکات، پاداشت لەجۆری کارەکەتانە، چەندێ سوپاسگوزار بن ئەوەندە خوای گەورە بەفەزڵی خۆی بۆتان زیاد دەکات، دیارە گەنجینەکانی پەروەردگار کۆتاییان نایەت، دیارە سوپاسگوزار بوون لەسەر نیعمەتی سامان خێرکردن و بەخشینە، هەروەها سوپاسگوزاری کردن لەسەر نیعمەت فێرکردنی زانستە بۆ خەڵکی.

ڕۆژێك پێغەمبەر ﷺ پارچەنانێکی بینی تەپ و تۆزەکەی لەسەر لابردو ناوی خوای هێناو پاشان خواردی و فەرموی: ئەی عائیشە بەجوانی ڕەفتار لە نیعمەتەکانی خوابکە بەدەوربەرتدا، بەڵێ نیعمەتەکانی خوا لای ئێمە داوامان لێ دەکات بەجوانی مامەڵەیان لەگەڵدا بکەین بەسوپاسگوزاری و جوان بەکارهێنانیان.

با هەموومان بەسەرهاتی ئەو دێیە لەبیرنەکەین کەسەرپێچی فەرمانی خوایان کرد بۆیە خوای گەورەش بەرگی برسیەتی و ترسی بەبەرداکردن دوای ئەوەی

---

١- إبراهيم: ٧

دێیەکی ئارام و دڵنیابوون و ڕۆزییان بەلێشاو لای خواوە بۆ دادەبەزی بەڵام ئەمان پشتیان کردە ئەو نیعمەتانە، بەجوانی مامەڵەیان لەگەڵ نیعمەتەکانی خوادا نەکرد بەڵکو نکوڵییان لەبەخشینەکانی خوا کرد.

کاتێك موسوڵمانان قوبرسیان ڕزگارکرد هاوەڵی بەڕێز ئەبوزەری غەفاری دەستی کرد بەگریان، پێیان وت لەم ڕۆژەدا دەگریت کەخوای گەورە ئیسلامی سەربەرز کردووە؟! وتی: ئەمانە پاڵیان دابوویەوەو ڕایان دەبوارد، کاتێك سەرپێچی فەرمانەکانی خوایان کرد گەردنیان دایە دەستمان لەگەڵ خاك و ماڵ و سامانەکانیاندا، ئەگەر ئێمەش لە سوپاس کردنی ئەم نیعمەتانە بێ ئاگابین و سوپاسی خوای گەورەی لەسەر نەکەین وەکو ئەمانەمان لێ بەسەر دێنێت.

## کلیلی خۆشەویستی خوا:

خوای باڵادەست لەفەرمایشتێکی قودسیدا دەفەرموێت: (ئەوەی لەدەروونی خۆیدا یادم بکات منیش لای خۆم یادی دەکەم، ئەوەشی لەناو کۆمەڵێکدا یادم بکات ئەوا من لەکۆمەڵێکی زۆر لەو باشتر یادی دەکەم، ئەوەی بەڕۆشتن بێت بۆ لام من بەڕاکردن دێم بۆ لای، ئەوەی یەك بست لێم نزیك بێتەوە باڵێك لێی نزیك دەبمەوە ئەوەی بەئەندازەی باڵێك لێم نزیك بێتەوە بەئەندازەی هەنگاوێك لێی نزیك دەبمەوە) ئایا کەرەم و بەخشین لەمە زیاتر هەیە؟ ئەو خوایەی کە بێ نیازە لەهەموو جیهان بەڵام پاکی و بێ گەردی بۆ زاتی خۆی خۆشحاڵ دەبێت بەندەکەی ڕووی تێ بکات و داوای لێخۆش بوون بکات، ئەمە خۆشەویستیەکە دڵەکان ئاوەدان دەکاتەوەو شەیطان ڕاو دەنێت و لەخوات نزیك دەکاتەوەو دەبیتە خۆشەویستی خوا.

ئەوەی شەو و ڕۆژ بکاتەوەو زمانی بەیادی خوا تەڕو پاراو بێ، شەو و ڕۆژی لێ بکەوێتەوەو تاوان ئەنجام نەدات. وشەی یەکتاپەرستی (لا إلـه إلا الله) کلیلی

بەهەشتە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: (باشترین یادێك كە من و پێغەمبەرانی تر كردبێتیان یادی "لا إله إلا الله" یە).

## كلیلی نزا:

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَقَالَ رَبُّكُمُ ادْعُونِي أَسْتَجِبْ لَكُمْ﴾[1] واتە: خودای ئێوە وتی: بانگ بكەنە من بەدەنگتانەوە دێم .

خوای گەورە ئەوبەندانەی خۆش دەوێت كەبەردەوام نزا دەكەن و ڕەزامەندی ئەویان دەوێت، ئەوانەی بەترس و ملكەچیەوە لێی دەپاڕێنەوە لەبەرامبەر پەرستنی خوا خۆیان بەگەورە ناگرن خوا خۆشحاڵ دەبێت بەوەی بەندە هەرچیەكی لێ بكەن، بەڵام لەو بەندانە تورەو زویر دەبێت كە داوا لە بەندەكانی هاوشێوەی خۆیان دەكەن ئەوانیش ڕووی خۆیان وەردەگێڕن، خوای گەورە تورەو نیگەرانە لەو بەندانەی كە واز لە داواكردن دێنن لە خوای خۆیان.

لە ڕەوشتەكانی داواكردن ئەوەیە بەندە ڕوپامایی بۆ خوا بكات، واتە پێش ئەوەی بچێتە ناو نزاكانیەوە تەسبیحات و ناردنی سەڵاوات بۆ پێغەمبەرەكەی پێش بخات، پاشان بە دڵسۆزی و دڵنیاییەوە نزای خراپ نەبێ یاخود بۆ پچڕانی پەیوەندی خزمایەتی نەبێ.

دەبێت نزاكان لێوان لێو بن لەئومێدو هیوا لەگیرابوون و بەدەمەوە هاتنی پەروەردگار، بەو شێوەیە خوای گەورە دێت بەدەم نزاكانتەوە لەو كاتەی كەخۆی ویستی لەسەرەو وە ئەو چۆنیەتیەی كەخۆی دەیەوێت: ﴿وَيَدْعُ الْإِنسَانُ بِالشَّرِّ دُعَاءَهُ بِالْخَيْرِ ۖ وَكَانَ الْإِنسَانُ عَجُولًا﴾[2] واتە: بنیادەم لەكاتی ڕق هەڵساندا

---

١- غافر: ٦٠

٢- الإسراء: ١١

دوعای شەڕ لە خۆیو لەماڵو منداڵی ئەکات وەك چۆن دوعای خێریان بۆ ئەکات.
بنیادەم پەلەیەو چی بەدڵیا هات ئەیکات بێ ئەوەی بیر لە ئەنجام بکاتەوە.

ئادەمیزاد نابێت هەرگیز واز لەنزاکردن بێنێت وە نابێت لە گیرابوونی نزاکانی نائومێد بێت چونکە تەنها ئەوکەسانە لە ڕەحمی خوا نائومێد دەبن کە ستەمکارن، کەسێك لەئێوە نەڵێت نزام کردو خوا بەدەممەوە نەهات، داوام کردو بۆی جێبەجێ نەکردم.

ئەوە کلیلی شەیتانە، دەی با ئەودەرگایە بەڕویدا دابخەین و ڕووبکەینەوە خوای خۆمان: ﴿وَمَن يَتَوَكَّلْ عَلَى ٱللَّهِ فَهُوَ حَسْبُهُۥٓ﴾[1] واتە: هەر کەسیش پشت بەخوا ببەستێ خوای بەسەو پێویستی بە کەسی تر نییە.

هەر خۆی بیسەرو بینایە بۆ وەڵامدانەوەی تواناداره، گەنجینەکانی بەفەڕو خێر لێوان لێون، دەستەکانی دەوڵەمەندو بەخشندەن.

جاری وامەیە خوای گەورە ئەو نزایەی کردوتە بۆت کۆدەکاتەوە بۆ ویستێك کە هەر خۆی دەزانێت لەبەرئەوە نارازی دەرمەبرەو گیرابوونی نزاکەتی بۆ دواخستویت تا لەڕۆژی دوایدا بێت بەهاناتەوە.

## کلیلی خۆشەویستی لەبەر خوا:

ڕۆژێك پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ هاوەڵە پاکەکانیدا دانیشتبوو پاشان فەرمووی: ئەی ئەبوبەکر نزیك بەرەوە. ئینجا فەرمووی: هەرکەسێك دەستێکی یارمەتی بۆ درێژ کردبێتین لەپێناوی بانگەوازدا پاداشتمان داوەتەوە تەنها تۆ نەبێت یارمەتیەکت داوە تەنها خوای جیهانیان دەتوانێت پاداشتت بداتەوە.

ئەبو حەفص نزیك بەرەوە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەی ئەبو حەفص تۆ لەکاتی نەفامیدا زۆر لەبەرامبەرمان ڕەق بویت هەتا خوای گەورە منەتی

---

[1] – الطلاق: ٣

ڕێنموێنی خۆی دا بەسەرتدا. پاشـان پێغەمبـەر ﷺ دەسـتی خسـتە سـەر ئـەبو بەکرو عومەرو فەرمووی: بەم شێوەیە هەرسێکمان دەڕۆینە بەهەشـتەوە پاشـان سەیری حەزرەتی عوسمـانی کـردو فـەرمووی: ئەگـەر کچـی سـێیەممان هەبوایـە لەدوای ئوم کەلثوم و ڕوقیە پێمان دەدایت...

چونە ژورەوەیان بـۆ بەهەشـت بـەم شـێوەیە دەبێـت، ڕۆژێـك پێغەمبـەر ﷺ ڕۆشتە باخێکەوە ئەبوموسای ئەشعەری لەبەردەرگاکەیـدا وەسـتابوو، پێغەمبـەر ﷺ قاچـەکانی خسـتە ئـاوی کانیەکـەوە پاشـان ئەبوموسـا هـات و فـەرمووی پێغەمبـەری خـوا ئەبوبـەکر داوای مۆڵـەت دەکـات فـەرمووی: بیکـەرە ژورەوەو مژدەی بەهەشـتی بـدەرێ، پـاش کـەمێك حـەزرەتی عومـەر داوای مۆڵـەتی کـرد پێغەمبــەر ﷺ بـە ئەبوموسـای فـەرموو، بیکـەرە ژورەوەو مـژدەی بەهەشـتی بدەرێ... پاش کەمێك ئەبوموسا وتی پێغەمبەری خوا ﷺ عوسمان داوای هاتنە ژورەوە دەکـات، پێغەمبـەر ﷺ فـەرموی: بیکـەرە ژورەوەو مـژدەی بەهەشـتی بدەرێ لەسەر ئەو بەڵایەی دوچاری دەبێـت (ئـەویش بەشـەهیدی و بـەرۆژوانی و لەکاتی قورئان خوێندنداو لەتەمەنی (٨٠)ساڵیدا شەهید کرا).

پاشان حـەزرەتی عـەلی داوای مۆڵـەتی هاتنـە ژورەوەی کـرد پێغەمبـەر ﷺ فەرموی: ئەی باوکی حەسەن نزیك بەرەوە، جبریل فەرمانی پێ کردوم فاطمەی کچمت لـێ مـارە بکـەم. ئەوانـە گـەلێکی بـۆ خـوا ژیـاوبوون لەبـەرخوا یـەکیان خۆشدەویست لەبەرخوا ڕقیان دەخستە کار.

حـەزرەتی عومـەری کـوڕی خـەطـاب(رەزای خـوای لێ بـێ) لـە یـەکێك لـە فەرمایشتە سـەیرەکانیدا دەفـەرموێت: سـوێند بـەخوا موسـوڵمانبوونی عەباسـم لەموسوڵمان بـوونی کوڕەکـەی خـەطـاب پـێ خۆشـترە، وتیـان ئەمـە چۆن؟!. فەرموی: لەبەرئەوەی موسوڵمانبوونی عەباس دڵی پێغەمبەری خوا خۆشدەکات،

بەڵام موسوڵمانبوونی خەتاب تەنها دڵی خۆم خۆشدەکات، دڵخۆشکردنی پێغەمبەری خوا ﷺ لای من لەپێشترە لە دڵخۆشبوونی خۆم.

چەند جوانە ئەو خۆشەویستییە لەبەرخوا!. ئەوە باڵاترین پلەکانی بۆیەک ژیانە، خۆشەویستی لەبەرخوا بەرزترین پلەکانی گەیشتنە بەخوای باڵادەست.

## کلیلی دامەزراوی:

ئەعرابیەك هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا شتێکم لەئیسلام پێ بڵێ کەئیتر لەدوای تۆ لەکەسی تر پرسیار نەکەم پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو: بڵێ (باوەڕم بەخوا هێناوە پاشان دامەزراوبە) واتە باوەڕو کارکردن بەپێی پرۆگرامی باوەڕ: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ قَالُواْ رَبُّنَا ٱللَّهُ ثُمَّ ٱسۡتَقَٰمُواْ تَتَنَزَّلُ عَلَيۡهِمُ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ أَلَّا تَخَافُواْ وَلَا تَحۡزَنُواْ وَأَبۡشِرُواْ بِٱلۡجَنَّةِ ٱلَّتِي كُنتُمۡ تُوعَدُونَ﴾[1]

واتە: بەڕاستی ئەو کەسانەی وتوویانە: پەروەردگاری ئێمە زاتی خوایەو، پاش ئەو دان پیانانەیان لەسەر باوەڕ بەو قسەیان و فەرمانبەرداری کردنی خوا بەردەوام بوون، ئەوانە فریشتە دێنە خوارەوە بۆ سەریان و پێیان ئەڵێن : لە هیچ مەترسن و خەفەتی هیچ مەخۆن و خۆش مژدە بن بەو بەهەشتەی لەسەر زمانی پێغەمبەران گفتتان پێ‌ئەدرا کە بۆتان ئەبێ.

کاتێك باوەڕدار بەملکەچی و دەروونی پاك و ئارامی ئایەتەکانی زیکری (الحکیم) دەخوێنێتەوە هەست بە ئارامی و هێمنی نەفس دەکات، ئەوە فریشتەکانی رەحمەتن لە لای خوای گەورەوە دابەزیون.

حەزرەتی ئوسەیدی کوڕی حضیر(رەزای خوای لێ بێ) کاتێك سورەتی (الکهف)ی دەخوێند بینی ئارامش دابەزیە سەری و ئەسپەکەی کەوتە حیلان

---

١- فصلت: ٣٠

بەجۆرێك خەریك بوو ڕەشوەكەی دەقرتا، كاتێك سەیری كرد چەند چرایەكی پرشنگدار لەئاسماندا دەدرەوشانەوە. الله أكبر، حەزرەتی ئەسید شڵەژاو لەسەر قورئان خوێندنەكەی وەستا، چراكان بەرەو ئاسمان بەرزدەبوونەوە هەتا دیار نەمان، لەنوێژی بەیانیدا ئەم ڕوداوەی بۆ پێغەمبەر ﷺ گێڕایەوەو وتی: ئەی پێغەمبەری خوا دوێنێ شەو ئاواو ئاوام بینی ئەسپەكەم كەوتە حیلان كوڕەكەم كەوتە سەر سنگ ئیتر من ترسام و قورئان خوێندنەكەم وەستاند، پێغەمبەر ﷺ فەرموی: ئەسید بخوێنە، ئەسید بخوێنە ئەوە ئارامیی خواییە بەقورئان خوێندنەكەت دابەزیوەتە سەرت ئەگەر بەردەوام بویتایە لەسەری هەموو خەڵكی مەدینە دەیانبینی.

## كلیلی ڕەحمەت:

ئەوانەی ڕەحم بەخەڵك دەكەن خوای "الرحمن" ڕەحمیان پێ دەكات، پێغەمبەری خوا ﷺ باسی پیاوێكی ئومەتەكانی پێشویان بۆ دەكات و دەفەرموێت: (ئەو پیاوە بەڕێگایەكدا دەڕۆشت تینویەتی زۆری بۆ هێنا لەناكاو بیرێكی بینی و چووە ناوی و تینویەتی خۆی شكاند پاشان هاتە دەرەوە سەیری كرد سەگێك هەناسە بڕكێی پێ كەوتوە لەناچاریدا خۆڵی دەخوارد، كابرا وتی ئەم سەگە لەتینویەتیدا وەك منی لێ هاتووە بۆیە ڕۆشتە ناو بیرەكەو بە پێڵاوەكەی ئاوی بۆ هێنایە دەرەوەو بەدەست گرتی بۆی و ئەویش تینویەتی خۆی شكاند سەگەكە سوپاسی خوای كرد بۆی و خوای گەورەش لێی خۆش بوو)[1]. بەزەیی و ڕەحمی بۆ یەكێك لەدروست كراوەكانی خوا جوڵاو ڕەحم و لێخۆشبوونی خوای مسۆگەر كرد.

---

١- رواه البخاري.

## کلیلی لێخۆشبوون:

دەربارەی لێخۆشبوون خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَقُلْتُ اسْتَغْفِرُوا رَبَّكُمْ إِنَّهُ كَانَ غَفَّارًا (١٠) يُرْسِلِ السَّمَاءَ عَلَيْكُم مِّدْرَارًا (١١) وَيُمْدِدْكُم بِأَمْوَالٍ وَبَنِينَ وَيَجْعَل لَّكُمْ جَنَّاتٍ وَيَجْعَل لَّكُمْ أَنْهَارًا﴾[1] واتە: پێم وتن: داوای لێخۆشبوون بکەن لە خوای خۆتان، خوا زۆر گوناهبەخشە. بارانی ئاسمانتان بە خوڕ بۆ ئەنێرێ. یارمەتیشتان ئەدا بە ماڵ و منداڵ و، باخ و باخات و جۆگەو ڕووبارتان بۆ دروست ئەکا.

هەر کەسێك داوای لێخۆشبوون زۆر بکات خوای گەورە بۆ هەموو غەمێکی دەرویەك دەنێری بۆ هەر تەنگانەیەکیش دەرویەکی بۆ دەنێرێت، لە شوێنێکەوە ڕۆزی دەداتێ کە بەخەیاڵیدا نەهاتبێ، گەورەی لێخۆشبوونەکان ئەمەیە: (اللهم أنت ربي لا إله إلا أنت خلقتني وأنا عبدك وأنا على عهدك ووعدك ما استطعت أعوذ بك من شر ما صنعت أبوء لك بنعمتك عليّ وأبوء بذنبي فاغفر لي فإنه لا يغفر الذنوب إلا أنت)[2]، باشترین شتێك کە بیڵێیت ئەوەیە کە لەدڵتەوە بێتە دەرەوە.



---

١- نوح: ١٠ - ١٢

٢- رواه البخاري.

# دەرگاكانی بەهەشت

## چەند پایەیەك لەپشت دەرگاكانەوە...!!!

دەبێت چەندپایەو كۆڵەكەیەكی گرنگ بدرێت پێش وەستان لەبەردەم دەرگاكانی بەهەشت.

**پایەی یەكەم:**

بەهەشت پۆشاكی خوایە، بەڵێ پۆشاكی خوایە، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: (پۆشاكی خوا گران بەهایە، پۆشاكی خوا بەهەشتە)[1]

**پایەی دووەم:**

گەورەترین ڕابواردن كە باوەردار لە بەهەشتدا جەخت بكاتەوە لەسەری: ﴿فَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ﴾[2] واتە: لە پاشەڕۆژیدا نە ترس ڕوویان تێئەكات و نە خەفەت ئەخۆن. ئەمەش بۆ هەموو بەهەشتیەكانە.

**پایەی سێیەم:**

﴿لَهُم مَّا يَشَاءُونَ فِيهَا وَلَدَيْنَا مَزِيدٌ﴾[3] واتە: هەرچیبیان ئارەزوو لێ بێ بۆیان هەیە لەو بەهەشتەداو لەوەیشمان زیاتر لایە بۆیان.

دراوی ئاڵوگۆڕپێكراوی بەهەشت (سبحانك اللهم)ە، بە هۆیەوە ئەوەی دەتەوێت بۆت دێت، ئەوەش وشیەكی نهێنیە، دوعاو نزایان سبحانك اللهم.

---

١- سنن الترمذي.

٢- البقرة: ٣٨

٣- ق: ٣٥

## پایەی چوارەم:

سەیرکردنی ڕوخساری خوای بەخشندەیە، ئەوەش بەرزترین پلەی بەهەشتە کە بە بەیانی و ئێوارە سەیری ڕوخساری خوای خۆیان دەکەن: ﴿وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ نَّاضِرَةٌ ۝٢٢ إِلَىٰ رَبِّهَا نَاظِرَةٌ﴾[1] واتە: لەو ڕۆژی قیامەتەدا چەندین ڕوو جوان و گەشن. چونکە بۆ خوای خۆیان ئەڕوانن.

ڕوخسارەکان بەگوێرایەڵی خوا لەم دنیایەدا ڕووناکەو ڕەزامەندی پەروەردگار لە ڕۆژی دوایدا.

پێش چونە بەهەشت، بەحەوزی کەوثەردا تێدەپەڕن و لێی دەخۆنەوە پاشان پردی سیراط تێ دەپەڕێنن، لەگەڵ خواردنەوەیدا باوەڕدار ڕوخساری ڕووناکی پڕ نیعمەتی تێدا دەردەکەوێت و ڕق و کینە لەدڵیدا دەردەهێنرێت هەتا بەدەروونێکی بێ گەردەوە بڕواتە بەهەشت: ﴿وَنَزَعْنَا مَا فِي صُدُورِهِم مِّنْ غِلٍّ إِخْوَانًا عَلَىٰ سُرُرٍ مُّتَقَابِلِينَ﴾[2] واتە: هەرچی کینەو ناحەزی هەبوو لە سینەیانمان دەرهێنا و، بەرامبەر یەك، لەسەر کورسی دائەنیشن.

لە نەهامەتی ستەمەکان و غەمی دنیا ڕزگاری دەبێت، بەجۆرێك کاتێك ئەوانە دەبینێت کە ستەمیان لێ کردووە هەست بە ڕق و کینەو پەشیمانی یاخود ئازار ناکات.

﴿الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي أَذْهَبَ عَنَّا الْحَزَنَ﴾[3] واتە: سوپاس بۆ ئەو خوایەی غەمو پەژارەی ژیانی دنیاو ترسی ئاخرشەڕیی قیامەتی لێ لادایین.

---

١- القيامة: ٢٢ - ٢٣

٢- الحجر: ٤٧

٣- فاطر: ٣٤

ئەوە بەسە کە تۆ لە بەهەشتدا قسەی چاك و جوان نەبێ هچی تر نابیستی، چونکە هەروەك چۆن لە دنیادا لەگەڵ کۆمەڵی خێردا دادەنیشت و گوێی لە قسەو گوفتاری باش دەگرت ئاواش ئێستا ئەو کەسە لە بەهەشتدایە:

﴿إِلَّا قِيلًا سَلَٰمًا سَلَٰمًا﴾[1] واتە: تەنها هەر وتەی (سەلام .. سەلام) ئەبیسرێ.

**پایەی پێنجەم:**

ئافرەتی باوەڕدار لەوە دەترسێت لەبەهەشتدا هاوسەرداری ئەو پیاوە بکات کە سزای سەختی لەدەستی بینیوە لەدنیادا، نەخێر با دڵنیا بێ بەفەزڵی خوا هاوسەرداری بەوکەسە دەکات کەخۆی پێی ڕازییە. ئوم سەلەمە لەپێغەمبەری خوای پرسی ﷺ: ئایا ژنێك لەئێمە شو بەپیاوێك و دوو پیاو دەکات واتە دەمرێت یاخود تەڵاق دەدرێت) لەڕۆژی دوایدا شو بەکامیان دەکات؟ فەرمووی: شو بەوەیان دەکات کەبەڕەوشتترە. بەڵێ، ڕەوشت جوانی خێری دنیاو دوارۆژی برد بۆ خۆی.

## ئافرەتانی بەهەشت:

ئافرەتانی بەهەشت دوو جۆرن: جۆرێك خوای بەندەکان دروستی کردووە بە: ﴿كُن فَيَكُونُ﴾[2] ئەوان بەدەنگێکی ڕۆحی نەرم گۆرانی بۆ بەهەشتیەکان دەڵێن: ئێمە ئەو نەرم و ناسکانەین کەهەرگیز نائومێد نابین، ئێمە ڕاضییەکانین هەرگیز نیگەران نابین، ئێمە دانیشتووەکانین هەرگیز داناکەوین، ئێمە گەنجین هەرگیز پیر نابین خۆزگە بەو کەسەی بۆ ئێمەیە، وە خۆزگە بەو کەسەی ئێمەی بۆ دەبین.

---

١- الواقعة: ٢٦

٢- البقرة: ١١٧

ئەوەی لەم دنیا گوێ لەگۆرانی بگرێت لەگۆرانی پەریەکانی بەهەشت بێ بەش دەبێت.

لەخەسڵەتەکانی پەریەکان: مرۆڤ سپێتی ڕوخساری خۆی لەڕومەتەکانیاندا دەبینێ وە ئەگەر بخرێنە دەریایەکی سوێر دەیکەنە دەریایەکی شیرینی سازگار، ئەگەر سەری پەنجەکانی لەشەوی تاریکدا دەربخات دەیکاتە ڕۆژی پرشنگدار.

جۆری دووەم ئافرەتانی دنیان، زۆرێك هەن لەو مێردانەی دنیا ئاوات دەخوازێت بەوەی هاوڕێیەتی خێزانەکەی بکاتەوە بەهۆی ئەو ڕازی بوون و خۆشەویستیەی کەهەیەتی بۆی. دەی با هاوڕێی مێردەکەی بێت، بەڵام ئەگەر بیەوێت کەسێکی تر بێت ئەوا ئافرەتانی تر زۆرن لەبەهەشتدا.

بەڵام ئەو ئافرەتەی کە مێردەکە سزاو ئازاری داوەو ڕقی لەهاوسەرییەتی ئەوا نابێتەوە بەهاوسەری لەبەهەشتدا چونکە لە بەهەشتدا: ﴿وَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ﴾[1] واتە: لە قیامەتدا ناترسن لە مەئموری سزاو، دڵگران نابن.

## یەکەم کەس کە بەهەشت دەکاتەوەو دەڕواتە ناوی...

پێغەمبەری خوا ﷺ پێمان ڕادەگەیەنێت کە ئەسپ سوار چل ساڵ بە سواری ئەسپەکەیەوە ڕێگای نێوان یەکەم دەرگای بەهەشت و دواهەمینیان تێپەر ناکات، پێغەمبەری ئازیز یەکەم کەسە دەچێتە ناو بەهەشتەوە، دەرگاکەی داخراو دەبێت پێغەمبەر ﷺ دێت و لەخوا داوا دەکات بیکاتەوە، دەرگاکەی بۆ دەکرێتەوە لەوەوبەر بۆ کەسی تر نەکراوەتەوە، لەئەڵقەریزی دەرگاکەی دەدات واتە لێی دەدات تا دەنگێك دەردەکات.

---

١- البقرة: ٢٦٢

با لەیادمان بێت: ئەمەی لە دواڕۆژتاندایە لەدنیادا تەنها چەند ناوێکە، دەرگاکانی بەهەشت هەشت دەرگان و بەردەوام کراوە دەبن.

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: (جبریل هات بۆ لام و دەستی گرتم و ئەو دەرگایانەی پیشاندام کەئومەتەکەم لێوەی دەچنە ژوورەوە) حەزرەتی ئەبوبەکر(رەزای خوای لێ بێ) فەرموی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ حەزم دەکرد لەگەڵ تۆ بوومایە تا سەیرم بکردایە، پێغەمبەر ﷺ فەرموی: (بەڵام تۆ ئەی ئەبوبەکر یەکەم کەسیت لەئومەتەکەم کەدەچیتە نێو بەهەشت)[1]

ئەم بەهەشتە پلەی هەیە، وەك چۆن خوا پەنامان بدات لەگەڵ ئێوەدا دۆزەخیش پلەی هەیە نێوان دوو پلە بەئەندازەی دووری نێوان ئاسمان و زەوییە.

ئەو کاتەی ئەو دایکەی تاقە کوڕەکەی شەهید بوو بە پێغەمبەری ﷺ وت: کوڕەکەم لەبەهەشتدایە ئارام بگرم؟ یان لەدۆزەخدایەو هەموو تەمەنم بۆی بگریم؟ پێغەمبەرﷺ فەرموی: کوڕەکەت لەفیردەوسی باڵادایە واتە باڵاترین پلەکانی بەهەشت لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ، ئەوێ شوێنی پێغەمبەرە لەبەرئەوەی سەربانی فیردەوس عەرشی پەروەردگارە، لەبەرئەمە لە پێغەمبەرەوە ﷺ هاتووە دەفەرموێت: (ئەگەر داوات لە خودا کرد داوای فیردەوسی باڵا بکە).

---

١- سنن ابو داود.

## خەسلەتەکانی ڕابواردنی ناو بەهەشت:

خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿وَبَشِّرِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ أَنَّ لَهُمْ جَنَّٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ ۖ كُلَّمَا رُزِقُواْ مِنْهَا مِن ثَمَرَةٍ رِّزْقًا ۙ قَالُواْ هَٰذَا ٱلَّذِى رُزِقْنَا مِن قَبْلُ ۖ وَأُتُواْ بِهِۦ مُتَشَٰبِهًا ۖ وَلَهُمْ فِيهَآ أَزْوَٰجٌ مُّطَهَّرَةٌ ۖ وَهُمْ فِيهَا خَٰلِدُونَ﴾[1]

واتە: موژدە بدە بەوانەی ئیمانیان هێناوەو چاکەیان کردووە کە لە قیامەتدا ئەبنە خاوەنی باغ و باغاتی وەها جۆگا بەناویانا ئەڕوات، کە لە بەری ئەو باغ و بەهەشتانە ڕزقێکیان بۆ بێت ئەڵێن: ئەمە ئەو خواردەمەنی‌یەیە کە لە دنیادا بۆمان ئەهێنراو ئەمانخوارد چونکە ڕزقیان لەسەر وێنەی هی دنیا بۆ ئەهێنرێ. یاخۆ مەعنای ئەوەیە هەر لە بەهەشتدا هەر جاری خواردنێکیان بۆ ئەهێنن کە بە وێنە لە خواردەمەنی پێشووئەکات و لە تام و لە زەتدا لە یەك جیان. ئەم خاوەن ئیمانانە لە بەهەشتدا خێزانی پاك و پوختەو بێ‌خەوشیان هەیەو هیچ شتێ ئەو خۆشی‌یەیان لێ تێك نادات و هەتا هەتایە لەو بەهەشتەدا دەمێننەوە.

بەروبومەکانی بەهەشت جۆرەها شێوازو ڕەنگ و تامی جیاوازن ئادەمیزاد پاشەڕۆی نیە، بەڵکو پاڵفتەکەی وەك بۆنی میسکە، نە عارەقی هەیە نە حەیزو نە زەیسانی و نە تف و بەڵغەم و ڕشانەوەو تۆو، هیچ شتێکی تر لەو شتانەی کە ئازاری بۆ دروست بکات کە لەم دنیایەدا هەیە، هەرچی ئازارو ناڕەحەتی هەیە لەسەی نامێنێت، بەڵکو تەنها نیعمەتێکی تایبەت و چێژێکە بەردەوام دەمێنێت.

---

١- البقرة: ٢٥

## ڕێگای شەهیدبوون:

خوای گەورە دەفەرموێت:﴿ وَلَا تَحْسَبَنَّ ٱلَّذِينَ قُتِلُوا۟ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ أَمْوَٰتًۢا ۚ بَلْ أَحْيَآءٌ عِندَ رَبِّهِمْ يُرْزَقُونَ ﴾[1] واتە: ئەوانەی لە ڕێگای خوادا کوژراون هەرگیز وا مەزانن مردوون، نەخێر؛ ئەوانە زیندوون و لای خودا ڕۆزییان ئەدرێتێ.

شەهید لە بەهەشتێکدایە پانتاییەکەی بەئەندازەی ئاسمانەکان و زەوییە، هەر کەسێك بجەنگێت لە پێناوی بەرز ڕاگرتنی ناوی الله، ئەوە شەهیدەو لە فیردەوسی بالآدا نیشتەجێ دەبێت لەبەرئەوە شەهید چەند پلەیەکە: ئەوەی لەئاودا خنکابێ یان بەسوتان یان پیری یان بە سك ئێشە یان گیاندارێك جوتەی لێبدات.

سوپاس و ستایش بۆ خوا شەهیدانی ئەم ئومەتە زۆرن، بەلآم شەهیدێك کە بەشمشێر شەهید کرابێ، ئەو کەسە ناشۆرێت و هەر بە بەرگی خۆیەوە دەنێژرێت.

## خەو بینینی باش:

لەجەنگی قادسیەدا، سەعیدی کوڕی زەید کە مێردی فاطیمەی کچی خەطاب، زاوای حەزرەتی عومەرو یەکێك لە دە مژدە پێدراوەکەی بەهەشت بوو، ماوەی چەند ڕۆژێك بوو نەنوستبوو براکەی سوێندی لێخوارد بڕواتە نێو خێمەکەیەوەو کەمێك بحەوێتەوە خۆشی لەبەردەرگاکەیدا وەستا بوو پاسەوانی دەکرد.

پاش کەمێك گوێی لەسەعید بوو قسەی دەکرد زۆر ترسا لەوەی کەیەکێك لەدوژمنان لەنێو خێمەکەیدا شەهیدی کردبێت، ئەو هاوەڵە بەڕێزە ڕۆشتە ژورەوە گوێی لەسەعید بوو دەیوت: سوێند بەخوا ئەی عەیناء مەرضیە نامەوێ بگەڕێمەوە، ئەمیش لەخەوەکەی بەئاگای هێنایەوە ئەویش هەڵساو وتی خوا

---

١- آل عمران: ١٦٩

پاداشتی خێرت بداتەوە بۆ هەڵتساندم؟ خەوێکم بینی. براکەی پێی وت چۆن بوو بۆم بگێڕەرەوە، سەعیدیش وتی: سوێندت دەدەم بەخوا بۆ کەسی تری نەگێڕیتەوە هەتا دوای مردنم نەبێت پاشان ئەو خەوە پیرۆزەی بۆ گێڕامەوە.

وتی: بینیم خەریك بوو قیامەت بەرپا دەبوو یەکێك لەژێر عەرشەوە بانگی دەکردم: خوا لە سەعیدی کوڕی زەید ڕازی بوو، منیش سێ ئەسپی ناوقەد باریك و خرپنم لەبەردەمدا بوو دوانیان دوو فریشتەیان بەسەرەوە بوو سێیەم لەنێوانیاندا بوو وتیان: سەعید سەرکەوە با بتبەین بۆ ئەو شوێنەی خوا بۆی ئامادە کردویت، پێکەوە ڕۆشتین دەرگای بەهەشتمان بۆ کرایەوە ڕۆشتینە ژوورەوە سەیرم کرد کۆمەڵە ئافرەتێکم بینی وەکو مانگی شەوی چواردە بوون، وتم: ئێوەن پەریەکانن ئەوانەی کەخوای بەندەکان لەقورئاندا بۆی باس کردوین؟ وتیان: نەخێر، ئێمە خزمەتکاری ئەوانین تۆزێك ڕۆشتم ڕێم کەوت لەکۆمەڵە ئافرەتێکی جوانتر، وتم ئێوە پەریەکانن؟ وتیان، نەخێر ئێمە خزمەتکاری ئەوانین.

پاشان سێ ئافرەتم پێگەشت، دوانیان وەك مانگی چواردە وابوون یاخود وەك بەدر ئەوەی تریان وەکو خۆر وابوو دەوروبەرەکەی ڕووناك کردبویەوە.. منیش سڵاوم لێ کردن.

﴿وَتَحِيَّتُهُمْ فِيهَا سَلَٰمٌ﴾[1] وتم تۆ کێی؟. وتی: من (عیناء المرضیه)م، من خێزانی تۆم لە بەهەشتدا، دەستم درێژ کرد تا تەوقەی لەگەڵدا بکەم، وتی: وازم لێ بێنە سەعید تۆ هێشتا لە دنیادایت بەڵام تۆ لای ئێمە دەبیت وتم: سوێند بەخوا من نامەوێ بگەڕێمەوە دنیا، نامەوێ بگەڕێمەوە، بەخێربێی عەیناء بەخێربێی مرضیە، بەڵام تۆ بەئاگات هێنام لەخەوەکەم خوا پاداشتت بداتەوە.

---

١- یونس: ١٠

پاش دوو ڕۆژ یان سێ ڕۆژ دوای ئەم خەوە، پێنج شەممە بوو (ئەو ڕۆژەی کە کردەوەی بەندەکانی تێدا بەرز دەبێتەوە) سەعید بە ڕۆژوو بوو، شیرێك چەقی بەجەستەیداو گیانی پاکی سپارد بەخوا لەکاتێکدا کە بەڕۆژوو بوو، براکەی لەسەر ئەو حاڵەتە بینی و ئێرەیی پێ برد. کوا بەریانگەکەت سەعید؟. سەعید دەڵێت: لەشوێنی ڕاست و پەسەندان لای پادشای بەدەسەڵات، بەخێربێی ئەی عەیناء بەخێربێی ئەی مەرضیە، هاتووە تا پێشوازی لێبکات ئای لەو مژدە خۆشەو لەو چارەنوسە جوانەی!.

## لێخۆشبوون خوانی تەوبەکردنە:

وەك باسکراوە خێزانی باوەڕدار لەپەریەکانە ئەگەر خێزانەکەی دنیای ئازاری بدات، پەریەکان پێی دەڵێن: لەخوا بترسە لای تۆ کۆچ دەکات و دێت بۆ لای ئێمە. خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَسَارِعُوٓاْ إِلَىٰ مَغۡفِرَةٖ مِّن رَّبِّكُمۡ وَجَنَّةٍ عَرۡضُهَا ٱلسَّمَٰوَٰتُ وَٱلۡأَرۡضُ أُعِدَّتۡ لِلۡمُتَّقِينَ﴾[1]

مادام لەسەر سفرەو خوانی لێخۆشبوونی خوایین کەواتە دەبێت لەسەر باسی تەوبە کردن بوەستین.

تەوبەکردن یەکێکە لەنیشانەکانی ژیانی باوەڕدار، پیاوێك هاتە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا بەهەشت بەئەندازەی پانتایی ئاسمانەکان و زەوییە ئەی دۆزەخ؟ پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ئەگەر شەو هات کوا ڕۆژ؟! پیاوەکە ڕۆشت بۆ لای حەزرەتی ئەبو بەکر هەمان پرسیاری لێ کرد هەر هەمان وەڵامی پێغەمبەری ﷺ گوێ لێبوو، ڕۆشت بۆ لای حەزرەتی عومەر هەر هەمان وەڵامی دەستکەوت.

---

١- آل عمران: ١٣٣

دەروونێکی تێر نەخواردووە، پاوەکە سەری سوڕماو وتی: هەمان پرسیارم کردو یەك جۆر وەڵامیان دامەوە، وتیان: ئەگەر پرسیارت لەفلان و فلان بکردایە هەر هەمان وەڵامی دەدایەوە.

## لەخەسڵەتەکانی لەخواترساوان (المتقين):

خەسڵەتەکانی لەخواترساوان چین؟ خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿وَسَارِعُوٓاْ إِلَىٰ مَغۡفِرَةٖ مِّن رَّبِّكُمۡ وَجَنَّةٍ عَرۡضُهَا ٱلسَّمَٰوَٰتُ وَٱلۡأَرۡضُ أُعِدَّتۡ لِلۡمُتَّقِينَ ١٣٣ ٱلَّذِينَ يُنفِقُونَ فِي ٱلسَّرَّآءِ وَٱلضَّرَّآءِ وَٱلۡكَٰظِمِينَ ٱلۡغَيۡظَ وَٱلۡعَافِينَ عَنِ ٱلنَّاسِۗ وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ١٣٤ وَٱلَّذِينَ إِذَا فَعَلُواْ فَٰحِشَةً أَوۡ ظَلَمُوٓاْ أَنفُسَهُمۡ ذَكَرُواْ ٱللَّهَ فَٱسۡتَغۡفَرُواْ لِذُنُوبِهِمۡ وَمَن يَغۡفِرُ ٱلذُّنُوبَ إِلَّا ٱللَّهُ وَلَمۡ يُصِرُّواْ عَلَىٰ مَا فَعَلُواْ وَهُمۡ يَعۡلَمُونَ﴾[1] واتە: ئەی موسوڵمانینە! پێشدەستی بکەن و بەپەلە کردەوەی باش بکەن و زوو دەس بدەنە کاری خێر. ئەو بەهەشتە دەست خۆتان بخەن کە زۆر گەورەو بەر بڵاوەو بەقەدەر ئەرزو ئاسمانەکانەو ئامادەکراوە بۆ ئەوانەی لەخودای خۆیان ئەترسن و نزیکی گوناه و نا فەرمانیی خودا ناکەونەوە. ئەو لەخوداترسانەی کە لە خۆشیو ناخۆشیدا ماڵی خۆیان لەپێناوی خودای خۆیانا سەرف ئەکەن و لە کاتی تووڕەبوونا ڕقی خۆیان ئەخۆنەوەو، ئەوانەی تاوانیان بەرانبەر کردوون چاوپۆشییان لێ ئەکەن و لێیان ئەبوورن، بێ گومان خودا چاکەکارانی خۆش ئەوێ. ئەوانەی هەرکاتێ تاوانێکی ناڕەوایان کرد یا ستەمیان لە خۆیان کرد بە گوناهێکی تر، بیری گەورەیی خودا ئەکەنەوەو داوای لێخۆشبوونی لێ ئەکەن و پەشیمان ئەبنەوە لەو تاوان و ستەمە. کێیش ئەتوانێ گوناه بپۆشێ لە خودا بەولاوە. هەروەها بەردەوام نابن

---

١- آل عمران: ١٣٣- ١٣٥

لەسەر ئەو گوناهەی کردوویانەو ئەزانن ئەوکارەی کردوویانە تاوانەو مایەی سزایە.

مەبەست لەوەیە کە لەکاتی خۆشی و ناخۆشیداو لەهەموو کاتەکاندا ببەخشین، وەکو چۆن حەزرەتی ئەبو بەکر ئەنجامی دەدا ئەوکاتەی خەرجی مسطحی کوڕی ئەثاثە ی دەدا ئەو کەسەی کەشەرەفی خاتو عائیشەی لەکەدار کرد، بەلاَم ئەو بەخشینەکەی زیاتر کردو فەرمووی بەڵێ خوایە حەزدەکەین خوا لێمان خۆشبێ، ئەمەش دوای دابەزینی سورەتی (النور).

﴿ وَلَا يَأْتَلِ أُوْلُوا۟ ٱلْفَضْلِ مِنكُمْ وَٱلسَّعَةِ أَن يُؤْتُوٓا۟ أُو۟لِى ٱلْقُرْبَىٰ وَٱلْمَسَـٰكِينَ وَٱلْمُهَـٰجِرِينَ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ ۖ وَلْيَعْفُوا۟ وَلْيَصْفَحُوٓا۟ ۗ أَلَا تُحِبُّونَ أَن يَغْفِرَ ٱللَّهُ لَكُمْ ۗ وَٱللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴾[1]

واتە: با خاوەن دارایی‌و گوشاد ڕۆزییەکانتان سوێند نەخۆن کەوا هیچ نادەن بەخزمەکانیان و هەژاران و گەدایان و بەوانەی لەپێناوی خوادا ماڵ و حاڵی خۆیان بەجێ هێشتووەو کۆچیان کردووەو، با لێیان خۆش بن و لێیان ببوورن ئەگەر هەڵەیان کردبێ. ئایا ئێوە حەزناکەن خوایش لە ئێوە خۆش ببێ و، خوا گوناهبەخش و بەڕەحمە. ئەگەر پێتان خۆشە خوا لێتان خۆش ببێ، ئێوەش لە خەتای خەتاکاران خۆش بن.

خواردنەوەی ڕق و کینە بەشەرع کپ دەکرێتەوە، کاتێک دەروونەکان پڕدەبن بەڕق و کینە باوەڕدار دەڵێ خوایە بمپارێزە لەگەرمی توڕەبوونم پاشان دەست نوێژێك دەگرێت ئاگری توڕەبوونی بەئاوی دەست نوێژەکەی دەکوژێنێتەوە، توڕەبوون لەشەیطانەوەیە کە دروستکراوێکە لە مەشخەڵی ئاگر، پاشان حاڵەتی خۆی دەگۆڕێت ئەگەر بەدانیشتنەوە بوو با هەڵسێت وە پەنابگرێت بەخوا لەشەیطانی ڕەجمکراو.

---

١- النور: ٢٢

پێغەمبەری ئازیز هەرگیز لەبەر خۆی تورە نەبوو، بەڵکو لەبەرخوا تورە بووە! ئەگەر سنورەکانی خوا بشکێندرایە تورە دەبوو، ئەوەبوو لەڕوخساری پیرۆزییەوە دەردەکەوت.

## لێبوردن و چاوپۆشی:

مەبەست لە لێبوردن ئەو کاتەیە کە ئەو کەسە دەسەڵاتی تۆڵەسەندنەوەی هەیە، نەك لێبوردنی لاوازی ناتوانێت شەڕ لەخۆی دووربخاتەوە، دیارترین نموونە لەکاتی دەسەڵاتی پێغەمبەر ﷺ بۆ خەڵکی مەککە لەساتی ڕزگارکردنیدا ئەوکاتەی پێی فەرموون: گومانتان وایە کە من چیتان لێدەکەم؟ وتیان برایەکی بەخشندەو برازایەکی بەخشندە، پێغەمبەری بەخشندە فەرمووی: فەرمایشتەکەی حەزرەتی یوسفتان پێ دەڵێم کە بەبراکانی فەرموو:

﴿ قَالَ لَا تَثْرِيبَ عَلَيْكُمُ ٱلْيَوْمَ يَغْفِرُ ٱللَّهُ لَكُمْ وَهُوَ أَرْحَمُ ٱلرَّٰحِمِينَ ﴾[1]

واتە: یووسف وتی: ئەمڕۆ سەرزەنش و لۆمەتان لەسەر نییە. خودا لێتان خۆش ئەبێ، خودا لە هەموو میهرەبانێ میهرەبانترە.

بڕۆن ئێوە ئازادن، ئەوەبوو ئەو خەڵکەو قەرەباڵغیەزۆرە بەیەك دەنگ وتیان: شایەتی دەدەین أن لا إله إلا الله وە تۆ ئەی محەمەد رسول الله.

سڵاوات لەتۆ ئەی پێشەواو خۆشەویستیمان ئەی پێغەمبەری خوا، ڕاستی فەرموو ئەو زاتەی بە (رؤوف و رحیم) ناوی بردویت ئەوە بوو بەو لێبوردنە زیاتر لە دوو هەزار کەس موسوڵمان بوون.

کەس نەڵێت لێبوردن پێچەوانەی پیاوەتی و ئازایەتییە ئەوە دڵەڕاوکێی شەیطانیە، ڕێگاکانی شەیطانە لەنێو دەروندا هەتا دەستی بەسەردا بگرێت و فڕێی بداتە نێو ئاگرەکەوە.

---

١- یوسف: ٩٢

## هارونه ڕەشیدو خزمەتکارەکەی:

جارێك خزمەتکارەکەی هارونە ڕەشید بەبێ مەبەست دەست شۆرەکە لەدەستی کەوتە خوارەوە لەوکاتەدا کە هارونە ڕەشید دەستنوێژی دەگرت، خزمەتکارەکە زانی هارون زۆر توڕەبووە وتی: ﴿وَٱلۡكَٰظِمِينَ ٱلۡغَيۡظَ﴾[1]

واتە: لە کاتی تووڕەبوونا ڕقی خۆیان ئەخۆنەوە.

ویستی ئەو ئایەتەی بۆ بێنێتەوە بەڕەوشتی قورئان هەتا لەسزادانی خۆی بپارێزێت، هارونە ڕەشیدیش وتی: ڕقەکەت خواردمەوە.

خزمەتکارەکە ترسا لەوەی لەدڵیدا ئەو ڕقە بمێنێتەوەو لەدواییدا سزای بدات بۆیە وتی: ﴿وَٱلۡعَافِينَ عَنِ ٱلنَّاسِۗ﴾[2] واتە: ئەوانەی تاوانیان بەرانبەر کردوون چاوپۆشییان لێ ئەکەن و لێیان ئەبوورن.

هارونە ڕەشیدیش وتی: ئەوا لێت بورام، پاشان خزمەتکارەکە وتی: ﴿وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلۡمُحۡسِنِينَ﴾[3] واتە: بێ گومان خودا چاکەکەرانی خۆش ئەوێ.

ئەویش وتی: تۆ لەپێناو ڕەزامەندی خوا ئازادیت، با سەیری بکەین چۆن ئیسلام دەروونەکان بەرەو باڵابوون دەبات، لەکاتی توڕەبوون بەرەو حاڵەتی لێبوردن و چاوپۆشی!

## بۆ ئەوەی جوامێری نەڕوات:

بەسەرهاتێك دەربارەی لێبوردن لە ئەبو هورەیرەوە دەگێڕنەوە دەڵێن: پیاوێکی پێگەشت ئاژەڵێك باخەکەی تێکدابوو خاوەنی باخەکەش کوشتبووی، ئەوەبوو کەس وکاری کوژراوەکە کابرای بکوژیان گرت و ویستیان تۆڵەی لێ

---

١- آل عمران: ١٣٤
٢- آل عمران: ١٣٤
٣- آل عمران: ١٣٤

بسـێنن؛ پیاوەکـە بـەدوای کەسـێکدا دەگـەڕا دەسـتباریەکی بـۆ بکـات هـەتا بگەڕێتـەوە نـاو کـەس و کارەکـەی و هەنـدێك بەرپرسـیاریەتی و بـەڵێنی هەیـە جێبەجێی بکات، ئەبو هورەیرەش هـەتا ڕۆژی دوایـی بـۆی دەستەبەر کرد بـێ ئەوەی بیناسێت و بزانێت خەڵکی کوێیەو لەچ هۆزێکە؟

کاتێك وادەکەی هات، پرسیاریان لە ئەبو هورەیرە کرد: بۆچی بەرپرسیارێتی پیاوێکت کرد کە نایناسیت؟ وتی: لەبەرئەوەی خەڵکی نەڵێن جوامێری نـەماوە، قسەکەی تـەواو نـەکردبوو کابرایـان بینـی لـەدورەوە هـات بـۆ لایـان، چـی تـۆی هێناوە کە کەس ناتناسێت؟ بیرت لەوە نەکردەوە لەتۆڵەسەندن ڕزگارت نابێت؟ خۆ کـەس تـۆی بـۆ نـەدەگیرا؟ کـابرا وتـی: بۆئـەوەی خـەڵکی نـەڵێن جـوامێری نەماوە، ئـەوەبوو کـەس و کـاری کوژراوەکـەش لەبکوژەکـە خـۆش بـوون، هـەتا خەڵکی نەڵێن جوامێری نەماوە.

## لێخۆشبوون فراوانترە لەگوناهەکانمان...

خـوای گـەورە دەفـەرموێت: ﴿ وَالَّذِينَ إِذَا فَعَلُوا فَاحِشَةً أَوْ ظَلَمُوا أَنفُسَهُمْ ذَكَرُوا اللَّهَ فَاسْتَغْفَرُوا لِذُنُوبِهِمْ وَمَن يَغْفِرُ الذُّنُوبَ إِلَّا اللَّهُ وَلَمْ يُصِرُّوا عَلَىٰ مَا فَعَلُوا وَهُمْ يَعْلَمُونَ ﴾[1] واتە: ئەوانەی هەرکاتێ تاوانێکی ناڕەوایان کرد یا ستەمیان لـە خۆیـان کـرد بـە گونـاهێکی تـر، بـیری گـەورەیی خـودا ئەکەنـەوەو داوای لێخۆشبوونی لێ ئەکەن و پەشیمان ئەبنەوە لەو تاوان و ستەمە. کێیش ئـەتوانێ گوناه بپۆشێ لە خودا بەولاوە. هـەروەها بـەردەوام نـابن لەسـەر ئـەو گوناهـەی کردوویانەو ئەزانن ئەوکارەی کردوویانە تاوانەو مایەی سزایە.

---

١- آل عمران: ١٣٥

دیاره تەوبەکردن دەبێت پەشیمان بونەوەیەکی توندو نیەتێکی ڕاستگۆو نەگەڕانەوە بۆ سەر گوناهی بەدوادا بێت، پاشان بەدبەختەیەکەی بەسەریدا زاڵ ببێت و ئارەزووەکانی تێکی بشکێنن لەگەڵ ئەو ژینگەیەی کەتیایدا دەژی و هاوڕێ خراپەکانی بەو شێوەیە بگەڕێتەوە سەر گوناهەکانی و داوای لێخۆش بوون بکات.

خوای باڵادەست دەفەرموێت: بەندەکەم زانی کە من لێخۆشبووی گوناهەکانیم ئەوا لێی خۆشبووم، پاشان بەندە دەگەڕێتەوە سەر گوناهەکانی و دوایی داوای لێخۆشبوون دەکات، خوای گەورە دەفەرموێت: بەندەکەم زانی کە خوایەکی هەیە لە گوناهەکانی خۆش دەبێت دەی فریشتەکان بەشاهیدبن ئەوا من لێی خۆشبووم گەڕانەوەیم لێ وەرگرت، ئەوەش بەوەی دەرگای سەرپێچی لەسەر خۆی دابخات، ئەگەر بەرەو ڕووی ڕۆیشت بانگی دەکاتەوە: ئەی بەندەکەم بۆ کوێ دەڕۆیت؟ ئایا خوایەکی جگە لەمنت دەست کەوتووە لەمن میهرەبانتر بێ! ئەڵڵاە لەو ڕەحمەتەی خوا بۆ ئێمەی موسوڵمان.

## ژوورەکانی ئەو جۆرە کەسانە لەبەهەشتدا:

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: (لەبەهەشتدا چەند ژوورێك هەیە لەناوەوە دەرەوە دەبینی لە دەرەوەش ناوەوە دەبینی وتیان: یارسول الله ئەوانە بۆکێن، فەرمووی: بۆ ئەو کەسانەیە خەڵکی برسی تێر دەکەن بۆ ئەوانەیە قسەی نەرم و نیان دەکەن ئەوانەش ڕۆژوو دەگرن و ئەوکاتانەش خەڵك هەموو نوستون ئەوان بەئاگان و شەونوێژ دەکەن، وتیان کێ دەتوانێت؟ فەرمووی ئومەتەکەم)[1]

هەرکەسێك بەڕویەکی زەردەخەناوی و کراوەوە بەبراکەی بگات و سڵاوی لێ بکات، ئەوەی خواردنی حەڵاڵ بدات بەژن و منداڵەکانی و تێریان بکات، زمانی

---

١- رواه أحمد.

نەرم بێ واتە وتەی جوان بێ لەگەڵ براکانیدا: ﴿ فَبِمَا رَحْمَةٍ مِّنَ ٱللَّهِ لِنتَ لَهُمْ ﴾[1]

واتــە: لەبەرئــەوەی کــە خــودا بــە میهرەبــانی دروســت کــردوویەو دڵــت پــڕ بەزەیییە، نەرم بوویت بۆیان و لەگەڵیان گونجای.

سڵاوکردن بۆ موسوڵمان سڵاو لەبرای موسوڵمانی بکات ئیتر بیناسێت یان نا، وە هەرکەسێك لەمانگێکدا سێ ڕۆژ بەڕۆژو بێ و بەردەوام بێ لەسەری ئەوا چاکەکردن بە دە هێندەی خۆیەتی سێ ڕۆژ بەفەزڵی خوا دەبێت بە سی ڕۆژ، بەمەش هەموو ساڵەکە بەڕۆژو بووە. ئەم کراوەیی و زەردەخەنەکردنە پێچەوانە نیە لەگەڵ سوربوون لەسەر شتەکان، پێغەمبەر ﷺ کەسێکی کراوەو بەشەرم، دەم بەپێکەنین بوو، هەتا جاری وا هەبوو دانەکانی دەردەکەوت لەگەڵ ئەمانەشدا پاکترین کەس بوو هەموو ژیانی بۆ خوای گەورە تەرخان کردبوو. نەمان بیستووەو نەمان زانیوە یەك هاوەڵ ڕوخساری گرژومۆن بووبێ... هەرگیز ئەوە ڕووی نەداوە.

## تێکۆشان و نیەت:

خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿ فَٱسْتَجَابَ لَهُمْ رَبُّهُمْ أَنِّى لَآ أُضِيعُ عَمَلَ عَٰمِلٍ مِّنكُم مِّن ذَكَرٍ أَوْ أُنثَىٰ ۖ بَعْضُكُم مِّنۢ بَعْضٍ ۖ فَٱلَّذِينَ هَاجَرُوا۟ وَأُخْرِجُوا۟ مِن دِيَٰرِهِمْ وَأُوذُوا۟ فِى سَبِيلِى وَقَٰتَلُوا۟ وَقُتِلُوا۟ لَأُكَفِّرَنَّ عَنْهُمْ سَيِّـَٔاتِهِمْ وَلَأُدْخِلَنَّهُمْ جَنَّٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ ﴾[2]

واتــە: خــودا تکاکــەی قوبــووڵ کــردن و ئاواتیــانی هێنایــەدی و، وتــی: مــن هەرکەس لە ئێوە کارێکی چاك بکا پاداشی لەکیس نادەم پیــاو بــێ یــا ئــافرەت،

---

١- آل عمران: ١٥٩

٢- آل عمران: ١٩٥

کـه هەنـدێکتان لـە هەنـدێکتانن، یـا تێکـەڵیتان هەیـەو پێکـەوە هەڵئەسـتن و دائەنیشن و یەک ئایین کۆتان ئەکاتەوە، ئەوانەی ماڵ و حاڵی خۆیان بەجێهێشت و لە شوێن و بەرەی خۆیان دەرکران و، لەپێناوی ڕەزامەنـدیی منـدا ئـازاردران و چـوونە ڕیـزی جیهـادو لەگـەڵ کافرەکـان جـەنگان و لێیـان کـوژرا، ئەوانـە گوناهـەکانیان ئەسـڕینەوەو ئەیانخەینـە چـەند باغچـەیێکی ڕازاوەو جـوان لـە بەهەشتدا کە چەند جۆگاییێکی جوان و ڕوون و سازگاریان پیا ئەڕوات.

لەدوای فەتحەوە کۆچکردن نیە بەڵام تێکۆشان و نیەت هێنان بۆی هەیە، لـە سەرپێچییەوە کۆچ بکات بـەرەو گوێڕایـەڵی، لەتەمەڵیـەوە بـەرەو کـارکردن کـۆچ بکات... ئەم جۆرە کۆچکردنە بەردەوام دەمێنێتەوە.

بەڵام ئازاردان لەپێناوی خوادا ئەوەتا موسوڵمانان لەسەرەتاکانی بەرەبەیانی ئیسـلامدا جۆرەهـا سـزاو ئەشـکەنجە دران. ئـوم سـەلەمە خـوای لێ ڕازی بێـت، کاتێك کوڕەکەیان لەئامێزی وەدەرنـا، ویسـتیان زۆری لێبکـەن دابنیشـێ و کـۆچ نەکات، بـەڵام ڕازی نـەبوو. هـەتا پیاوێك لەقوڕەیشیەکان کەهێشـتا موسـوڵمان نەبووبوو وتـی: خەڵکینـە شـەرم لـەم کارەبکـەن کـەئێوە ئـەنجامی دەدەن..!! ئەمـە ڕەوشـتی عـەرەب نیـە! بۆیـە پێغەمبـەر ﷺ، لێـی خـۆش بـوو لـەدیلی ئـازادیکرد ئەوکاتـەی کـە کەوتـە دەسـتی موسـوڵمانان وەکـو پاداشـتێك بـۆ ئەوکارەی کە لەبەرامبەر ئوم سەلەمەدا کردی.

لەهەڵوێستێکی تردا، پێغەمبەر ﷺ ڕێزێکی زۆری کچی حاتەمی طائی گـرت و ئازادی کرد ئەوکاتەی لەگەڵ هۆزەکەیدا کە (بني طيء) بون بەدیل گـیران لەبـەر ڕێزی باوکی کەحەزی لەڕەوشـتە باڵاکـان بـوو پاشـان فـەرمووی: ئەگـەر باوکـت موسوڵمان بوایە ڕەحممان بۆ داوا دەکـرد لـەخوای گـەورە. ڕەوشـتی پێغەمبـەر ﷺ قورئانیی بوو، قورئانێك بوو بەسەر زەویدا دەڕۆشت.

## نهێنی دڵنیایی دەروون:

خوای گەورە لەسورەتی (المائدة)دا دەفەرموێت:﴿هَٰذَا يَوْمُ يَنفَعُ ٱلصَّٰدِقِينَ صِدْقُهُمْ﴾[1] واتە: ئەمە ئەو ڕۆژەیە کە ڕاستگۆیان ڕاستییەکەیان فریایان ئەکەوێت .

حەسەنی بەصری دەڵێت: خوای گەورە پرسیاری ڕاستگۆبوون دەکات لە ڕاستگۆیان، ئاخۆ ئێمە چۆن بین؟!. پرسیاریان دەربارەی پلەی ڕاستگۆبوونیان لێ دەکات، ئەی ئێمە چی بکەین؟

با لەم بارەیەوە گوێ لەحەسەنی بەصری بگرین چی دەڵێت. پرسیاریان لێ کرد بۆ وا لەمژدە پێدراوان دەچی و ڕوت خۆشە؟! وەڵامی دایەوەو فەرمووی: زانیم کە ڕۆزی من جگە لەخۆم کەسی تر ناتوانێت بیبات دڵم ئۆقرەی گرت، وە زانیم کە کارکردنم جگە لەخۆم کەسی تر پێی هەڵناسێت هەڵسام و هەوڵی تەواومدا، وە زانیم کە خوای گەورە لەهەموو ساتێکدا ئاگای لێمە، بۆیە ترسام بەسەرپێچی کردنەوە بمبینێ، وە زانیم کەمردن چاوەڕێمە خۆم ئامادەکرد بۆگەشتن بەخوا. ئەم وتانە ڕووناکی بۆ پێشەوا عەلی هەڵدەکەن: دنیا ساتێکە بیکەرە ساتی خواپەرستی، ئارەزووی دەروون چاوبرسیە بەقەناعەت ڕای بهێنە، ئەگەر ڕۆچویتە دنیاوە ڕۆت دەخاتە قوڕو لیتەوە، ئەگەر پۆشیت دەتپۆشێت، ئەگەر پیاتدا هەڵداو ستایشت کرد ئەویش پیاتدا هەڵدەدا، ئەگەر بەسکۆو زانی نزمت دەکاتەوە، چەند پادشاو دەسەڵاتدارمان بینی پلەو دەسەڵاتی بەرزبوو کاتێك بەرزتر بوویەوە مرد.

خوای باڵادەست دەفەرموێت: ئەی بەندەکانم بەڕەحمی خۆم بڕۆنە بەهەشتەوە بەکردەوەکانتان لەنێو خۆتاندا دابەشی بکەن. نزمترین پلەی بەهەشت بەئەندازەی هەزار ساڵ ڕۆشتنی سوار چاکێك بەژێر سێبەرێکی دوورو

---

[1] - المائدة: ١١٩

درێژدایه لەبەرئەوە: ﴿فَمَن زُحۡزِحَ عَنِ ٱلنَّارِ وَأُدۡخِلَ ٱلۡجَنَّةَ فَقَدۡ فَازَ﴾[1] واته: ئیتر ئەوەی لە سزای ئاگری دۆزەخ لادراو خرایە بەهەشت، ئەوە بەختیارو سەرکەوتووە. خوای گەورە دەفەرمویت: ﴿لِّلَّذِينَ أَحۡسَنُواْ ٱلۡحُسۡنَىٰ وَزِيَادَةٞ﴾[2] واته: بۆ ئەو کەسانەی چاکە ئەکەن و لە خودا ئەترسن پاداشی زۆر چاك هەیە لەگەڵ زیادەدا.

هەموو ئەمانە خوای گەورە بۆ ئەوانە ئامادەی کردووە کەکردەوەی چاکە دەکەن و زۆر (زیاتریش) واته بینینی خوا (جل جلاله) وشەی (ٱلۡحُسۡنَىٰ) بەرزترین پلەکانی ئیحسانە واته چاکە کردن، وتراوە الحسنی واتە بەهەشتێکە بۆ ئەو کەسانەی لەدنیادا چاکە دەکەن، (وَزِيَادَةٞ) واته بینی خوای پەروەردگار.



---

١- آل عمران: ١٨٥

٢- یونس: ٢٦

# بەهەشتیەکان

## تاقی کردنەوەو بەڵا سروشتی دنیایە...

یەکەم دەمەوێت بڵێم دەبێت موسوڵمان و باوەڕداری ڕاستەقینە دەرك بەشتێکی زۆر گرنگ بکات، ئەویش ئەوەیە خوای گەورەو باڵادەست ڕێگەی لێ دەگرێت بۆگەشتن بەهیواو ئاواتەکانی ئەمەش وەك ڕەحمەتێکی خوایە بۆ ئەو باوەڕدارە، بە بەڵاو نەخۆشی و کەمی ڕۆزیی و خراپی خەڵك لەبەرامبەری و خواردنی مافەکانی لەلایەن خەڵکەوە.

ئەم جۆرە ڕێگرتنە وێنەیەکە لەوێنەکانی ڕەحمەتی خوا، خوای بەندەکان دەیەوێت نەچنە پاڵ دنیا بەڵکو دەیەوێت بێزارت بکات لێی، دەیەوێت پاڵ نەدەیت بەشتێکەوەو ئەو شتە سەرقاڵت بکات بەخۆیەوە، لەهەموو بەڵایەکدا لەهەموو تێکەوتنێکدا دەڵێی: خوایە لەهەموو قەیرانێکدا دەڵێی: خوایە.

زۆرترین کەس لە خەڵکی کە دوچاری بەڵاو نارەحەتی دەبن پێغەمبەرانن ئەوان زۆرترین کەسن کە پابەندو وابەستەن بەخواوە، هەر کە خەڵکی دنیای بینی ئەوان بەڕێگر دەبینین، کەواتە بەڵاو نارەحەتی بەند نیە بەدووربوون لە خواوە، نەخێر ئەو بەڵایە کافر بەتەواوی تێك دەشکێنێت.

## جیاوازی نێوان بەڵاو تاقیکردنەوە:

الابتلاء: تاقیکردنەوەی باوەڕدارە بەخێرو شەڕ، ئەویش ساڵنامەی ژیانی باوەڕدارە بەجۆرێك لەهەموو شتێکی دنیا بێزار دەبێت و بەرەو لای خوا ڕادەکات و پاڵ نادات بەکەسی ترەوە، زۆر سکاڵا کردن لای بەندەکان ناشیرینە،

چونکە تۆ سکاڵا لەو زاتە دەکەیت کە بەرەحمە لای کەسێك کە رەحمت پێ ناکات.

﴿ أَشْكُواْ بَثِّي وَحُزْنِيٓ إِلَى ٱللَّهِ ﴾[1] واتە: من سکاڵای غەم و دڵگرانیی خۆم لای خودای خۆم ئەکەم.

حەزرەتی یەعقوب ئەم ئایەتەی فەرموو، ئەگەر بەندە سکاڵای خۆی بردە لای خوا ئەوا سکاڵاکەی بردۆتە لای زاتێك کە ناخەوێت و بێ ئاگا نابێت.

زانست بەزۆر گێڕانەوە نیە، بەڵکو زانست لەخوا ترسانە، ئەوەیە لەخوا بترسین، ئەگەر زانستێکت بینی یان زانی خوات بیربێنێتەوەو، بەرەو لای خوات ببات، ئەمە ئەو زانستەیە کە هەڵسوکەوتێکە دەجولێت.

دەمانەوێت بنەمایەك دابنێین: دنیا لەسەر ئەم تاقیکردنەوانە بەندە.. بۆچی؟ ئەوە؟ لەبەرئەوەی خەڵکانێك هەن لەبەر خۆشەویستیان بۆ خوا هەمیشە وابەستەن بەخواوە بەدەربڕینێکی سەردەمانە: هێڵێکی گەرم لەنێوان دڵی بەندەو دەرگاکانی ئاسماندایە، ئەم هێڵەش نابێت بە تاقیکردنەوەی زۆر نەبێت، لەبەرئەوە ئەگەر بەندە لەنێوان خۆیی و دنیادا بەهەموو ڕابواردن و فراوانی و دیمەنەکانیەوە بۆ لای واڵا بوو ئەوا لەبیری دەچێتەوە..

﴿ كَلَّآ إِنَّ ٱلْإِنسَٰنَ لَيَطْغَىٰٓ ﴿٦﴾ أَن رَّءَاهُ ٱسْتَغْنَىٰٓ ﴾[2] واتە: ئەوەی ئینکاری نیعمەتی خوا ئەکا بەسەر ئادەمزادەوە یا دەسبەردار ببێ لەو کارەی، بەڕاستی ئادەمزاد عادەتی وایە توغیان ئەکاو غەڕڕا ئەبێ لە خۆی، هەر ئەوەندە خۆی ببینێ بێنیازە لە خەڵك و پێویستی پێیان نییە. لەبەرئەوە دەفەرموێت:

---

١- یوسف: ٨٦

٢- العلق: ٦ - ٧

﴿وَاذْكُر رَّبَّكَ إِذَا نَسِيتَ﴾[1] واته: جا ئەگەر لەبیرت چوو و کەوتەوە بیرت بڵێ: (إن شاء الله).

ئەگەر بیرت چویەوە کەتۆ بەرەو خوا کۆچ دەکەیت، ئەگەر ملکەچیت لەنوێژدا بیر چویەوە ئەوا بیری خۆتی بێنەرەوە، ئەگەر بیرت چویەوە کە گوناهێکت کردوەو پەشیمان نەبوویتەوە با بیرت بێت، لە هەموو سات و کاتێکدا با خوات بیربێت.

## ئەم تاقیکردنەوەیە ڕەحمەتە...

خەڵکانێك هەن وەك ڕەحمەتێکی خواییە بۆیان، بۆ نموونە کچێکی نەخۆشیان پێ دەبەخشێت یاخود بە کەمئەندامی دەیبەخشێت، خەڵکی دەڵێن: ئەمە کەم ئەندامە، نەخێر من دەڵێم ئەم مرۆڤە تاقیکراوەتەوە، ئەم مرۆڤە ڕەحمەت و بەخشینی خوایە بۆ ئەو ماڵە، هەر لەمیانەی نزایان بۆ ئەو کچەیان وابەستە دەبن بەخوای میهرەبانەوە یاخود فەڕو پیتێکە بۆ ئەو ماڵە.

ئێمە وا دەبینین ئەم مرۆڤانە زۆر لەوانە لای خوا باشترن کە بەمۆسیقا سەما بە جەستەیان دەکەن، بەوەش سەرپێچی خوا دەکەن بەڵام ئەو کەم ئەندامە وابەستەیە بەخواوەو لەدڵیدا فەڕو پیتێکی زۆر هەیە.

جابری کوڕی عەبدوڵا خوا لەخۆی و باوکی خۆشبێ، باوکی کەم ئەندام بوو یەکێك لە قاچەکانی نەبوو، ویستی بەشداری بکات لە جەنگی ئوحوددا چوار کوڕیشی هەبوو، کوڕەکانی پێیان وت: بۆکوێ دەڕۆیت باوکە؟ وتی: دەڕۆم بۆجیهاد دەمەوێت بەم قاچە شەلەمەوە پێ بنێمە ناو بەهەشت، وتیان: باوکە ئێمەت بەسە، وتی: سوێند بەخوا لای پێغەمبەری خوا سکاڵاتان لێ دەکەم، ئەوەبوو کردی و لەو جیهادەدا بەشداری کردو شەهیدیش بوو، کاتێك پێغەمبەر

---

١- الكهف: ٢٤

ﷺ جابری بینی بەسەر جەستەی باوکیەوەیەتی و دەگری فەرمووی: جابر سوێند بەو خوایەی بەحەق منی بەپێغەمبەری بۆ ناردوون خوای گەورە لەپشتی پەردەوە نەبێت فەرمایشتی لەگەڵ کەسدا نەکردووە باوکی تۆ نەبێت، کاتێك شەهید بوو بەبێ پەردە فەرمایشتی لەگەڵدا کرد پێی فەرموو: بەندەکەم داخوازیەکانتم بۆ بڵێ. باوکیشت وتی: بمگێڕەوە بۆ دنیا هەتا جارێکی تر شەهید بکرێمەوە، خوای گەورە فەرمووی: من بڕیارم داوەو بڕیارو فەرمانی منیش ناگەڕێتەوەو بەرپەرچ نادرێتەوە: ﴿ مَا يُبَدَّلُ الْقَوْلُ لَدَيَّ وَمَا أَنَا بِظَلَّامٍ لِلْعَبِيدِ ﴾[1] واتە: قسە لای من هەر یەك قسەیەو ناگۆڕێ و، من ستەمکاریش نیم لەبەندەکانی خۆم. بەڵام ئەوا ڕوخساری خۆمم بۆ واڵاکردی هەتا بەیانی و ئێوارە سەیرم بکەیت.

ئەم پیاوە بەشێکی بەرفراوانی زانستی پێدراوە: ﴿وَإِنَّهُ لَذُو عِلْمٍ لِمَا عَلَّمْنَاهُ ﴾[2] واتە: بەڕاستی یەعقووب لەوانە گەیشتووە کە بە وەحی پێمان ڕاگەیاندووە.خوای گەورە ڕاستی شتەکانی پێ بەخشیوە.

## خەسلەتەکانی بەهەشتیەکان:

بەهەشتیەکان چەند خەسلەتێکی دیاری کراویان هەیە:

**یەکەمیان:** ئارام گرتن نیوەی باوەڕە، با گەڕانێك بکەین بەناو پەرتوکەکەی پەروەردگاردا: ﴿إِنَّ الْأَبْرَارَ يَشْرَبُونَ مِن كَأْسٍ كَانَ مِزَاجُهَا كَافُورًا ﴾[3] واتە: بەڕاستی خاوەن ئیمانە پیاوچاکەکانیش لە کاسەیێ ئاو ئەخۆنەوە کافووری

---

١- ق: ٢٩

٢- یوسف: ٦٨

٣- الإنسان: ٥

تێکراوه تا تام و بۆنو چەشی خۆشتر بێ. (الأبـرار) كۆی (بـار)ه یـاخود كۆی (بڕ)، (بڕ)یش واته له مامەڵەكردنیدا ڕاستگۆیه: ﴿ إِنَّا كُنَّا مِن قَبْلُ نَدْعُوهُ إِنَّهُ هُوَ الْبَرُّ الرَّحِيمُ ﴾[1] واته: ئێمه لەمەوبەر كه لـه دنیـادا بـووین هاوارمـان هـەر لـەو ئەكرد. بەڕاستی هەر ئەو خاوەن ئیحسان و میهرەبانه.

ئـەو زاتـەی ڕاسـتگۆیه لەگەڵمانـدا وه لەڕاسـتگۆیی و فـەزڵی خـۆی پـێ بەخشیوین، ئەو زاتەی كه وادەیپێداوین پێشێلی نەكردووەو بەدەم وادەكەیەوە بووه:

﴿وَمَنْ أَصْدَقُ مِنَ اللَّهِ قِيلًا ﴾[2] واته: كێ له خودا قسه ڕاست تـرو وەفا بـه وەعـده كردووتـره؟. ﴿وَمَنْ أَوْفَى بِعَهْدِهِ مِنَ اللَّهِ ﴾[3] واتـه: كـێ لـه خـوا بەوەفاتره به وەعدەو گفتی خۆی؟

كەواته ئادەمیزادی ڕاستگۆ یاخود (الأبرار) واته ئەو پێشینانەی كـه بـەدەم وادەو بەڵێنەكانیانەوەن، یەكەم پەیمان لەگـەڵ خـوای باڵادەست بـه گوێڕایـەڵی كردنی.

پەیمانی خواش ئەوەیه لەگـەڵ بەنـدەو دروسـت كراوەكانیـدا چاكەكار بـین. دەبێت لەگەڵ خەڵكیدا به ڕەحـم بـین، پێغەمبـەر ﷺ دەفـەرموێت: (ڕەحـم بـەو كەسانه بكەن كـه لەزەویـدان ئـەوەی لەئاسمانەكانـه ڕەحمتـان پـێ دەكـات)[4]، خوای گەوره دەفەرموێت:

---

١- الطور: ٢٨

٢- النساء: ١٢٢

٣- التوبة: ١١١

٤- سنن الترمذي.

﴿إِنَّ ٱلْأَبْرَارَ يَشْرَبُونَ مِن كَأْسٍ كَانَ مِزَاجُهَا كَافُورًا ﴾[1]

(الكأس) له زمانی عەرەبیدا بەو کوپـە دەوترێت کە پـڕە، ئەگـەر لـە زمـانی عەرەبیدا وترا (الكأس) واتە کوپێکی پڕ لە شەراب، شەرابی دنیا زۆر جیاوازە لە شـەرابی ڕۆژی دوایـی، خـوای گـەورە دەربـارەی بەهەشـت دەفـەرموێت: بـە گەورەیی و دەسـەڵاتم ئـالودەبوانی شـەراب و (الـديوث) ناچـنە نـاوی؟ هـاوەڵان وتیان: ئـەی پێغەمبـەری خـوا ﷺ ئـەوا زانیمـان ئـالودەبوی شـەراب کێیـە ئـەی (الديوث) کێیە؟ فەرمووی: ئەو کەسەیە کاری قێزەون لە خێزانەکـەی دەبینێ و پێی ڕازی دەبێت.

چۆن فێری غیرەی بکەین؟ ئەگەر پیاوەتی تیابروێنرێت ئـەوا غـیرەی مرۆیـی تیادەڕوێت، سەرەڕای غیرە لەئیسلامدا.

عەرەب لەپێش ئیسلامدا خاوەنی غیرە بـوون، وای لێهـاتووە غـیرەی هەنـدێ ئەوانەی کە تیایانـدا نـەماوەو گەیشـتونەتە ئاسـتی ئەبوجـەهل و ئـەبو لەهـەب، چۆن؟ لەمێـژوودا خوێندوتانەتـەوە کـە ئەبوجـەهل بـە ئـوم جـەمیلی ژنـی ئـەبو لەهـەبی وت: بـا سـەمات لەگەڵدا بکـەم؟. نـەخێر.. ڕووی نـەدا ئەگـەر ڕوویبدایـە ئەژنۆی دەشکاند! شاعیرێکی سەردەمی نەفامی دەڵێت:

وأغض طـرفي إن بَـدَتْ لـي جـارتي حتـى يـواري جـارتـي مـأواها

واتە: چاوم دادەخەم ئەگەر دراوسێکەم دەرکـەوت، هـەتا دراوسـێکەم خـۆی کۆ دەکاتەوە.

ئـەوە ژیریـی عـەرەب بـوو، لەبەرئـەوە بـوو لەنێوانیانـدا پێغەمبـەر ﷺ هـات لەبەرئەوە گەلێك بوون ڕەوشـتێکیان هـەبوو لـەهیچ گـەلێکی تـردا نـەبوو، وەکـو

---

١- الإنسان: ٥

پیاوەتی و ئازایەتی و پاراستنی دراوسێ و پەیمان پارێزی، ئەوەتا پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: (بۆ ئەوە هاتووم هەتا ڕەوشتە باڵاکان تەواو بکەم)[1].

چاکەکارو ڕاستگۆیان لەگەڵ گەوادەکاندا ناخۆنەوە بەڵکو: ﴿مِن كَأْسٍ كَانَ مِزَاجُهَا كَافُورًا﴾[2]

(الكافور) ناخورێتەوە بەڵکو بۆنێکی زۆر خۆشە، لەبەرئەوە خوای گەورە دوای ئەوە دەفەرموێت: (عَيْنـاً) واتە خواردنەوە لەکانی نەك لەکافور، کافور شلەمەنی نیە بەڵکو وەکو وتم بۆنێکی خۆشە: ﴿إِنَّ الْأَبْرَارَ يَشْرَبُونَ مِن كَأْسٍ كَانَ مِزَاجُهَا كَافُورًا ۝٥ عَيْنًا يَشْرَبُ بِهَا عِبَادُ اللَّهِ﴾[3] واتە: بەڕاستی خاوەن ئیمانە پیاوچاکەکانیش لە کاسەیێ ئاو ئەخۆنەوە کافووری تێکراوە تا تام و بۆنو چەشی خۆشتر بێ. ئەو کافوورەیش لە کانییەکە بەندەکانی خوا لێی ئەخۆنەوە.

کەواتە یەکەم خەسڵەت لە خەسڵەتکانی ئەوانەی کە دەچنە بەهەشت ئەوەیە کە بەندەی خوان، کەواتە چاکەکارو ڕاستگۆیان پاشان بەندەکانی خوا، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿بَعَثْنَا عَلَيْكُمْ عِبَادًا لَّنَا﴾[4] واتە: چەند بەندەیێکی بەهێز و ئازا لە بەندەکانی خۆمان ڕەوانە ئەکەین بۆ سەرتان.

نەك بەندەی دنیابێت لەبەرئەوە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت (چارە ڕەش بێت بەندەی دنیا، چارە ڕەش بێت بەندەی درهەم و پوڵ، چارە ڕەش بێت بەندەی جلی ڕەش چارە ڕەش بێت بەندەی قەیفە، چارە ڕەش بێت سەرشۆڕ

---

١- رواه البخاري.

٢- الإنسان: ٥

٣- الإنسان: ٥ - ٦

٤- الإسراء: ٥

بێت (وإذا شيك فلا انتقش) واتە: (وە ئەگەر پۆشاكی رێك و پێكی پۆشی ڕازاوە نەبێ)[1] . واتە ئەگەر درکێك چوو بەقاچیدا خوای گەورە کەسێکی بۆ نانێرێ بۆی دەربێنێت، درکێك وای لێ دەکات ئازار بکێشێت لەبەرئەوەی تەنها غەمی دنیایە، بەڵام باوەڕدار غەمی بەرزە، غەم و ئەندێشەی خوای گەورەیە، هەم و غەمی ئومەتەکەم لە دەوڵەمەندیدایە، بەشی خۆت لەدنیادا لەیاد مەکە بیکەرە تۆژەنکردنەوەی ڕۆژی دوایت. خوای گەورە حەز دەکات ئاسەواری نیعمەتکانی بە بەندەکانییەوە ببینێ ﴿وَأَمَّا بِنِعْمَةِ رَبِّكَ فَحَدِّثْ﴾[2] واتە: باسی ئەو نیعمەتانەی خوایش بۆ خەڵك بگێڕەوە کە داونی پێت، کە باشترین جۆری ئەو باسی نیعمەتی خوا گێڕانەوەیش بە کردەوە ئەوەیە بەشی هەژاران و دەست کورتانی لێ بدەی.

هاوەڵان بە پێغەمبەریان ﷺ فەرموو: ئەی پێغەمبەری خوا، هەرکەسێك لە ئێمەی بەندەی خوا ئەگەر حەز بکات جلەکانی چاك بێت و پێڵاوی چاك بێت و جوان بێت.. ئایا ئەمە لە خۆبەزلزانینەوەیە؟ پێغەمبەری ئازیز فەرموی: خۆبەزلزانین (بطر الحق وغمط الناس)[3] .

وتیان: بەندە لەنێو بەهەشتدا دەڕوات تولێکی ئاڵتونی پێیە دوڕ و گەوهەری پێوەیە دەیدات بە زەویەکەدا، خاکی بەهەشتیش پاڵفتەو کارینە واتە ئەصڵە، پاك و بێگەردی بۆ خوا، چەندێك لەخاکەکەی درا کانی تیادا دەردەچێت بەو شێوەیەی ئارەزووی دەکات و حەزی لێیەتی وەك ئەوەی لە نیەتیدایە، بەهەشت یەك چین نیە، بەڵکو ژوورە بەسەر ژوورەوە، چەند پلەیەکە نێوان زەویەکەی و ئاسمانەکەی ڕێگای (٧٠) ساڵە! باوەڕدار بەبیرو هۆشی لەبەرزەخی

---

١- رواه البخاري.

٢- الضحى: ١١

٣- رواه مسلم.

پەروەردگاریدا (الملکوت) دەگەڕێت، بەدڵی دەگەڕێت لەخۆشەویستی خوادا، بە ترسیشی دەگەڕێت بۆ خۆشەویستی خوا، خوای گەورە دەفەرموێت: (بەندەکەم بگەڕێ وەك چۆن دەگەڕایت) ئەوەش ڕێزلێنان و هاندانە،.. سەردەمی ئارامگرتن تەواو بوو، سوێند بەخوا لەبەخشندەیی خوایە کاتێك بەهەشت دروستکراو پێی فەرموو قسە بکە، وتی: باوەڕدارن براوەن، فەرموی خۆزگەم بەخۆت ئەی شوێنگەی پادشایان.

هەر لەنێو دانیشتوانەکەیدا ئەو هەزارانەی تێدایە کە کەس لەدنیادا گرنگی پێ نەدەدان بۆیە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: (چەند کەس هەن قژ ئاڵۆزکاو و تەپ و تۆزاوی، جلی بەرگیان شڕو گوێت پێ نەداوە ئەگەر هەر داوایەك لای خوا بکات بۆی جێبەجێ دەکات)[1]. بەڕاستی ئەوە پادشایە، پادشای بەهەشتە، خوا بەهەشتی کردوەتە موڵکی لەبەرئەوەی لەدنیادا دڵی خۆی کردۆتە موڵکی خوا، لەدڵی خەڵکیدا ئیسلامی کردۆتە موڵکیان بە کردەوەو پێشەنگ بوون و ئارامگرتن و هەڵسوکەوت.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿عَيْنًا يَشْرَبُ بِهَا عِبَادُ اللَّهِ يُفَجِّرُونَهَا تَفْجِيرًا﴾[2]

واتە: ئەو کافوورەیش لە کانییەکە بەندەکانی خوا لێی ئەخۆنەوە، هەڵیئەقوڵێنن بە هەڵقوڵاندن لە هەر کوێیەکا دڵیان بیگرێ. واتە خۆی لێی دەخواتەوە هەتا هەست بەتام و چێژەکەی بکات.

---

١- سنن الترمذي.

٢- الإنسان: ٦

## کێن ئەو بەندانەی خوا؟

## خەسڵەتی بەندەکانی الرحمن:

یەکــەم خەســڵەتی بەنــدەکانی الــرحمن: ﴿يُوفُونَ بِٱلنَّذۡرِ وَيَخَافُونَ يَوۡمٗا كَانَ شَرُّهُۥ مُسۡتَطِيرٗا﴾[1] واتە: ئەو بەندانەی خوا وەفا ئەکەن بە هەر نەزرێ لەسەر خۆیانیـان نـەزرکردبێ‌و لـە ڕۆژێ ئەترسـن کـە شـەڕو مسـیبەتی بـە هـەموو لایـەکا بـڵاو ئەبێتەوە. واتە لە ڕۆژی دوایی، لە حاڵەتی ترسدان لە ڕۆژی دوایی.

﴿وَيُطۡعِمُونَ ٱلطَّعَامَ عَلَىٰ حُبِّهِۦ﴾[2] لەوانەیە کەسێك بڵێـت: حـەزی لـەخواردن نیـەو ئارەزووی نیە بۆی بەخێر، حەزی لێیەتی، بـەڵام لەگـەڵ ئـەوەی حـەزی لێیـەتی دەیبەخشێت بەو کەسانەی کە لایان نیـە، ئـەوە زۆر باشـترە لـەوەی حـەزی لـە خـواردن نیـە، واتـە لـە خۆیـان دەبـورن: ﴿وَيُطۡعِمُونَ ٱلطَّعَامَ عَلَىٰ حُبِّهِۦ مِسۡكِينٗا وَيَتِيمٗا وَأَسِيرًا﴾[3] واتە: لە خۆشەویستیی خواداو بۆ خاتری خوا خواردەمەنی ئـەدەن بـە گەدا کە بەشی خۆی شك ناباو بە هەتیوو بە دیل. واتە خواردن دەدات بەهـەژار، هەژار کێیە؟! ئەو ئادەمیزادەیە کە پێویستی هەیە بەڵام داوای ناکات.

## جیاوازی هەیە لەنێوان (الفقیر و المسکین)دا:

المسکین ئەو هەژارەیە کە پێویسـتی زۆری هەیـە بـەڵام داوا لەکـەس ناکـات، بەڵام الفقیر ئەو هەژارەیە هیچی نیە بەڵام داوای دەکات. ئیسلام دەبەخشێ بـەو هەژارانەی کە ئاتاجن بەو بەخشینە نەك هەژارێك کە کاری تـەنها داواکـردن بێـت چونکە ئیسلام دانی پێدانانێت، هەژار پێداویستیەکەی بـاری گـران کـردووە یـان

---

١- الإنسان: ٧

٢- الإنسان: ٨

٣- الإنسان: ٨

لەبەرئەوەیە لاوازەو داوا لەکەس ناکات یاخود سەری بەرزی ڕێگەی پێنادات دەستی پان بکاتەوە، ئەمە مانای لەم ئایەتەدا بەرجەستە دەبێت:

﴿يَحْسَبُهُمُ ٱلْجَاهِلُ أَغْنِيَآءَ مِنَ ٱلتَّعَفُّفِ تَعْرِفُهُم بِسِيمَٰهُمْ لَا يَسْـَٔلُونَ ٱلنَّاسَ إِلْحَافًا﴾[1] واتە: یەکێ نەیانناسێ و ئاگاداری حاڵیان نەبێ بە دەوڵەمەندیان ئەزانێ؛ چونکە نەفسیان بەرزەو دەست لە خەڵك پان ناکەنەوەو موحتاجیی خۆیان دەرنابڕن، بەڵام بە شێوەو حاڵیاندا دیارە کە بێ دەرامەت و هەژارن.

## بەندە لە چاکەکاریدا (الإحسان) . وە لە تاقیکردنەوەشدایە:

ئیبن عەباس(رەزای خوای لێ بێ) لەنێو کۆمەڵێك خەڵکدا دانیشتبوو فەرمووی: پێم گەیشتووە کە هەژاران بەنیو ڕۆژ پێش دەوڵەمەندەکان دەچنە بەهەشت: ﴿وَإِنَّ يَوْمًا عِندَ رَبِّكَ كَأَلْفِ سَنَةٍ مِّمَّا تَعُدُّونَ﴾[2] واتە: یەك ڕۆژی خوایی وەك هەزار ساڵ وایە لەو ساڵانەی ئێوە ئەیان ژمێرن.

وتیان ئیبن عەباس ئەمە بۆچی وایە؟ وتی: بۆ ئەوەی دەوڵەمەندەکان لێپرسینەوەیان دەربارەی سامانەکانیان لێبکرێت (پرسیار لەسامانی دەکرێت.. لەکوێوە پەیدای کردوە؟ وە لەچیدا خەرجی کردووە) بەڵام هەژار سامانێکی نیە هەتا لێپرسینەوەی لەگەڵدا بکرێت، پیاوێك وتی: من هەژارم . ئیبن عەباسیش فەرمووی: ئایا کاتێ نانی شێوت دەخۆیت بەشی نانی بەیانیت بۆ دەمێنێتەوە؟ وتی: بەڵێ، ئیبن عباس فەرمووی: نەخێر تۆ هەژار نیت.

---

١ - البقرة: ٢٧٣

٢ - الحج: ٤٧

سەعیدی کوڕی زەید (ڕەزای خوای لێ بێ) (لەکاتێکدا تاکە پۆشاکەکەی دەشۆردو چاوەڕاون بوو وشك بێتەوە تا لەبەری بکاتەوە) وتی: من هەژارم؟ ئیبن عەباس فەرموی: ئایا بڕۆیت قەرز لە خەڵکی بکەیت پێت دەدەن؟ وتی: بەڵێ ئیبن عباس وتی: قەرزیان پێ نەداویت هەتا نەیان زانیبێت کەبۆیان دەگێڕیتەوە، کەواتە هەژار نیت. پیاوێك هەڵساو وتی: من قەرز لەخەڵکی دەکەم ئایا هەژارم؟ ئەویش فەرموی: دەتوانی کار بکەیت؟ وتی: بەڵێ، فەرموی کەواتە تۆش هەژار نیت.

پیاوێك هەڵسا هەموو مەرجێکی تێدابوو ئیبن عەباس لێی پرسی کاتێك شەو دەکەیتەوەو ڕۆژ دەکەیتەوە لەخوای خۆت ڕازیت؟ وتی: بەڵێ، ئیبن عەباس فەرموی: تۆ لەو کەسانەی کەپێش دەوڵەمەندەکان دەچنە بەهەشتەوە.

ئەمە پرسیارلێکردنی دەوڵەمەندێکی سوپاسگوزارە کە مافی تەواوی سامانی داوە، پرسیارێکی ڕێزلێگیراوە، لەبەر هۆشداری پێدان و ئاگادارکرنەوەو سوکایەتی پێکردن و ئازاردانی نیە، وەکو تاقیکردنەوەیەك وایە، دیارە تاقیکردنەوە لە هەموو حاڵەتێکدا بەڵا نیە.

دیارە دەوڵەمەندێکی سوپاسگوزار باشترە لەهەژارێکی ئارامگر کە تەنها ئارامگرتنی بەدەستەوەیە، دەوڵەمەند چەندین ئاراستەی هەیە سامانەکەی تێدا خەرج بکات پاشان لە ڕۆژی دوایدا لێپرسینەوەی لەگەڵدا دەکرێت:

﴿ وَيُطْعِمُونَ ٱلطَّعَامَ عَلَىٰ حُبِّهِۦ مِسْكِينًا وَيَتِيمًا وَأَسِيرًا ﴾[1]

بێ باوك ئەو هەژارەیە کە باوکی مردووە تەمەنی پێ نەگەشتووە، بێ باوکیش هەیە باوکی سامانێکی زۆری بۆ بەجێهێشتووە کەزەکاتی دەکەوێتە سەر، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: (ئەو کەسەی بێ باوکێك دەگرێتە ئەستۆ بۆ

---

١- الإنسان: ٨

ئەو یان کەسێکی تر من و ئەو کەسە لەبەهەشتدا وەك ئەمە واین (ئاماژەی بە هەردوو پەنجەی ناوەڕاست و شایەتومان کرد)[1].

بەندەش بەم بۆنەیەوە بە موسوڵمانان دەڵێم لەدەزگا گەورەکانی چاودێری کردنی بێ باوکان بپرسن، وێنەی منالآنی بێ باوك ئامادەبکەن منداڵەکانیان وا لێ بکەن خۆیان منداڵێکی بێ باوك هەڵبژێرن هەتا بیانگرنە ئەستۆی خۆیان و خەرجییان بۆ مسۆگەر بکەن و لەبەرخوا بیانکەنە برای خۆیان و لەڕۆژانی پشودا پێشوازییان لێبکەن و لەبۆنەکاندا سەردانیان بکەن... کاری خێر بەم شێوەیە دەبێت: ﴿وَيُطْعِمُونَ الطَّعَامَ عَلَىٰ حُبِّهِ مِسْكِينًا وَيَتِيمًا وَأَسِيرًا﴾[2] دیل ئەو کەسەیە کە لەشەڕدا دەگیرێت، ئەم قسەیە بەسەر براکانمان لەفەلەستین و هەر جێیەکی تر کەموسوڵمانانی تیا دەچەوسێنرێتەوە جێبەجێ دەبێت، ئەرکی سەرشانمە کۆمەکی بکەم، یان بەتێرکردنی یاخود بەنزای خێر یان چارەسەرکردنی کێشەکەی، بە بەهێزکردنی پشتی و یارمەتیدانی.

## هەموو کەسێك ئەوەی بۆی دروست بووە دەتوانێت ئەنجامی بدات...

چەند کەسێکی هەژار هاتن بۆ لای پێغەمبەر ﷺ وتیان: ئەوەی لای دەوڵەمەندەکانە لای ئێمە نیە، نوێژ دەکەن نوێژ دەکەین، بەڵام ماڵ و سامانیان دەبەخشن ئێمە نیمانە بیبەخشین، پێغەمبەر ﷺ فەرموی: (شتێکتان پێ بڵێم فریای ئەوانەی پێش خۆتان بکەون و پێش ئەوانەی دوای خۆشتان بکەون؟ ئەوەی ئێوە هێناوتانە هیچ ئومەتێك نەیهێناوە مەگەر ئەوکەسە نەبێت وەکو

---

١- رواه مسلم.

٢- الإنسان: ٨

ئەمە دەهێنێت لەدوای هەموو نوێژێکەوە (١٠) جار (سبحان الله) بکەن و (١٠) جار (الحمد الله) بکەن و (١٠) جار (الله أکبر) بکەن)[١].

هەژارەکان بەم هەواڵە زۆر دڵ خۆش بوون و نیازمەندانە گەڕانەوە ئەم هەواڵە گەیشتە دەوڵەمەندەکان ئەوانیش کاری خۆیان کرد، هەژارەکان گەڕانەوە بۆلای پێغەمبەری خواو ﷺ وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ دەوڵەمەندەکانیش ئەم هەواڵەیان پێ گەیشتوە، پێغەمبەر ﷺ پێکەنی و فەرمووی: ئەوەش فەزڵی خوایە دەیدا بەوەی کە ویستی لەسەرە خوا خاوەنی فەزڵ و بەخشینێکی گەورەیە.

لەوانەیە نەزانین هەواڵەکە دەکەوێتە کوێوە. هەموو کارەکان بەنیەت و نیازەکانە، دادوەرێك هەبوو لەنێو بەنی ئیسرائیلیەکاندا ساڵێك کەوتنە قات و قڕی و برسێتیەوە وتی: خوایە بە گەورەیی و شکۆمەندیت ئەگەر بەئەندازەی ئەو کێوانە خۆراکی من بوونایە بەسەر خەڵکیدا دابەشم دەکرد. خوای گەورە فەرمووی ئەی موسا: بەو بەندەیەمان بڵێ ئەوا نیەتەکەیمان لێ وەرگرت.

کاتێك حەزرەتی ئەبوبەکر(رەزای خوای لێ بێ) لە (مسطح) تورەبوو کەشەرەفی لەکەدار کرد، کەچی فەرمووی: دەمەوێ خوا لێم خۆشبێ، بۆیە لە جاران زیاتر خەرجی پێ دەدا هەتا ئەوەی لە دڵیدا لەبەرامبەر (مسطح) دروست بوو بسڕێتەوە: ﴿إِنَّمَا نُطْعِمُكُمْ لِوَجْهِ اللَّهِ لَا نُرِيدُ مِنكُمْ جَزَاءً وَلَا شُكُورًا ﴿٩﴾ إِنَّا نَخَافُ مِن رَّبِّنَا يَوْمًا عَبُوسًا قَمْطَرِيرًا﴾[٢] واتە: پێشیان ئەڵێن: خواردنتان هەر لەبەر ڕەزامەندیی خوا ئەدەینێ و نامانەوێ لێتان نە پاداشمان بدەنەوەو نە سوپاسیشمان بکەن. بە

---

١- رواه البخاري.

٢- الإنسان: ٩ - ١٠

ڕاستی ئێمە لە خوای خۆمان ئەترسین کە گرفتاری ناڕەحەتیی ڕۆژێکی تووش و سەختمان بکا.

ئێمە لەناو بەهەشتدا دەگەڕێین لەپەرتوکەکەی پەروەردگاردا، بەڵام دەبێت بترسین، بترسین لەعاقیبەت شەڕی، لەوانە بترسین کە ستەم لێکراون، لەفریشتەی مەرگ بترسین لەناکاو هێرشمان بۆ بهێنێت و تەوبەمان نەکردبێت، وەکو وتراوە ئەوەی بترسێت سەلامەت دەبێت.

سەهلی کوڕی عەبدولاَ(ڕەزای خوای لێ بێ) دانیشتبوو قورئان خوێنێك قورئانی دەخوێند: ﴿وَسَقَىٰهُمْ رَبُّهُمْ شَرَابًا طَهُورًا﴾[1] واتە: خوای خۆیان شەرابی خاوێنی پێ نۆش کردوون.

لێوەکانی دەجولاَند وەکو ئەوەی بخواتەوە.. وتیان: ئەوە چیە سەهل وتی: بەخوێندنەوەی ئەم ئایەتە وا هەست دەکەم دەخۆمەوە.. الله أکبر هەستی بەو ئایەتە کرد لەخوا ئومێدی خواست کە لەوانە بێت.

## چەمکی ترس لە ڕۆژی قیامەتدا:

لەڕۆژی دوایدا بە دوو پێناسەی جیاواز ترس دووبارە بۆتەوە، بۆچی؟ لەبەرئەوەی ڕۆژی دوایی ڕۆژی گرژیی و مۆنیە، بەندە لەنێوان دوو ترسدایە، ئایا بەترسەوە خواپەرستی ئەنجام بدەین؟ نەخێر. بەڵکو لەخۆمان بترسین کردەوەکانمان نەگەنە ئاستی وەرگیراو.

جارێك پێغەمبەر ﷺ ڕۆشت بۆ لای ئەبو موسای ئەشعەری نوێژی دەکردو قورئانی دەخوێند، کاتێك نوێژەکەی تەواوکرد پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو: لەدەنگە خۆشەکەی داودت پێ بەخشراوە، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا گوێت لێم

---

١- الإنسان: ٢١

بوو؟! فەرموی: بەڵێ، وتی: بەو زاتەی تۆی بەحەق ناردوۆە بە پێغەمبەریەتی، ئەگەر بمزانیایە گوێت لێگرتوم زۆر بەجوانترو بە تەجویدەوە دەمخوێندەوە.

خـوای گـەورە دەفـەرموێت: ﴿إِنَّا نَخَافُ مِن رَّبِّنَا يَوْمًا عَبُوسًا قَمْطَرِيرًا﴾[1] واتـە: بـە ڕاستی ئێمە لە خوای خۆمان ئەترسین کە گرفتاری ناڕەحەتیی ڕۆژێکی تـووش و سەختمان بکا.

بڕوادار لەنێوان دوو ترسدایە: یەکێکیان تێپەڕیوەو نازانێت خوای گەورە چـی لێدەکات، ئەوی تریان بەڕێوەیەو نازانێت خوای گەورە چ بڕیارێکی لەسەر داوە.

بۆیە دەبێت بەم شـێوەیە کارەکانـت چـاکتر بکـەیت، کەمـەکان لای خـوا زۆر بکەو کـردەوە زۆرەکانـت بچـوك بکـەرەوە واتـە ئـەوەی ئـەنجامت داوە بـەزۆری مەزانە. پێشەوا ئەحمەدی کوڕی حەنبەل (رضي الله عنه) لەسەر مەسەلەی دروستکراویی قورئان ئەشکەنجەیان دەدا کەچی لەکاتێکدا ئەوانەی لەوێدابوون دەگریـان ئـەو زەردەخەنەی دەکرد، کاتێك پرسـیاریان لێکـرد، ئـەی پێشـەوا ئەوکاتـەی لێیـان دەدایت تۆ زەردەخەنەت دەکردو لە ئێمەشیان نەدەدا کەچی ئێمە دەگریـاین؟! پێشەوا وتی: ئێوە ئەو قامچی وەشێنەتان دەبینی، بـەڵام مـن خـوای بەنـدەکانم دەبینی.

جارێـك پرسـیار لـە خـاتو عائیشـە کـرا (ڕەزای خـوای لەسـەر بـێ): بۆچـی پارەکەت بۆندار دەکـەیت؟ فـەرموی: لەبەرئـەوەی ناکەوێتـە دەسـتی هەژارەکـە بـەڵکو دەکەوێتـە دەسـتی پـەروەردگارەوە، بـەڵێ بـارو سروشـتی زانایـان و پێشینانی ئەم ئومەتە بەو جۆرە بوون خوا لێیان ڕازی بێت.

وعلي قدر أهل العزم تأتي العـزائم    وتأتي علي قدر الكرام المكـارم

واتە:

---

١- الإنسان: ١٠

(بەتواناو لێهاتوویی خەڵکی خاوەن هەڵوێست سەرفرازی بەدی دێت
بەهێزو ویستی خەڵکی بەخشندە شکۆمەندی بەدی دێت)

## ئارامگرتن نیوەی باوەڕە...

دوو جۆر ئارامگرتن هەیە: ئارام گرتن لەسەر سەرپێچیکردن، لەوەش توندتر ئارامگرتنە لەسەر گوێڕایەڵی، هەرکەسێك سێ ڕۆژ یاخود چوار ڕۆژ بەسەریدا تێپەڕێ بێ ئەوەی تاقیکردنەوەیەکی بەسەردا بێت با بەچاکە کردنەکانیدا لەگەڵ خوادا بڕواتەوە، باسی تاقیکردنەوەکانی باوەڕدار باسێکە هیچ گفتوگۆیەکی تێدا نیە، ئەوەی تاقی نەکرێتەوە یان دڵی مردووە یاخود باوەڕ لەدڵیدا لاوازە یان خۆبەگەورەزانە یان ریا کارە یان لەخۆباییە.

من لەبەرامبەر بەڵاو تاقیکردنەوەکاندا ئارام دەگرم چونکە لەگەڵ خواپەرستی و گوێڕایەڵیدا ئارام دەگرم، کەواتە گوێڕایەڵی پێویستی بە ئارامگرتنە:

﴿وَأۡمُرۡ أَهۡلَكَ بِٱلصَّلَوٰةِ وَٱصۡطَبِرۡ عَلَيۡهَا﴾[1] واتە: فەرمانیش بدە بە ژن و منداڵ و کەسوکارو دەستەو بەستەت کە نوێژ بکەن و بۆ خۆیشت بەردەوام بە لەسەر ئەم نوێژکردنە لە خۆشیو ناخۆشیدا.

نەیفەرموە ئارام بگرە، بۆچی؟! هەتا ئارامگرتن لات ببێتە خوو نەریتێك خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿وَجَزَىٰهُم بِمَا صَبَرُواْ جَنَّةٗ وَحَرِيرٗا ١٢ مُّتَّكِـِٔينَ فِيهَا عَلَى ٱلۡأَرَآئِكِۖ لَا يَرَوۡنَ فِيهَا شَمۡسٗا وَلَا زَمۡهَرِيرٗا ١٣ وَدَانِيَةً عَلَيۡهِمۡ ظِلَٰلُهَا وَذُلِّلَتۡ قُطُوفُهَا تَذۡلِيلٗا ١٤ وَيُطَافُ عَلَيۡهِم بِـَٔانِيَةٖ مِّن فِضَّةٖ وَأَكۡوَابٖ

---

١- طه: ١٣٢

﴿كَانَتْ قَوَارِيرَا ﴿١٥﴾ قَوَارِيرَا مِن فِضَّةٍ قَدَّرُوهَا تَقْدِيرًا ﴿١٦﴾ وَيُسْقَوْنَ فِيهَا كَأْسًا كَانَ مِزَاجُهَا زَنجَبِيلًا ﴿١٧﴾ عَيْنًا فِيهَا تُسَمَّىٰ سَلْسَبِيلًا ﴿١٨﴾ وَيَطُوفُ عَلَيْهِمْ وِلْدَانٌ مُّخَلَّدُونَ إِذَا رَأَيْتَهُمْ حَسِبْتَهُمْ لُؤْلُؤًا مَّنثُورًا﴾[1]

واته: له پاداشی سەبرکردن و خۆڕاگرتنیشیاندا بەهەشتی دانێ تیا دانیشن و ئاوریشمی دانێ لەبەری‌کەن. پاڵ ئەدەنەوە له بەهەشتا به قەنەفەوە نه هەتاو ئەبینن لەو بەهەشتەداو نه سەرمای سەخت. سێبەری درەختەکانی بەهەشت نزیکە بەسەر سەریانەوەو چنینی میوەی درەختەکانی بەهەشتیان بۆ ئاسان کراوە بە ئاسان کردن. ئەگەڕێن بە سەریانا بە کاسەی زیوین و بە کووپی بێدەسکی وەك ئاوێنە. وەك ئاوێنە لەشێوە تیا دەرکەوتنا، بەڵام لەڕاستیدا زیوین کە خۆیان چۆنیان بە دڵ بوون ئاوا دروست کراون بۆیان. شەرابێکیان لەو کاسانەدا دەرخوارد ئەدرێ کە زەنجەفیلی تێکەڵ کراوە. ئەو زەنجەفیلەیش لە سەرچاوەیەکەوەیە پێی ئەڵێن سەلسەبیل. مێردمندالآنێکی تازە هەڵچوویش ئەگەڕێن بەسەریانا ئەم شەرابەیان دەرخوارد ئەدەن، کە هەمیشە هەر لەو تەمەنەدا ئەمێننەوەو، ئەگەر بیبانبینی وا ئەزانی مرواریی هەڵڕژاون.

پۆشاکەکانیان لەبەهەشتدا ئاوریشمە لەبەرئەوەی لەدنیادا لێیان حەرام کرابوو، (ٱلْأَرَآئِكِ)واته ئەو قەنەفەیەی کەئەملاو لای هەیە بۆ ئەوەی ئەو کەسەی لەسەری دادەنیشێت پشوو بدات لەسەری، نە گەرمی خۆر دەبینن نە بەستەڵەکی دۆزەخ، سێبەر لەدوورییەکی زۆرەوە بەسەریاندا دێت، بەروبومەکان شۆڕبۆتەوە لەسەریان، پشتی و پاڵپشتی جوان و ڕازاوە زۆر بەئاسانی لەبەردەستیاندایە.

---

١- الإنسان: ١٢ - ١٩

لەپیاوێك پرسیاكرا كە لەنیعمەتەكانی بەهەشتدا نغرۆ بووبوو، دوای ئەوەی كە ئازارو سزایەكی زۆری چێشت: لە ژیانتدا نائومێدیت بینیوە بەخۆتەوە؟ وتی: بەعیزەت و دەسەلاتت لەوكاتەوە دروستت كردوم هەر لەنیعمەتدا بووم..!! هەرچی سزاكانی دنیا بوو بیری چویەوە.

پرسیار لەكەسێك دەكرێت لەبەرزەخدا: دەتەوێت بگەڕێیتەوە بۆ دنیا؟ پیاوە باوەڕدارەكە دەڵێت: نەخێر نەخێر... بمبەن بمبەن بۆ لای خوای خۆم.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَيُطَافُ عَلَيۡهِم بِـَٔانِيَةٖ مِّن فِضَّةٖ﴾[1] . لەبەرئەوەی لەدنیادا حەرام بوو، كوپ كە لەخاكی بەهەشت دروستكراوە لە میسك نەك سلیكۆن، كوپ و پەرداخێك كە لە شوشەیەكی پاڵفتەی پاك دروستكراوە بەرەنگی زیو، خزمەتكار بەئەندازەی خواردنەوەت بۆ تێدەكات بێ ئەوەی داوابكەیت، واتە هەست بە ئارەزوومەندیت دەكات بۆ خواردنەوە.

ئەو زەنجەبیلەی لەدنیادا دەتخواردەوە تامی لەگەرودا توندبوو جگە لەبۆنەكەی، لەبەرئەوە ئیبن عەباس(رەزای خوای لێ بێ) دەفەرموێت: (لیس في أخراكم من دنياكم إلا أسماء فقط) واتە: ئەوانەی دنیاو بەهەشت بەراوردیان ناكرێت.

## ڕابواردنێكی ئامادەو بەردەوام:

نیعمەتەكانی بەهەشت بێزاركەر نین كەس ماندو نابێت لێیان، ئەو كانیەی كە لێی دەخورێتەوە پێی دەوترێت (سلسبيلا) لەپێكهاتەی (السلاسة أو تسلسل) واتە نیعمەتەكان بەدوای یەكدا دێن، هەروەها منداڵانی هەمیشە زیندوو بەدەوریاندا دێن (ولدان مخلدون) واتە بەردەوام لەخزمەتیاندا دەبن، (ولدان)

---

١- الإنسان: ١٥

کۆی (ولد)ە واتە منداڵانێکی بچوك، ئایا فریشتەن یاخود مرۆڤن یان خوای گەورە بەدەسەڵاتی خۆی دروستی کردوون ﴿ كُن فَيَكُونُ ﴾[1]

یاخود نەوەو منداڵی موسوڵمانانن کە بەمنداڵی مردوون؟ ئێمە پێمان وایە خوای گەورە دروستی کردون و ڕۆڵەی موسوڵمانان نین، لەبەرئەوەی کاتێك منداڵە بچوکەکەم دەبینم خزمەتی کەسێك دەکات نیگەران دەبم و غەمم زیاد دەکات، لەبەهەشتدا شتێك نیە سینە ساڤ بشێوێنێ، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَإِذَا رَأَيْتَ ثَمَّ رَأَيْتَ نَعِيمًا وَمُلْكًا كَبِيرًا ﴾[2] واتە: کە ئەو بەهەشتە ببینی نازو نیعمەت و سامانێکی زۆر لەویادا ئەبینی.

ڕابواردنی بەنادیار ناوبردوە بۆ گەورەکردن و زۆرکردنی، موڵك و ماڵ لە خاوەنداریی ئەو موڵکەوەیە ﴿ فِي مَقْعَدِ صِدْقٍ عِندَ مَلِيكٍ مُّقْتَدِرٍ ﴾[3] واتە: لەنشینگەی پەسەندو بەدڵا دائەنیشن لای پادشایەکی توانا کە خواوەندی ئەم جیهانەیە.

هەر کورسیەك نەمێنێتەوە ئەوە درۆزنە، ئەو موڵکەی دەمێنێتەوە ئەوە ڕاستەقینەیە، کاتێك هارونە ڕەشید لە سەرەمەرگدا بوو وتی: ئەی ئەو زاتەی کەموڵك و ماڵی لەناو ناچێت بەزەیت بەو کەسەدا بێتەوە کەموڵك و ماڵی تیا دەچێت. خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ عَالِيَهُمْ ثِيَابُ سُندُسٍ خُضْرٌ وَإِسْتَبْرَقٌ وَحُلُّوا أَسَاوِرَ مِن فِضَّةٍ وَسَقَاهُمْ رَبُّهُمْ شَرَابًا طَهُورًا (٢١) إِنَّ هَٰذَا كَانَ لَكُمْ جَزَاءً وَكَانَ سَعْيُكُم مَّشْكُورًا ﴾[4]

---

١- البقرة: ١١٧
٢- الإنسان: ٢٠
٣- القمر: ٥٥
٤- الإنسان: ٢١ - ٢٢

واتە: ئەو مێرد منداڵە شەرابگێڕانە كراسی ئاوریشمی سەوزیان لەبەرایە هیی ناسك و هیی ئەستوورو، بازنی زیویان كراوەتە دەستومەچەك و، خوای خۆیان شەرابی خاوێنی پێ نۆش كردوون. جا بەو خاوەن باوەڕە پیاوچاكانە ئەوترێ: ئەم خێروبێرەی پێتان دراوە پاداشی بیروباوەڕو كردەوەی چاكتانەو، ڕەنج و تەقەلاتان بۆ فەرمانبەرداریی خوا، لای خوا بە خۆڕایی نەڕۆیشتووەو پاداشی دراوەتەوە. (عالیهم) واتە بەرزترینیان بەرگی ئاوریشمی نەرمی سەوزیان لەبەردایە، وە پارچەی ئاوریشمی تەنك، جلی ژێرەوەی بەهەشتیەكان ئاوریشمە.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَسَقَىٰهُمْ رَبُّهُمْ شَرَابًا طَهُورًا﴾[1]

خوای گەورە بەفەزڵ و منەتباری بەدەستی خۆی ئاویان پێ دەدا دوای خواردنەوەی كافور و زەنجەبیل و كانی سەلسەبیل، كاتێك بەنێو بەهەشتدا دەگەڕێن مسك و عەنبەرو جۆرەها بۆنی خۆشیان بەسەردا دەبارێت.

خوای گەورە دەفەرموێت: ئەی فریشتەكانم، كەس وكارو بەندەكانم و دراوسێكانی منتان تێركرد؟ ئەوانیش دەڵێن: بەڵێ خوایە، پرسیار دەكات: تێرتان كردن؟. جۆرەها خواردنیان لەبەهەشتدا بۆ دەهێنان كەلەوەو پێش نەیان بینیوە، لەبەرئەوە دەفەرموێت: ﴿وَلَدَيْنَا مَزِيدٌ﴾[2] زیاتریان بدەنێ..

شەراب و (مەی)ێكیان دەدەنێ لەبەهەشتدا لەوەو پێش شتی وایان نەخواردۆتەوە.

هەموو لایەك كۆدەبنەوە وەك لەڕۆژانی هەینیدا كۆدەبونەوە، لەبەرئەوە بەدبەختی بۆ ئەو كەسانەی كە واز لە نوێژی هەینی دێنن، مۆر دێنن بەسەر سێ بەشی دڵیدا، هەر كەسێك دوو نوێژی هەینی نەكات مۆر بەسەر سێ بەشی دڵیدا

---

١- الإنسان: ٢١

٢- ق: ٣٥

دێت، هەر کەسێکیش سێ نوێژی هەینی نەکات ئەوا مۆر بەسەر هەموو دڵیدا دێت و نورو ڕۆشنایی خوای بە روودا دەبەسرێت. خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿ وَأَقْبَلَ بَعْضُهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ ﴾[1] واتە: هەندێکیان ڕووئەکەنە هەندێکی تریان لەناو خۆیانا پرسیارو وەڵام ئەکەن.

سەردانی یەکتر دەکەن، بۆ نموونە تۆ ئەبو هورەیرەت خۆش دەوێت و دەتەوێت بیبینیت، من دەمەوێت خالیدی کوڕی وەلید ببینم، هەتا بەسەرهاتی جەنگی یەمامەم بۆ بگێڕێتەوە، خێرا فریشتەکان دەتگوێزنەوە، حەز دەکەین پێغەمبەر ﷺ ببینین هەتا باسی (الإسراء والمعراج)مان بۆ بکات.

﴿ لَهُم مَّا يَشَاءُونَ فِيهَا وَلَدَيْنَا مَزِيدٌ ﴾[2] واتە: هەرچییان ئارەزوو لێ بێ بۆیان هەیە لەو بەهەشتەداو لەوەیشمان زیاتر لایە بۆیان. هەروەها دەفەرموێت:

﴿ وَسَقَاهُمْ رَبُّهُمْ شَرَابًا طَهُورًا ﴾[3] ، واتە پاکردنەوە لەستەم و نادادی دنیا.

# ڕابواردن و خۆشگوزەرانی بەهەشت

## دواهەمین کەسی دۆزەخیەکان کەدێتە دەرەوەو دەبرێت بۆ بەهەشت...!!!

پێش ئەوەی باسی خۆشگوزەرانی بەهەشت بکەین تیشکێك بخەینە سەر دواهەمین کەس کە لەنێو ئاگر دێتە دەرەوەو دەڕوات بۆ ناو بەهەشت، ئەو کەسە کێیە و بەسەرهاتەکەی چۆنە؟

پێشەوا موسلیم لە (صحيح)ەکەیەوە بۆمان دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموی: دواهەمین کەس لە ئاگر دەردەهێنرێت لەو کەسانەیە کە

---

١- الطور: ٢٥
٢- ق: ٣٥
٣- الإنسان: ٢١

(سەرپێچیکارێکی یەکتاپەرستە) کەسێکە سەیری لای ڕاستی دەکات کەس نابینێت، سەیری لای چەپ دەکات هەر کەس نابینێت، دەڵێت خوایە لەم ئاگرە دەرم بێنە مەمکەرە بەدبەخترین کەسی دروستکراوەکانت، خوای گەورە وەڵامی دەداتەوەو دەفەرموێت: ئەگەر دەرم هێنایت داوای هیچی تر نەکەیت ئەویش وتی نەخێر خوایە داوای هیچی تر ناکەم. فەرموی: دەریبێنن، بە سنگەکڕێ و سنگەخشێ هاتە دەرەوە کاتێ گەیشتە قەراغەکەی وتی: خوای گەورە شتێکی پێداوم نەیداوە بەکەسی تر لەم دنیایەدا! دوای ئەوە کەوتە سەیرکردن بەلای ڕاست و کەسی نەبینی ئاگر نەبێت لای چەپیشی کەسی نەبینی ئاگر نەبێت، وتی: خوایە لەبەرچاوم دووری بخەرەوەو مەیهێڵە (نایەوێت بیبینێت بەهۆی توندی ئەو سزاو ئەشکەنجەیەی لەو ئاگرەدا چەشتی، وەکو ئەو مرۆڤەی ڕوداوێکی بەسەردادێت یاخود بەسەر یەکێك لەنزیکەکانی دێت نایەوێت ئەوە ببینێتەوە یان پیایدا تێپەڕبێت، ئاخۆ ئەو شوێنە چۆن بێت کە هەموو سزاو ئازارێکی تێدا چەشتبێت خوای گەورە پەنامان بدات لەگەڵ ئێوەدا)، خوای گەورە دەفەرموێت: بەندەکەم چەندێك بێ وادەی بۆ بەڵێنەکەت! ئەی پەیمانت پێ نەدام هیچی ترم لێ داوانەکەیت.؟ وتی: خوایە مەمکەرە بەدبەخترین کەسی بەندەکانت. خوای گەورە فەرموی دیمەنی ئاگر لەبەرچاوی لاببەن (وەکو ئەوەی لەبەردەم خوادا خۆی ملکەچ بکات جگە لەخوا کێی تری هەیە) کاتێك هێنرایە دەرەوە لەو شوێنە لەدورەوە چاوی بەدرەختێك کەوت سێبەرێکی بەرفراوانی هەبوو ڕوبارێك بەژێریدا دەڕۆشت خۆی پێنەگیراو ئارامی نەما (ئەو هێشتا کاریگەری ئاگرەکەی بەسەرەوە ماوە) بۆیە وتی: خوایە بمخەرە ژێر سێبەری ئەو دارە، هەتا هەواکەی هەڵبمژم و ئاوی ڕوبارەکەی ژێری بخۆمەوە. خوای گەورە فەرموی: بەندەکەم چەندێك بێ پەیمانیت ئەی پەیمانت پێ نەدام داوای هیچی تر نەکەیت، وتی: خوایە مەمکەرە بەدبەخترین کەسی بەندەکانت. خوای

گەورە فەرموی: بیگوێزنەوەو بیبەن بۆ ژێر ئەو دارە (ئیتر لەوێوە لەم دار بۆ ئەو دار دەڕۆشت، لە قۆناغی سێیەمدا خۆی لەنزیك بەهەشتدا بینیەوە) وتی: خوایە بمخەرە پاڵ دەرگاکەی. خوای گەورە فەرمووی: بەندەکەم چەندێك بێ پەیمانیت ئەی پەیمانت پێ نەدام ئیتر داوای هیچی تر نەکەیت. وتی: خوایە مەمکەرە بەدبەخترین کەسانی نێو بەندەکانت. خوای میهرەبان فەرموی: بیبەنە پاڵ دەرگای بەهەشت، کاتێ گەیشتە پاڵ دەرگاکەی سەیری کرد دەرگاکانی بەهەشت لەبەردەمیدا کراونەتەوە ئەبڵەق بوو لەو دیمەنەی بینی، ئەگەر جارێکی تر مردنی لەسەر بنوسرایەتەوە لەخۆشیدا دەمرد، دەڵێت خوایە بمخەرە ناو ئەو بەهەشتە. خوای میهرەبان فەرموی: بەندەکەم چەندێك بێ وادەی! ئەی پەیمانت پێ نەدام داوای هیچی تر نەکەیت؟ وتی: خوایە مەمکەرە بەدبەخترین کەسی نێو بەندەکانت. خوای گەورە پێی دەفەرموێت موڵك و سامانێکت پێ دەبەخشم بەقەد موڵکی پاشایەکی دنیا ئەویش دەڵێت: خوایە گاڵتەم پێ دەکەیت تۆ خوای هەموو جیهانی (وا گومان دەبات کە جێگەکەی پڕ بوەو کەسی تر ناگرێت) خوای گەورە پێی دەفەرموێت: سەد هێندەی قەبارەی دنیات دەدەمێ. بەهۆی زۆر دڵەڕاوکێی ئەو بەندەیەوە دەڵێت: خوایە تۆ بەندەی منی و من خوای تۆم. پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: لە زۆر دڵخۆشی خۆیدا هەڵەی کرد پێغەمبەر ﷺ پێکەنی، کاتێك پرسیاری لێکرا فەرموی: (خوا بەو بەندەیە پێکەنی و پاشان ڕۆشتە بەهەشتەوە).

## کەس بەنزاکردن تیاناچێت و بەدبەخت نابێت:

لەمە سود وەردەگرین کە بەندە، یەکەم: لە ڕەحمی خوا نائومێد نەبێت، دووەم: لە نزاکردن بۆ لای خوا بێزار نەبێت و، هیچ شتێك بە گەورەتر نەزانێت لە تواناو لە دەسەڵاتی خوای گەورەو باڵادەست.

ئەوە حەزرەتی موسایە علیه السلام دەفەرموێت: (خوایە شەرم دەکەم داوایەکی بچوکت لێ بکەم، خوای گەورە فەرمووی ئەی ئەو کەسەی قسەم لەگەڵدا دەکەیت شەرم مەکە لەوەی داوای نرخی خواردنێك بکەیت) واتە نرخی خوێیەك، کێ هەیە جگە لە خوا گەورەو بچوکت پێ ببەخشێ.

بەڵام کاتێك داوا لە خوا دەکەیت ورەت بەرز ڕابگرەو هەرگیز لەنزاکردن نائومێد مەبە. تەنانەت ئەگەر بینیت نزاکانت گیرا نابن غەمبار مەبە لەبەرئەوەی خوای گەورە دەیەوێت لەبەردەرگاکەیدا بیت کە تۆ ملکەچترین کەسی. خوای گەورە حەز دەکات گوێی لە دەنگی بەندەکەی بێت کەنزا دەکات بۆیە دەفەرموێت: (پێویستی بەندەکەم دوا بخەن حەز دەکەم گوێم لەدەنگی بێت).

لەوانەیە ئەگەر پێمان ببەخشێ دوربکەوینەوە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَإِذَا مَسَّ ٱلْإِنسَٰنَ ٱلضُّرُّ دَعَانَا لِجَنۢبِهِۦٓ أَوْ قَاعِدًا أَوْ قَآئِمًا فَلَمَّا كَشَفْنَا عَنْهُ ضُرَّهُۥ مَرَّ كَأَن لَّمْ يَدْعُنَآ إِلَىٰ ضُرٍّ مَّسَّهُۥ ﴾[1] واتە: بنیادەمی ستەمکار کە تووشی زیانێك ئەبێ، وەك نەخۆشیو فەقیریو بێحاڵی، بە پاڵکەوتن و دانیشتن و بەپێوەو لە هەموو کات و ساتێکدا لێمان ئەپاڕێتەوە ئەو ناخۆشییەی لەکۆڵ بکەینەوە، جا کە چووین بەدەنگیەوە و، مەینەتەکەمان لەکۆڵ کردەوە، دیسان ڕێگای گومڕاهی ئەگرێتەوەبەرو لە خۆی بایی ئەبێ، ئەڵێی هەرگیز لێمان نەپاڕاوەتەوە بۆلابردنی ناخۆشی! ستەمکارە لەسنووردەرچووەکان، ئابەم جۆرە، کردەوەی

---

١- یونس: ١٢

بەدی خۆیان و لەخۆبایی‌بوونیان لە بەرچاو جوانکراوە!. ئەوە لە ڕەحمەتی خوایە بتخاتە بەر دەرگاکەی هەتا ئارامگریت فێربکات.

ئەو پیاوەی کە دواهەمین کەس بوو لە دۆزەخیەکان لەنێو ئەو یەکتاپەرستە سەرپێچیکارانەی کە ماوەیەکی دیاری کراوی لەسزا تێدا بردە سەرو پاشان لێی هاتەدەرەوە، ئەمەیش وشەی کافرو هاوەڵدانەری لەسەر جێبەجێ نابێت ئەوانەی کە لەئاگردان.

﴿ يَـٰمَـٰلِكُ لِيَقۡضِ عَلَيۡنَا رَبُّكَ ﴾[1] واتە: ئەوانەی لەناو ئاگری دۆزەخان هاوار ئەکەنە دەرگاوانی دۆزەخ کە ناوی (مالیك)ەو پێی ئەڵێن: ئەی مالیك! بەڵکو کارێ بکەی خوا گیانمان بکێشێ‌و بمرین و بحەسێینەوە.

کەواتە مەودایەك هەیە بۆ موسوڵمانی یەکتاپەرست هەتا بگەڕێتەوە بۆ لای خوای خۆی، ئێستاش فرسەت ماوە مادام دڵ لێدەدات.

## بەهەشت بەخشینێکە دوای باوەڕ:

هەندێ کەس وا دەزانن کە بەخشینی خوای گەورە بۆ موسوڵمانان و باوەڕداران لە بەهەشتدا بۆ قەرەبوکردنەوەی هەندێك لەو بێ بەش بوونانەی دنیایە کە موسوڵمان دوچاری بووە، بەڵام موسوڵمان لە دنیادا بێ بەش نەبووە، بەڵام ئەو خۆی وایزانیوە لە شتانێك بێبەشبووە کە بەچێژو خۆشی زانیوە، ئەمەش وانیە، ئێمە لە نیعمەتانێکی زۆردا دەژین و هەستی پێ ناکەین و بەگەورەی نازانین و فەزڵی شتە بەسەرچووەکان دەدەین بەسەر ئەوانەی کە دەمێننەوەو بیر لەدانایی خوا ناکەینەوە لە بەخشین و گرتنەوەو پێ نەدان.

بۆ نموونە کاتێك ئادەمیزادێك ئاو دەخواتەوە هەست بەنیعمەتی خوا دەکات و دەڵێت سوپاس بۆ ئەو خوایەی بەڕەحمەتی خۆی ئەم ئاوەی کردۆتە ئاوێکی

---

[1] - الزخرف: ٧٧

شیرین و سازگارو بەهۆی گوناهەکانەوە نەیکردۆتە ئاوێکی سوێری ناخۆش و وای لێکردوین هەست بەنیعمەتی ئاو بکەین.

باشترین ڕۆزیەك لەدنیادا بدرێت بەئادەمیزاد لەش ساغیە. لەش ساغی تەنها لەش ساغی جەستە نیە بەڵکو لەش ساغی دنیاو ڕۆژی دواییە، کاتێك مەی خۆرێك دەبینیت، دەڵێیت سوپاس بۆ ئەو خوایەی منی پاراستوە لەوەی ئەو بەندەیەی دوچار کردوە نزای بۆ دەکەیت، کەسێکت بینیوە ئەندامێك لەئەندامەکانی جەستەی لەدەست دابێت. دەی کەواتە سوپاسی خوا بکە لەسەر ئەوەی بە تۆی بەخشیوەو نەیداوە بە کەسێکی تر.

کاتێك منداڵەکانت بینی نوێژ دەکەن و منداڵی دراوسێکەتان نایکات سوپاسی خوا بکە لەسەر نیعمەتی ڕێنمویی خوا بۆ منداڵەکانت.

لەوە زیاتر سەلامەتیت دەوێت، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: (هەرکەسێك لەئێوە ڕۆژ لە ماڵەکەی خۆیدا بە بێ ترس بکاتەوە و لەش ساغ بێت و ڕۆزی ئەو ڕۆژەی هەبێت کە تیایدا دەژی وەکو ئەوە وایە کە خوای گەورە هەموو دنیای پێ بەخشیبێت)[1]

## گرتنەوە لەلایەن خواوە سەرچاوەی بەخشینە:

بەڵام خوای گەورە بەگرتنەوەی هەندێ شت لێت بێزارت دەکات هەتا هیچ شتێك سەرقاڵت نەکات لەخۆی، بەڵام وەکو وتمان ئەمە بێ بەش کردن نیە، بەڵکو بێ بەش ئەو کەسەیە لە چێژی قورئان بێ بەشە، باوەڕدار وابەستەیە بەخوای پەروەردگارەوە، خاوەنی رازی بوونی دڵنیایی و سینەیەکی کراوەیە وەکو ئەوە وایە هەموو دنیای پێ درابێت.

---

١- رواه الترمذي.

هەندێك خەڵك ملیارەها خەرج دەكەن هەتا بۆ ساتێك بەختەوەر بن بێ ئەوەی دەستیان بكەوێت.

ولست أرى السعادة جمع مالاً ولكن التقيَّ هو السعيد

واتە: بەختەوەری لەكۆكردنەوەی ساماندا نابینم، بەڵام لەخواترساو بەختەوەرە.

هەندێ كەس وادەزانن هەژاری سەرچاوەی ئازارو مەینەتە نەخێر هەرگیز ئەوە سیاسەتی ژیان نیە، خوای پەروەردگار دەفەرموێت:

﴿ فَقُلْنَا يَٰٓـَٔادَمُ إِنَّ هَٰذَا عَدُوٌّ لَّكَ وَلِزَوْجِكَ فَلَا يُخْرِجَنَّكُمَا مِنَ ٱلْجَنَّةِ فَتَشْقَىٰٓ ﴿١١٧﴾ إِنَّ لَكَ أَلَّا تَجُوعَ فِيهَا وَلَا تَعْرَىٰ ﴿١١٨﴾ وَأَنَّكَ لَا تَظْمَؤُا۟ فِيهَا وَلَا تَضْحَىٰ ﴾[1] واتە: جا بە ئادەممان وت: بەڕاستی ئەم شەیتانە دوژمنە بۆت و بۆ ژنەكەت، دەسا ئاگاداربە دەرتان نەپەڕێنێ لە بەهەشت و گیرۆدەی ناڕەحەتی ببی. بێگومان ئەمە بۆ تۆ لە بەهەشتا هەیە كەوا نە برسیت ببێ تێیداو نە بێ بەرگ و پۆشاك بی. تینوویشت نەبێ تیایاو گەرمات نەبێ.

سەیركە چۆن خوای گەورە هۆكارەكانی ژیانت لەم ئایاتەدا دیاری دەكات:

﴿ إِنَّ لَكَ أَلَّا تَجُوعَ فِيهَا وَلَا تَعْرَىٰ ﴾ برسیەتی و بێ بەرگی.

﴿ وَأَنَّكَ لَا تَظْمَؤُا۟ فِيهَا وَلَا تَضْحَىٰ ﴾. تینویەتی و گەرمی خۆر، (تضحی) مەبەستی لەوەیە كەماڵێكت نیە پارێزگاریت لێبكات.

كەواتە چوارشت هەیە: (برسیەتی و تینویەتی) و (نیشتەجێ بوون و بەرگ و پۆشاك) ئەمە چوار بنەمای سەرەكین بۆ هەژاری ئەگەر لێیان پارێزرابیت وەكو ئەوە وایە هەموو شتێكت پێ درابێ، لەبەرئەوەی خوای گەورە وادەی بە ئادەم

---

١- طه: ١١٧ – ١١٩

دا ئەم شتانەی لە بەهەشتدا بداتێ، بەڵام ئادەمیزاد دەیەوێت هەرچیەك لە زەویدا بێتە مۆڵكی خۆی و بێ ئەوەی بزانێت كە لەوانەیە سەرچاوەیەك بێت بۆ بەدبەختی.

هەندێكیش بیانوی ئەوە دێننەوە كە داهاتو بۆ ڕۆڵەكانیان دابین دەكەن...

﴿ وَلْيَخْشَ الَّذِينَ لَوْ تَرَكُوا مِنْ خَلْفِهِمْ ذُرِّيَّةً ضِعَافًا خَافُوا عَلَيْهِمْ فَلْيَتَّقُوا اللَّهَ وَلْيَقُولُوا قَوْلًا سَدِيدًا ﴾[1] واتە: با ئەوانەی میرات وەرئەگرن و، خزمو هەتیوو هەژارانیان لا كۆئەبنەوە، وا فەرز بكەن كە خۆیشیان ئەمرن و منداڵەكانیان دەستەپاچەو لانەواز داماون و ئەڕۆنە ئەو شوێنانەی میراتیان تیا بەش ئەكریو چاوەڕوانی دەست و دەهەنەیان ئەبن. هەروەكو حەز ئەكەن بەشیان بدەن و ئیحتیاجییان جێبەجێ بكەن، بەشی ئەو هەتیوو خوێش و هەژارانەیش بدەن و دڵیان خۆش بكەن. با لە خودا بترسن و قسەی دامەزراوی شەرعییان لەگەڵ بكەن.

بە (عومەری كوڕی عبد العزیز)یان وت (ڕەزای خوای لێ بێ) حەوت كچەكەت بەجێدەهێڵێت؟! وتی: ترسم لێیان نیە سورەتی (الواقعة)م فێركردون، ئەگەر چاكبن ئەوە خوای گەورە لێخۆشبووە بۆ ئەوانەی بۆ لای ئەو دەگەڕێنەوە، خۆ ئەگەر پێچەوانەی ئەوەن ئەوا شتێكیان نادەمێ هەتا بەهێزیان بكات بۆ سەرپێچیكردنی پەروەردگار.

سەیری دانایی حەزرەتی عومەر بكە ژیانی كچەكانی دایە دەست خوا وە فێری كردن هانای بۆ بەرن، وە ئەو پارەی ناو نەبردوە بەوەی پارەیە بەڵكو پارەی خەڵكە بەحەقی خۆی. وردبەرەوە لەم فەرمایشتەی خوای گەورە كە دەفەرموێت:

---

[1]- النساء: ٩

﴿ٱلۡمَالُ وَٱلۡبَنُونَ زِينَةُ ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَاۖ﴾[1] واته: ماڵ و سامان و ئەولاد جوانیی ژیانی دنیان و زوو لەناوئەچن.

نەیفەرمووە سەرچاوەی ژیان ژیانی دنیایە، بەڵکو پارە جوانیەکی دەرەکیە وە لەهەمان کاتدا فیتنەیە: ﴿أَنَّمَآ أَمۡوَٰلُكُمۡ وَأَوۡلَٰدُكُمۡ فِتۡنَةٞ﴾[2] واتە: زۆر چاك بزانن ماڵو دارایی‌و ئەولادو نەوەتان هۆی ئاژاوەو نەگبەتین بۆتان.

لەهەر تاقیکردنەوەیەکدا دەبێت سوپاسگوزار بین، باوەڕدار دەبێت بەشوێنگەکانی قەدەر رازی بێت وە خوای گەورە نەیفەرموە نابێت بەندە لەم شتانە نزیك بێتەوە مەگەر بەئەندازەی ئەو جوانیە نەبێت کە بەهۆیەوە دوچاری تاقیکردنەوە بۆتەوە ئەوەتا دەفەرموێت: ﴿لَتُبۡلَوُنَّ فِيٓ أَمۡوَٰلِكُمۡ وَأَنفُسِكُمۡ﴾[3] واتە: قەسەم بە خودا ئێوە ئەی موسوڵمانەکان لەلایەن خوداوە تاقی ئەکرێنەوەو تووشی زیان ئەبن لە ماڵ و سامانتاندا لەسەر دەستی کافرەکان.

تۆ خۆت دوچاری بەڵا دەکەیت، بۆ نموونە کەسێك ئەوەندەی هەبێت بەشی بکات کەچی قەرز دەکات لەبانك، هۆکارەکەی ئەوەیە دەیەوێت کارەکانی یاخود کۆمپانیاکەی فراوانتر بکات بۆچی؟ (ئەوەی کەمەو بەشت دەکات باشترە لەوەی زۆرەو بێ ئاگات دەکات).

ئەمەش بانگەشەیەك نیە بۆ خاوبوونەوەو گەڕانەوە، چیت دەوێت لەدنیا ببیە بەڵام نیەتەکەت بەتەواوی لەپێناوی خوادا بێت، بیکەرە هۆکاری ئاوەدان کردنەوەی زەوی، ئاڵای (لا إله إلا الله)ی پێ بەرزبکەرەوە، مەیخەرە دڵتەوە

---

١- الكهف: ٤٦

٢- الأنفال: ٢٨

٣- آل عمران: ١٨٦

بەڵكو با لەدەستتدا بێت، بۆ ئەوەی بەو شێوەیەت لێبێت دەبێ هەست بەوە بكەیت ئەوەی كە ڕۆزیت دەداتی پەروەردگارەو كردویەتیە ئەمانەتێك لەدەستتدا ئینجا سەیرت دەكات چی لێ دەكەیت.

كورتەی وتە ئەمەیە بەختەوەری نزیكبوونە لەخوا چەندێك لەخوا نزیك بیتەوە ئەوەندە لەنزمی بەرز دەبیتەوە دنیا لێت دوردەكەوێتەوە، بەختەوەری ئەو ویستەیە كە خوا بۆ بەندەی بڕیار دەدات كە لەسەر ڕێگاكەی ڕاوەستاو بێت.

## بە چاوی دنیاوە سەیری ڕۆژی دوایی مەكە:

ئەوە بزانە كە تۆ نامریت هەتا نەگەیت بە ڕۆزی خۆت. فریشتەی مەرگ لەبەر دەرگادا دەوەستێت و دەفەرموێت لەترسی مـن دەگرین مـن فـەرمان پێكراوم! یاخود بۆ ئەو دەگرین كەبێ دەسەڵاتە، سوێند بەخوا فلسێكم لەڕۆزیەكەی كەم نەكردۆتەوە، وە ساتێكیم لە تەمەنی كەم نەكردوەتەوە، وە من جار لەدوای جار دەگەڕێمەوە لاتان هەتا كەستان نامێڵمەوە. پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: ئەگەر گوێتان لەو وتانەی فریشتەی مەرگ بوایە ئەوا بۆ خۆیان دەگریان و ئارەزویان بۆ دنیا نەدەما.

ئەی كەواتە دنیا بۆ دراوە بە ناموسوڵمانان؟ بەئارەزووی خۆیان پیایدا دەگەڕێن، ئەمەش لەبەرئەوەیە ئەوان بۆ دنیای خۆیان دڵسۆز بوون بۆیە پێیان درا، بەڵام ئێمە كەمتەرخەمیمان كرد لە ئاینەكەماندا و دڵسۆز نەبووین بۆی بۆیە لێمان سەندرایەوە.

ئەوەی ئازار دەرە دەبینیت زۆربەی ئەو شتانەی كە موسوڵمان سەرقاڵ دەكات لە ڕۆژی دوایی ئەوەیە كە: ئایا چەند پەریمان دەبێت وە چەندمان دەبێت لەوەو لەوە..!! تەنانەت باسەكانی ڕۆژی دوایی بۆتە تێڕوانینە

دنیاییەکان و گرنگی بەوە نادەین چۆن پێی دەگەین؟ وەچۆن دەچینە ناوی؟ ئەو کارانە چین کە دەمانگەیەنێتە لای؟

## دڵنیابەو سەیرکە بزانە چیت پێیە...!!

بەڵام ئایا دڵنیابین و ئومێدمان هەبێت یاخود بترسین و لەدڵەڕاوکێدا بین؟ پێویستە لەسەرمان دڵنیابین، بەڵام ئەوە ئێمەین کە گرفتەکان بۆ خۆمان وەدی دێنین و دوچاری گوناهیشمان دەکەن، هیچ پێیەك بەیەکدا نایەت یان هیچ دڕکێك ناچێت بە پێماندا بەهۆی گوناهو کارە خراپەکانمانەوە نەبێت. خوای گەورەش لێت خۆش دەبێت، خوای گەورە دەفەموێت: ﴿مِّمَّا خَطِيٓـَٔـٰتِهِمْ أُغْرِقُوا۟﴾[1] واتە: جا ئەم قەومی نووحە بەهۆی تاوانەکانیانەوە لە تۆفانا نوقم کران و خنکێنران.

ئێمەش لە ئارەزووە دنیاییەکاندا نغرۆ بووین، خەڵکیش وا دەزانن ئەوە نیعمەتێکە، لەکاتێکدا وانیە، ئێمە وەك هۆکارێك بەکاری ناهێنین بەڵکو کردومانەتە ئامانج، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: (چارەڕەش بێت بەندەی دنیا چارەڕەش بێت بەندەی فلس و درهەم، چارەڕەش بێت بەندەی بەرگ و پۆشاك)[2].

باسەکە ئەوە نیە دوچاری ترس و دڵەڕاوکێ بین بەڵکو ئایا کارەکانمان بەمەبەستی ڕەزامەندی پەروەردگارمان ئەنجام دەدەین نوێژەکانمان، ڕۆژوومان.. ئایا ریاکاری و لەخۆبایی بوون و هاوەڵ دانان بۆ خوامان تیایە، یاخود ڕاستگۆیی و دڵسۆزی و دڵنیابوونمان تیایە، ئایا پشتی تەواومان بەستوە

---

١- نوح: ٢٥

٢- رواه البخاري.

بەخوا، بەڵام تەنانەت لە پشت بەستنمان بەخوا نارێکی دەنوێنین و پشت بەخەڵکی دەبەستین.

بەندە گوناه دەکات و دەڵێت خوا لێخۆشبوو و میهرەبانە، بەڵام ئەگەر پارەیەکی دۆڕاند یاخود بازرگانیەك دەبینێت زۆر سورە لەسەر گەڕانەوەی و گەشەپێدانی، ئەوەی لەیاد چووە کەخوا لێخۆشبوون و گەڕانەوەی لێ وەربگرێت، بەڵام بەندە بەکردەوەی چاکە.

کەواتە دەبێت بەتێگەشتنێکی ڕاستەقینە لەم ئاینەمان تێ بگەین، بەمەش دەبێتە سەرەتایەك بۆ ڕابونێکی گەورە، بەویستی خوا داهاتو بۆ ئەم ئوممەتەی ئێمەیەو ئەم ئوممەتە هەر دەمێنێتەوە، لەبەرئەوەی ئاینەکەمان فەرمایشتی پەروەردگارە: ﴿ إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا الذِّكْرَ وَإِنَّا لَهُ لَحَافِظُونَ ﴾[1] واتە: ئێمە خۆمان قورئانمان نازڵ کردووەو هەر ئێمەیش ئەیپارێزین لەوەی بفەوتێ یا دەسکاری بکرێ و زیادو کەمی تێدا بکرێ.

وە بەگەڕانەوە بۆ ئاین سەرکەوتنە بەسەر دوژمناندا لەبەرئەوەی ئێمە بە خواپەرستیمان سەردەکەوین و بەسەرپێچی دوژمنانمان، بەڵام ئەگەر تەریب بووین لەگەڵ سەرپێچیماندا ئەوا دوژمنەکانمان لەڕووی چەندێتی و چۆنیەتیەوە بەسەرماندا سەردەکەون.

بەڵام ئێمە دەمانەوێت بەسەر خودی خۆماندا سەربکەوین وە بەسەر ئارەزووە شەیطانیەکانماندا سەربکەوین، دیارە شەیطان ناتوانێ بەسەر کەسدا سەرکەوێ مەگەر باوەڕ لاواز نەبێت:

---

١- الحجر: ٩

﴿ فَبِعِزَّتِكَ لَأُغْوِيَنَّهُمْ أَجْمَعِينَ ﴿٨٢﴾ إِلَّا عِبَادَكَ مِنْهُمُ الْمُخْلَصِينَ ﴾[1] واتـه: جـا ئیبلیس وتی: به عیززەت و جەلالی تۆ قەسەم هەموویان سەرجەم گومڕا ئەکەم. تەنها بەندە خاوێن و دڵسۆزەکانت نەبێ لە ناویانا.

ئێمە دەمانەوێت ئەم ئومەتە کارا بێت، مرۆڤێکمان دەوێت خاوەن باوەڕێکی بەهێزبێت، دیارە باوەڕداری بەهێز چاکترو خۆشەویستترە لای خوا لە باوەڕدارێکی لاواز.

## شکۆمەندی و ڕێز بۆ خاوەن دەستی بالایە:

ئێمە بوینەتە ئومەتێکی لاواز ئومەتێك پێداویستیەکانی خۆی پێ دابین ناکرێت، ئەمەش لە ڕەوشتی ئیسلام نیە، ئەوە پێغەمبەری خوایە ﷺ پیاوێك هاتە لای نەیدەتوانی ژیانی خۆی دابین بکات پێی فەرمو: هیچتان نیە لەماڵەوە؟ کابرا وتی: تەنها مەرکانەیەکمان هەیە ئاوی تێدا دەخۆینەوە وە پارچە حەسیرێك هەندێکی رادەخەین و ئەوی تریشی دەدەین بەخۆماندا، پێغەمبەر ﷺ فەرموی: برۆ بیهێنە، ئینجا پێغەمبەر ﷺ بەرزی کردەوەو فەرموی: کێ ئەم دوانە دەکرێت؟ پیاوێك وتی: بە درهەمێك، پێغەمبەر ﷺ فەرموی: کێ زیاتر دەدات؟ یەکێکی تر وتی: بە دوو درهەم، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بێنە ئینجا پێی فەرمو ئەوە درهەمێکیان بیدە بەخۆراك و منداڵەکانتی پێ تێر بکە، درهەمەکەی تریش تەورێکی پێبکڕە و بۆمی بهێنە.

پیاوەکە تەورێکی لەبازاڕ کڕی، پێغەمبەر ﷺ گرتی و لقی درەختێکی پێ بڕی. پاشان پێی فەرمو برۆ داری پێ ببڕە، هەتا پانزە ڕۆژی تر نەتبینمەوە، ئەمە باشترە لەوەی کە سواڵ بکەیت لەخەڵکی.

---

١- ص: ٨٢ - ٨٣

یەکێك لە هاوەڵان هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ دەستی زبر بووبوو، پێغەمبەر ﷺ فەرموی: ئەوە چیە؟ وتی: بەهۆی کارکردنەوەیە، پێغەمبەر ﷺ فەرموی: ئەوە دەستێکە خواو پێغەمبەرەکەی خۆشیان دەوێت.

خوای گەورە بەندەیەکی پیشەوەری خۆش دەوێت وەکو پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: هەر خاوەن پیشەوەرێ، ئەوەتا زەکەریا پێغەمبەر عليه السلام دارتاش بوو، حەزرەتی موسا عليه السلام ماوەی (١٠) ساڵ شوان بوو، پێغەمبەر ﷺ (١٣) ساڵ شوان بوو، ئێمە لەوان چاکترنین.

کەواتە دەبێت دروشممان هەوڵدان بێت، هەتا هێزی ڕۆژئاوا بەسەرماندا زاڵ نەبێت، ئێمە ئەگەر سود وەربگرین لە نوری خوا ئەوا دەبینە شارەزاو بلیمەتی دنیاو ڕۆژی دوایی، ئێمە فەرمان پێکراوین بەوەی ئوممەتێکی کارا بین، بەهێزو ئیجابی بین و ئومەتێك بین دروستکار بین و داوالێکراو بین و داواکەر نەبین.

کەواتە دەبێت فیقهی یەکەم مافدارێتی (أولويات) جێبەجێ بکەین هەتا بەتێگەیشتن و هۆشیاریەوە بەرەو ڕووی کارەکان ببینەوە ئەمەش نابێت مەگەر بەگەڕانەوەمان نەبێت بۆ لای زانایان و شارەزاو خواناسان و ئەوان دەرك بەوە دەکەن کامە لەپێشەو کامە لەدوایە، وە کامە پێشبکەوێت و کامە دوابکەوێت، سەرقاڵ نەبین بەلاوەکیەکان لەسەر حسابی بنەماکان، وە نە بەڕووکەش لەسەر حسابی ناوەڕۆك.

## خۆراكی بەهەشت و خواردنەوەی...

بۆ ئەوەی بەهەشت بناسین و ئەوەی تیایدایە، با وردبینەوە لە بوكەكەی قورئان سورەتی (الرحمن) كە وەكو سیوەی بەهەشت وایە بۆ بەهەشتیەكان، دادەنیشن و لەنێو خۆیاندا ئاڵوگۆڕی پێ دەكەن و دەیدەن بەیەكتر.

لەفەرمایشتی خواوە دەست پێ دەكات ﴿وَلِمَنْ خَافَ مَقَامَ رَبِّهِ جَنَّتَانِ﴾[1] واتە: بۆ ئەوانەیش كە لەوەی خوای خۆی ترساون كە ئەوەستێ بۆ حیساب و كیتاب كردن لەگەڵ بەندەكان، دوو بەهەشت هەیە. بۆچی دوو بەهەشت بۆ ئەوانەی كە لەخواترسن.

یەكەم: بەهەشتێك بەهۆی راستگۆیی باوەڕی لەگەڵ خوادا.

دووەم: لەبەرئەوەی ڕۆشتە بەهەشتەوە لەرێی دوو شوێنگەوە، پێگەی ترس و پێگەی كاركردن.

خوای گەورە پێناسەی دوو بەهەشتەكەی بە (ذواتا أفنان)كردوە، واتە لق و پۆپی زۆری تیایە، دەفەرموێت: ﴿فِيهِمَا عَيْنَانِ تَجْرِيَانِ﴾[2] واتە: ئەو دوو بەهەشتە دوو كانیاوی ڕەوانیان تیایە.

ئایا كانیەك بۆ هەر بەهەشتێكیانە؟ بەڵكو دوو كانی و سەرچاوەیان تیایە رێگە دەبڕن.

﴿فِيهِمَا مِن كُلِّ فَاكِهَةٍ زَوْجَانِ﴾[3] واتە: لەو دوو بەهەشتەدا لەهەر میوەیێ دوو جۆری ناسراوو نەناسراو یا دوو جۆری تەڕو وشك هەیە.

---

١- الرحمن: ٤٦

٢- الرحمن: ٥٠

٣- الرحمن: ٥٢

له چ میوەیەك كە موسوڵمان لە دنیادا بینیویەتی یاخود هەر جۆرێكیانی نەبینیوە (زوجان) واتە دوو جۆر، دوو جۆر كە بەندە لێیان بێزار نابێت ئەمەش لە ڕەحمەتی خواوەیە.

لەوانەیە كەسێك پرسیار بكات: ئایا جگە لە میوە هیچی تر لە خۆراك لە بەهەشتدا نییە؟ بەڵێ گۆشت هەیە گیانداران دێن لەبەهەشتدا وەكو وشتر ڕوخساری جوانەو دەنگی خۆشە دەڵێت: ئەی خۆشەویستی خوا ئێمە لەكانی (تەسنیم)مان خواردۆتەوەو لەژێر عەرشی (الرحمن)دا لەوەڕاوین لە ئێمە بخۆ ئێمە خۆشترین خواردن، كاتێك بیر دەكاتەوە لە خواردنی گۆشتەكەی لە دەفرێكدا دەخرێتە بەردەمی، هەر كە خواردی و تێربوو لێی هەڵدەستێتەوەو لەژێر عەرشی (الرحمن)دا دەست دەكاتەوە بەلەوەڕین.

ئایا ئەوەی تیانیە كە نەچاو بینیویەتی و نەگوێ بیستویەتی و نەبەدڵی هیچ كەسێكدا نەهاتوە..!

﴿ مُتَّكِـِٔينَ عَلَىٰ فُرُشِۭ بَطَآئِنُهَا مِنۡ إِسۡتَبۡرَقٖۚ ﴾[1] واتە: ئەوانەیش كە لەوبەهەشتانەدان پاڵ ئەدەنەوە بە ڕایەخی واوە ناوەكەی ئاوریشمی ئەستوورە.

سەرین بەرگ و ناواخنی هەیە، جا ڕەنگە بەئیسفەنج یاخود لۆكە یان خوری یان ریشاڵ ناواخن كرابێ بەڵام سەرینی بەهەشت بەرگی ناواخنەكەی بەئاوریشم پڕ كراوە! ئاخۆ دەرەوەی چۆن بێت. (الإستبرق) واتە ئاوریشمێكی ئەستور.

﴿وَجَنَى ٱلۡجَنَّتَيۡنِ دَانٖ ﴾[2] واتە: لێكردنەوەی میوەی بەهەشتەكانیش نزیكەدەستەو هەستانەوەی ناوێ.

---

١- الرحمن: ٥٤

٢- الرحمن: ٥٤

واتە ئەگەر چاوت بەدرەختێك کەوت نێوان تۆ و ئەو (١٠٠) ساڵ بێ ئارەزووی بەرەکەی بکەیت یەکسەر دەهێنرێتە بەردەمت.

ئادەمیزاد تەنها بەئاوات خواستنێك، لەبەرئەوەی مرۆڤ ماندوە، ئەمەش دەسکەوتی ماندوبوونەکەیەتی.

## ئافرەتانی بەهەشت:

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فِيهِنَّ قَٰصِرَٰتُ ٱلطَّرۡفِ﴾[١] واتە: لەو بەهەشتانەدا حۆریی وا هەن چاویان تەنها لە مێردەکانی خۆیانەو ناڕواننە کەسی ترو بەر لە مێردەکانیان کەسی تر.

قورئان پێناسەی پەریەکان دەکات یەکەم خەسڵەتیان ئەوەیە بێجگە لەهاوسەرەکانی خۆیان سەیری کەسی تر ناکەن، بەڵکو چاوی کەسی تر نابینێت، شەرمیان لێ دەبارێت، دیارە ڕەوشتی ئیسلامیش شەرم کردنە، پێغەمبەر ﷺ وای فەرموە، پێغەمبەر لەهەموو کەس زیاتر بەشەرم بوو تەنانەت لەو کچەی کە لە جێگەکەیدایە بەشەرمتر بوو، (قاصرات الطرف) واتە تەنها بۆ هاوسەریەتی سەیری ئەو نەبێت سەیری کەسی تر ناکات.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿لَمۡ يَطۡمِثۡهُنَّ إِنسٞ قَبۡلَهُمۡ وَلَا جَآنّٞ﴾[٢]

واتە: نە ئادەمزادو نە پەری، لاقەی نەکردوون و دەستی پێ نەگەیاندوون.

ئایەتەکە ئاماژەش بۆ ئەوە دەکات کە پەری (الجن)یش دەچنە بەهەشتەوە، بەڵام پەری باوەڕدار، خەڵکی بە قەبارەی خۆی دەیبینێت، لەبەرئەوەی پێغەمبەر بۆ ئادەمیزادو پەریەکان نێردراوە.

---

١- الرحمن: ٥٦

٢- الرحمن: ٥٦

بەهەشت هەموو ئەوەی تێیدایە سەیرە، کێ لەئێمە فریشتەی بینیوە؟ کەس، بەڵام لە بەهەشتدا ﴿يَدۡخُلُونَ عَلَيۡهِم مِّن كُلِّ بَابٖ﴾[1] واتە: هەموو دەرگاکانیان لە ڕوودا کراونەتەوە.

بەویستی خوا دەیبینیت لەگەڵماندا دادەنیشن، لەبەرئەوەی لەناو دنیادا لەنێو دانیشتنی زیکرو یادی خوادا لەگەڵیان دادەنیشتین، کاتێک قورئان دەخوێنین لەگەڵمانن، کاتێك نزا دەکەین ئامینمان بۆ دەکەن، کاتێك دەڕۆین بۆ مزگەوت لەگەڵمانن، باڵیان بۆ زانستخوازان ڕادەخەن، وە هەیانە فریشتەی چاودێرو تۆمارکەرە.

## باشترین پاداشت بۆ باشترین بەندە...

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿كَأَنَّهُنَّ ٱلۡيَاقُوتُ وَٱلۡمَرۡجَانُ﴾[2] واتە: ئەو حۆرییانە لە سووریدا ئەڵێی یاقووت و لە سپێتیدا ئەڵێی مەرجانن، واتە ڕەنگیان سوورو سپییە. کاتێك سەیری دەکەیت دەبینیت گەوهەرە.

دەڵێت: ﴿هَلۡ جَزَآءُ ٱلۡإِحۡسَٰنِ إِلَّا ٱلۡإِحۡسَٰنُ﴾[3] واتە: ئایا پاداشی کردەوەی چاك لە پاداشی چاك بەولاوە شتێکی ترە؟

کاتێك لە دنیادا چاك دەبیت بۆ خواو بۆ ئاینەکەت و بۆ پێغەمبەرەکەت ﷺ و بۆ زانستخوازان و بۆ چاکەخوازان، ئەمە هەرگیز لای خوا تیا ناچێت، کاتێك چاکەکەت دەپێورێت، تۆ چەند ساڵ چاکەت کردووە؟ پەنجا ساڵ، سەد ساڵ، دوو سەد ساڵ، بەڵام ئەی خوا چەند چاکەی بۆ تۆ بووە؟ هەتا هەتایە، ئەمەش فەزڵی خوایە.

---

١- الرعد: ٢٣

٢- الرحمن: ٥٨

٣- الرحمن: ٦٠

﴿خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدًاۚ﴾[1] واتە: بۆ هەمیشە تیایا ئەمێنێتەوە. لەبەرئەوەی خوای گەورە بەئاگاترە لەبەندە باوەڕدارەکانی ئەگەر هەتا هەتا بیهێشتایەتەوە ئەوا هەتا هەتایی خواپەرستی دەکرد، لەبەرئەوەی خوای خۆش دەوێت، هەروەها بەئاگاترە لەبەندەی بێ باوەڕی دەزانێت ئەگەر بێ باوەڕ بهێڵتەوەو نەیمرێنێت ئەوا هەتاهەتایە هەر بە بێ باوەڕی دەمایەوە، کەواتە حسابیان بەپێی نیەتەکانیانە.

کەواتە ﴿هَلْ جَزَآءُ ٱلْإِحْسَٰنِ إِلَّا ٱلْإِحْسَٰنُ﴾[2]

با سەیر بکەین (محسن) کێیە؟ (محسن) خوایە، هەتا باوەڕدار لە دنیادا خۆڕاگربێت خوای گەورە بانگی دەکات: ڕووی تێ بکە.چاکەی دەبینێت، ئەگەر درەختی خێرو چاکەت ڕواند ئەوا بەرەکەی دەچنیتەوە، خۆ ئەگەر درەختێکی پیست ڕواند ئەوا هیچ ناچنیتەوە تەنها بەرێکی پیس نەبێت.

بێگومان بەندە دەبێت بۆ ڕۆژی دوایی بچێنێت هەتا خوای گەورە ڕێگەی بۆ بکاتەوە، ڕێنمونی بکات و باوەڕی لا خۆشەویست بکات، وە لەدڵیدا بیرازێنێتەوە بێ باوەڕی و خراپەکاری و سەرپێچی لا ناشرین بکات، ئەوانە ژیرو تێگەیشتون.

(الراشد) ئەو کەسەیە خۆی پێگەیاندوە بۆ بەرنامەو پرۆگرامی خواو سونەتەکانی پێغەمبەر ﷺ، بەڵام لەگەڵ ئەمانەشدا بەکارو کردەوەی بەندەکەیە، حەزرەتی عومەر(ڕەزای خوای لێ بێت) فەرمووی: کەس لەئێوە لەسەر پشتی نەخەوێت و بڵێت خوایە ڕۆزیم بدەرێ کە دەشزانێت ئاسمان زێڕو زیو نابارێنێت.

---

١- التغابن: ٩

٢- الرحمن: ٦٠

## پلەیەکی تر... کوا کردەوەکەت لە حزوور بەخشندەیی دا؟!

﴿ وَمِن دُونِهِمَا جَنَّتَانِ ﴾[1] واتە: لە دووبەهەشتە وەعدە پێدراوەکەیش بەولاوە دوو بەهەشتی تر بۆ بەهەشتییە دەستەڕاستەکان هەیە.

ئەمە ئاستێکی ترە، وتراوە: واتە نزیکترە لەعەرشەوە لەمە یاخود لەو دوانە، دیارە (الجنان) نزمترین پلەکانی لەعەرشەوە لەنێوان پلەیەك بۆ پلەیەکی تر ڕێگای سەد ساڵە، بەهەشت (٧) پلەیە ئەم دەرگایانەی بەهەشت، وەکو فیردەوس و عەدەن.... لەگەڵ ئەم پلانەشداو لەناو پلەکاندا پلەی تریش هەیە.

بەڵام لە سورەتی (الرحمن)دا چوار (جنتان) واتە باخ هەیە لەنێو یەك پلەدا وە لە پێناسەکانی ﴿ مُدْهَآمَّتَانِ ﴾[2] واتە: ئەو دوو بەهەشتە لەبەر زۆریی دارو درەخت کە دەوریان داوە ڕەشباو دیارن. ئەو ڕەنگە تۆخەی بەهۆی زۆر بەیەکداچونی لقەکانیەوەیەتی و جوانی درەختەکانیەتی.

هەروەها خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ فِيهِمَا عَيْنَانِ نَضَّاخَتَانِ ﴾[3] واتە: لەم دوو بەهەشتەی ترا دوو کانیاو هەن ئاویان بەهێز لێ هەڵئەقوڵێ. (تجریان) گشتگیر ترە لە (نضاختان)، (نضاخة) واتە بەتوندی هەڵدەچێت ﴿ وَنَخْلٌ وَرُمَّانٌ ﴾[4] واتە: لەو دوو بەهەشتەدا میوەو دارخورماو هەنار هەیە.

---

١- الرحمن: ٦٢

٢- الرحمن: ٦٤

٣- الرحمن: ٦٦

٤- الرحمن: ٦٨

﴿ فِيهِنَّ خَيْرَٰتٌ حِسَانٌ ﴾[1] واتە: ئافرەتانی چاك و جوان و لە شێوەو لە ڕەوشتا لەو بەهەشتانەدا هەن. وە لەئایەتی دیکەشدا باسی کردووە: ﴿ حُورٌ مَّقْصُورَٰتٌ فِي ٱلْخِيَامِ ﴾[2] واتە: ئەو ئافرەتانە حۆرین و لەناو ڕەشماڵەکانیانا ماونەتەوە. بەڵام لە بارەی وشەی (الخيام) ەوە حەزرەتی عومەری کوڕی خەطاب(ڕەزای خوای لێ بێ) دەفەرموێت: ئەو خێمانە وەك گومەزەی بەتاڵ وان لە مرواری و زومردو زیو دروست کراون قەبارەیان بەئەندازەی قەبارەی دنیایە.

﴿ لَمْ يَطْمِثْهُنَّ إِنسٌ قَبْلَهُمْ وَلَا جَآنٌّ ﴾[3] واتە: بەر لە مێردەکانیان کەسی تر، نە ئادەمزادو نە پەری، لاقەی نەکردوون و دەستی پێ نەگەیاندوون.

وەکو وتمان پلەکانی تر: ﴿ مُتَّكِـِٔينَ عَلَىٰ رَفْرَفٍ خُضْرٍ وَعَبْقَرِيٍّ حِسَانٍ ﴾[4] واتە: پاڵیان داوەتەوە لەسەر سەرین و پشتیی سەوزو ڕایەخی جوانی ساختی عەبقەر لەوانەی لەوێ دروست ئەکرێن.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ مُتَّكِـِٔينَ عَلَىٰ فُرُشٍۭ بَطَآئِنُهَا مِنْ إِسْتَبْرَقٍ وَجَنَى ٱلْجَنَّتَيْنِ دَانٍ ﴾[5] واتە: ئەوانەیش کە لەو بەهەشتانەدان پاڵ ئەدەنەوە بە ڕایەخی واوە ناوەکەی ئاوریشمی ئەستوورە، ئیتر ئەبێ دەرەکەی چی بێ و، لێکردنەوەی میوەی بەهەشتەکانیش نزیکەدەستەو هەستانەوەی ناوێ.

لێرەدا سەیر دەکەین بەسەر شتێکەوەن کە باڵ دەدا بەیەکداو دەفرێت کە ئاوریشمێکی زۆری پێوەیە، بەڵام (العبقري) مەبەستی لەوەیە ئەو شوێنەی

---

١- الرحمن: ٧٠

٢- الرحمن: ٧٢

٣- الرحمن: ٧٤

٤- الرحمن: ٧٦

٥- الرحمن: ٥٤

لێوەی پێگەیشتوە، کەواتە (العبقري) ئەوشتەیە کە لەوەوپێش نەمان بینیوە، واتە لەسەر شتێك دادەنیشێت کە لەوەوپێش دانەهێنراوە.

ئەمەش ئەو هەمەجۆری و گۆڕانکاریەیە لەبەرئەوەی بەهەشت یەك شوێن نیە، بەندە بەناو موڵکی خۆیدا لە بەهەشتدا هەزار ساڵ دەڕوات.

﴿تَبَٰرَكَ ٱسۡمُ رَبِّكَ ذِي ٱلۡجَلَٰلِ وَٱلۡإِكۡرَامِ﴾[1] واتە: پیرۆزو موبارەکە ناوی خوای پەروەردگارت. کە خاوەنی شان و شکۆو قەدرزانینی هەر خاوەن قەدرێکە. هەر بەدەسەڵات و بەخشندەیی خۆی نیعمەتی ڕشتووە بەسەر بەندە باوەڕدارەکانیدا بۆیە دەبێت ڕێزی بگرین و لەپایەو پێگەی بترسین، هەرخۆی خاوەنی بەخشندەییە کەبەو بەخشندەییەی بەکارێکی کەم خێرێکی زۆرمان پێ دەبەخشێت، کەواتە چی یەکسانە لەبەرامبەر بەخشندەیی خوادا؟

## حەوانەوە نیە لەبەهەشتدا نەبێت...

لەمیانەی ئایەتەکاندا تێبینی باسی دانیشتن و وەسفەکانی دەکەین، هەروەها باسی پەریەکان و خواردن و خواردنەوە دەبینین ئەم شتانە هی خەڵکین لەدنیادا! بەڵام ئەگەر بەو شکۆمەندیەوە لەدنیا گرتی ئەوا لەڕۆژی دوایدا پاداشتی بەهەشت دەبێت، بەڵام دیارە ڕابواردنەکانی زۆرترن هیچ ڕووی بەراورد کردن نیە. ئەم شتانە لەدنیادا هاوڕێیە بەماندوبون و نائارامی بەوەی کە تیادەچن و نامێننەوە، بەڵام لە ڕۆژی دوایدا: ﴿وَلَا خَوۡفٌ عَلَيۡهِمۡ وَلَا هُمۡ يَحۡزَنُونَ﴾[2] واتە: نە ترسیان هەیەو نە خەم. ئێستا موڵکی (الرحمن)ە، کە ڕابواردنی سەرەکیە.

---

١- الرحمن: ٧٨

٢- البقرة: ٦٢

با بەنێو سورەتی (الواقعة)دا بگەڕێین، خەڵکی لە دنیادا کراون بەسێ بەشەوە، هەروەها لە کاتی گیان دەرچونیشدا هەر سێ بەشە؛ (الواقعة) واتە ڕۆژی قیامەت:

﴿ لَيْسَ لِوَقْعَتِهَا كَاذِبَةٌ ۝٢ خَافِضَةٌ رَّافِعَةٌ ﴾[1] واتە: کەسێ نابێ ڕوودانەکەی بە درۆ بزانێ چونکە ڕوویداوەو هەموان بە چاوی خۆیان ئەیبینن. سەری هەندێ نزم و شۆڕ ئەکاو سەری هەندێکی تریش بەرز ئەکاتەوە.

سەرپێچیکاران بەگوناهەکانیان نزم دەبنەوە، لەخوا ترساوانیش بە باوەڕەکەیان بڵند دەبنەوە.

بێ دەسەڵات بەهۆی خواپەرستی و گوێڕایەڵیەوە بەرز دەبێتەوە، دەسەڵاتداریش بەسەرپێچی کردن نزم دەبێتەوە.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ إِذَا رُجَّتِ الْأَرْضُ رَجًّا ۝٤ وَبُسَّتِ الْجِبَالُ بَسًّا ﴾[2] واتە: کاتێ کە زەوی لەرییەوە بە لەرەیەکی توند، بەجۆرێ هەرچی کۆشک و تەلار بەسەریەوەیە هەموو ڕووخان، شاخەکانیش پارچە پارچە بوون و شکان بە شکان و وردوخاش بوون .

(البس) واتە وەك کرێمی لێ دێت وەك خوری شیکراوەی لێ دێت: ﴿فَكَانَتْ هَبَاءً مُّنبَثًّا ﴾[3] واتە: بوون بە تۆزی بڵاوبووەوە بە دەشت و دەرا. ﴿ وَكُنتُمْ أَزْوَاجًا ثَلَاثَةً ﴾[4] واتە: ئێوەیش، ئەی بەرەی ئادەمزادو پەرییان کە زیندووکراونەتەوە بۆ حیساب و کیتاب لەگەڵ کردن، سێ جۆر بوون. با سەرنجی دابەش کردنەکە

---

١- الواقعة: ٢ - ٣

٢- الواقعة: ٤ — ٥

٣- الواقعة: ٦

٤- الواقعة: ٧

بــدەین: ﴿ فَأَصْحَٰبُ ٱلْمَيْمَنَةِ مَآ أَصْحَٰبُ ٱلْمَيْمَنَةِ ﴿٨﴾ وَأَصْحَٰبُ ٱلْمَشْـَٔمَةِ مَآ أَصْحَٰبُ ٱلْمَشْـَٔمَةِ ﴿٩﴾ وَٱلسَّٰبِقُونَ ٱلسَّٰبِقُونَ ﴾[1] واتە: جۆری خاوەن بەرەکەت، تۆ چوزانی جۆری خاوەن بەرەکەت چین؟ جۆری خاوەن نەگبەتییش، تۆ چوزانی جۆری خاوەن نەگبەتی چین؟ جۆری لەپێشیش کە بەڕاستی لەپێشن کە ئەوانەن هەر لەگەڵ سەرهەڵدانی هەر ئایینێ لە ئایینەکانی خوادا باوەڕیان پێ کردووەو ئیمانیان پێ هێناوە.



١- الواقعة: ٨ - ١٠

# بینینی خوای باڵادەست لەڕۆژی دواییدا

## زیاتر لە ڕابواردنی بەهەشت:

بینینی ڕوخساری خوا کە فەزڵێکی تایبەتە، خوای گەورە دەیدات بەدروستکراو و بەندەکانی، ئەم پلەیە کەس پێی ناگات باوەڕداری ڕاستگۆ نەبێت کە ماندو و شەکەت بووە لەدنیادا، وە لەسەر ڕێگا ڕاوەستاو و بەردەوام بووە.

زانایان یەك دەنگن لەسەر ئەوەی سەخترین سزا بۆ دۆزەخیەکان بوونی ئەو بەربەستەیە کەناهێڵت خوای باڵادەست ببینن، وە گەورەترین نیعمەت لە بەهەشتدا بینینی ڕوخساری خوای پەروەردگارە، ئیتر هەرچی ئازارو ئەشکەنجەیان بووە بە بینینی خوا لە بیریان دەچێتەوە، خۆ ئەگەر ڕوخساری خوایان لێ بەربەست بوایە ئەوا بۆ ژیانیان خۆش نەدەبوو، بینینی خوا پلەیەکە وەك مرواری لەنێو تاجدا، ئەوە ئەوپەری هیواو ئاواتەکانی ئادەمیزادە بۆ گەیشتنی بەو نیعمەتە کە بینینی خوایە.

لە بەهەشتدا پلەیەك هەیە هیچ ڕەنگێك لە ڕەنگەکانی ڕابواردنی تێدا نیە لەوانەی کە باسمان کرد، بەڵام تەنها یەك شت هەیە لەم پلەیەدا ئەویش:

﴿عِلِّيُّونَ﴾[1] ئەمەش نیعمەتێکە خوای گەورە دەیدات بە بەندەکانی تەنها سەیرکردنی ڕوخساری پیرۆزی خۆیەتی.

﴿كَلَّآ إِنَّ كِتَٰبَ ٱلۡأَبۡرَارِ لَفِي عِلِّيِّينَ ١٨ وَمَآ أَدۡرَىٰكَ مَا عِلِّيُّونَ ١٩ كِتَٰبٞ مَّرۡقُومٞ ٢٠ يَشۡهَدُهُ ٱلۡمُقَرَّبُونَ﴾[2] واتە: با ناتەواوپێوو ناتەواوکێشەکان واز لەم سەنگ سووکی و کەم پێوییەیان بێنن. سیاهەی کارو کردەوەی پیاوچاکان لە (عیللیین)دایە. تۆ چوزانی عیللییون چییە؟ کتێبێکی نووسراوە. فریشتەکانی لەخواوەنزیك ئامادەی پێشوازی لێ کردنی ئەبن کە فریشتەی کارو کردەوەی چاکان نووس هەڵیئەبڕن بۆ ئاسمان.

قسەکردن سەبارەت بەخوای گەورە دڵەکان ناسك دەکاتەوە، لەبەرئەوەی هیچ بەندەیەك نیە بە خۆشەویستی خواپەرستی نەکردبێت وە ڕێگای خوای نەگرتبێتەبەر بەفەزڵ و گەورەیی نەبێت، دیارە لەنێوان خۆشەویستی و فەزڵدا خێریان تێکەڵ دەبێت، ئەویش ﴿لَيۡسَ كَمِثۡلِهِۦ شَيۡءٞ﴾[3] واتە: هیچ شتێ وێنەی خوا نییە. وە هەروەها: ﴿لَّا تُدۡرِكُهُ ٱلۡأَبۡصَٰرُ وَهُوَ يُدۡرِكُ ٱلۡأَبۡصَٰرَۖ وَهُوَ ٱللَّطِيفُ ٱلۡخَبِيرُ﴾[4] واتە: چاوی مەخلوقات هێزی ئەوەیان نییە خودا ببینن و کونهی خودایان پێ بزانرێ. خودا کونهی چاوەکان و خاوەن چاوەکانیش ئەزانێو بە وردی ئەیانبینێو ذەڕڕەیێکی لێ ون نابێ. خودا لەطیفی ڕاستەقینەیەو هیچ شتێ مەنعی ناکات لە بینینی هیچ شتێك، خودا شارەزایەو لە هەموو شت ئاگادارە .

---

١- المطففين: ١٩

٢- المطففين: ١٨ - ٢١

٣- الشورى: ١١

٤- الأنعام: ١٠٣

بینینی خوا لەعەقیدەی ئەهلی سوننەو جەماعەدا جێگیرە، بەپێی دەقی ئایەت و فەرمایشتەکان دروستە.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ نَاضِرَةٌ (٢٢) إِلَىٰ رَبِّهَا نَاظِرَةٌ﴾[1] واتە: لەو ڕۆژی قیامەتەدا چەندین ڕوو جوان و گەشن. چونکە بۆ خوای خۆیان ئەڕوانن.

ئەمەش هەرەتی نیعمەتە ﴿تَعْرِفُ فِي وُجُوهِهِمْ نَضْرَةَ النَّعِيمِ﴾[2] واتە: لە سیمایانا گەشیی نازو نیعمەت ئەناسیتەوە. ئەمەش مەبەستی لە ڕەنگاڵەبوونی نیعمەتەکانە کە دیارو ئاشکرایە پرشنگداریی دڵ نیشان دەدات لە ترسی خوا لە دنیادا.

## بینینی جێگیرو دروستە...

حەزرەتی موسا ﷺ بانگی خوا دەکات و دەفەرموێت: ﴿أَرِنِي أَنظُرْ إِلَيْكَ﴾[3]

واتە: خودایا خۆتم پیشان بدە تا بتبینم و و زیاتر دڵم بە نوورت ڕووناك بێتەوە.

ئەمەش ئەدەبێکە لە قسەکردندا، ئەگەر بینینی خوا دروست نەبوایە حەزرەتی موسا داوای نەدەکرد. داواکردنی بینینی خوا بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە نازی بەسەر خوادا کردوە، هەروەك بەقسەکردن لەگەڵمدا ڕێزت لێنام هەرواش بە بینین ڕێزدارم کە.

کاتێك داوای بینینی خوای کرد هەر لەخۆیەوە نەبوو بەڵکو ئەوە ڕاستیە؛ کە ئەو زانیویەتی کە دروستە داوا لەخوا بکات ڕوخساری پیرۆزی خۆی پیشان

---

١- القيامة: ٢٢ - ٢٣

٢- المطففين: ٢٤

٣- الأعراف: ١٤٣

بدات، وەڵامەکەی زۆر سەیرو کتوپڕ بوو، ﴿لَن تَرَىٰنِي﴾[1] واتە: تۆ ئیستە توانای ئەوەت نییە من ببینی. نەیفەرموو: هەرگیز نامبینی.

زانایانی زمان دەڵێن: (لن) بۆ پێشهاتنەو، نەریٚ داهاتووی مەحاڵە. ئەگەر خوای گەورە فەرمووی: هەرگیز، ئەوە باسەکە تەواو دەبوو بینین نامێنیٚ نە لەدنیاو نە لەدوارۆژدا.

﴿وَلَٰكِنِ ٱنظُرْ إِلَى ٱلْجَبَلِ﴾[2] واتە: بەڵام بۆ ئەوەی زیاتر دڵنیا ببی کە توانات نییە بمبینی سەیرێکی ئەو کێوە بکە. بەراورد لەنێوان کێو و حەرزەتی موسا بەراورد لەنێوان شتێکی گەورەو ڕەق و هەر لەزووەوە هەیە، خوای گەورە پێش بوونی ئادەم دروستی کردوە وە لەدوای مردنی حەزرەتی موساش(عليه السلام) هەر دەمێنێتەوە، ئەمەش خوای گەورە لەنێو دروستکراوەکانیدا بەگەورەی گرتوە ئەی موسا ئەو کێوە لە تۆ بەهێزترو توندترو ڕەقترو گەورەترە.

﴿فَإِنِ ٱسْتَقَرَّ مَكَانَهُۥ فَسَوْفَ تَرَىٰنِي﴾[3] واتە: ئەگەر لە شوێنی خۆیدا مایەوە ئەوا تۆیش لەمەوپاش ئەتوانی بمبینی. جێگیربوونی کێوەکەی بە بینینەوە بەستەوە:

﴿فَلَمَّا تَجَلَّىٰ رَبُّهُۥ لِلْجَبَلِ﴾[4] واتە: کە خودای گەورە جیلوەو نووری خۆی گرتە کێوەکە.

---

١- الأعراف: ١٤٣

٢- الأعراف: ١٤٣

٣- الأعراف: ١٤٣

٤- الأعراف: ١٤٣

ئەوا خوا دەردەکەوێت، لەوێدا بەشێوەی مەعنەوی دەردەکەوێت، دەوترێت نوری خوا ڕۆیشتۆتە دڵێکەوەو کردویەتیەوە، ئەوە دەرکەوتنی خوایە بۆ ئەو بەندەیە، ئەوا نورو ڕۆشنایی خوایە.

کاتێك پرسیار لە پێغەمبەر ﷺ کرا بۆ نیشانەی ئەو دڵە فەرموی: پشت دەکاتە ماڵی لەخۆبایی دنیاو گەڕانەوە بۆ ماڵی هەمیشەیی، خۆ ئامادەکردن بۆ مردن پێش کۆچ کردن، کاتێك پرسیار لە إبن حزم کرا(ڕەزای خوای لێ بێ): کێ ژیرترین کەسە؟ فەرموی: ژیرترین کەس ئەو کەسەیە دنیا جێدەهێڵێت پێش ئەوەی دنیا جێی بهێڵێت، گۆڕەکەی ڕوناك دەکاتەوە پێش ئەوەی بچێتە ناوی، ئەوەتا خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿ تِلْكَ ٱلدَّارُ ٱلْءَاخِرَةُ نَجْعَلُهَا لِلَّذِينَ لَا يُرِيدُونَ عُلُوًّا فِى ٱلْأَرْضِ وَلَا فَسَادًا ﴾[1] واتە: ماڵی قیامەت بۆ ئەو کەسانە تەرخان ئەکەین نایانەوێ لە زەویدا بەسەر خەڵکی ترا بەرز ببنەوەو خراپە لەناو خەڵکا بکەن.

لەفەرمایشتی قودسیدا هاتوە دەفەرموێت: خۆزگە بۆ بەهەشتە. چونکە ماڵی پادشایانە، واتە ئەوانەی ئارەزووەکانیان جڵەوگیر کرد لەدنیادا.

کەواتە خوای گەورە بەنوری خۆی لە دڵی باوەڕداردا دەردەکەوێت و ڕاستیەکان بەچاوی ئاین دەبینێت نەك بەچاوی دنیا، غەمبار نابێ بەڵکو بە بەخشینی خوا ڕازی دەبێت و بەنەمانی پارە یان لەدەستدانی پلەو پایە یاخود مردنی منداڵێکی غەمبار نابێت.

خوای گەورە دەفەرموێت:﴿ فَلَمَّا تَجَلَّىٰ رَبُّهُۥ لِلْجَبَلِ جَعَلَهُۥ دَكًّا ﴾[1] واتە: کە خودای گەورە جیلوەو نووری خۆی گرتە کێوەکە گورج ئەو کێوە وردو خاش و هەڕوون هەڕوون بوو.

---

١- القصص: ٨٣

واته کێوەکە خۆی پێ نەگیرا لەگەڵ زەویدا یەکسان بوو ئیتر کێو لەویا نەما ئەوەش کتوپڕ بوو، بۆیە حەزرەتی موسا عليه السلام کەوت و بورایەوە بەرگەی ئەوەی نەگرت ئەو کێوە ببینێت لەگەڵ خاکدا یەکسان بوو، کاتێك بەئاگا هاتەوە وتی پاکی و بێ گەردی بۆ تۆ خوایە من هەڵەم کرد.

لێرەدا خوای پەروەردگار فێرمان دەکات داوای شتێك نەکەین کە هێشتا قەدەر بۆی دانەناوین، وەکو حەزرەتی نوح فەرموی کاتێك داوای لە خوا کرد کوڕەکەی ڕزگار بکات ﴿قَالَ يَٰنُوحُ إِنَّهُۥ لَيْسَ مِنْ أَهْلِكَ إِنَّهُۥ عَمَلٌ غَيْرُ صَٰلِحٍ﴾[2] واتە: خودا وتی: ئەی نووح! ئەوکوڕە لە ئەهلی تۆ نییە؛ ئەو کردەوەی خراپ و ناڕەوایە.

هەروەها دەفەرموێت: ﴿إِنِّىٓ أَعِظُكَ أَن تَكُونَ مِنَ ٱلْجَٰهِلِينَ﴾[3] واتە: من ئامۆژگاریت ئەکەم، نەکەی لە نەزانەکان بی. نەچۆتە بازنەی نەزانینەوە، ئەوە پێغەمبەرێکی بەڕێزە بەڵام خوای گەورە ئامۆژگاری دەکات خۆی نەکات بەیەکێك لەوانە.

ئەمەش بەڵگەیەکی ئاسانە بۆمان دەردەخات کەبینینی خوا دروستە، وە گەر نا حەزرەتی موسا داوای نەدەکرد، پێغەمبەران هەر لەخۆیانەوە داوای هیچ شتێك ناکەن سەرەڕای ئەمەش لە ئایەتە قورئانیەکاندا هاتووە:

﴿وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ نَّاضِرَةٌ ﴿٢٢﴾ إِلَىٰ رَبِّهَا نَاظِرَةٌ﴾[4] واتە: لەو ڕۆژی قیامەتەدا چەندین ڕوو جوان و گەشن. چونکە بۆ خوای خۆیان ئەڕوانن.

---

١- الأعراف: ١٤٣

٢- هود: ٤٦

٣- هود: ٤٦

٤- القيامة: ٢٢ - ٢٣

هەروەها هاوەڵان خوا لێیان ڕازی بێت پرسیاریان لە پێغەمبەری خوا کرد ﷺ دەربارەی بینینی خوا ئەوەتا پێشەوا موسلیم لە صەحیحەکەیدا هاتوە لە ئەبوهورەیرەوە رضي الله عنه دەگێڕێتەوە ئەویش لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەفەرموێت: (کاتێك بەهەشتیەکان دەچنە بەهەشتەوە خوای گەورە دەفەرموێت: شتێکتان دەوێت بۆتان زیاد بکەم؟ ئەوانیش دەڵێن ئەوەنیە ناوچاوانت سپی کردوین، ئەوە نیە ئێمەت خستۆتە بەهەشتەوەو لە دۆزەخ ڕزگارت کردوین؟ ئینجا خوای گەورە پەردەیەك لادەبات..!! هیچیان پێ نەدراوە لەوە خۆشتر بێت لایان، کە سەیری خوای خۆیان دەکەن).

لە ئەبوبەکرەوە(ڕەزای خوای لێ بێ) هاتوە دەفەرموێت: ﴿لِّلَّذِينَ أَحْسَنُوا الْحُسْنَىٰ وَزِيَادَةٌ﴾[1] واتە: بۆ ئەو کەسانەی چاکە ئەکەن و لە خودا ئەترسن پاداشی زۆر چاك هەیە لەگەڵ زیادەدا.

لە پاداشتی ئەو چاکانەی کە کردوویانە، پاداشتی چاکترو بەهەشتی بەرین و زیاتریش ئامادەیە ئامادەیە بەچەندەها قات، ئەو زیادەیەش بەتەماشاکردنی ڕوخساری پڕ لەنوورو قەشەنگی زاتی پەروەردگارە.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلَا يَرْهَقُ وُجُوهَهُمْ قَتَرٌ وَلَا ذِلَّةٌ﴾[2] واتە: لە ڕۆژی قیامەتدا تۆزوگەردی غەم و پەژارە ڕوخساریان داگیرناکات و سووکیو بێ حورمەتییان بەسەردا نایێ.

کاتێك بوونە خەڵکانێکی بەخشندە لەدنیا، بەخشندە لەگەڵ خۆیاندا، لەبەرئەوەی کاتێك ئادەمیزاد ڕێز لەخۆی ناگرێت، بە سەرپێچیکردن یان نەگەڕانەوە بۆ لای خواو بەردەوام بوون لەسەر سەرپێچی کردن ، خوا بێ نرخی

---

١- یونس: ٢٦

٢- یونس: ٢٦

دەكات، ئەوە ڕۆژی دوایی بێ بەش و بێ ڕێزە، بەڵام كەسی بەخشندە لە گوناه دوردەكەوێتەوەو ڕوودەكاتە تەوبەكردن و لەسەر ڕێگای ڕاست بەردەوام دەبێت ئەوانە

﴿وَلَا يَرۡهَقُ وُجُوهَهُمۡ قَتَرٞ وَلَا ذِلَّةٌۚ﴾[1].

لە ئەبوهورەیرەوە(ڕەزای خوای لێ بێ) ئەمیش لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەفەرموێت: (خەڵكانێك پرسیاریان كرد ئەی پێغەمبەری خوا، لەڕۆژی دوایدا خوای خۆما دەبینین؟ فەرموی: ئایا هیچ ناڕەحەتیەك دەبینین لە بینینی مانگ لەشەوی چواردەدا؟ وتیان: نەخێر ئەی پێغەمبەری خوا، پێغەمبەر ﷺ فەرموی: سوێند بەخوا بەو شێوەیە دەیبینن).

لەڕۆژی دوایدا خەڵكی كۆدەكرێنەوە پێیان دەوترێت كێ هەرچیەكی پەرستوە با دوای بكەوێت، ئینجا ئەوانەی خۆریان پەرستوە دوای خۆر دەكەون، ئەوەی مانگی پەرستوە شوێن مانگەكە دەكەوێت، ئەوانەشی شوێن ستەمكارلن كەوتون لەوێش دەكەونە دوایان... ئەم ئوممەتە ئاوا دەمێنێتەوە دووڕوەكانیشی تێدایە خوای گەورەو باڵادەست لەشێوەیەكی تری جگە لەشێوەی خۆی دێت بۆ لایان كە زانیویانە (بەڵام چۆن بیناسین كە ئێمە نەمان بینیوە؟ مەبەستی لەو وێنەیە هەریەكەمان لە ئەندێشەو خەیاڵی خۆماندا دامان ناوە) دەفەرموێت من خوای ئێوەم، ئەوانیش دەڵێن: نابێت خوا بێت بۆ لامان، ئینجا خوای گەورە لەو وێنەیەی كە دەیناسن دێت بۆ لایان: ﴿فَكَشَفۡنَا عَنكَ غِطَآءَكَ فَبَصَرُكَ ٱلۡيَوۡمَ حَدِيدٞ﴾[2] واتە: ئەی ئادەمزاد، یا ئەی ئادەمزادی بێ باوەڕ! تۆ ئەم ڕۆژەت فەرامۆش كردبوو و لەیادی خۆتت بردبووەوە، وا ئێستا ئێمە

---

١- یونس: ٢٦

٢- ق: ٢٢

پـەردەی سەرچـاوتمان لاداو، چـاوت ئێسـتا زۆر تیـژەو هـەموو شتێ بـە باشـی ئەبینی.

ئەوە مەبەستەکەیە، بەدیهاتنی ڕاستیەکان، ئەو مەبەستەی ئەگەر ڕوخساری پیرۆزی ببینێت دەیناسێت، لەبەرئەوەی لەژیانی دنیایدا لەسەر گوێرایەڵی کردنی ژیاوە بۆیە خوای گەورە ژیری بۆ ڕووناک کردۆتـەوە بۆیـە لـەڕۆژی دوایـدا خـوای خۆی دەبینێت.

دەفەرموێت من خوای ئێوەم شوێنی دەکەون، پردی سـیراط دادەنـێ لەسـەر پشتی دۆزەخ پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: (خۆم و ئوممەتەکەم یەکـەم کەسـانێك دەبین لەسەری دەپەڕینەوە)[1].

ئەمـە لەسـەر خـاکی مەحشـەر دەبێـت، لـەو ڕۆژەدا کـەس قسـە ناکـات پێغەمبـەران نـەبێت ﴿وَعَنَتِ ٱلۡوُجُوهُ لِلۡحَيِّ ٱلۡقَيُّومِۖ وَقَدۡ خَابَ مَنۡ حَمَلَ ظُلۡمٗا﴾[2]

واتە: هەموو چیهرە و ڕوخسارێ دائەنەوێتـەوەو سـەر شـۆڕو مـل کـەچ ئـەکا بـۆ خواوەندی هەمیشە زیندووی جیهـان ڕاگـر و هەرکەسـێ بـاری تـاوانی هـەڵگرتبێ نائومێد ئەبێ.

نزای پێغەمبـەران لـەو ڕۆژەدا ئـەوە دەبێـت : پـەروەردگارم: سـەلامەت بکـە سەلامەت بکە.

## بینینی خوا بۆ ئەوانەی لەدنیادا حەقیان بینیوە:

لـە دۆزەخـدا شوشـەی داڕژاو هەیـە وەکـو درکـی سـەعدان. پێغەمبـەر ﷺ پرسیاری کرد: درکی سەعدانتان بینیوە؟ وتیـان: بـەڵێ ئـەی پێغەمبـەری خـوا. لەکاتێکدا کەس نازانێت گەورەیی چەندە خوای گەورە نەبێت.

---

١- رواه البخاري.

٢- طه: ١١١

ئەو دڕکە خەڵکی بەکردەوەکانی خۆیان دەفڕێنێت، هەتا لەدادوەری نێوان بەندەکان سڵەمیەوە وە خوای گەورە دەیەوێت بەویستی خۆی بەڕەحمەتی خۆی لەنێو دۆزەخیەکاندا سەرپێچیکارە یەکتاپەرستەکان دەربێنێت، خوای گەورە دەفەرموێت: ئەوەی هاوەڵی بۆ خوا بڕیار نەداوە دەری بێنن لە ئاگر.

کەواتە، ئەوانەی باوەڕدارن هەیانە خوای بەندەکان دەبینن لەخاکی مەحشەردا هەتا دڵیان ئۆقرە دەگرێت، هەروەها دووڕووەکانیش دەیبینن، بەڵام ئەمە بۆ ئەوەی بێ باوەڕ زیاترو زیاتر غەمبارو نائومێد بێ وا بزانێ هەر ئەوە کە هیچی دەست نەکەوتووە.

بە وردبوونەوە لەباسی سەیرکردنی ڕوخساری پیرۆزی پەروەردگار، و هاوەڵان و پێشینانی پیاوچاك و کردەوەکانیان شتی زۆر سەیر دەبینرێت.

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: (ئەمشەو شتێکی سەیرم بینی، ئەبوبەکرم بینی بە دۆڵچەیەك لەبیرێکدا دوو دۆڵچە ئاوی هەڵگۆزی، پاشان عومەر هات دۆڵچەکەی وەرگرت و ئەوەندەی ئاو هەڵکێشا خەڵك وشترەکانیان پاراو کردو بردیانن بۆ مۆڵگا، هیچ ئازایی و لێزانیەکم لە ئادەمیزاد نەدیوە بەوێنەی عومەر ئاو هەڵبکێشێ).

زانایان بەو شێوەیە لێکیدەدەنەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی دەفرێك یان دوو دەفر، واتە ئەبوبەکر لە دوای پێغەمبەر ﷺ ساڵێك یان دووساڵ دەژی، هەر واش بوو، بەڵام حەزرەتی عومەر(١٠) ساڵ و شەش مانگ وەك پێشەواو جێنشینی پێغەمبەری خوا ژیاوە، هەموو زەوی پڕکردووە لە دادو چەندین وڵات و سەرزەمینی نوێی ڕزگارکردو لە کاروباری دەوڵەت و خەڵکیدا لەپێش هەموانەوە بوو.

بەڵگەش لەم بارەیەوە ئەوەیە کە ئەو هاوەڵە بەڕێزانە لەنزیکان و خۆشەویستانی خوای گەورەن و لە شوێنە بەرزو بڵندەکاندان، هاوەڵان بەیاسا

دنیاییەکە لەژیانی خۆیاندا نیعمەت و ڕابواردنی دنیایان نەبینی، لە ژیانی مەدینەیاندا زیاتر لە (٢٧) جەنگ و شەڕیان بینی، لەهەر جەنگێکیاندا خوای گەورە چەندین کەسی لێ دەکردن بەشەهید، هەموو ئەو جەنگانە تەنها بۆ لابردنی ئەو بەربەستانەی بەردەم بانگەوازی (لا إله إلاّ الله) بوو.

ئایا ئەو ماندوبوون و ڕەنجە بێ شومارەی کە کێشایان هەروا بە فیڕۆ دەڕوات؟ کەواتە دەبێت لەڕۆژی دوایدا ڕێزیان لێ بگیرێت، بە بینینی ڕوخساری پەروەردگاریان شادبن ﴿ هَلۡ جَزَآءُ ٱلۡإِحۡسَٰنِ إِلَّا ٱلۡإِحۡسَٰنُ ﴾[1]

ئەگەر سەیری باپیرانمان بکەین، چەندێك لە نیعمەتەکانی دنیا سودیان بینی؟ بەڵام لەلایەن ئێمەوە کەمتر نیعمەتیان دەستکەوت؟ ئێمە زیاترمان چنگ کەوتوە، بۆ نموونە تۆ بەتەلەفۆن قسە لەگەڵ براکەتدا دەکەیت لە ئوسترالیا یان ئەمریکا یان لە ڕێی ئینتەرنێت یاخود فاکسەوە، ئایا بەندەکان سوپاسی خوایان کردوە؟ هەتا شایستەی بینینی ڕوخساری خوای پەروەردگار بین؟

ئایا بیرمان چویەوە یاخود یادی نیعمەتەکان دەکەین بەڵام بەخشێنەرەکەیمان لەیاد کردوە؟!!!

## ئیسلام تێڕوانینەکان بەرفراوان دەکات:

ئەوەی لەدنیادا حەق نەبینێت و لەسەری ڕانەوەستێ ئەوا لەڕۆژی دوایدا ڕوخساری خوا نابینێت، هەریەکێك لەئێمە دەزانێت حەق چیە، حەق یەك پێوەری هەیە، هەندێك جار پێوەرەکان زیاد دەکەین ئەوەش کارەساتەکەیە.

حەق لەپێشترە بۆ ئەوەی پێشی بکەوین ئەویش قورئانی خواو سونەتەکانی پێغەمبەرە ﷺ، ڕای جیاواز لە لق و ڕێچکەکاندا هەیە بەڵام لە بنەڕەت و بنەماکاندا نیە، جیاوازی لە لێکدانەوە بۆ دەقێك یاخود کاریگەریەکەی، بەڵام

---

١- الرحمن: ٦٠

هەموو لایەك لەسەر نەگۆڕەكان بەیەك دەگەن كەواتە جیاوازی لەسەر قورئان و سوننەدا نیە.

زانایەكمان نەبینی بڵێت من وا دەبینم نوێژی نیوەڕۆ سێ ركاتە... ئێمە بەرێژەی ٩٠٪ یەك دەنگین، ئەوەش جیاوازیمان لەسەری هەیە لە ٥٪ بۆ ١٠٪ یە.

لە نیشانەكانی لاوازیی عەقیدە لە دڵەكاندا، ئەوەیە كە خوا ئامانجمان نیە، یاخود قورئان و سوننەت تاكە پێوەرمان نیە یاخود لەبەرئەوەیە ئادەمیزاد شوێن ئارەزووەكان دەكەوێت یاخود ئێمە واز لەوە دەهێنین كە لەسەری رێكەوتوین وە جیاو پەرش و بڵاوین لەسەر ئەوەی جیاوازین تیایدا.

وە دەگەڕێینەوە جەخت دەكەینەوە لەسەر ئەوەی هەركەسێك كە چووە بەهەشتەوە پلەو پایەی هەرچیەك بێت روخساری خوا دەبینێت، بەڵام جیاوازیەكە لەوەدایە خەڵكانێك هەن ساتە نا ساتێك خوای خۆیان دەبینن، هەندێ خەڵكانیش هەن بەیانی و ئێوارە دەیبینن، كەواتە بینینیش بە پلەیە.

بەئەندازەی دووركەوتنەوەی ئادەمیزاد لە رۆچون لەدنیادا، بەو ئەندازەیە فەزڵی خوای پێ دەبەخشرێت لەرۆژی قیامەتدا.

## گەڕان بەناو بەهەشتدا بەگشتی...

دروستە ئەو بەهەشتیانەی كە خاوەنی پلەو نمرەیەكی دیاری كراون بەناو بەهەشتدا بگەڕێن و بڕۆن بۆ لای (علیین) و لەوێ بمێننەوە، خوای گەورە ئاوات و داخوازی وا دەخاتە دڵی بەندە بەهەشتیەكانیەوە كە پێشتر بەخەیاڵیشیاندا نەهاتووە، كاتێك بە بەندەیەكی دەڵێت ئادەی ئاواتت چیە داخوازیت چیە تا بەندە هەموو ئاواتەكانی تەواو دەبێت، بەدوای ئەمەدا خوای گەورە داخوازی و

ئـاواتی تـر دەخاتـە دڵیـەوە هـەتا بێـزار نـەبێت: ﴿لَا يَبْغُونَ عَنْهَا حِوَلًا﴾[1] واتـە: هەتاهەتایە تیایدا ئەمێننەوە و داوای ئەوە ناکەن لەوێ بگوێزرێنەوە.

لەوانەیە پرسیارێك بەهزرماندا بێت: ئەی چۆن خوای گەورە رێگـەی نـەدا بـە حەزرەتی موسا چاوی پـێ بکـەوێت؟ لەبەرئـەوەی بەرگـەی نـەدەگرت، ئایـا لـە بەهەشتدا بەندەکان سەیری روخساری خوای خۆیان دەکەن؟

دەڵێین: خوای گەورە لە رۆژی دوایدا خەڵکی لەسەر شێوەی باوکیـان ئـادەم زینـدو دەکاتـە کـە (٦٠) بـاڵ بـووە لـە ئاسمانـدا، وەك دەوترێـت یـەك بـاڵ (٧٥)ســــم) ە، ئیتر خۆت بیهێنەرە پـێش چـاوت پیاوێـك لەبـەرزی دوو نهۆمـدا بێت، ئێستا دروستکراوەکان بەرەو کەم بوونەوەو پوکانەوە دەچن، لەبەرئەوەی پێویستی بەجەستـەی گـەورە بـەرەو کـەم بوونـەوە چـووە بـەهۆی ئـەو هـەموو داهێنانەوە کە ئێستا پەیدابوون و ئاسانکاریان بۆ مرۆڤ هێناوەتە پێش بۆ دابـین کردنی هەرشتێك پێویستی پێیەتی.

هەموو لایەك لەبەهەشتدا یەك درێژیی هەیە بـەڵام یـەك شـێوەیان نیـە بـەڵکو لەسەر شێوەی ئێستایانن هەتا خەڵکی یەکتر بناسنەوە.

ئەمەش خۆشیەکەیە کە شێوەو تایبەتمەندیمان نـەگۆڕێت و خـوای گـەورەش ببینین.

هەروەها لەفەزڵی خوا بەسەرمانەوە لەبەهەشتدا ئەوەیە کە خـەڵکی یـەکتری دەبینن، هەر وەك چۆن لە دنیادابوون، هەندێك وا دەزانن مەبەسـتی فەرمایشـتی خوا﴿عَلَى الْأَرَائِكِ يَنظُرُونَ﴾[2] ئەوەیـە کـە تایبەتمەنـدێتی نیـە، بـەڵکو تایبەتمەنـدی هەیە، بەڵام پێگەیشتنی گشتی هەیە خەڵکی بە براکانی خۆیان دەگەن.

---

١- الكهف: ١٠٨

٢- المطففين: ٢٣

هەروەها بەهەشتیەکان سەردانی یەکتر دەکەن، خاوەنی ئەو پلەو پایە بەرزە سەردانی ئەو بەهەشتیە دەکات کە لەخوار پلەی خۆیەوەیەتی بەو شێوەیە.

ئەمەش بەتەواوی فەزڵی خوایە، بەڵکو هەر چونە ناو بەهەشت خۆی فەزڵ و رەحمەتێکی بێ پایانی پەروەردگارە، کاتێک پێغەمبەر ﷺ فەرموی: کەس لەئێوە بەهۆی کردەوەکانیەوە ناچێتەوە بەهەشت... پرسیایان لێکرد ﷺ: تەنانەت تۆش ئەی پێغەمبەری خوا؟ فەرموی: تەنانەت منیش مەگەر خوا بەفەزڵ و بەخشینی خۆی دامپۆشێت.[1]. کەواتە کەس بەهۆی کردەوەکانیەوە ناچێتە بەهەشت بەڵکو گرنگی کارکردن لە جیاوازی ئەو پلەیەیە کە تیایدا نیشتەجێ دەبێت.

## پلەکانی بەهەشت:

بەهەشت لە پلەکانیدا جیاوازی هەیە، هەیانە وتویەتی سەد پلەیە، بەڵام من لەسەر ئەو رایەم کە دەڵێت ژمارەی پلەکانی بەهەشت بەئەندازەی ژمارەی ئایەتەکانی قورئانە، لەبەرئەوەی ئەو کەسە دێنن کە هەموو قورئانی لەبەرەو کاری پێکردوە پێی دەوترێت قورئان بخوێنەو بەرزبەرەوە، پلەو پایەی تۆ لەگەڵ کۆتا ئایەتدایە کە دەیخوێنێتەوە.

ئەگەر لەو کەسانە بێت کە قورئانی لەبەرەو کاری پێ کردوە ئەوا خۆی لە تەنیشت پێغەمبەری خوا ﷺ دەبینێتەوە واتە فیردەوسی باڵا، ئەوەش فەزڵی قورئانی پیرۆزە کە بەندە دەگەیەنێتە فیردەوس.

بەڵام ئەگەر قورئانی لەبەربێت و کاری پێ نەکردبێت ئەوە کارەساتە، خوای ئەو قورئانەو خودی قورئان نەفرینی لێ دەکەن، لە زمان و گوێی تێ ناپەڕێت و

---

١- رواه البخاري.

ناچـێته حاڵـەتی کردەییـەوە هەرچەندێکیشـی لەبـەرکردبێت دەبێتـە بەڵگـە بەسەریەوە.

ئایا لەسـەروی بەهەشـتەوە هیچی تـر هەیـە؟ بـەڵێ لەسـەروی بەهەشـتەوە عەرشی (الرحمن) هەیـە، عەرشـی خـوا هەمەڕەنگـە کـەس جوانیەکـەی نازانێـت بەدیهێنەرەکـەی نـەبێت، وە الله لەسـەر عەرشـە! و عەرشـی خـۆی سـەقفی فیردەوسە!!

## بـەڵام بۆچـی بینـینیخـوا گـەورەترین داوایـە کـە ئاواتەخوازی بین؟

ئێمە لـەدنیادا لـە ژێـر چـاودێریی و پاراسـتنی خـوای گـەورەو رەحمـەت و رۆشنایی ئەودا دەژین، ئایا بەندە بەتاسەوە نەبێت بۆ بینـینی بەدیهێنـەری ئـەم خێرە! بۆ نموونە تۆ هەر لە منداڵیتەوە نامەیـەکی مانگانـەت بـۆ دێـت لەسـەری نوسراوە (خێرکارێکە) شتێکی تێدایە سودت پی دەگەیـەنێت و قەیرانـەکانت بـۆ چارەسـەر دەکـات. کاتێـك دەڕۆیـت بـۆ پێـدانی پـارەی پسـوڵەی کارەبـا پێـت بوترێت: کەسێك هات و پارەی پسوڵەکەی دا، هەر بەو شێوەیە دەڕۆیت بۆ هـەر شوێنێك خێرەکەی دەوری داوی، ئایا تامەزرۆی بینینی ئەو کەسە ناکەیت.

ئەی دەبێ بۆ خوا چۆن بین کە رێزی لێناوین بەئیسلام بـێ ئـەوەی داوامـان لێکردبێت و بەنیعمەتەکانیەوە ژیان دەگوزەرێنین، ئایا چـۆن تامـەزرۆی بینـینی نابین؟!

## فەرمایشتەکانی خوا بۆ بەهەشتیەکان:

ڕەحمەتەکانی خوا هەر تەنها بە بینینەوە ناوەستێت بەڵکو قسەشمان لەگەڵدا دەکات، با وردبینەوە لەم فەرمایشتەی پەروەردگارمان:

﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَشۡتَرُونَ بِعَهۡدِ ٱللَّهِ وَأَيۡمَٰنِهِمۡ ثَمَنٗا قَلِيلًا أُوْلَٰٓئِكَ لَا خَلَٰقَ لَهُمۡ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ وَلَا يُكَلِّمُهُمُ ٱللَّهُ وَلَا يَنظُرُ إِلَيۡهِمۡ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ وَلَا يُزَكِّيهِمۡ ﴾[1] واتە: ئەوانەی وەختی خۆی پەیمانیان بە خودا دابوو کە ئیمان بە پێغەمبەر بێنن و یارمەتیی بدەن کەچی لەپاشاندا وەفایان بەو پەیمانە نەکردو بەرامبەر بە ماڵی بێ مایەی دنیا گۆڕییانەوەو پەیڕەویی پێغەمبەریان نەکرد، ئەوانە لە قیامەتدا بێ بەش ئەبن لە کەرەمی خودا، خودای گەورە لەو ڕۆژە پڕسامەدا قسەیان لەگەڵ ناکات و ناڕوانێ بۆیان و بەبێ گوناهیان دانانێ و مەدحیان ناکات و سەرباری ئەمانەیش سزای توند ئەدرێن.

واتە ئەوانەی کە بازرگانی بەئاینەوە دەکەن و فتوا دەدەن بۆ ئارەزووبازی و ئەو بەرژەوەندیانەی کە پێچەوانەی شەرعی خوان، نموونەیان وەك نموونەی ئەحبارەکانی جولەکە و قەشەی مەسیحیەکانە، ئەوانەی بەنرخێکی کەم فەرمایشتەکانی خوایان فرۆشت، ئەوانە خوای گەورە نایاندوێنێ ئەمەش سزایەکی سەختە، ئیتر ئەوەی دەمێنێتەوە لەدوای ئەوانە خوای گەورە لەگەڵیاندا دەدوێت.

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: کەسێك لای پەروەرگاری باڵادەستەوە بانگ دەکات ئێستا خوای گەورە سڵاوتان لێ دەکات ئەوەتا لە سورەتی (یس)دا دەفەرموێت:

---

١- آل عمران: ٧٧

﴿ سَلَٰمٌ قَوۡلٗا مِّن رَّبّٖ رَّحِيمٖ ﴾[1] واتــه: ســهلاميان بــه وتــن لهلایــهن خــوای میهرهبانهوه بۆ دێ. ڕستهکه لێرهدا پێناسهی حاڵهتی سڵاوکردن دهکات بهوهی که بهفهرمایش کردن دهبێت لهلایهن خوای جیهانیانهوه.

ئهوهی سهیره ئێمه ئهم وشهیه لهکاتی ترس و تۆقیندا بهکاردێنین و دهڵێین: (سَلَٰمٌ قَوۡلٗا مِّن رَّبّٖ رَّحِيمٖ) ئهمه سڵاوه لهلایهن خواوه ههتا بهندهکان گوێیـان لـه فهرمایشتهکانی الله بێت له بهههشتدا.

ئهو بهنده گوناهبارهی که دهگهڕێتهوهو خوا لێـی وهردهگرێـت بـهرهو پلـهی (الکلیم) بـهرز دهبێتـهوه، واتـه لـهڕۆژی قیامهتـدا قسـه لهگـهڵ خـوادا دهکـات و دهیبینێـت، کهواتــه خــوای گــهوره پلــهی بهنــدهکانی بــهرز دهکاتــهوه: ﴿يَرۡفَعِ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مِنكُمۡ وَٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡعِلۡمَ دَرَجَٰتٖۚ ﴾[2] واتـه: ئهوانـهی خـاوهن باوهڕو خاوهن زانستن، خوا چهند پله بهرزیان ئهکاتهوه.

ئهمانه پله بهرزهکانن، ئهوهی له بهههشتدایه گوێی له دهنگی خوایه ئهگـهر له خوارهوهی بهههشتیش بێت، بهڵام دۆزهخیهکان تهنها گوێیان له کڵپهی ئـاگر دهبێت لهبهرئهوهی له دنیادا ڕێگهیان نهدا گوێیـان لـه حـهق بێـت بۆیـه لـهڕۆژی دوایشـدا لـه گـویٚ بیسـت بـوون لـه دهنگـی خـوا نائومێـد دهبـن هـهروهك چۆن لهبینینیشی بیٚ بهش دهبن.

---

١- يس: ٥٨

٢- المجادلة: ١١

## یادخستنەوەیەکی ڕەببانی جوان:

کەس نیە کە خوای گەورە وتارێکی بۆ نەدا! خوای گەورە دەفەرموێت: ئەی فلان ئەو ڕۆژەی ئەمەو ئەمەت ئەنجامدا (سەیرکە خوا قسەی لەگەڵدا ئەکات، هەندێك لەو کارانەی کە لەدنیادا کردویەتی وەبیری دێنێتەوە) بەندەکە دەڵێت: لێم خۆش نەبوویت، ئەو ویستی ئەو نیعمەتانەت بیربێنێتەوە کە پێی بەخشیویت.

ئیبن حەزم(ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێت کەس نیە لەئێوە هەر خۆی و خوا نەبێت، واتە کەس لەنێوانیاندا نیەو پەردە لەنێوانیاندا نەماوە.

بەڵام ئەم نیعمەتە گەورەیەو ئەوەی کە پێی بەخشیویت سەرپێچی و گوناه بێ بەشت دەکات لێیان، کەواتە هیچ گوناهێك بە بچوك مەزانە چونکە ئەوە دەبێتە هۆی لەدەستدانی زرنگی و چاك بینی، ئەو بەندەیە سەرەنجامی سەرپێچی کردن نابینێت.

## چۆن دەگەینە بینینی خوا لە بەهەشتدا:

گوناهەکان چوار جۆرن لە دوو بەشدا:

**بەشی یەکەم:** سەرپێچی ئەندامەکانی جەستە، و دڵ.

**بەشی دووەم:** گوناهە بچوکەکان، گوناهە گەورەکان.

بۆ نموونە تۆ وادەزانی سەیرکردن گوناهێکی بچوکە، بەڵام دوو شتی لێ دەکەوێتەوە: (الاستمراء) واتە شوێنکەوتنی هەنگاوەکانی شەیطان هەتا دەکەویتە خراپەکاریەوە.

بۆ نموونە خوا چاوی پێ بەخشیوم هەتا بەهۆیەوە بیر لە ئاسمانەکان و زەوی بکەمەوە بۆ ئەوەی قورئانی پێ بخوێنین بۆ ئەوەی پێی بڕۆین بۆ مزگەوت بۆ ئەوەی سەردانی خزم و دۆستانی پێ بکەم، بۆ ئەوەی سەردانی نەخۆشی پێ بکەم.

بەڵام ئەوەی لە شکاندنی سنورەکانی خوادا بەکاری دێنێت وەك بە سوك تەماشاکردنی موسوڵمانان یان سەیرکردنی ئەوەی خوا حەرامی کردوە، وە بەفیڕۆدانی کات لەوەی کە خوا حەرامی کردوە وە بینینی ئەوەی کە حەرامی کردوە ئەمەش نکوڵی و کەللەرەقی نواندنە لەبەرامبەر نیعمەتەکانی پەروەردگاردا ئەوەتا پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: (لەڕۆژی دوایدا هیچ ئادەمیزادێك هەنگاوێك نانێت هەتا سەبارەت بە پێنج شت پرسیاری لێ نەکرێت، تەمەنی لەچیدا بەخەرجدا، وە گەنجی لەچیدا بەسەربرد، وە سامانی لەکوێوە پەیداکردو لەچیدا خەرجی کرد، وە چی کرد بەوەی کە زانیویەتی)[1].

بۆیە ئەرکی سەرشانی باوەڕدارە ویست و ئیرادەی خۆی بگرێت و ئەو لەدنیادا ماندو دەبێت هەتا لەڕۆژی دوایدا بڵێت: ﴿هَآؤُمُ ٱقۡرَءُواْ كِتَٰبِيَهۡ﴾[2] واتە: فەرموون کارنامەکەم بخوێننەوە.

بەڵام چۆن بگەینە بینینی خوای گەورە؟

بۆ ئەوەی لە ڕۆژی دوایدا ڕوخساری پەروەردگار ببینین دەبێت کۆمەڵێ شت هەیە جێبەجێی بکەین ئەویش: گەڕانەوە بۆ لای خوا بە باشترین شێوە، پاشان بگەڕێم بەدوای ئەوەی کەخواو پێغەمبەرەکەی ڕازی دەکات لە گوفتارو کردارو ئەنجامیان بدەم، وە دووربکەومەوە لەوانەی خواو پێغەمبەرەکەی دەرەنجێنێت، بەخۆمدا بچمەوە: ئایا غەمی ئیسلامم هەڵگرتوە؟ چیم بۆ کردوە؟ ئایا قورئانم خوێندوەتەوە؟ بەشەودا نوێژم کردوە کەخەڵکی نوستون؟ سەردانی خزم و دۆستانم کردوە؟ سەردانی نەخۆشم کردوە لەبەرامبەر خەڵکیدا خۆم بەگەورە نەزانیوە؟ دەستم هێناوە بەسەر بێ باوکدا؟ حەقی کەسێکم پێشێل کردوە؟

---

١- رواه الترمذي.

٢- الحاقة: ١٩

بەم کارانە کارم ڕاست دەبێت، بزانە دنیا کوڕی خۆی هەیەو قیامەتیش کوڕی خۆی، دەی تۆ لە کوڕانی قیامەت بە، دنیا بەسەرچوو و بەفەنا بووە، شوێنی پەڕینەوەیە بۆ ڕۆژی دوایی. پێویستە بەرنامەی خوا بخەینە بەردەممان هەتا فەزڵی خوامان بۆ دێت و دەرگاکانی بەهەشتمان بۆ بکرێتەوە.

بزانە لەدنیادا بەهەشتێك هەیە ئەوەی نەچێتە ناوی ناچێتە بەهەشتی ڕۆژی دوایی ئەویش ڕازی بوونە لەخوا، وە بەوەی کە پێیداوین، تەنها لێرەدا دەرگاکانی بەهەشت دەکرێنەوەو شادەمیزاد بەبینینی پەروەردگار شادو شەرەفمەند دەبێت، ئەمەش لای خوای بەدەسەڵات زۆر ئاسانە.



# پێڕست